مەدیان

# شەڕی ناوخۆی کورد



## بۆچی سەری هەڵدا؟ چۆن گەشەی کرد، سەرئەنجام

**سەلاح ڕەشید**



ADIBAN

**ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان**

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا،قولگەی گۆزەکان نزیك مەڵبەندی ڕۆژهەڵاتی کوران

پەیوەندی: 07701974856 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

Email: bookadiban@gmail.com

Facebook: https://www.facebook.com/eadiban

ناوی کتێب: شەڕی ناوخۆی کورد، بۆچی سەری هەڵدا، چۆن گەشەیکرد، سەرئەنجام

بابەت: سیاسی، مێژو

نوسەر: سەلاح رەشید

دیزاین: سیروان خەلیل

بەرگ: ڕێبوار رەشید

نۆبەتی چاپ و ساڵ : چاپی یەکەم ۲۰۲۰

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ۱۷۱۰ ) ساڵی (۲۰۲۰) ی پێدراوە.

## ناوەڕۆک

١٩٩٦



١٩٩٧



١٩٩٨

## سەرەتایەکی پێویست

شـــەڕی نـــاوخۆ، نە ســـیمایەکی کـــوردییە و نە ســـەرهەڵدان و بەگژیەکداچونێکی نوێیە، لە دێر زەمـانەوە شـەڕی نـاوخۆ لە نێوان گروپ و کۆمەڵ و گەلانـی جیـاواز رویـداوە، لە قۆناغێکـدا لایەک سـەرکەتوە بەسـەر لایەکـی تـردا و پـاش مـاوەیەکی تـر، شــەڕی تـر روی داوە و ئەمجـارە لا سەرکەوتوەکە شکاوە و لاکەی تر دەسەڵاتی وەرگرتوە، بە واتـایەکی تر هیچ کام لە گروپە شەڕکەرەکان سەرکەوتنی هەمیشـەییان بەدەست نەهێنـاوە و لە ئەنجامدا زەرەر و زیانی گەورە بەر هەردولا کەوتوە.

شــەڕی کــوردیش لە دێــر زەمــانەوە، بە هەمــان شــێوە رویشــتوە و زەرەرمەندی یەکەم، تەنها کورد خۆی بوە و کوردستانیش وێران و کاول بوە.

شـەڕی سـاڵانی شەسـتەکان لە کوردسـتانی عێـراق، لە نێـوان بـاڵی مەلا مسـتەفا و مەکتەبـی سیاسـی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و دوای ئەوەش شــەڕی خوێنـاوی هێـزە کوردیەکـان و بەتـایبەتی، نێـوان یەکێتـی نیشـتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان لەو باسـەی سـەرەوە بەدەر نیە و هیچ کاتێک، هیچ هێزێکیـان براوە نەبـون و نین و نـابن، زەرەرمەنـدی یەکەم تەنها هاوڵاتیانی کوردستان بوە.

هەردو هێزی سـەرەکی، ویستویانە خۆیان باڵادەستی سیاسی و سـەربازی بن و گەورەترین ناوچەی جوگرافییان لەژێر دەسەڵاتدا بێت، ویستویانە ئەوان برا گەورە و ساحێب ماڵ و هێزەکانی تر میوان و گوێگر و جێبەجێکار بن و مافی ئەوەیان نەبێت فەرمانی (گەورەکان) جێبەجێ نەکەن.

کلتوری بەڕێوەبردن لە چەرخەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەم لە ئەوروپا، چۆن بەڕێوەچوە، ئێستاش هەمان کلتور لە بەرگێکی تردا لە کوردستان بەڕێوەدەچێت، ئەم کلتوری بەڕێوەبردنە ڕێگا نادات کە هێزی تر وەک خۆی بێتە کایەوە و قبوڵیشی ناکات کە هێزی تر بە هەمان خواست و قەبارە و توانا لەو ناوچەیە بونی هەبێت.

ئەم عەقڵیەتە، زەمینەی بۆ شەڕی ناوخۆ زۆر ئاسانکردوە، لەبەرئەوەی هەریەکەیان (شەرعیەتی شۆڕشگێری) یان لە فکری خۆیاندا دروستکردوە و هەر ئەو عەقڵیەتەش وایکردوە کە ئەو هێزانە مافیان بەخۆیان داوە، کاتێ هەستیان کرد بەرامبەرەکەیان (زیادڕۆییان) کردوە، تەمێیان بکەن.

جاران باسی هەندێ ڕواڵەت دەکرا، وەک توڵەسەندنەوە، ڕق لەیەک بون و لەناوبردن و تەفروتوناکردنی یەکتر، کە سیمای نەشیاون و لەناو کوردا بونیان کەم بوە، بەڵام ڕۆژانی شەڕی ناوخۆ لە کۆن و ئێستادا، نیشانی دا، کوردیش لە لەناوبردنی هاونیشتیمانی خۆیدا دەستی باڵای هەبوە و هەیە.

دروستبونی هێز و گروپی زۆری چەکدار، نیشانەیەکی زۆر ئیجابی نەبوە لە مێژوی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیدا، ئەوە جگە لە پەرتەوازەیی، وای لە هێزەکان کردوە لە پێناوی مانەوەی خۆیاندا، پێویستیان بە هاوکاری و پشتیوانی هێزی تری گەورەی ناوخۆیی و دەرەکی هەبێت، ئەو یارمەتی و پشتگیرییە هیچ کاتێ لە پێناوی بەرژەوەندی کوردا نەبوە و زوربەی جار ئەو هێزانە ناچاربون فەرمانی ئەو گروپ و لایەن و وڵاتانە جێبەجێ بکەن، کە هاوکاریان کردون و فەرمانی ئەوانیش وەک بەنزین بوە بیکەیت بەسەر ئاگردا.

هێزە ئیقلیمیەکان، هەمیشە بە زارەکی خۆیان بە دۆستی کورد نیشانداوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەگەر لە قۆناغێکدا یارمەتی لایەکیان دابێت، بۆ ئەوەبوە، لاکەی تر بێ هێزبکەن و ناکۆکییەکان گەورەتر و درزەکان قوڵتر و ئاگرەکە گەشتر و کێشەکان فراوانتر بێت.

لە شەڕی جاراندا، زوربەی کوژراوەکان، سەرباز بون، بەڵام لە شەڕی ئەم چەرخەدا، زۆربەی کوژرا و بریندارەکان هاوڵاتین، هەروەها لە شەڕی کلاسیکی روبەڕودا، شەرکەران هیچ یەکێکیان ئەوەی تریان نەناسیوە و زوربەی جار هەرلایەک سەر بە وڵاتێک بوە، جیاوازی نەتەوەیی، ئاینی، کلتوری و زمانیشیان هەبوە، بەڵام لە شەڕی ناوخۆدا، شەڕکەران، هاوڵاتی یەک ناوچەن، زمان و کلتوریان یەکە یان نزیکن، زۆر جار هەردولا هاوڵاتی یەک کۆمەڵگان و ناسیاو و هاوڕێ و دۆستی یەکترن، یان دانیشتوی یەک دێ یان یەک شارن جگە لە هاورێیەتی، خزم و ناسیاوی یەکترن.

شەڕی ناوخۆ بوە بوە بە سیمایەکی دیاری شۆڕشی نوێی دوای ١٩٧٦ ، شەڕ بوە لەسەر دەسەڵاتی سیاسی، کێ ئەتوانێت فراوانترین و زۆرترین ناوچە و شار و شارۆچکە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، کێ ئەتوانێت بەرزترین چیا بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، گرنگ نەبو چەند کەس دەکوژرێت، گرنگ ئەوەبو کە فلان لوتکە داگیر بکرێت! شەڕ لەسەر هەندێ شوێن دەکرا کە بە (ئیستراتیجی) ناودەبرا، بەڵام لە راستیدا، لوتکەیەکی بەرز و روتی بێ ئاو و دور لە شارستانی.. کە باسی کەپکی حەمەدائاغامان ئەبیست، وامان دەزانی ئەو کەپکە بەقەدەر گەروی هورمز یان (جەبەل تارق) گرنگە یان زیاتر!.

شەڕی ناوخۆ، بە مەترسیترین نەخۆشی دەژمێرێت، کە توشی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد بوبێت و بوە هۆی بێهێزی و لاوازی لەشی شۆڕشی کورد، ئەوەندی هاوڵاتی کورد لە هەمولاکان لە شەڕی ناوخۆدا کوژراون و لەناوچون، نیوەی ئەوە لە شەڕی دژ بە رژێم شەهید نەبوە.

شەڕی نێوان هێزەکوردیەکان، بو بە کێڵگەیەکی بەرهەمهێنانی رق و کینە و بوغز و تۆڵە لەیەکتر، یەکترشکاندن و لەناوبردنی فیزیکیی و تۆڵە لە یەکتر، بو بە کارێک و ئامانجێکی پیرۆز بۆ هێزە سیاسیەکان کە پاشماوەکەی وا بەئاسانی ناسرێتەوە، ئێستاش لە کاتی گرژیەکی کاتی لە

نێوان هێزە سیاسییەکاندا، هەمان عەقڵیەتی جاران زیندودەبێتەوە و هەریەکە بەوەی تر دەڵێ کە کاتی ئەوە هاتوە (بیانخەینەوە قالبەکەی خۆیان) و (سنورێکیان بۆ دابنێین)، کە ئەمانە هەموی ئاماژەن بۆ سبەینێیەکی تاریک.

رەنگە زەمینەی شەڕی ناوخۆ، لەم قۆناغەدا دوربێت، بەڵام ئاشتییەکی پتەویش زۆر نزیک نیە، تا ئەو کاتەی، کە ئەم دو حیزبە خاوەنی هێزی چەکداری خۆیان بن، دۆستی راستەقینەی یەک نەبن و هاوسەنگی لە نێوانیاندا دروست نەبێت و یەک پیلان دژی بەوەی تر دابنێت و ناوچەیەک تا دێ دەوڵەمەند و ئەوەی تر هەژار، تا هێزێک خۆی بە پێشڕەو و رابەر بزانێت و ئەوانەی تر بە هێزی دوهەم و سێهەم، لایەک تا بیناقاقای لە غروردا بێت و ئەوانەی تر بە پچوک سەیر بکات، ئەوە بەدڵنیایەوە ئاشتی راستەقینە لەم ناوچەیە دوردەکەوێتەوە.

# سەرەتایەک بۆ شەڕی ناوخۆ

**ڤلادمیر لینین: هیچ شۆڕشێکی مەزن لە مێژوودا ڕوی نەداوە، بێ شەڕی ناوخۆ.**

شـەڕی نـاوخۆ، یـان شـەڕی براکـوژی، یـاخود شـەڕی نێـوان هاوڵاتیـان، شەڕێکی چەکداریە لە نێوان هاوڵاتیانی ناو یەک وڵاتدا، یان لە نێوان چەند گروپێکـی نـاو وڵاتێکـدا، کە شـەڕی یەکتـر دەکەن. زۆرجـار ئەم شـەڕانە، هۆکاری ئەوەی کە کۆمەڵێک لە وڵاتێکدا دەیانەوێت دەسەڵات بگرنە دەست، یان بەشێ لە هاوڵاتیانی وڵاتێک دەیانەوێت جیاببنەوە و وڵاتەکە بکەن بە دو بەش، یان زیاتر.

ئەمە شەڕی وڵاتێک نیە، کە هێرش بکاتە سەر وڵاتێکی تر، بەڵکو گروپێک یان زیاتر لە وڵاتێکدا دژ بەیەک دەجەنگن.

لە دەستوری نەتەوەیەکگرتوەکاندا بەندی ( ٤-٢) ئاگاداری وڵاتـانی ئەندام ئەکات کە نابێت هەوڵی ئەوە بدەن کە دەستبخەنە نـاو کاروبـاری نـاوخۆی وڵاتانی ترەوە.

"لە ڕوانگای یاسـای نێودەوڵەتییەوە، شـەڕی نـاوخۆ، بە (شـەڕ) ناونابرێت، بەڵکو بە کێشەیەکی ناوخۆیی وڵاتێک دەژمێرێت. لەبەرئەوە مەسـەلەی ئەوەی ئـایە دەسـتێوەردانی هێـزی دەرەکـی لە شـەڕی نـاوخۆدا چەنـد ڕەوایە بـۆ هاوکاری هاوڵاتیان"[١].

شارەزایەکی مێژو بە ناوی Reinhart Koselleck دەڵێ: "شـەڕی نـاوخۆ، بە

[١] Gerd Schneider / Christiane Toyka-Seid: Das junge Politik-Lexikon von www.hanisauland.de, Bonn: Bundeszentrale für politische Bildung ٢٠١٩.- Whywar.at, Friedensbüro Salzburg, *Thomas Roithner.*

شەڕ ناودەبرێت، بەڵام جیاوازە لە کودەتا یان شۆڕش، یان مانگرتنێک، کە هێزی تێدا بەکاربێت، بەڵام شەڕی وڵاتان نیە، شەڕی ناوخۆ لە نێوان هاوڵاتیانی یەک وڵاتدا روئەدات، شەڕێکە مەترسی وڵاتانی دەرەوەی لەسەر نیە".

شارەزایەکی ئینگلیزیش بەناوی David Armitage لە بارەی شەڕی ناوخۆوە دەڵێ: "ئاشتییەکی درێژخایەن، هەمیشە لەژێر سێبەری شەڕی ناوخۆدا ئەجولێت، خەوبینینی هاوڵاتیان بە ئاشتیەکی هەمیشەیەوە، هیچ نیە، جگە لە خەیاڵ نەبێت، کێشە و گیروگرفتی ناوخۆی وڵاتان لەم چەرخەدا، لە زیادبوندایە" هەروەها دەڵێت: "شەڕی ناوخۆ، بە پێچەوانەی شەڕ لە نێوان دو وڵاتدا، وڵاتەکە بەرەو پارچەبون دەبات، کۆتایی شەڕی نێوان دو وڵات، کە لە ئەنجامی ریکەوتن، لەیەک خۆشبون دروست دەبێت، هاوڵاتیانی ئەو وڵاتانە هەستی سەرکەوتن و پتەوبونی هێزەکانی ناوخۆییان لا دروست دەبێت، بەڵام لە شەڕی ناوخۆدا، کە کۆتاییەکەی بەسەرکەوتنی لایەک و بەکارهێنانی هێزی زۆر کۆتایی دێت، ئەم سەرکەوتنە ئەنجامێکی خراپ لەناو کۆمەڵگەدا بەجێ دەهێڵێت. شەڕی ناوخۆ لەوە دەرچوە کە کێشەیەکی ناوچەیی بچوک و سنوورداربێت، شەڕی ناوخۆی ئەمریکا، شەڕی جیاواز لە وڵاتانی ئەفەریقا، شەڕی نێوان ئیسلام و هندییەکان لە هندستان و شەڕ و کێشەکان لە عێراق، ئەفغانستان، ئۆکرانیا و سوریا، نیشانەی ئەوەن کە شەڕی ناوخۆ، وەک کێشەی ناوخۆیی نەماوە"[٢].

کۆتایی شەڕی ناوخۆ، بە مانای کۆتایی شەڕوئاژاوە و کێشەکان نیە، بەڵکو دوای کۆتایی هاتنی شەڕەکەش، لێکەوتە سیاسی و کۆمەڵایەتی و مرۆییەکانی بۆ ماوەیەکی درێژ دەمێننەوە.

هەروەها ئەو نوسەرە دەڵێ: "شەڕی ناوخۆ، جیاوازە لەگەڵ شەڕی

---

[٢] David Armitage: „Bürgerkrieg". Vom Wesen innerstaatlicher Sebastian Vogel. Klett-Cotta- Konflikte. Aus dem Englischen von Verlag, Stuttgart ٢٠١٨.

ئاسایی، چونکە لە شەڕی ناوخۆدا دوژمنی دەرەکی تێدا نیە وەک شەڕی ئاسایی نێوان دو دەوڵەت، شەڕەکە لە ناوخۆدایە و لە نێوان هاوڵاتیانی ناوچەیەکی دیایکراودایە، هەروەها شەڕی ناوخۆ دەبێتە هۆی زیادبونی ناکۆکی ناوخۆ تا لێکدابڕانی هێزە ناوخۆییەکان، بەڵام لە شەڕی نێوان دو وڵاتدا هەستی بەیەکەوە بون و تەبایی ناوخۆ سیمای شەڕەکەیە و لە کۆتایدا، لایەنی براوە هەمویان بەیەکەوە خۆیان بە براوە دەزانن، بەڵام ئەنجامی شەڕی ناوخۆ بە لێکترازان و دروستبون و سەرهەڵدانی کێشەی جیاوازتر کۆتایی دێت، پاشماوەی خراپ لەدوای خۆی بەجێدێڵێت*.

زەمینەی دەستێوەردانی دەرەکی لەم جۆرە کێشانەدا زۆر ئاسانە و زۆرجار روئەدات، بە تایبەتی لە دوای شەڕی دوەمی جیهانی، کە زلهێزەکان بە تایبەتی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤێت نەیانتوانی شەڕی راستەوخۆی یەکتر بکەن، کەوتنە قۆناغی شەڕی ساردەوە و هەر لایەنە پشتگیری لایەک یان گروپێکی ئەکرد لە وڵاتێکدا دژ بە لاکەی تر، وەک چۆن لە ڤێتنام لە نێوان ١٩٥٧ – ١٩٧٥ رویدا.

شەڕی ناوخۆ لە نێوان میلەتان و گروپی چەکداری جیاواز و هێزی پێشمەرگە و گەریلا و سوپای تایبەتدا روئەدات، هەرەها ناکۆکی نێوان سوپای دەوڵەتێک و چەند گروپێکی چەکدار، کە بە (گەریلا یان پێشمەرگە) ناسراون، بە شەڕی ناوخۆ ناودەبرێت. هۆی سەرەکی شەڕەکە بۆچونی جیاوازە، کە چۆن وڵات بەرێوەدەبرێت، کێ بەرێوەی دەبات و کێ دەسەڵاتی هەیە، مافی میللەتان و گروپی ئایینی و نەتەوەیی چۆن زامن دەکرێت لە پەیوەندی نێوان میللەتی گەورە و دەسەڵاتداردا.

هەروەها پێناسەی شەڕی ناوخۆ لای شارەزایان زۆر جیاوازە، هەندێکیان دەڵێن، کاتێ ئەتوانی بە شەڕێک بڵێین شەڕی ناوخۆ، کە کەمتر لە ١٠٠ کەس نەکوژرابێت، هەندێکی تریان دەڵێن پێویستە لەو شەڕەدا بەلای کەمەوە ١٠٠٠ کەس کوژرابن، ئەو کاتە ناو دەبرێت بە شەڕی ناوخۆ. هەندێکی تر بە ماوەی

شەڕەکە دەیبەستنەوە و دەڵێن: "پێویستە ئەو شەڕە بەلای کەمەوە زیاتر بێت لە یەک ساڵ بۆ ئەوەی پێی بوترێت شەڕی ناوخۆ". لەبەرئەو هۆیانە، شارەزایانی بواری شەڕی ناوخۆ لەسەر یەک پێناسە رێک نەکەوتون.

هەندێجار ئەو شەڕە ناوخۆییە، لە پێناوی سەربەخۆیی، یان بەدەستهێنانی ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمی، یان دروستکردنی حکومەتێکی سەربەخۆ، یان لکاندنی ئەو حکومەتە بە دەوڵەتێکی ترەوەیە، زۆرجار هۆی سیاسی، ئێتنی، دینی، یان کۆمەڵایەتی شەڕ هەڵدەگیرسێنێ، کاتێ کە گروپێک هەست دەکات مافی هاولاتیبونی پێشێل دەکرێت و هەست بە چەوساندنەوەی هەمەجۆری خۆی دەکات.

زۆرجاریش شەڕی ناوخۆ لە نێوان هاولاتیانی ولاتێکدا روئەدا کە کێشەی نەتەوەیی، یان جوگرافییان هەبێت و هەردولا لەسەر پارچەیەک زەوی شەڕ دەکەن، کە هەریەکە بە زێدی خۆی دەزانێت، بە مانایەکی تر، هەمو شەڕە ناوخۆییەکان، بۆ ئەوەی نیشانی بدەن کە رەوایە، چوارچێوەیەکی دینی یان تایەفی یان فکری بۆ دروستدەکەن، کاتێ لیۆن ترۆتسکی لە دوای شۆرشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ سوپای سوری روسی دروستکرد، دوچاری شەڕیکی خوێناوی بو لەگەڵ سوپای سپیدا لە ١٩١٧-١٩٢٣ و لە ئەنجامدا زیاتر لە ١٣ ملیۆن هاولاتی بونە قوربانی.

لە شەڕی ناوخۆدا، هاولاتیانی سیڤیل دەبنە قوربانی، چونکە هیچ کام لە گروپەکان، رەچاوی یاسا نێودەوڵەتییەکان ناکەن، بەتایبەتی رێکەوتنامەی جنێفی ١٩٤٩ بۆ پارێزگاری ژیانی هاولاتیانی سیڤیل، کە پەیوەندییان بە شەڕ و کێشەکانەوە نیە.

لە شەڕی ئاسایی نێوان دو دەوڵەتدا، دو هێز بەرامبەر بەیەک دەوەستن، چەکی گەورە و قورس و تانک و فرۆکە بەکاردێنن، لە شەڕی ناوخۆدا، زۆرجار چەکەکانیان سوک و ئاساییە، هەروەها لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆدا، هاولاتیان بۆ خۆ رزگارکردن لە کوشتن، هەڵدێن و دەربەدەر دەبن و

ناچـاردەبن شـوێنی خۆیـان بەجـێ بهـێڵن و ڕو لە وڵاتـانی دراوسـێ یـان دەرەوەی وڵات بکەن، وەک ئەوەی لە هەشتاکان و نەوەدەکاندا لە کوردستان رویدا و یان کە ئیستا لە سوریا دەبینرێت.

شەڕی ناوخۆ، کە تاکو ئیستا، لە زۆر وڵاتانی جیهان بە ئاشکرا دەبینرێت و لە زۆر وڵاتیش زەمینەکەی لە بارە، وەک هەژاری و برسێتی، کە تا ئایندەیەکی درێـژیش ئەم کێشـانە ئەمێنـنەوە و زەمیـنەی مانەوەیـان رەخسـاوە، لەبەر ئەم هۆیانە شەڕی ناوخۆ وا بە خێرایی و بە ئاسـانی لێمان جیا نابێتەوە. هەروەها (داڤید ئارمیتاج) دەڵێ: "کۆمەڵگا ئەتوانێت هۆی سەرهەڵدانی کێشەکان چارەسـەر بکات و رۆڵی ناوبژیکەر ببینێت لە نێوان گروپە جیاوازەکاندا، لەبەرئەوە، هێنانە کایەی ئاشتی و ئارامی لە وڵاتێکدا کە شـەڕی نـاوخۆی تێدا بێت، تەنها خەیـاڵ نیە، بەڵکو ئەو خەیاڵە ئەتوانرێت ببێت بە ڕاستی" (هەمان سەرچاوەی پێشو)

شەڕی ناوخۆ، لەسەرەتای چەرخی هەژدە و نۆزدەهەمەوە، هەمیشـە وەک کارێکی قێزەون سەیر کراوە و هەوڵ دراوە کە میللەتان لێی دورکەونەوە و ئەنجامـدەرانی بە زینـدانی و هەڵواسـین ترسـێنراون، "پەیـرەوی فەرەنسـی سـاڵی ١٨٣٣ لە مـادەی ١٩ی سـزاکان نوسـیویانە: ئەوەی هەوڵ بـۆ شـەڕی ئەهلی ئەدا لە ڕێگای پڕچەککردن یان هاندانی هاوڵاتیـان بۆ چەک هەڵگرتن، دژ بەیەک، بـۆ هانـدانیان بـۆ نـانەوەی شـەڕی دژ بەیەک یـان کـاولکردن و کوشـتن و بەتـاڵانبردن لە نـاوچەیەکی دیـاریکراودا، یـان لە چەنـد نـاوچەیەک، ئەوە تاوانەکەی ئیعدام کردنە"[3].

[3] شال زور غيب، الحرب الاهلية – ترجمة احمد برو، بيروت ١٩٨١، ص ٢٦.

## کام بەرە لە شەڕی ناوخۆ سەرکەوتوە؟

کەم وڵات هەیە، بە شێوەیەک لە شێوەکان تامی شەڕی ناوخۆی نەچێشتبێت، لەوانە ئەمەریکای جاران کە دوچاری شەڕێکی گەورەی خوێناوی لە نێوان ویلایەتەکانی سەرو کە سیستەمی کۆیلایەتی لابردبو، وەک ئۆهایۆ، میشیگن، پنسلڤانیا.. لە دژی ولایەتەکانی خوارو کە شەڕیان لە پێناوی مانەوەی سیستەمی کۆیلایەتی دەکرد، ئەو شەڕە کە لە ساڵی ١٨٦٠ رویدا کاتێ ئەمەریکا سەرۆکێکی نوێی هەڵبژارد، کە ئەبرەهام نیلکۆلن بو، لەو شەڕەدا زیاتر لە ٦٠٠ هەزار ئەمریکی بونە قوربانی، ئەمە زیاتر بو لە قوربانییەکانی هەردو جەنگی جیهانی، ئەو کێشەیەی نێوان ولایەتەکانی خواروی ئەمریکا کە ناوچەیەکی کشتوکاڵی بو، دژ بە ولایەتەکانی سەرو کە زیاتر گەشەکردنی پیشەسازی دەستی پێکربو، تا ئەم چەرخە پاشماوەی ماوەتەوە.

"٥٥٪ ئەو شەڕە ناوخۆیانەی لە ١٩٥٥ ەوە رویداوە، ٧٥٪ بەسەرکەوتنی سەربازی لایەکیان کۆتایی هاتوە "حکومەتەکان توانیویانە ٤٠٪ ی شەڕەکان ببەنەوە و شۆڕشگیرەکانیش ٣٥٪ سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە"[٢-٥].. هەندێ جار رێکەوتن لەناوخۆیاندا بە هاوکاری لایەنی سێهەم ئەنجام ئەدرێت بۆ ئەوەی دەسەڵات لە رێگای بەکارهێنانی هێزەوە وەرنەگیرێت، وەک چۆن ئەمەریکا ئەو رۆڵەی لە عێراق بینی، کاتێ حکومەتی هاوبەشیان لە نێوان شیعە و سونە و کورد پێکهێنا بۆ رێگرتن لە رشتنی خوێنی زیاتر. کاتێ شەڕی ناوخۆ لە سودی لایەک یەکالا نابێتەوە، ناچار دەبن رێکبکەون، وەک چۆن لە ١٩٩٥ دوای سێ ساڵ شەڕی ناوخۆ لە بۆسنا ناچاربون رێکەوتنیان

ئەنجامـدا[3-4] کەم وڵات هەیە توشـی شـەڕی نـاوخۆ نەبوبێـت، ئەڵمانیـا پـێش چوارسەد ساڵ توشی شەڕێکی خوێناوی بو، کە بە شەڕی (سی ساڵە) ناوی دەرکردوە، بە تایبەتی لە نێوان ناوچەکانی کاسۆلیک و پرۆتستاندا.

هەروەها شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا، کە لە ١٩٣٦- ١٩٣٩ ی خایاند، لە نێوان سۆسیال دیموکرات و چەپەکان، کاتێ هەڵبژاردنیان بردەوە و ویستیان گۆڕانی زۆر لە سیستەمی حوکمرانیدا لە ئیسپانیا بکەن، بەرامبەر بەوان نەتەوەپەرستەکان بەسـەرۆکایەتی فرانسیسـکۆ فرانکـۆ دژی هەمـو گۆڕانکاریەکـان وەسـتان، لە ئەنجامد فرانکۆ وەک دیکتاتۆرێک نزیکی ٤٠ ساڵ ئیسپانیای بەڕێوەبرد و زیاتر لە ٢٠٠ هەزار هاوڵاتی بونە قوربانی و بێسەروشوێن کران.

دوای جەنگی جیهـانی یەکەم و دوەمەوە، نەخشـەی سیاسـی و پەیوەنـدی سیاسی لە جیهانـدا گۆڕانی زۆری بەسـەرداهات و مەترسـی جەنـگ لە نێـوان وڵاتـانی زلهێزدا کەمتر بۆوە، ئەویش بەهـۆی ڕۆڵـی نەتەوە یەکگرتوەکانەوە، کاریگەریـان هەبو. واتـا جەنـگ لە نێوان وڵاتاند کەمتر بۆوە، بەڵام جەنگەکە شـوێنەکە و شـێوەکەی گـۆڕی و کێشـە لە ناوچەکـانی تـر سـەری هەڵـدا کە پێدەوترا (جیهانی سێ) کە شەڕی ناڕاستەوخۆ بو لە نێوان هێزە گەورەکاندا.

---

[3-5] هەمان سەچاوە.

[4] جواد الديوان، الحرب الاهلية في العراق، حوار المتمدن، عدد ٢٤٤١، ٢٠٠٨/١٠/٢١.

## شێوه و جۆرەکانی شەڕی ناوخۆ

هەندێ شـەڕی نـاوخۆ، لە ئەنجامی هێرشـی سـەربازی دەرەکی ئەنجام دراوە، وەک لە یۆنان لە ١٩٤٩، مەلایە (مالیزیا) لە ١٩٥٧ دا و چونە نـاوەوەی هیند لە شەڕی ناوخۆی بەنگلادیش لە ١٩٧١ کە بەرەو سەربەخۆیی چون.

شـەڕی نـاوخۆ، زۆر شـێوەی بەخۆیەوە بینیوە، لەوانە، شـەڕی نـاوخۆ لە یۆنان کە لە مـارتی ١٩٤٦ تـا ٩ی تشرینی یەکەمـی ١٩٤٩ ی خایاند، لە نێوان بەرەی میللیی سوپای دیموکراتی یۆنـان کە لە لایەن ئەلبانیا و یۆگۆسـلافیاوە پشـتگیری دەکـرا و لەولاشـەوە حکـومەتی پارێزگـارانی یۆنـانی کە لە لایەن بەریتانیا و ئەمریکاوە هاوکاری سەربازی دەکرا.

یـاخود شـەڕی بەنگلادیـش، شـەڕێ بـو لە نێـوان پاکسـتان (جـارانی رۆژئاوای پاکستان) و بەنگلادیش (جارانی رۆژهەلاتی پاکستان) کە لە ٢٥ مارتی ١٩٧١ تا ١٦ کانونی یەکەمی ١٩٧١ ی خایاند. ولاتی هیند پشتگیری پاکسـتانی رۆژهەلاتـی کـرد، کە بە شـەڕی سـێهەمی هنـدی پاکسـتانی دائەنرێـت، شـەڕەکە بە سـەرکەوتنی رۆژهەلاتـی پاکسـتان و دامەزرانـدنی دەوڵەتی بەنگلادیش کۆتاییهات.

شەڕی نێوان بەنگالییەکان و تامیلەکان لە دوایی دەستپێکرد لە ئەنجامی ئەوەی سـریلانکا لە ١٩٤٨ سـەربەخۆیی وەرگـرت و سـینیگالییەکان دەسـەلاتیان قـۆرخکرد و تامیلەکـانیش وەک گروپێکـی ئیتنـی لە سـریلانکا پشتگوێ خـران. کێشـەکان لە دوای ١٩٨٣ وە پەرەیسـەند و شـەڕ لە نێوان حکومەتی ناوەندی و گروپی پڵنگەسـەربەخۆکانی تامیل ئیلام دەستپێکرد، کە دوایی بە سەربەخۆیی ناوچەکانی سەرو لەگەڵ رۆژئاوا کۆتایهات.

هەروەها شەڕی ناوخۆی لوبنان، کە لە ١٣ نیسانی ١٩٧٥ تا ١٣ تشرینی یەکەمی ١٩٩٠ ی خایاند، ئەو شەڕە لە نێوان چەندین گروپی جیاواز و چەندین وڵاتی جیاواز رویدا و راستەوخۆ و ناراستەوخۆ هاتنە ناو جەنگەکەوە و ئاگرەکەیان زیاتر خۆشکرد. ئەم شەڕە کە لە نێوان عەرەبە ناسیۆنالیستەکان و گروپە مەسیحییە جیاوازکان و ئەوجا لە نێوان مەسیحی و موسڵمانەکان یان فەلەستینییەکان روییدا، هەروەها بە شەڕی ئەیلولی رەش ١٩٧٠ کۆتایی هات کاتێ فەلەستینیەکان لە ئەردەن دەرکران و هاتن بۆ لوبنان و ئەوجا ئەو شەڕە هاتنی سوپای ئیسرائیل بۆ ناو بەیروت و هاتنی سوپای سوریا بۆ ناو لوبنان ئاسانکرد، هەمو ئەمانە بە کوشتنی دەیان هەزار هاوڵاتی لوبنانی و فەلەستینی و وێرانکردنی بەیروت کۆتاییها، بەڵام پاشماوەکانی تا ئیمرۆ ماوەتەوە.

هەروەها شەڕی ناوخۆی یۆگۆسلافیا، کە لە کاتی رژێمی پاشایەتی لە ١٩١٨ تا ١٩٤١ خایاند و ئینجا دوای دامەزراندنی دەوڵەتی یۆگۆسلافیای ئیتحادی کە لە ١٩٤٥ تا ١٩٩٢خایاند. کێشەی ئەو وڵاتە ئەوە بوە کە نەتەوە و ئاین و مەزهەبی جیاوازی تێدا ژیاوە و هەمیشە کێشە هەبوە لە نێوانیاندا، لە هەندێ قۆناغدا ناکۆکیە نەتەوەییەکان شاراونەتەوە (قۆناغی سەرۆک تیتۆ) و لە هەندێ کاتی تردا سەری هەڵداوەتەوە، لەبەرئەوەی کێشەکە، کێشەی میللی بوە، هیچ کاتێ نەکوژاوەتەوە.

هەروەها شەڕی ناوخۆ لە کۆڵۆمبیا لە نێوان حکومەتی کۆڵۆمبیا و گروپی (FARC) کە نزیکی ٥٠ساڵی خایاند و لە ئەنجامی گفتوگۆی درێژخایان لە ٢٠١٦/١٢/١ ئاگربەست راگەیەندرا و ئاشتی ئاسمانی کۆلۆمبیای گرتەوە و سەرۆکی کولۆمبیا (خوان مانویل سانتۆس) لە هەمان ساڵدا لە پێناوی هێنانە کایەی ئاشتی و کۆتایی جەنگ لە وڵاتەکەی، خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی پێ بەخشرا.

شەڕی ناوخۆی نێوان گروپە جیاوازەکانی فەڵەستین، بەتایبەتی لە نێوان

حەماس و فەتح، کە لە حوزەیرانی ٢٠٠٧ دەستیپێکرد و لە ئەنجامدا گروپی حەماس توانی دەست بەسەر کەرتی غەزەدا بگرێت و حکومەتێک بۆ خۆی دابمەزرێنێت. ئەم کێشەیە تا ئەیلولی ٢٠١٧ ی خایاند، تا ئەو دەمەی میسرییەکان حەماسیان ناچارکرد حکومەتەکەیان هەڵوەشێننەوە و حکومەتی هاوبەش لە نێوان هەردوکیان دروست بکەن، ئەم کێشەیەی نێوان حەماس و فەتح بەردەوامە و تا ئیمرۆ کۆتایی نەهاتوە.

شەڕی خواروی سودان، لە ١٩٨٣- ٢٠٠٥ لە نێوان سەرو و خوارو یان لە نێوان حکومەتی ناوەند لە خەرتوم بەردەوام بو، حکومەتی خەرتوم تا ناوەڕاستی نیسانی ٢٠١٩ قورئانیان وەک سەرچاوەی دەستور بەکاردەهێنا. مەسیحییەکان لە باشور توانیان لە ٢٠١١/٧/٩ دەوڵەتی خواروی سودان دابمەزرێنن، بەڵام کێشەکان لە نێوان هەردولادا لە ڕەگەوە هەڵنەکێشراوە.

هەروەها شەڕی نێوان گروپە جیاوازەکانی لیبیا، دوای کوشتنی موعەمەر قەزافی سەری هەڵدا و تا ئێستاش شەڕ لە نێوان حکومەتی مەرکەزی لە تەرابلوس و سوپای رزگاری لیبیا بەسەرۆکایەتی حەفتەر بەردەوامە.

یەکێ لە شەڕەگەرمە درێژخایەنەکانی ناوخۆی ئەم سەردەمە، شەڕی سوریایە، کە لە بەهاری ٢٠١١ دەستیپێکردوە و هەزاران هاوڵاتی بونەتە قوربانی و سەدان هەزاری تر، بە وڵاتانی دراوسێ و ئەوروپادا بڵاوبونەتەوە.. گەشەکردن و بەردەوامی شەڕی ناوخۆی سوریا بەستراوەتەوە بە دەست تێوەردانی دەرەوە، وەک دەبینرێت بەرەیەک بەسەرۆکایەتی روسیا و ئێران و ئەو گروپانەی بەوانەوە بەستراون، هاوکاری حکومەتی دیمەشق دەکەن بە سەرۆکایەتی بەشار ئەسەد و بەرەکەی تر کە پێکهاتوە لە کۆمەڵێک هێزی چەکداری هەمەجۆری ئیسلامی کە تورکیا و هەندی لە وڵاتانی ئەوروپی و ئەمەریکا و سعودیە و خلیج هاوکاریان دەکەن..ئەم بارودۆخەی سوریا نمونەیەکی نوێی نزیکی شەڕی ناوخۆ پیشان ئەدات.

تەمەنی شـەڕی نـاوخۆ هێندەی تەمەنی سـەرهەڵدانی مرۆڤایەتی کۆنە، شەڕی ناوخۆی چین کە بە (سـەرهەڵدانی ئان لوسـان) ناودەبرێت لە سـاڵی ٧٥٥ دەسـتیپێکردوە و ٧٦٣ کۆتایهات، هەروەهـا شـەڕی نـاوخۆی هەنگاریـا، بەریتانیا، پورتوگال، ئیسپانیا، سویسرا، ئەمریکا، شیلی، کۆلۆمبیا، ئیرلەندا، ئەم شەڕە ناوخۆیانە هەموی پێش جەنگی یەکەمی جیهانی بون.

لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی زیاتر لە ٢٠ وڵات شـەڕی نـاوخۆی تێدا رویـداوە و لە هەندێکیشـیاندا شـەڕە چەکـداریە کلاسـیەکە نەمـاوە، بەڵام شەڕەکە شێوەی فکری، ئایدۆلۆجی، دینی و ئیتنی وەرگرتوە و پاشماوەکەی بە ئاسانی لەناوناچێت.

## بەشێ لە پەنۆرامای شەڕی ناخۆ لە هەندێ وڵاتی جیهان:

- ١١٢٠-١٢٤٠ شەڕی ناوخۆ لە نەرویج
- ١٤٥٥-١٤٨٥ شەڕی ناوخۆ لە بەریتانیا(دوگوڵ)
- ١٤٦٧-١٤٧٧ شەڕی ناوخۆ لە ژاپۆن( شەڕی ئۆنین)
- ١٥٦٢-١٥٩٨ لە فەرەنسا
- ١٨٦١-١٨٦٥ لە ئەمەریکا
- ١٩١٧-١٩٢١ لە روسیا
- ١٩١٨ لە فینلەندا
- ١٩٢٢-١٩٢٣ لە ئێرلەندا
- ١٩٢٣-١٩٣٧، ١٩٤٥-١٩٤٩ لە چین
- ١٩٣٠-١٩٧٥ ڤیتنام
- ١٩٣٦- ١٩٣٩ لە ئیسپانیا
- ١٩٤٦-١٩٤٩ لە یۆنان
- ١٩٥٠-١٩٥٣ لە کۆریا

- ١٩٦٥-١٩٦٦ لە ئەندەنوسیا
- ١٩٦٧-١٩٧٠ لە نایجیریا
- ١٩٧١ لە پاکستان
- ١٩٧٥-١٩٩٠ لە لوبنان
- ١٩٧٥-١٩٩٢ لە مۆزەنبیق
- ١٩٨٣-٢٠٠٩ لە سریلانکا
- ١٩٩١-٢٠٠١ لە یۆگۆسلاڤیا
- لە کۆتایی ١٩٧٩ تا ئیمرۆ شەڕ لە ئەفغانستان بەردەوامە..
- ١٩٩٢- ٢٠٠٢ لە جەزائیر
- ١٩٩٣- ٢٠٠٥ لە برۆندی
- ١٩٩٦- ٢٠٠٦ لە نیپاڵ
- ٢٠٠٤- ٢٠١٨ لە عێراق
- ٢٠١١ شەڕی ناوخۆ لە سوریا بەردەوامە
- ٢٠١١ شەڕ لە لیبیا بەردەوامە
- ٢٠١٥ شەڕ لە یەمەن بەردەوامە[٥]

---

[٥] سەرچاوەی ویکی پیدیا.

# مێژوی دێرینی شەڕی ناوخۆی کورد لە کوردستان

١. میرنشینەکان

٢. دوای جەنگی دوەمی جیهانی

٣. دوای شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١

شەڕی ناوخۆ لە چەرخەکانی حەڤدەهەمەوە لە کوردستان دەستپێکردوە و کەم ناوچە هەیە لە کوردستان پریشکی شەڕی ناوخۆی بەرنەکەوتبێت، زۆربەی زۆری شەڕەکان دەستی ئیمپراتۆریتی فارسی یان عوسمانیان راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لە پشتەوە بوە. میرەکانی چەندین میرنشین شەڕی یەکتریان کردوە تەنها لە پێناوی فراوانی دەسەلاتی خۆیاندا و هاولاتیانی کوردیش بون بە کەرەسەی شەڕەکان، هەر لە ١٨٧٩ سمایل بەگی میرنشینی بادینان بە هاوکای میرنشینی بۆتان کەوتونەتە شەڕەوە لەگەڵ براکانی.

لە مانگی ئابی ١٨١٣ شەڕ لە نێوان سلێمان پاشای بابان و ئەورەحمان پاشای بابان رویداوە، کاتێ سلێمان پاشا ویستی پەلاماری سۆران و رەواندز بدات و لەم شەڕەدا زیانی گەورە بە هەردولا گەیشتوە. هەر دوساڵ دوای ئەو شەڕانە، میر موحەمەدی سۆران لە شەڕێکی قورسدا زۆربەی هەرێمی برادۆستی خستۆتە ژێر دەسەلاتی خۆی و لە رەواندوز دەستیکرد بە دروستکردنی چەک (تۆپ) و لێدانی سکە وەک سەرەتایەک بۆ دروستکردنی فەرمانرەوایی کوردی[٦] هێزەکانی میر موحەمەد، لە ١٥ مارتی ١٨٣٢ دا چون بە گژ کوردە یەزیدیەکان

[٦] جلیلی جەلیل، راپەرینی کوردەکان لە ١٨٨٠. رابطة کاوة للمثقفین ل ١٢٠ و ١٤١.

و بە ناوی ئەوەی دەیەوێت بیانکەن بە ئیسلام، هاتن و دەستی گرت بەسەر قوش و شیخاندا و کوشتارێکی زۆر رویدا[٧].

"ئەورەحمان پاشا لە دەربەندی بازیاندا سەنگەری قایمکرد، دەمی دەربەندی گرت، لەشکری وەزیر گەیشتە شیوە سور، خالید و سلێمان و دەست و پێوەندەکانیشیان لەگەڵ بو، وەزیر بۆ رێگایەکی ئاسان ئەگەڕا کە پشت لە هێزەکانی بابان بگرێ، خالید و سلێمان رێگەیەکیان دۆزییەوە ئەورەحمان پاشا نەیگرتبو. پشتی هێزەکانی ئەورەحمان پاشا گیرا، شەڕێکی قورس قەوما ٣٠٠ کەس لە لەشکری بابان کوژران، ئەورەحمان پاشا شکا. عەلی پاشای وەزیر فەرمانیدا سەری دیل و کوژراوەکانی بابان ببڕن، ٦ سندوقی لێ پڕ کرد و بە دیاری ناردی بۆ دەوڵەت. ئەورەحمان پاشا ناچار بو ڕو بکاتە وڵاتی ئەردەڵان (١٢٢٠ک/١٨٠٥ ز) "[٨].

میر موحەمەد، هێرشی کردۆتە سەر زۆربەی ناوچەکان و شەڕی ناوخۆی هەڵگیرساندوە، لە ١٨٣٣ وە هێرشی کردۆتە سەر ناوچەکانی ئاکرێ و ماردین و دیاربەکر و لەملاشەوە هێرشیکردۆتە سەر حریر و خۆشناو و کۆیە، کە لە ژێر دەسەڵاتی بابانەکاندا بوە[٩]. بابانەکان بە شەڕی خوێناوی زۆر ناوچەی کوردستانیان داگیرکردوە، لە ساڵەکانی ١٠٥٦ و ١٠٦٠ هیجری فەقێ ئەحمەدی دارشمانە، بابانەکانی زیندو کردەوە، دوای ئەوەی مەرگە و قەزای شارباژێر و زۆر ناوچەی شارەزوری خستە ژێر دەسەڵاتی بابانەکانەوە. سلێمانی کوری فەقێ ئەحمەد لە ١٠٧٦ هیجری لەشکرێکی گەورەی پێکهێنا و دەستی گرت بەسەر خاکی ئەردەڵان و شاری

---

[٧] هەمان سەرچاوە، ل ١٥٣.

[٨] نەشیروان مسەفا ئەمین، میرایەتی بابان لە نێوان بەرداشی ڕۆم و عەجەم دا، بەرلین، ١٩٩٨، ل ١١٧.

[٩] (م.س). لازریف، مێژووی کوردستان، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی رۆژهەلات، ٢٠١٢، و، وشیار عەبدولا سەنگاوی، ل ١٩٣.

ســـنه و موکریـــان و ســـابڵاخ و به قەڵاچـــوالانەوه گرێـــی داون[10].
میری بابانیش بێ بەش نەبوه له لەشکرکێشی و داگیرکرنی خاکی کوردان، میر سلێمانی کوری میر ئەحمەدی بابان، له ساڵی ١٠٧٦ دا، لەشکرێکی گەورەی پێک هێناوه چۆته سەر خاکی ئەردەڵان و شاری سنه و دەوروپشتی داگیرکردوه و هەروەها چۆته سەر موکریان و شاری سابڵاغی خستۆته ژێر دەسەڵاتی خۆیەوه و به قەڵاچوالانی گرێدایەوه دوای ئەوەی نوێنەری خۆی لەو شوێنانه داناوه[11].

شەڕ له نێوان میرەکاندا، هەمیشه بەردەوام بوه، میر محەمەدی میری رەواندز، له مانگی رەبیعی دوەمی ساڵی ١٢٣٨ ی کۆچیدا دوای گرتنی حەریر به سێ رۆژ، چۆته سەر خۆشناو و کەوتۆته شەڕ لەگەڵ عوسمان بەگی سەرکردەی میری خۆشناو، له دوای کوشتارێکی قورس، میرانی خۆشناو دەشکێنن و مل بۆ میر محەمەدی رەواندز دادەنەوێنن و له هەمان کاتدا، عوسمان بەگ بەفێل دەباته حەریر و لەوێ هەڵیدەواسێ. هەر له مانگی سەفەری ١٢٤٣ میر محەمەد چوه سەر کۆیه و لەشکری بابان بێ شەڕ کۆیەی چۆڵ کردوه و بەرەو سلێمانی گەڕاوەتەوه[12].

شەڕی خوێناوی و درێژخایانی نێوان کورد و کورد زیاتر له دوای ١٨٩٢ بەدەوام بوه، شەڕ له نێوان سورچی و بارزانیەکان و بەتایبەتی سورچی و زێباری و گۆران و هەرکی دژ به بارزانیەکان رویداوه و کۆمەڵێک عەشایری کوردی تریش هاوکاری سورچیەکانیان کردوه، لەوانه عەشایری پشدەر، پلک، رەواندز، نێرۆیی، رێکانی و دۆسکی[13].

کێشـــه و دژایەتـــی و شـــەڕی نـــاوخۆیی نێـــوان هێـــزو و گـــروپه

---

[10] حسێن حوزنی موکریانی، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، دەزگای ئاراس ٢٠٠١، ل ٤٦٢.

[11] سەجەم بەرهەمی حوسەین حوزنی، چاپی دوهەم ٢٠١١، ل٤٦٣.

[12] حسین حوزنی، مێژوی میرانی سۆران، هەولێر ١٩٦٢، ل ٥٦ – ٦٢.

[13] پی رەش، بارزان و الحركة الوعي القومي الكردي ١٨٢٦-١٩١٤، ل١١٠.

جیاوازەکانی کورد، وەک ئێستا هۆی سەرەکی بون بۆ ئەوەی نەتوانن هێزێکی یەکگرتو دروست بکەن، یاخود هەرهیچ نەبێت، زەمینەیەک دروست ببێت کە شەڕ و قەتڵوعامی یەکتر نەکەن: "میرەکانی بابان لەناو خۆیاندا زۆر ناکۆک بون، برا لەگەڵ برا و ئامۆزا لەگەڵ ئامۆزاو، مام لەگەڵ برازا نارێک بون. لە پێناوی دەسەلات و پارەدا پیلانیان لە یەکتری گێراوە و، هێزی بێگانەیان هێناوەتە سەر یەکتری و یەکترییان کوشتوە"[14]. شارەزایان و گەریدە ئەوروپاییەکان کە هاتون بۆ کوردستان و ماوەیەک ماونەتەوە و شارەزای بارودۆخی سیاسی و کۆمەلایەتی و مێژویی گەلی کورد بون، لەوانە کلۆدیۆس جەیمس ریچ، نوێنەری کومپانیای هیندی رۆژهەلات لە بەغدا، کە لە ١٨٢٠ بۆ ماوەی چەند مانگێک بە کوردستان دا گەڕاوە، هەروەها جەیمس فرەیزەر گەریدەیەکی سکۆتلەندی لە ١٨٣٤ دا بە زۆربەی شارەکانی کوردستاندا گەڕاوە، هەردوکیان هۆکاری ڕوخاندنی میرایەتی بابان بە دو هۆی سەرەکی دەگێرنەوە، ئەوانیش هەڵکەوتی نالەباری جیوپۆلیتیکی کوردستان و ناکۆکی ناوخۆ.

دوای دروست بونی حیزب و سەرهەڵدانی هێزی سیاسی، شەڕی کورتخایان لە نێوان کۆمەڵێک هۆزدا رویداوە، لەوانە لە نێوان بارزانی، سورچی، هەرکی، رێکانی، زێباری، هەمەوەند، جاف. بۆ نمونە: "هەر لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە، شەڕی ناوخۆی نێوان کورد و کورد بەردەوام بوە، سمکۆی شکاک لە ١٩٢١/١٠/٦ هێرشی کردە سەر سابلاخ (مهاباد) و کەوتە تالان کرنی ئەو شارە و کوشتنی هاولاتیان"[15].

(محەمەد حەمە باقی) لەوبارەیەوە نوسویتی "سمکۆی شکاک لە شەوی ١٩٢١/١٠/٧/٦ دا، هێرشێکی غافڵگیرانە و لەناکاوی بۆ سەر سەربازگە و شاری مهاباد کردوە، کە لە ماوەی شەڕێکی نزیکەی دو رۆژدا، زۆر خێرا

[14] نەشیروان مسەفا، میرایەتی بابان، بەرلین ١٩٩٨، ل ١٧٨.

[15] کریس کۆچێرا، کورد لە سەردەی نۆزدە و بیستامدا، و. حەمە کەریم عارف. ل ٥٣.

ســـەرلەبەری ســـەربازگەکەیان شـــپرزە و تەفروتونـــا کـــرد و ئەوانەی لەســـەربازگەکەدا بـــون، کـــوژران و بەدیـــل گیـــران و دوایـــیش جـــگە لە (مەلیکزادە)ی فەرماندەیان و چەند ئەفسەرێکی دی، دیلەکانیان گولەباران کردن و چەک و تەقەمەنی و جبەخانەی سەربازگەکەشیان چنگ کەوت[16].

لە بەهاری ١٩٢٠ دا، بارزانیەکان و زێباریەکان دایان بەسەر ئاکرێدا و تالانیان کرد و لە ١٩٢٠/٩/١٣، عەشیرەتی (سورچی بادینان و سورچی سۆران) ڕێکەوتن و لە دەشتی حەریر پێک گەیشتن و بە سەرۆکایەتی شێخ مەزو و عەبدولای سورچی چونە سەر ڕەواندز و داگیریان کرد. ئەوەی لەدەست روس و ئەرمەن و ئاسوری رزگاری بوبو، ئەمجارە لەدەست سورچیەکان توشی ئەزێت و نەبونی بون[17].

شەڕی ناوخۆی کورد، تەنها ناوچەیەک یان پارچەیەکی کوردستانی نەگرتۆتەوە، بەڵکو شەڕێک بوە لە جوگرافییەکی فراواندا رویداوە، بۆ نمونە سمکۆی شکاک لە ١٩٢١/١٠/٦ دا هێرشی کردۆتە سەر سابلاخ (مهاباد) و قەتڵ و عامێکی گەورەی کردوە، هێزەکانی سمکۆ کەوتنە تالانکردنی مهاباد[18].

کاربەدەســـتانی ئەوکـــاتەی عێـــراق لە هـــاوینی ١٩٣١ دا هـــانی برادۆستیەکانیان (شێخ رەشیدی لۆلان) دا پەلاماری هۆزی شیروانیی ناوچەی بارزان بدەن و گوندەکانی (گرکال، کۆڵەک و بابکێ) بدەن و تالانیان بکەن ماڵەکانیان سوتاند[19]، واتا دەوڵەتی مەرکەزی کوردی وەک ئامراز بەکارهێناوە بۆ شەڕی براکانی.

ئەو شەڕانەی نێوان هۆز و تیرە کوردیەکان، زۆریان لە لایەن یەکێ لە دەسەڵاتدارانی ناوچەکەوە پشتگیری کراون دژ بە لایەکی نەیاری خۆی، بەڵام

---

[16] بیرەوەریەکـانی سـەید عەزیـز شـەمزینی، ئامـادەکردنی مـحەمەدی حەمە بـاقی، بڵاوکراوەی بنکەی ژین، چاپ ٢١١، ل ٦١.

[17] حسین حوزنی موکریانی، مێژوی میرانی سۆران، هەولێر ١٩٦٢، ل ١١٨.

[18] کریس کۆچێرا.. کورد لە سەردەی نۆزدە و بیستامدا.و. حەمە کەریم عارف. ل ٥٣.

[19] مەسعود بارزانی و بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد، بەرگی یەکەم ١٩٣١-١٩٥٨، ل ٢٨.

ڕەگی دێرین و قوڵی هەبوە و هەیە و ئەویش مەسەلەی زەوی، دەسەڵات، موڵک و ماڵ، کێشەی کۆمەڵایەتی، دینی و مەزهەبی لە هۆ دیارەکانن.

زۆرجار ئەگەر هۆزێک پشتگیری هێزێکی سیاسی یان شۆڕشی کردبێت، ئەوا ئۆتۆماتیکی هۆزەکەی بەرانبەری چۆتە بەرەکەی تر و دژی ئەوانەی تر وەستاوە، بێ ئەوەی لە ناوەڕۆکە سیاسیەکەی کۆڵیبێتەوە، کە ئەو هەڵوێستەیان چەند سود یان زیان بە مەسەلەی کورد یان ناوبانگی خۆیان دەگەیەنێت. نمونەی کێشەی نێوان بارزانیەکان و سورچی و هەرکی و زێباریەکان تا ئیمروش دانەمرکاوە، کاتێ بارزانیەکان لە بەرەی شۆڕش بون، هۆزەکانی تر لە دژی ئەوان چونەتە بەرەی حکومەت و بون بە جاش. واتا سەرەتای جاشایەتی بەرهەمی ناکۆکی عەشایری و سیاسی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردەواری لە شەڕی ناوخۆوە سەرچاوەی گرتوە، ئاگری ئەو ناکۆکیە بەیەکجاری خامۆش نەبوە.

نەوشیروان مستەفا، دەربارەی کێشە سیاسی و سەربازی و جوگرافی و کۆمەڵایەتیەکانی کوردستان و ڕۆڵی فراوانی کوردستان و دابەشبونی بەسەر دو ئیمپراتۆری مەزندا دەنوسێت: "دابەشبونی کوردستان بەسەر دەوڵەتێکی سوننی و دەوڵەتێکی شیعی دا کە دو زمانی جیاواز و دو فەرهەنگی جیاواز و پەیرەوی دو جۆری ڕێکخستنی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری جیاوازیان ئەکرد، هەروەها دابەشبونی هەر بەشێکی کوردستان بەسەر چەندین میرنشینی جیاوازدا، سەرەڕای دۆخی تۆپۆگرافی نالەباری ئەرزەکەی کە شاخ و دۆڵ و روبار لەیەکتری دابڕی بو، ئەمانە هەموی نەک هەر یارمەتی کوردیان نەدا بەرەو لەیەکچونی فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی، سیاسی بۆ پێشەوە بچێ، بەڵکو دەلاقەکانی جیاوازی لەیەک نەچونیان لەناو دانیشتوانی کوردستان دا قوڵتر کردەوە"[٢٠].

[٢٠] نەوشیروان مستەفا ئەمین، کورد و عەجەم، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی ی کوردستان. سلێمانی ٢٠٠٥، ل ١٨٧.

## ناکۆکی لە نێوان ریزەکانی پارتیدا لەسەرەتای ١٩٦٠

کێشــە و نــاکۆکی نێــوان هێــزە جیاوازەکــان و کەســایەتیە دیارەکــانی کوردستانی عێراق، مێژوەکەی دەگەرێتەوە بۆ کۆماری مهاباد، کاتێ بارزانی هەوڵی گەڕانەوەی داوە لە مهابادەوە بۆ کوردستانی عێراق و ویستویەتی حیزبێک وەک ئەوەی کۆماری مهاباد لە کوردستانی عێراق دامەزرێنێت. "دوای دامەزراندنی کۆماری مهاباد لە ١٩٤٦ دا، هەمـزە عەبـدوڵای بە نامەیەکیبارزانییەوە هات بۆ عێراق، لەم نامەیەدا بارزانی داوای ئەمەی کردبوو، کە رێگایەک فەراهەم بکرێ تا هەمزە عەبدوڵا بە مەبەستی گفتوگۆ لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا دەربارەی گەڕانەوەی بارزانی، پەیوەندی بە بابا علی کوڕی شێخ مەحمودەوە بکات. بارزانی داوای لە خەباتگێرانی کوردی عێراق دەکرد یارمەتی هەمزە عەبدوڵا بدەن بۆ دامەزراندنی "حیزبی دیموکراتی کوردستانی عێراق"[٢١] ئەم هەوڵەی بارزانی، نیگەرانی لای ئەندامانی لقی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە سلێمانی و بە تایبەتی ئیبراهیم ئەحمەد دروستکردوە، کە بە هیچ جۆرێک حەزی بە گەڕانەوەی بارزانی نەبو[٢٢]. ناکۆکی نێوان ئیبراهیم ئەحمەد و بارزانی، سەرەتاکەی دەگرێتەوە بۆ پێش دروستبونی پارتی دیموکراتی کوردستان، ئەو ناکۆکیە بە پێی کات و شوێن، گەشەی کردوە و شکڵ و فۆرم و ناوی جیاوازی بەخۆیەوە وەرگرتوە، ناکۆکیەکان لەسەرەتادا سیاسی و شەخسی بون و ئینجا گەشەیان کردوە بۆ ناکۆکی چەکداری یان شەڕی ناوخۆ.

---

[٢١] کریس کۆچیرا، کورد لە سەدەی نۆزدەم و بیستەمدا، ل ٢٤٣ .

[٢٢] هەمان سەرچاوە، ل ٢٤٣.

ناکۆکیەکـان لە دوای گەڕانەوەی بـارزانی بـۆ عێـراق لە ١٩٥٨/١٠/٦ دا زیاتر ئاشکرا دەبێت، کاتێ ئەو نەک هەروەک سـەرۆکی پارتی، بەڵکو وەک سەرۆکی گەلی کورد سەیر دەکرێت، ئەم گرنگیدانە لە لایەن قاسم و هەندێ گروپی کوردی و عێراقیەوە، جێی دڵخۆشی هەندێ لایەن نەبو.

پـێش دەسـتپیکردنی شۆڕشـی ١٩٦١، پەیوەنـدی بـارزانی و قاسـم زۆر باشبو، قاسم هەوڵی ئەدا بارزانی لەو کێشـە و شـەڕانە تێوەگلێنێت کە خۆی توشی بوە: "لە ساڵی ١٩٥٩ دا، شێخ رەشیدی لۆلان لە ناوچەی برادۆست لە دژی عەبدولکەریم قاسم یاخی بوو. بۆ سەرکوتکردنی یاخیبونە چەکداریەکە، هێزێکی بارزانیەکان بەسەرکردایەتی مەلا مستەفا و هێزێکی حیزبی شیوعی کە نـزیکەی ١٥٠ چەکـدار دەبـو، بەسـەرکردایەتی فـاخیر مێـرگە سـوری و سەرپەرشتی راسـتەوخۆی جەمـال حەیـدەری تەرخـان کـرا، ئەمە دەرفەتێکی زێـرین بـوو تـا بتـوانێ لە رێگـای ئەو شـەڕەوە چەک و تفـاق بـۆ بارزانیەکـان پەیدا بکا و تۆڵەی خۆی و عەشیرەتەکەشی لە شێخ رەشید و برادۆستیەکان بکـاتەوە کە دوژمنـایەتیەکی دێرینیـان لە نێوانیانـدا هەبـوو، هەروەهـا دڵسـۆزی خۆشی بۆ زەعیم عەبدولکەریم قاسم دوپات بکاتەوە.."[٢٣].

جـگە لەوەی بـارزانی رۆڵـی دیـاری هەبـو لە کوردسـتان و عێـراق، بەڵام بیرکـردنەوەی زۆر جیـاواز بـو لە بیرکـردنەوەی سـەرکردەکانی پـارتی یـان ئەنـدامانی مەکتەبـی سیاسـی، "سـەرکردەکانی پـارتی، کەسـانی مەدەنـی و رۆشنبیر و زۆریـان دەرچـوی زانکۆ بـون و قاڵبوی خەبـاتی سیاسـی نەهێنـی بـون و بەنـدکردن و راونـانی زۆریـان چێشـتبو، خۆیـان بە رەواتـر دەزانـی کە سـەرکردایەتی پـارتی و شـۆڕش بـکەن، لەوەی بیـدەنە دەسـت ئەو سـەرکردە عەشایریانەی کە خۆیان دایان ناوە"[٢٤].

---

[٢٣] زمانی تاوان هاتە قسە، شەپۆل فاخیر مێرگە سوری، سلێمانی، ١٩٩٧، ل ٢١.

[٢٤] بۆچی راستیەکان لە گەلی کورد بشارێتەوە. جرجیس فتحولا، لەژێر ناوی ئەندازیار سەعید عەبدول وەهاب،١٩٧٧ ، ل ٧.

بارزانی بە پێی پەروەردە و گەشەکردنی سیاسی، هەمیشە کەسی یەکەم بوە و دوای ئەو کەسی تر نەبوە کە سڵی لێبکاتەوە یان ئامۆژگاری بکات، تەنها کەس کە سڵی لێکردۆتەوە و بە قسەی کردوە، شێخ ئەحمەدی برا گەورەی بوە، هەر لەو روانگەیەوە، بڕوای بە حیزب و کۆبونەو و بڕیار و دسپلینی حیزبیی نەبوە و لە ژیانیدا مومارەسەی نەکردوە. بارزانی لەسەرەتادا خواستێکی هەبوە کە سەرۆکی حیزبێکی سەرتاسەری کوردستانی بێت. "لە کۆتایی تشرینی دوهەمی ١٩٥٨، لە کۆبونەوەیەکدا بە ئامادەبونی هەمزە عەبدولا و برایم ئەحمەد و نوێنەری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، بارزانی پێشنیازی ئەوە دەکات کە یەک حیزب بۆ سەرتاسەری کوردستان دامەزرێنێ دەڵێ "بەلای منەوە سنور نیە" ...بارزانی کە دەبینێ کۆمۆنیستەکانی عێراق و سۆڤێتێکان و کوردەکانی ئێران دژی ئەم بەرنامەیەن، کە خۆ بە خۆ ئەو دەکات بە رێبەری سەرتاسەری کوردستان، چاوپۆشی لە ئەنجامدانی بەرنامەکە دەکات"[٢٥].

چەند سەرچاوەیەک باس لە ناکۆکی نێوان قازی محەمەد و بارزانی دەکەن، لەبەرئەوە، بارزانی هەوڵی ئەوەی داوە، کە کوردستانی ئێران بەجێ بهێڵێت و بگەرێتەوە بۆ ناوچەی بارزان، لەو بارەیەوە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە گفتوگۆیەکی سێ قۆڵی لەگەڵ عەبدولا ئوجەلان (ئاپۆ) و محەمەد رەسوڵ هاوار، کە لە ١٩٩٦ ئەنجامیان داوە، دەڵێت: "مەلا مستەفا لە مهابادەوە لە رێگای هەمزە عەبدولاوە، نامەیەکی بۆ ناردم، هەروەها نامەیەکی تریشی بۆ ناردبوم کە بیدەم بە کورەکەی شێخ مەحمود، بەلام نامەکە کراوە بوو، نامەکەم خوێندەوە، لە نامەکەدا دەیخواست، بۆ ئەوەی مەلا مستەفا بگەرێتەوە گوند و ناوچەکانی خۆیان، داوای لێکردبو لای شا فەیسەڵ ناوبژیوانی بۆ بکات، چونکە دەرهەق بە ١١١ بارزانی بڕیاری مردن و لە سێدارەدان لە ئارادا بوو، دەیخواست بڕیاری لەسێدارەدان هەڵبگیرێت

---

[٢٥] کریس کوچیرا، کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەم دا. ل ٢٦٢.

بۆ زیندانی دێژخایان بگۆڕدرێ، بەرامبەر بە ئەنجامدانی ئەم گۆڕانکاریەش بارزانی ئاماژەی بەوە دەکرد کە بگەڕێتەوە ئێراق[٢٦].

بارزانی ویستویەتی ببێت بەسەرۆکی هەمو کورد، بەڵام بە بچوکی زانیوە ببێت بە سەرۆکی پارتی لە کوردستانی عێراق، چونکە ئەو خۆی بە سەرۆکی هەمو کوردستانی عێراق زانیوە و نەیویستوە لەبەر خاتری حیزبایەتی خۆی بچوک بکاتەوە. زۆرجار و لە زۆر شوێن چەند بارەی کرۆتەوە کە (من هەرگیز نە سەرۆکی ئەم حیزبە ساختەیە بوم کە زیانی بۆ ئامانجی شۆڕشگێرەکانمان پتر بوە تا قازانج و نە سەرۆکیم)[٢٧].

بارزانی ئەوەندەی بروای بە هێزی عەشایر هەبوە، نیو ئەوەندە بروای بە حیزب و حیزبایەتی نەبوە، ئەم بروایەش لە تاقیکردنەوەی ژیانی خۆیەوە هاتبو، هەتا سەرەتای شەستەکان، هەمو دەورووپشت و باوەڕپێکراوکان و دۆست و هەڤاڵەکانی، زیاتر لەوانە بون کە هاورێی دێرینی خۆی بون یان لە عەشیرەتی بارزان بون. (بارزانی رۆحی سەرۆکایەتی، تەنها لەوەوە بەدەست نەهێنابو، کە سەرۆکی پارتیە، بەڵکو زۆر بە پێچەوانەوە، چونکە پارتی دەیویست دەسەڵاتی ئەو سنوردار بکات، بارزانی دوای گەڕانەوەی لە یەکێتی سۆڤێت، نەی ئەشاردەوە کە ناتوانێت لەگەڵ دەزگاکانی پارتی و سەرکردایەتیەکەی خۆی بگونجێنێت، بە تایبەتی لەگەڵ سکرتێری گشتیەکەی و رۆشنبیرێکی شاریی وەک ئیبراهیم ئەحمەد. تێروانینی جیاواز لە نێوان سەرکردایەتی پارتی و بارزانی، لە دوای دەستپێکردنی خەباتی چەکداری زیاتر رون بۆوە. بەتایبەتی کە دو مەرکەز لەناو خەباتی چەکداریدا دروست بوبون، بارزانی و عەشیرەتەکان لە بەشی باکوری کوردستانی عێراق "بادینان" و پارتی لە بەشی باشور "سۆران"، نیشانەی دوری و جیاوازی بو، نەک تەنها لە بواری جوگرافیەوە)[٢٨].

---

[٢٦] دادگای مێژوو، گفتوگۆیەک لە نێوان ئیبراهیم ئەحمەد و عەبدوڵا ئۆجەلان و هاوار، ل ١٢.

[٢٧] هەمان سەرچاوە

[٢٨] Ferhad Ibrahim, Die Kurdische Nationalbewegung, S.٥٢٨

# هۆکاری ناکۆکیەکان

بۆچون و تێروانینی سەرکردایەتی پارتی لە لایەک و بارزانی لە لایەکی تر، ڕەنگدانەوەی ئەو واقیعە بو، کە زۆربەی زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی، خوێندەوار و ڕۆشنبیرانی شارەکانی کوردستان بون و بارزانی و هاوڕێیانیان پەروەردەی دێهات و جەوێکی عەشایری بون، کە دابونەریتی ئەو سیستەمە حوکمی کردوە و کاریگەری خۆی بەجێهێشتوە. ئەیوب بارزانی لە زمانی ڕۆژنامەنوسی فەرەنسی کریس کۆچیراوە دەڵێ: (جەنەراڵ بارزانی عەیبێکی ئەساسی هەبو، ئەویش ئەوە بو، نەیدەزانی حیزب چیە!.. بە وەسیلەی دائەنا، ئەو بیری لەوە دەکردەوە چۆن دەسەڵات بەکاربهێنێت، بڕوای بە "دانوستاندن - نیقاش" و "بەشداری" نەبو، نەیدەزانی "دیموکراتی" چیە)[٢٩].

(م.س) پارتی، کەوتبونە هەڵەیەکی گەورەوە، ئەویش ئەوە بو، کە لە کەسایەتی و گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و سیاسی بارزانیان بە تەواوی نەکۆڵیبۆوە، بارزانی پێش ئەوەی ببێت بە حیزبی، سەرۆک یان کەسایەتیەکی زۆر دەست ڕۆشتوی عەشایر بوە، ئەو لە ڕوانگەی سەرۆک عەشیرەتەوە سەیری حیزبی دەکرد، چۆن سەرۆک عەشیرەت دەسەڵاتی ڕەهای هەیە و هیچ کەسێ نیە بەرەنگاری بێتەوە و ئەندامانی عەشیرەتەکە لە هەمو کارێکدا پێویستە گوێڕایەڵی سەرۆکەکەیان بن، ئەو ئەیویست

---

٢٩. ایوب بارزانی، الحركة التحررية الكوردية و صراع القوى الاقليمية و الدولية، ١٩٥٨-١٩٧٥- ٢٠١١ – جنيف . ل، ٥٣.

هەمـان یاسـا لە حیزبیشـدا جێبەجـێ بکـات و سـەرۆکێک بێـت کە هەمـو دەسـەڵاتێکی هەبێت و چـی بوێـت ئەوە بکـات، ئەوانەی خـوار ئەویـش بـێ بیرکردنەوە بڕیارەکانی جێبەجێ بکەن، چۆن ئەندامانی عەشیرەت ملکەچی سـەرۆکەکەیان دەبـن، بـارزانیش ئەو جـۆرە حیـزبەی دەویسـت. هەروەهـا لەناو پارتیشـدا بەتەمەنترین کەسیان بـوو، ١١ سـاڵ لە ئیبراهیم ئەحمەد و ٣١ ساڵیش لە مام جەلال گەورە تر بـو، ئەمەش هەقی بـرا گەورەیـی پێدابو، هەروەها جیاوازی تەمەن لە کۆمەڵگای عەشایریدا ڕۆڵـی خـۆی هەیە، بەڵام بارزانی ئەم گوێڕایەڵیەی لەگەڵ مەکتەبی سیاسـیدا بـۆ نەئەچـوە سـەر، بۆیە نە ئەوجۆرە حیزبە و نە ئەو جۆرە سـەرکرایەتیەی نە ئەویسـت، بەڵام دوای ١٩٦٤ کە مەکتەبـی سیاسـی دەرکـرد و مونافیسـی نەمـا، بە خۆشـیەوە تـا کۆچی دوایی بەسەرۆکی حیزب مایەوە.

کـاتێ بـارزانی حیزبـی ڕەفـز دەکـرد و جنێـوی پـێ ئەدا، ئەو کـاتە بـو، کە مەکتەبـی سیاسـی سـەرکردایەتیان دەکـرد، کـاتێ کە ئەوان نەمـان و خـۆی سـەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسـی دائەنـا، مەدحـی حیزبـی دەکـرد و ئەیگوت "هـیچ سـەورەیەک بەبـێ قیـادەی حزبێکـی مـونتەزم نـاجح نـابێ، ئەگەر ئەڵێم حـزب، مەعنـای ئەوە حزبێکـی مـوخلیس بە مـیلەت و مەصـالیحی مـلەت لەبەرچـاوی بـێ، نەک وەک ئەوانەی کە لە مـاوەت بـون و زوڵمیـان لە مـلەت ئەکرد و ناوی خۆشیان نـابو حـزب"[30]. بونی دو بۆچـون و دو سـەرکردایەتی، کـاریگەری گەورەی هەبـو لەسـەر سـەرجەم بـزوتنەوەی کـوردایەتی و دابەشبونی بە دو جەمسەرەوە، وەک ئەیوب بارزانی دەڵێ: "بزوتنەوەکە بە دو جەمسەر و دو بەرنامە دەستپێکرد"[31].

ڕۆژ بە ڕۆژ، بە تـایبەتیش دوای هەڵگیرسـانی خەبـاتی چەکـداری، ئەم

---

[30] وتـاری سـەرۆک بـارزانی لە کۆنفرانسـی ئەفسـەرانی پێشـمەرگە و کاربەدەسـتانی پارتی دا، ١٩٦٧/٤/١٥، ل ٧.

[31] آیوب بارزانی، الحرکه التحرریة الکوردیة. الجزء الاول، جنیف ٢٠١٧، ص ٥٣.

بۆچـونە جیـاوازانە زیادیـان دەکـرد، لە لایەک بـارزانی بـڕوای بە کـاری حیزبایەتی نەبو، گرنگی بە ئەندامانی سـەرکردایەتی نەئەدا و لە زۆر جێگا بە خراپە باسی دەکردن، ئەندامانی سەرکردایەتی و بە تایبەتی مەکتەبی سیاسـی، ئەوانیش درێخیان لە قسە پێوتن بە بارزانی نەدەکرد "ناوی مستەفا بارزانیـان بە عەشایر و نا رۆشنبیر و دواکەوتوو و خێڵەکی و نەخوێندەوار، وە هەوڵی کەمکردنەوەی توانا و شارەزایی و لێهاتووەکەیان دەدا"[32].

زۆرجـار لە نوسـراوی رەسـمی حیزبیدا، لە جیـاتی نـاوی بنـێن (سـەرۆکی گەلی کورد، یان سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان) ناویـان بە (مامۆستا یان بە کاک دەبرد، نامەی مەکتەبی سیاسـی پارتی بۆ بارزانی لە ١٩٦٣/٤/٢، ژمـارە ١٠٦ی ١٩٦٣/٢/٨)[33]، زۆرکەسـیش دەیزانـی کە مەلا مسـتافا پێخـۆش نەبو پێی بوترێت "مامۆستا" و بە جنێوی دەزانی.

پـارتی ٦ ژمـارە رۆژنـامەی (کوردسـتان) یـان لە نێـوان ٣/٤ تـا ١٩٦١/٤/١ دەرکردوە، کە خـاوەنەکەی ئیبـراهیم ئەحمەد و سەرنوسـەرەکەی مـام جەلال بـوە، لەو ٥ ژمـارەیەی کە بـڵاو و چـاپ کـراوە، جگە لە ژمـارە ١ نەبێت کە چاوپێکەوتنێکی رۆژنـامەی (النهضـة)ی بەیروتـی ژمـارە ٢٨ ی ١٩٦١/٢/٢٠ کە لەگەڵ بـارزانی ئەنجـامی داوە و رۆژنـامەکە کردبـوی بە کـوردی و بە وێنەیەکیەوە لەگەڵ (ندیم ابو اسماعیل) ی خاوەن رۆژنامەکە بڵاوکراوەتەوە، کە نازناوەکەی بە (تێکۆشەری بەناوبانگی کورد) پێناسە کراوە. لەسـەروتار و وتارەکانی تری هەر ٥ ژمارەکەی رۆژنامەکەدا، باسی بارزانی تێدا نیە و لە جیاتی باسی بارزانی باسی (پارتی پێشرەوی خەڵکی کوردستان) و ناوی بارزانی بەرچاو ناکەوێت[34].

---

[32] نەجم سەنگاوی، باشوری کوردستان، ٢٠١٦ - چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠١٧، ل ٣١٩.

[33] نەجم سەنگاوی، هەمان سەرچاوە.

[34] کوردسـتان رۆژنـامەیەکی سیاسـی رۆژانەیە، پ.د. هیمـداد حوسـێن و نەوزاد عەلـی، سەرلەنوێ چاپ و ئامادەیان کردوە. لە بڵاوکراوەکانی کوردستانی نوێ، ٢٠١٩.

ئەم هەڵوێستە نیشانی ئەدا، کە لەسەرەتای ١٩٦٠، کێشە و ناکۆکی لە نێوان رۆشنبیر و سیاسییەکانی پارتی و بارزانیدا هەبوە، بە ئەنقەست یان بێ ئەنقەست ویستویانە کە رۆڵی پارتی پێش رۆڵی بارزانی بخەن، ئەوەش وای لە بارزانی کردوە، کە ناکۆکیەکانی لەگەڵ دەستڕۆشتوەکانی ناو (م.س) ئاشکرا بکات و هێرشیان بکاتە سەر.

بارزانی لە چاوپێکەوتنە رۆژنامەوانیەکاندا هەمیشە نەیدەشاردەوە، کە ناکۆکی لەگەڵ حیزب هەیە، لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەنوسێکی ئەمریکی دەڵێ: "هیچ شتێ نیە پێی بوترێت حیزب، تەنها گەل هەیە، ئەوانەی سەردەکەون، هاولاتی کوردن... ئەو هێزانەی لەژێر دەسەلاتی پارتیدان، تا ئێستا دەستیان نەکردوە بە شەڕ، تەنها ئەو کاتە نەبێت کە جامانە سور و سپیەکانی بارزانییەکانیان بینی"[٣٥].

ئەندامانی مەکتەبی سیاسی کەم و زۆر سڵیان لە بارزانی کردۆتەوە، لەسەرەتادا زۆر بە ئاشکرا، هێرشیان نەکردۆتە سەری، بەلام بارزانی خۆی بەهێزتر دەزانی و ئەیزانی کە هاوپەیمانێتی لەگەڵ ئەندامانی مەکتەبی سیاسیدا کاتیە و لە زۆر شوێن بە زمانی زبر باسی دەکردن "تایبەندمەندیەکی مەلا مستەفا ئەوە بو، لە هەر جێگایەک، کە دائەنیشت لە جیاتی ئەوەی وەکو سەرۆکی حیزب بەرگری و پشتگیری لە حیزب بکات، هێرشی ئەکردە سەر حیزب...مەجلیسی مەلا مستەفا بوبو بە شوێنی جنێودان، سوککردنی پارتی و کادێرەکانی و باسکردنی ئەوەی، کە حیزب مانای تەفرەقەیە"[٣٦].

قسەکانی هەردولا دەگەشتنەوە بە یەک، هەر لەبەرئەوەی کە بارزانی وەک سەرۆکی پارتی لە لایەک و لە ناوچەیەک و ئەندامانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی لە لایەکی تر، هیچ کاتێ بۆ ماوەیەکی درێژ لە یەک ناوچە نەبون و یەک بارەگای هاوبەشیان نەبوە، ئەمەش هۆیەک بوە دژوار بو بۆ

[٣٥] دانا ادمز شمدت، رحلة الی رجال الشجعان في کوردستان، ترجمة جرجیس فتح الله، ل٢٩٢.
[٣٦] مام جەلال دیداری تەمەن، بەرگی ١، ل ٢٠١.

ئەوەی کە نەتوانن بە ئاسانی و خێرا، ئەو کێشانەی رۆژانە دێتە پێشەوە چارەسەی بکەن یان هەر هیچ نەبێت باسی لێوە بکەن. لەبەر ئەوەی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی لە شوێنی جیاو و دوربون لە بارەگاکانی بارزانی، توانیان یەک گروپ دروست بکەن و هەتا ١٩٦٤ کەم لەوانە پاڵپشتی بارزانی بون و هەر لەبەرئەوەش بارزانی لە هەمویان زویر بوبو، بۆیە کە فرسەتێکی بۆ رەخسا، زۆربەی زۆری مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی ١٤٠ ئەندام ی لە کۆنگرەی ١٩٦٤/٧/١ لە قەڵادزێ دەرکرد..

بارزانی دژایەتی بەرامبەر بە سکرتێری حیزب، ئیبراهیم ئەحمەد نەئەشاردەوە و ئەوی بە عەقڵی هەمو ناکۆکیەکان دەزانی، مەسعود بارزانی لەو بارەیەوە دەڵێ "بارزانی متمانەی بە ئیبراهیم ئەحمەد نەبوو، هەرگیز حەزی پێ نەهاتووە و سووریش بووە لەسەر ئەوە کە لاوە چاکەکانی پارتی لێ دوربخاتەوە و بیانپارێزێ نەوەکا کاریان تێ بکات و لەگەڵ خۆیدا بەکێشیان بخات"[٣٧].

سەرەرای ئەوەی، کە زۆربەی زۆری مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی، هەڵویستی نەرێنیان هەبو بەرامبەر بە بارزانی، بەلام لە وردەکاریدا یان لە شیتەڵکردنەوەی رۆڵی بارزانی لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستاندا، وەک یەک نەبون. بۆ نمونە، سەرەرای ئەوەی مام جەلال کارکتەرێکی دیار بو لەناو سەرکردایەتیدا، بەلام بۆچونی لە زۆیان جیاواز تر بو دەربارەی رۆڵی بارزانی "شێوەی بەگژاچونی مەکتەبی سیاسیم پێ چەپرەوانە و ئینعیزالی بو، پێموابو کە ئەبێ: مەکتەبی سیاسی ئەو ڕاستیە بزانێ، کە مەلا مستافا، پێویستیەکی مێژوییە بۆ شۆڕشی کورد...ئێمە ناتوانین مەلا مستەفا دەرکەین لە شۆڕش، یان وای نیشان بدەین کە ئیشمان پێی نەماوە، ئەوە کارێکی هەڵەیە و ناواقعیە و ناراستە...من پێموابو کە

[٣٧] مەسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ل ١٦٧.

مەکتەبی سیاسی ئەو بەگژا هاتنەوەی مەلا مستەفا تەنها بە هێزی پێشرەو دەکا نەک بە جەماوەر...ئەو کاتە لە ٩٠٪ ئەوانە لەدەوری مەکتەبی سیاسی بون، وایان ئەزانی بەو هێزە حیزبیە ئەتوانن بەربەرەکانی ئەو سیاسەتەی مەلا مستافا بکەن و بیبەنەوە"[٣٨].

هەر دەربارەی بۆچونی جیاواز لە مامەڵەکردن لەگەڵ بارزانی و پێویستی بارزانی بە پارتی و پارتیش بە بارزانی مام جەلال دەڵێ: "هەم مەلا مستەفا و هەم پارتی پێویست بون بۆ شۆڕش و بۆ کوردایەتی، لەبەرئەوە ئەبوایە پێکەوە بگونجێن و ئەو ناکۆکیانەی لە نێوانیاندا هەبون، ناکۆکی ناو ریزەکانی گەل بون، ئەبوایە بە رێگای گفتوگۆ، دانوستاندن، پێکەوە کارکردن، رەخنە و رەخنە لە خۆگرتن، بۆ سەلماندن و سازش چارەسەر بکرێن.."[٣٩].

نەوشیروان مستەفا، وەک یەکێک لە نەیارانی بارزانی، بەم شێوەیە باسی دەکات: "بێگومان مەلا مستەفا یەکێ بو لە گەورەترین سەرکردەکانی کورد لەم قەرنەدا، لە ناو خەڵکی کوردستاندا لە هەمو سەرکردەکانی تر زیاتر پشتیوانی لێکراوە، لە هەمویان زۆرتر سەرکردایەتی جوڵانەوەکەی کردوە و، لە هەمویان زیاتر لە سیاسەتی ناوەوەی عێراق و، لە سیاسەتی کوردیی و دەوڵەتانی ناوچەیی ئێران و تورکیا و، دەوڵەتانی گەورە: بەریتانیا، یەکێتی سۆڤێت، ئەمریکا دا دەوری هەبوە"[٤٠].

هەروەها جرجیس فەتحوڵا، دەیگێڕێتەوە لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد باسی روداوەکانی ١٩٧٦ مان دەکرد لە ئێران، ئەو دەربارەی بارزانی وتی: "بەدەر لە هەمو شتێ و بەدەر لەسەر کۆمەڵێک تێبینیم، مەلا مستەفا کەسێکی نیشتیمان پەروەر بوە، کەسێکی خەباتگیر بوە، ئەمە ڕاستیەکە، مساوەمەی

---

[٣٨] مام جەلال، دیداری تەمەن، بەرگی ١، ل ٢٠١.

[٣٩] مام جەلال، دیداری تەمەن، بەرگی ١، ل٢٨٧.

[٤٠] نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، دیوی ناوەوەی روداوەکانی کوردستانی عێراق ١٩٧٩ – ١٩٨٣، ل ٣٦.

لەسەر مافی کورد نەکردوە، باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە، مۆرکردنی ڕێکەوتنی بەیانی ئازار بو، سەرەرای ئەوەی کە شای ئێران دژی بو، وە ئاگاداری کردەوە کە دەسەلاتدارانی بەغدا تەنها ئەیانەوێت کات بەسەر بەرن"[41].

زۆری ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، ئەو ڕاستیەیان نەدەزانی یان خۆیان لێ ئەدزیەوە، کە کۆمەڵگای کوردی، کۆمەڵگایەکە کە سیستەمی دەرەبەگایەتی زاڵە بەسەریدا و هێشتا بۆرجوازی بچوک و مام ناوەندی وەک پێویست گەشەیان نەکردوە و شاری گەورە و کارگەی بەرهەمهێنان دروست نەبون، هەروەها کوردستان بە گشتی ناوچەیەکی دواکەوتو بو لە زۆر بواردا، لەبەرئەوە پەیوەندی کۆمەلایەتی و سیاسی و ئەو هەیکەلە چینایەتیەی کە هەیە کاریگەری لەسەر دەبێت. "مەکتەبی سیاسی حیزبێکی شورشگێری هاوچەرخیان دەویست کە بڕیارەکانی بە زۆربەی دەنگ بێت و لە جەوێکی ئازادا گفتوگۆ و باس و خواز لەسەر مەسەلەکان بکەن و بناغەی بڕیاردانیش، دەستوری حیزب بێت. هەروەها چونە پێشەوەی حیزبی لەسەر بناغەی لێوەشاوەیی بێت نەک ڕەچاوی خزم و خزمایەتی بێت"[42]، ئەمە بۆچونی زۆر لە چەپەکانی ناو پارتی بو، بەلام ئەو بۆچونانە لەو قۆناغە و لە ناو شۆڕش و پارتی و لەگەڵ بارزانی، زیاتر لە خەیاڵەوە نزیک بو، وەک لە واقع.

ناکۆکی سیاسی و کۆمەلایەتی و فکری لە نێوان مەکتەبی سیاسی و بارزانیدا، بەردەوام بو، هەندێ جار شێوەی ئاشکراو هەندێ جار توندی بە خۆیەوە دەبینی، هەندێ جاریش شاراوە بو.. ئەم ناکۆکیانە بە دەستپێکردنی خەباتی چەکداری زیاتر گەشەی کرد، هەر لەسەرەتاوە، پارتی و بارزانی لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕ نەبون، لەبەرئەوەی نەخۆیان بۆ ئامادەکردبو، نە بارودۆخەکە هی دەستپێکردنی خەباتی چەکدار بو. "لە ڕاستیدا حیزب ئامادەیی تێدا نەبو، شۆڕش هەڵگیرسێنێت و بیبات بەرێوە، نە لە بواری مادی،

[41] جرجيس فتح الله، زيارة للماضي القريب، ستوكهولم – السويد ١٩٧٨، ل ٧٥.

[42] جرجيس فتح الله، هەمان سەرچاوە، ل ٧٥.

نە لە بواری پەروەردەکرن..لە پڕ هەستیان کرد کە چەندەها گروپی چەکداری خۆیان ئامادەکردوە، لە نێوانیاندا ئەندامان و لایەنگیران و دۆستی پارتی تێدا بـو، لەبەرئەوە پـارتی هەسـتی کـرد کە نەکەوێـتە خـۆی، ئەوا هەیـمەنەت و قورسایی خۆی بۆ هەمیشە لەدەست ئەدا، هەوڵیدا لە ڕێگای بروسکەوە بۆ قاسـم، کە شـەڕەکە رابگرێت و ئـاگری کوشـتن لە کوردسـتان دوربخـاتەوە. سـەرۆکی پـارتی لە بـارزانەوە، دڵسۆزی خۆی بـو ڕژێـم دەربـڕی و دوپـاتی کـردەوە کە ئەو بە هـیچ جۆرێـک نایەوێت شـەڕ هەڵگیرسـێنێت. لە پێکـدادانی یەکەمەوە، ئەو گـروپە عەشـایریانە بڵاوەیـان لێکـرد.. وە هەڵسـانی ئەوان بە شەڕی چەکداری، هیچ پەیوەندیەکی بە مەسەلەی نەتەوایەتیەوە نەبو، بەڵکو دژ بە بڕیاڕی چاکردنی کشتوکاڵ بو کە حکومەت دەریکردبو"[٤٣].

---

[٤٣] ایوب بـارزانی، الحركة التحررية الكوردية و صراع القوى الاقليمية و الدولية، ١٩٥٨-١٩٧٥- ٢٠١١ – جنيف . ل، ١٩٣.

# شۆڕشی ئەیلول و کێشە ناوخۆییەکان

هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول، کێشەیەکی دروستکرد، نەک تەنیا لە نێوان (م.س) پارتی و بارزانیدا، بەڵکو بو بە کێشەیەک لە ناو خانەوادەی بارزانیشدا: "شێخ ئەحمەدی بارزانی، برای مەلا مستەفای بارزانی، سەرۆکی بزوتنەی کوردەکان، جارێکی تر لە نامەیەکی تردا بۆ قاسم، سوێندی خوارد کە دڵسۆزی قاسم بێت و جارێکی تر دڵنیای کردەوە کە ئەو هیچ پەیوەندیەکی بە راپەرینەکەوە نیە"[44].

پێکدادانی پچڕ پچڕ و نارێکوپێک زیاتر لە ناوچەیی بادینان رویدا، دوای ئەوانیش لە ناوچەی بازیانی نزیک سلێمانی، بەڵام هۆی سەرەکی ئەو جوڵانەوانە، نەتەوەیی نەبو بەڵکو دژ بە بڕیارەکانی حکومەتی عێراق بو، کە بەرژەوەندی دەرەبەگەکانی دەخستە مەترسیەوە، هەر کە فڕۆکە جەنگییەکانی عێراق هاتن و بۆردومانیان کرد، هەمو رایان کرد و وتیان: ئێمە لەگەڵ ئاسماندا شەڕمان پێ ناکرێ. لەو بارەیەوە، مەسعود بارزانی دەڵێ: "بەرژەوەندی تایبەتی خێڵەکی رۆڵێکی دیارتر و بەهێزتری هەبوو و بەسەر هەستی نەتەوایەتیدا زاڵ و لە پێش داخوازییە نیشتیمانیەکانەوە بوو. سەرباری ئەمەش دوژمنایەتی کۆن و ناکۆکی بەرپای نێوان ئەم خێڵ و ئەو خێڵ دەبوو بەهۆی ئەوەی هەندێ لە خێڵەکان کە خێڵە ناحەز و نەیارەکانی خۆیانیان دەدی لایەنی شۆڕش دەگرن، ئەوان دەچونە پاڵ دەسەلات...پارتی هیچ جۆرە دەسەلاتێکی بەسەر خێڵەکاندا وەدەست نەهێنا.

---

[44] نامەی نەهێنی سەفارەتی ئەڵمانی لە بەغدا،٤/٩/١٩٦٢ -٣٥٤ .Nr – ئارشیفی وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیا – بەرلین.

خێڵەکان لە کۆمەڵە خەڵکێک خربونەوە زیاتر نەبون کە سەرکردایەتییەکی فەرماندەری یەکگرتوویان نەبوو. تەنیا سەرۆکەکانیان سەرکردەیان بون... ئەم هێزە کوردیە نەهیچ بەربەرەکانێی کرد و نە پەلامارێکی ئەوتۆی بزوتنەوەکەی لەشکری حکومەتیدا کە شایانی باس بێت. خێڵە چەکدارە خڕبوەکان هەمو بڵاوەیان لێکرد"[45].

هەر دەربارەی رۆڵی ولاتانی دەرەوە و سەرۆک خێڵەکان، ئیبراهیم ئەحمەد دەڵێ: "خێڵە کوردەکان جموجۆڵێکی سەیریان پێکەوتبوو، عەلی حەسەن ئاغای مەنگوڕ، لە گوندەکەی خۆی (هێرۆ)، ئالای سەربەخۆیی کوردستانی هەڵکردبوو، دەوڵەتی ئێران پشتیوانییەکی باشی دەکردن، بۆمان دەرکەوت، بۆ ئەم هەرا و بەزمە پێشەکی کارێکی زۆری بۆ کراوە. ئێمە لەو باوەڕەدا بوین، کە ئەگەر شەڕ بێ و شۆڕش لە کوردستان دەست پێبکا، با لە دەست خێڵەکاندا نەبێ، هەوڵ بدەین شۆڕشەکە لە لادێوە بۆ شار بگوێزینەوە.."[46]. بارزانییش لەسەرەتادا هەوڵی خۆی دا کە حکومەت واتێنەگات، کە ئەو سەرهەڵدانە، ئەوی لە پشتەوەیە، لەبەرئەوە، "لە بارزانەوە پشتگیری خۆی بۆ حکومەت دەربڕی و ئیخلاس و پشتیوانی دەربڕی، کە ئەو بە هیچ جۆرێک نایەوێت بە جوڵانەوەیەکی چەکداری دژ بە حکومەت هەڵسێت"[47].

بزوتنەوە چەکدارەکە، زۆر سنوردار بو، هەروەها بچوکیش بو: "لە دەستپێکی مانگی ئەیلولی ١٩٦١دا، کاربەدەستانی ئەمەریکا لە (تەورێز) راپۆرتیاندا، کە گروپێک لە کوردان، ئەوانەی سەر بە بارزانی نین، رێگەی سەرەکی سەرسنوری ئێرانیان خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە.."[48].

---

[45] مەسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ل ٣٣، ٣٦.

[46] پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەد دا، حوسێن محەمەد عەزیز ١٩٩٥، ل ٢٩.

[47] جرجيس فتح الله، زيارة للماضي القريب، ل ٣٠.

[48] بریان ڕۆبەرت گیبسن، ئەرێ کورد بوونە بەردەباز؟ ل ١١١.

لە کۆتایی ١٩٦٠ دا، پارتی بڕیاریدا خۆی بکات بە خاوەنی شۆڕشەکە، لەم بارەیەوە نەوشیروان مستەفا دەڵێ: "لە مانگی کانونی ١٩٦١ دا، زۆرایەتی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پاش چەند مانگ لە یەک دابڕان لە گوندی عەودالان لە نزیک چەمی ڕێزان کۆبونەوە، لەم کۆبونەوەیەدا بڕیاریاندا:

- جوڵانەوەکە لە باوەش بگرن، ڕێکی بخەنەوە و سەرکردایەتی بکەن.
- دروشمی دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بەرز بکەنەوە.
- بارەگای مەکتەبی سیاسی دابنێن و، ڕێگەوشوێنی دەرکردنەوەی ڕۆژنامەی خەبات و بڵاوکراوەکانی پارتی دابنێن.
- دەستەیەکی نوێنەرایەتی بەسەرۆکایەتی عەلی عەبدوڵا بنێرن بۆ لای مەلا مستەفا بۆ نەهێشتنی گلەییەکانی و، پتەوکردنی پەیوەندی نێوان سەرۆک و سەرکردایەتی"[٤٩].

بۆچونێکی تر هەیە، دەربارەی هەڵگیرسانی شۆڕش، کە کەم باسی لێوە کراوە و سەرچاوەی زۆریش لەبەردەستا نیە، جگە لە چەند سەرچاوەیەکی ئینگلیزی و ڕوسی نەبێت و تا ئێستا لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە، بۆ ساغکردنەوەی ئەو دیکۆمێنتانە، کە ئایە ڕاستن یان دروستکراون، ئێمە تەنها لەو ڕونگەیەوە دەیخەینە بەردەستی خوێندەوەران، کە ئەهێنێت لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت و ئەمەش بۆ مێژونوسان و ئەو دەزگایانەی لەو بوارانەدا شارەزان بەجێ دێڵین.

بە پێی ئەو بەڵگەنامە و نوسراوانە، شۆڕشی ئەیلول لە ١٩٦١ دا بە هاندانی یەکێتی سۆڤێتی جاران دەستپێکردوە، ئەوەیش نەک لە پێناوی بەرژەوەندی کورد، بەڵکو بۆ قاسم مەشغوڵ بێت و کێشە بۆ وڵاتانی ڕۆژئاوا بە تایبەتی ئەمەریکا، ئینگلتەرا دروست ببێت و ئەو زەختە سیاسیەی لە ئەنجامی دروستکردنی دیواری بەرلین لە ١٩٦١/٨/١٣ کە بوە هۆی دابەشکردنی بەرلینی ڕۆژئاوا بەسەر هاوپەیمانانندا (ئەمەریکا، بەریتانیا و

[٤٩] نەوشیروان مستەفا ئەمین، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، ل ٦٤.

فەرەنسا) و بەرلینی ڕۆژهەڵات، کەوتە ژێر دەسەڵاتی یەکێتی سۆڤیێتەوە، ئەم دابەشبونە خەریک بو بەرەو شەڕێکی خوێناوی دەچو لە نێوان هاوپەیمانی ڕۆژئاوا و یەکێتی سۆڤیێتدا.

مەبەستی روسەکان لە هاندانی کورد بە هەڵگیرساندنی شۆڕش، لە پێناوی ئەوەدابو، کە هەمو قورسایی دنیا نەکەوێتە سەر کێشەی بەرلین و کوبا، لە یەکێک لە نوسینەکاندا هاتوە:

"لە ڕاپۆرتێکدا کە جێگری سەرۆکی دەزگای هەواڵگری (KGB) ئەوکات (پیتر ئیڤاتوشین) بۆ لیژنەی ناوەندی حیزبی شیوعیی سۆڤیێتی لە ١٩٦١/٩/٢٧ دەنوسێت:

بەپێی بریاری لیژنەی ناوەندی حیزبی شیوعیی سۆڤیەتی لە ١٩٦١/٨/١ لە بارەی وریابون و ئاگاداری لە هێزی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە بەرلینی ڕۆژئاوا، دوابەدوای جموجوڵەکانی هێزە عەشایەرە کوردەکان لە باکوری عێراق واتا کوردستان، پێشنیاری ئەم خاڵانە دەکەین:

١- هەمو تواناکانی (KGB) بەگەڕ بخرێت لە پێناو دروستکردنی خۆپیشاندان بە کوردەکان لە دژی پەیوەندیەکان و سیاسەتەکانی عەبدولکەریم قاسم و هاوەڵەکانی لە هیند و ئەندونوسیا و ئەفغانستان و کینیا و وڵاتەکانی تری هاوپەیمانی عێراق.

٢- دروستکرنی پەیوەندی لەگەڵ بارزانی و داوای لێبکرێت کە جڵەوی جوڵانەوەکە بەرنەدات و جوڵانەوەکە لە خێڵەکیەوە بەرەو دیموکراتی ببات و هەروەها ئاگاداری بارزانی بکرێتەوە کە کردەوەکانی زۆر بە وریایەوە ئەنجام بدات تا ڕۆژئاوا "ڕووسیا بەم پرۆژەیە تێوە نەگلێنن و تۆمەتباری نەکەن بە دەست تێوەردان لە بارودۆخی ناوخۆی عێراق".

٣- (KGB) ڕاسپێرێت بە مەشق پێکردنی هێزێکی سەربازی لە پیاوانی کوردی نیشتەجێی خاکی ڕووسیا کە پێک هاتبێت لە (٥٠٠ بۆ ٧٠٠) کەس تا بارزانی فێری هەندێک تاکتیکی سەربازی بکرێت و هەندێک لە پیاوەکانی

مەشق پێ بکرێت بۆ کاری (تۆپ و هاوەن و پەیوەندی لاسلکی و گروپی بۆردومان و گرووپی تەقاندنەوە) بۆ پشتیوانی لە جولانەوەی کوردی لە کاتی پێویستدا"[50] دەربارەی رۆڵی روسیای جاران لە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول نوسەرە ئەمریکاییەکان دەڵێن: "هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشەکە، ئیدارەی کەنەدی سەرقاڵی روداوگەلێکی دیکە بوو، لە ئەوروپا، تازە سۆڤێت سەرقاڵی دروستکردنی دیواری بەرلین بو. لەو کاتەدا، کاربەدەستانی واشنتن هۆکاری کەمیان سەبارەت بە هەڵگیرسانی شەڕی کورد لەبەردەستا بوو، بەوەی لەگەڵ کێشەی بەرلین بە یەکەوە بەسترابنەوە، کە لە واقیعیشدا هەروابوو. بەگوێرەی (ڤلادیسلاڤ زەبوک) ڕاپەرینەکەی کورد هەرچەندە لە نێو خەڵکی ڕەسەنی خۆشیدا بوو، بەڵام ڕێک لەگەڵ ستراتیژی سۆڤێت یەکیان دەگرتەوە، کە لە تەموزی ١٩٦١ بۆ ئەو مەبەستە دارێژرا، تا سەرنجی ئەمەریکا و هاپەیمانەکانی لەسەر مانۆڕەکەی بەرلین وەرگێڕێ. (زەبوک) لە وتارەکەیدا کە لە ١٩٩٤دا بلاویکردەوە، دەقی یاداشتنامەیەکی (کەی گی بی K.G.B) هێناوەتەوە کە لە (ئەلیکساندەر شێلەپین)ی سەرۆکی دەزگاکەوە بۆ خرۆشۆف لە ٢٩ تەموزی ١٩٦١دا لەسەر نوسرابوو، تێیدا رایدەسپێرێت، کە کێشە لە ناوچەی جیاجیای جیهان دروستبکرێ تا سەرنج و هێزەکانی ئەمەریکا و ولاتە پاشکۆکانی بەلارێدا ببرێ و واشیان لێبکا لە ماوەی دۆزی رێکەوتننامەی ئاشتی ئەڵمان و بەرلینی رۆژئاوا بیانبەستێتەوە"[51].

هەر دەربارەی رۆڵی یەکێتی سۆڤێت لە هەڵگیرسان و هاوکاری شۆڕشی

---

[50] نهێنیەکانی مەلا موستەفا بارزانی لە دۆکیومێنتەکانی دەزگای هەواڵگری یەکێتی سۆڤیەت- کوردستان پۆست، ٢٠١١/٨/٢٠.

-چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی RT لە ٢٠١٩/٦/٢٢ دا لەگەڵ رۆژهەلاتناسی روسی (الیکس فاسیلییف، دەربارەی کتێبەکەی (روسیا في الشرق الاوسط و لادنی)

[51] آکراد العراق تحت حکم عبد الکریم القاسم ١٩٥٨-١٩٦٣، رسالة مقدمة للحصول علی درجة الماجستیر- حامعة الزقازیق، کلیة الاداب، قسم التآریخ- سمر فضلا عبد الحمید محمد.

کـوردەوە، نـوێنەرانی هاوپەیمـانی نـاتۆ لەو بـارەیەوە لە کۆبـونەوەی رۆژی ١٩٦٢/٥/٢٩دا نوسـیویانە: "نـوێنەرانی ئەمەریکـا و بەریتانیـا، پێیـانوایە، کە بـارودۆخی سـەربازی لەو ناوچـانەی سـەرهەڵدانی کوردەکـانی تێدایە، چەنـد هەفـتەیەک دەبێـت، هـیچ گۆڕانکـاریەکی بەسـەردا نەهـاتوە. هەردو لا لە شـوێنەکانی خۆیـان مـاونەتەوە. وا هەسـت ناکرێـت لە ئاینـدەیەکی نزیکـدا، گـۆڕانێکی دیـار لە بـارودۆخەکەدا روبـدات، سـەرەرای ئەوەی کە فـڕۆکە جەنگیەکـانی عێـراق زۆر بە دژوارانە هێـرش دەکەنە سـەر سـەرهەڵدانە کوردەکان..ئەوەی جێی باسە کە یارمەتی و هاوکاری لەناو هێزە عەشـایرەکانی کـوردا زۆر لە زیـادبونە، وەک نـوێنەرانی بەریتانیـا، هۆڵەنـد و ئەمەریکـا گەیشتونەتە بۆچونێک کە کوردەکان چەکی سۆڤێتیان بەدەست نەگەیشتوە"[٥٢].

[٥٢] راپۆرتی نوێنەری ئەڵمانیای ئیتحادی لە هاوپەیمانی ناتۆ بۆ وەزارەتی دەرەوە. ئارشیفی نهێنی وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیا٢٠-٠٤-٢ Nr. ٠ ٦٢/٢٢٠٧/ - ١٦/٥/١٩٦٢

## ناکۆکی ئاشکرا لە نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسیدا

ناکۆکی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی لەسەرەتادا بە نهێنی مایەوە و ئەوانەی لە هەردولاوە نزیک نەبونایە، بە ئاسانی هەستیان پێ نەئەکرد، تا کودەتای ١٩٦٣/٢/٨ کە بەعسیەکان و ئەفسەرە نەتەوەییەکان دەسەلاتیان لە قاسم سەند.

حیزبی بەعس، پێش کودەتاکەی ٨ شوبات لە رێگەی تاهیر یەحیاوە پەیوەندی بە بارزانیەوە کرد و بەڵێنی چارەسەری کێشەی کوردیدا لە رێگای حوکمی لامەرکەزی و جێبەجێکردنی خواستە رۆشنبیرییەکانی کورددا، هەروەها بەعسیەکان خۆیان بە دۆستی رۆژئاوا و دژ بە یەکێتی سۆڤێت و کۆمۆنیستەکان نیشاندا، هەوڵیاندا لە پارتی نزیک ببنەوە و بە زارەکی بەڵێنیاندا کێشەی کورد چارەسەر بکەن، بە گوێرەی قسەی (جێمس کیجفیلد) بەرپرسی پێشووی هۆبەی سی ئای ئەی بۆ خۆر هەلاتی نزیک دەڵێ : "لە ١٩٦١ و ١٩٦٢ (سی ئای ئەی) مەیلی زیاتر بەلای بەعسدا رۆیشت، هەرچەندە بە شێوەیەکی کاراش پشتگیریان ئەکرد، بەلام لە روی سیاسی و کەلتوورییەوە ئێمە وامان بینی کە بەعس جێگەی سەرنجە، ئەمەریکا بە ئاسانی دەیتوانی خۆی لەگەڵدا بگونجێنێ و لە رووی سیاسیشەوە یارمەتی بدات"[٥٢].

ناکۆکیەکانی نێوان پارتی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ رژێمی نوێ لە کۆبونەوە جەماوەریە فراوانەکەی کۆیە کە لە ١٨ ئاداری ١٩٦٣ زیاتر ئاشکرا بو، چونکە بارزانی بۆ خۆی بەتەنها و بێ راوێژ لەگەڵ مەکتەبی سیاسی کۆبونەوەکەی ریکخستبو، ئەوەش بە مەبەستی کەمکردنەوەی هەیبەتی مەکتەبی سیاسی و

---

[٥٢] بریان رۆبەرت گیبسن، ئەرێ کورد بوونە بەردەباز؟ سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا، ل ١٢٥.

ویستی نیشانی بدات کە کێ دەسەڵاتدارە؟، مەسعود بارزانی لەو بارەیەوە دەڵێ: "بارزانی هەستی کرد کەوا کورد پێویستیان بە کۆنگرەیەکی بەربڵاوی نوێنەرانیانە، پێویستیان بە شتێکی گەورەترە لە ئەو خۆی و لە پارتیش، پێویستیان بە کۆمەڵەیەکی گشتییە، بە دەربڕینێکی ڕاست ڕای گشتی کوردان لەسەر ئاستی نەتەوەیی دەرببڕێ. ئەم بیرە زادەی خەیاڵی مەلا مستەفا خۆی بوو ئەو خاوەن و جێبەجێکاری بوو، ئەویش بو هەندێ لە نوێنەرەکانی دەستنیشان کرد و نوێنەری خۆی نارد بۆ هەمو لایەکی هەرێمی کوردستان.."[٥٤].

ئەمە سەرەتایەک بو کە بارزانی بەتەنها و بێ پرسی سەرکردایەتی پارتی، بڕیارێکی وا گرنگ بدات و هیچ پرسێ بە مەکتەبی سیاسی نەکات، ئەم هەنگاوە دەرگای ئەوەی کردەوە، بارزانی لەوە بەدواوە بیر لەوە بکاتەوە کە هەنگاوی لەوجۆرە بنێت و حیزب فەرامۆش بکات.

## ڕێکەوتنی بارزانی و حکومەت و جیابونەوەی مەکتەبی سیاسی

تەمەنی بەعسییەکان لە دەسەڵاتدا کورت بو، عەبدولسەلام عارف لە ١٩٦٣/١١/١٨ کودەتایەکی بەسەر بەعسیەکاندا کرد و دەرگای گفتوگۆی لەگەڵ بارزانیدا کردەوە، هەر دوای سێ هەفتە بەسەر کودەتاکەدا، حکومەتی عێراق لە ڕێگای بابە عەلی شێخ مەحمود، لە ١٩٦٣/١٢/٩ نامەیەک دەنێرێت بۆ بارزانی و تێیداهاتوە، کە ئەوان ئامادەن گفتوگۆ بکەن بۆ چارەسەری کێشەی کورد و بارزانییش لە ١٩٦٣/١٢/٢٦ وەڵامی ئەداتەوە کە ئەوانیش ئامادەی گفتوگۆ و چارەسەری ئاشتیانەن.

لە ١٩٦٤/٢/١٠ دا، ڕێکەوتنێک لە نێوان حکومەتی عێراق و بارزانیدا مۆر کرا، ئەو ڕێکەوتنە بەسەرەتای شەڕێکی ئاشکرا دائەنرێت لە نێوان بارزانی و

---

[٥٤] مەسعود بارزانی، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ل ١٠٨.

م.س، کە پاشماوەکەی تاکو ماوەیەکی زۆر درێژ مایەوە و هەزارەها رۆڵەی ئەم میلەتە بونە قوربانی ئەو ناکۆکییە کە رق و تۆڵەی شەخسی رۆڵی گرنگ و سەرەکی تێدا بینی، ئەتوانرا نەهێڵرێت ئەو ناکۆکیانە نەگاتە ئەو شەڕە خوێناوییە و لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا چارەی بکرێت..

ئیبراهیم ئەحمەد، لەو بارەیەوە دەڵێ: "من چوم بۆ سەنگەسەر بۆ لای مەلا مستەفا، دوای قسە و باس و هەواڵ پرسین، هاتینە سەر ئەوەی چۆن و بۆچی لەگەڵ حکومەتدا رێک کەوتوون، مەلا مستەفا وتی: "من وەکو سەرکردەی لەشکری کوردستان، وەکوو سەرۆکی پارتی، وەکوو سەرۆکی گەلی کورد، مافی ئەوەم هەیە بڕیار بدەم، شەڕ بوەستێ یان نەوەستێ، رێک بکەوم یان رێک نەکەوم"، وتم وەڵلا تۆ وەک سەرۆکی کورد و سەرلەشکریش قەیناکە بڕیار بدەی، بەڵام وەک سەرۆکی پارتی بۆت نییە بڕیار بدەی شەڕ بوەستێ یان نەوەستێ، وتی: من سەرۆکی پارتیم! وتم لە کاتێکدا ئێمە، ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی، ١٥ کەس رایەک دەردەبڕین، ٧ کەس لەگەڵ بێ و ٧ کەسی دیکە دژی بێ، ئەوا ئەو کاتە تۆ لەگەڵ کام لا بی، دەنگی ئەو لایە وەردەگیرێت، وتی مانای وایە من پارسەنگم. وتم نەخێر تۆ پارسەنگ نیت"[٥٥].

رێکەوتنی شوباتی ١٩٦٤، زۆر لاواز بو، لە ئاست چاوەروانی هاولاتیان و زۆری ئەندامانی پارتیدا نەبو، ئەم رێکەوتنە بە بلاوکراوەیەکی هاوبەش لە نێوان بارزانی و عەبدولسەلام عارفدا بلاونەکرایەوە، بەڵکو هەریەکەیان بەجیا بلاوکراوەیەکیان دەرکرد. لە خاڵە زۆر بێهێزەکان ئەوە بو، نە لە بەیانەکەی عارف و نە لە بەیانەکەی بارزانیدا وشەی "کوردستان یان گەلی کورد" نەهاتبو، لە جیاتی ئەوانە، وشەی "سەروی عێراق، برا کوردەکان" هاتبو، ئەمە سەرەڕای ناوەرۆکە سیاسییەکەی کە لەگەڵ خواست و ئاواتی پارتی و ئامانجەکانی شۆڕشدا یەکیان نەدەگرت، بە تایبەتیش ئەو کاتە دەسەلاتدارانی بەغدا لە هەمو کات بێهێزتر بون و کومەڵێک کێشە و گیروگرفتی ناوخۆیی و دەرەکی هەبو، لەبەرئەوە ئەگەر بارزانی

---

[٥٥] پێنج کاتژمێر، لەگەڵ برایم ئەحمەد دا. ل ٣٨.

سوربوایە لەسەر داخوازیەکانی، ئەیتوانی دەسکەوتی زۆر زیاتر بەدەست بهێنێت..

عیسا پژمار، نوێنەری ساواک لە کوردستان، لە بارەی هەڵوێستی بارزانی نوسیویێتی: "دوای قسەکانی، بە بارزانیم وت: سەرانی حیزبیش لەوە نارازین و ئاگربەس بە بەرژەوەندی نازانن، وتی: حیزب یانی من، سەرۆک یانی من، سەر و سەران یانی من، هۆز و سەرۆک، هۆز یانی من، بەهەر چەشنێک هەرکەس لە شەڕدایە لەژێر فەرمانی مندایە، سەرانی حیزب هەر غەڵەتێ ئەیانەوێ با بیکەن، لە پاشان وتی: سەلام و ڕێزی من بە شا و بەرپرسانی ئێران رابگەیەنە و لە لایەن منەوە بەڵێنیان بدەرێ، کە بێ بیروڕا و بەرژەوەندی ئەوان کارێک

ئەمە جگە لەوەی بلاوکراوەکەی عارف و بارزانی هیچ تینوێتی کوردیان نەشکاند، نامەکەی بارزانی و عارفیش کە لە ١٩٦٤/٢/١٠ دا لە ئێستگەی بەغدا خوێندرانەوە، هیچی تێدا نەبو بۆ چارەسەری کێشەی نەتەوەیی، هەردو نامەکە وەک کۆپی یەک وابون، بەڵکو لەوەش زیاتر لە نامەکەی بارزانیدا داوا لە هێزی پێشمەرگە دەکات کە شەڕ نەکەن و بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان و کارو کاسبی خۆیان بکەن "بڕیارمان دا کە تەقە بوەستێنین و داوا لە براکانم بکەم، کە بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان و خەریکی کاروکاسبی ئازاد و بەرێزی خۆیان بن"[٥٧].

هەروەها بارزانی لە نوسراوێکی تردا هەرەشە لە پێشمەرگە دەکات ئەگەر کێشە بۆ سوپای عێراق دروست بکەن "کە حکومەت ویستی بگەڕێتەوە ناوچەکانتان ئەبێ بۆی چۆڵ کەن، شەڕ هەڵگیرساندنەوە لە بەینی ئێوە و حکومەتدا ئەبێ بەهۆی هەڵگیرساندنی شەڕ لە بەینی من و ئێوەدا.."[٥٨].

بۆچونێکی تریش ئەوە بو، کە بارزانی زۆر مەبەستی بو، رێکەوتنێک لەگەڵ

---

[٥٦] عیسی پژمار، نەهێنیەکانی بەستنی پەیمانی ١٩٧٥ی ئەلجەزائیر، لە ئارشیفی تەواو نهێنی ساواک، وەرگێرانی: ناسر ئیبراهیمی، سوئێد ١٩٧، ل ٦٧.

[٥٧] بەڵگەنامەی پارتی دیموکراتی کوردستان، باڵی مەکتەبی سیاسی و باڵی بارزانی، بەرگی دووەم، شارەوانی سلێمانی، کۆکردنەوە و ئامادەکردنی شازین هێرش و نزار محەمەد، ل٢٣.

[٥٨] هەمان سەرچاوە، ل٤٥.

میری مۆر بکات و هەندێ دەسکەوت بەدەست بهێنێت و هەناسەیەک بدات، چونکە باری ئابوری ئەو کاتەی شۆڕش لەبار نەبو، لە هەمان کاتیشدا ئەیویست ئەو ڕێکەوتنە هەنگاوێک بێت بو سەرکەوتن بەسەر نەیارەکانی ناوخۆدا کە خۆی لە مەکتەبی سیاسی ئەبینیەوە، لەو بارەیەوە، مام جەلال دەڵێ: "مەلا مستەفا ئیمزای ئەو بەیاننامەیەی بە تەئسیری بابە عەلی و ئەسکەندەر کرد، گوایە ئەمریکاش پێی باشە و ڕەزامەندی شێخ ئەحمەدیشی لەسەر بو. لەبەرئەوە خۆشی زۆر ماند بوبو، بە ڕەئی من نیەتی ئەوەشی هەبو، کە حیزب تەسفیە بکات و سەرکردایەتی پارتی لەناو بەرێت، پێی وابو کە ئیتر گفتوگۆ بەسە و لەوە زیاتر ناکرێت و دەوڵەتە گەورەکانمان لەگەڵ نین"[59]. دۆستە بێگانەکانیش دودڵ بون لەوەی کە ئەم ڕێکەوتنە هیچ ئەنجامێکی هەبێت، لەوبارەیەوە، ڕۆژنامەنوسی ئەمریکی و دۆستی بارزانی و کورد، دانا ئادەمس شمدت لە کتێبی د. ئەدمسن، دەڵێ: "زۆر سەرسام بوم کە بارزانی دوای ٢٩ مانگ لە شەڕی بەردەوام و نەهامەتی زۆر، لەسەر ئەو ڕێکەوتنە ڕازی بوە، ئەی کوا مافە تایبەتەکانی کورد، کە جەلال تاڵەبانی لە ٢٤ نیسانی ١٩٦٣دا پێشکەشی بە حکومەت کرد؟.."[60].

هەر دەبارەی ئەوەی کە ڕێکەوتنەکەی بارزانی داخوازیەکانی کوردی پشتگوێ خستوە، ڕۆژنامەنوسی فەرەنسی، کریس کۆچێرا دەڵێ: "ئەم بانگەوازە (مەبەست بەیانەکەی بارزانیە) ئەگەر سەبارەت بە ئاماژە بۆ خوای موسڵمانان زۆر روون و ڕەوان و ئاشکرایە، بەڵام دەربارەی چارەنوسی کوردستان، زۆر ئاڵۆز و ناڕوون بوو، بارزانی هەر ئەوەندەی ڕاگەیاندبوو کە پاش (شەڕی براکوژی) دەوڵەتی عێراق هەنگاوی شایستە بۆ بوژانەوەی ژیان و سەقامگیری ئەمن و ئاسایش لە ناوچەکەدا دەنێ"[61].

---

[59] مام جەلال، دیداری تەمەن، بەرگی یەکەم، ل ٢٦٦.

[60] دیفید ادمسن، الحرب الكرديه وانشقاق ١٩٦٤، ل ٣٨.

[61] کریس کۆچێرا، کورد لەسەردەمی نۆزدە و بیستەم دا. ل ٣١٧.

## بڕوانەبونی بارزانی و عارف بە ڕێکەوتنەکەیان

نەک هەر مەکتەبی سیاسی، ڕەخنەیان لە ڕێکەوتنی بارزانی و حکومەت هەبو، حکومەتیش خۆی بڕوای بەو ڕیکەوتنە نەبو، بەڵکو بە ڕێکەوتنیشی نەدایە قەڵەم، ڕۆژنامەنوسی ئەمریکی لە چاوپێکەوتنێکدا لە گەڵ سەرۆک کۆمار، تەنها دو هەفتە دوای ڕێکەوتنەکە، لە پرسیارێکدا دەربارەی ناوەرۆکەکەی وتی: "لە ڕاستیدا هیچ ڕێکەوتنێک نیە لەگەڵ کوردا، تەنها گەڕانەوەیە بۆ ژیانی ئاسایی لە چوارچێوەی پەیوەندی برایەتیدا، دوایی زانیم کە وەستانی شەڕ لە نێوانیاندا لە ١٠ شوبات، لە ڕێگای ڕێکەوتنەوە نەبوە، بەڵکو تەنها ڕاگەیاندنی جیاواز بوە لە لایەن بارزانی و سەرۆک عارفەوە، هەروەها پرسیاری ئەوەم لێکرد، ئایە گفتوگۆی تر ئەبێت دەربارەی مافەکانی کورد، کە بخرێتە ناو دەستوری عێراقی کاتیەوە؟ سەرۆکیش بە تورەیەوە وتی: نەخێر، نە دانوستاندن دەبێت و نە دانیشتن و گفتوگۆ"[62].

دەربارەی هەڵویستی بارزانی لە ڕێکەوتنی شوبات، ئەویش هەروەک عارف بڕوای بە ڕێکەوتنەکە نەبوە، هەر لەگەڵ هەمان ڕۆژنامە نوسدا (ئادەمز شمیدت) دەڵێ: وەستانی شەڕ هیچ بەرهەمێکی نابێت، داماڵینی چەک لە هێزی چەکدار، بە هیچ شێوەیەک ڕوو نادات، ئەو ناتوانێت بڕوا بە سەرۆک عارف بکات یان ئەفسەرەکانی تر، ئەو جارێکی تر دەست ناکاتەوە بە شەڕ، ئامانجی ڕاستەقینەی ئەو لەم پرۆسەیە، ئەوەیە کە میلەتەکەی ماوەیەک بحەوێتەوە و دەسکەوتی سەربازی و مەدەنی دەست کەوێت و کەم وکوڕییەکانی پڕ بکەنەوە"[63].

پشتگیری ڕۆژئاوا بە گشتی و ئەمەریکا بۆ ڕژێمی نوێ، وای لە

---

[62] دانا ئادەمز شمدت، رحلة الى رجال الشجعان في كوردستان. ل ٤١٤.

[63] هەمان سەرچاوە، ل ٤٢٠.

دەسەڵاتدارانی بەغدا کرد، کە لە خۆیان بایی ببن و پشت بکەنە داوا ڕەواکانی شۆڕشی کورد، ئەمەریکا هەنگاوێکی لە سودی ڕژێمی نوێی بەغدا نا، کە بریتی بو: "یاداشتێکی دیکە لە ٢١ی حوزەیرانی ١٩٦٣ بۆ سەرۆک کەنەدی نێردار، ئاماژەی ئەوەی تێدا بوو، کە گروپەکە بڕیاری داوە پشتگیری ئابوری و سەربازی بۆ عێراق پتر بکا..پترکردنی فەندی پشتگیرییەکە لە ٨٠٠،٠٠٠ دۆلارەوە بۆ یەک ملیۆن دۆلار بەرزکرایەوە.."[٦٤].

ئەنجامی گفتوگۆکانی نێوان پارتی و ڕژێم بێ ئەنجام بو، هەر لەبەرئەوەش هەردو سەرۆکەکەش "بارزانی و عارف" خۆیان بە ئاشکرا باسیان کردوە، کە باوەڕیان بەو ڕێکەوتنە نیە و زۆربەی ئەندامانی پارتیش بەهەمان شێوە، ئیتر چۆن سەردەکەوێت؟.

ڕێکەوتنەکە بە گشتی خواستی کوردی نەهێنایە دی، بەڵام بارزانی توانی هەندێ دەسکەوتی دارایی دەست بکەوێت: "دوای ئەوەی کە بەڵگەنامە ڕەسمیەکانی حکومەت دەریان خست، کەبارزانی دوای ئەوە پارەی لە حکومەتی عێراق وەرگرتوە، مەکتەبی سیاسی ئەو پارە وەرگرتنەی بە ڕەشوە ئەدایە قەڵەم بەرامبەر بە وازهێنان لە مافی گەلی کورد، ئەمە لە کاتێکدا بارزانی ئەو پارە وەرگرتنەی بە مافێک لە مافەکانی گەلی کورد ئەدایە قەڵەم، وە بەشێکی زۆر کەمە لە بەرهەمەکانی کوردستانی عێراق و مافی هاوڵاتیان و بەرهەمە سروشتییەکان"[٦٥].

شەکیب عەقراوی کادیری پارتی و لێپرسراوێکی دیاری دەزگای پاراستن ، نوسیویێتی: "حکومەتی عێراقی بەهۆی پارێزگاری سلێمانیەوە، عەمید عەبدولرەزاق مەحمود، یارمەتی سەرکردایەتی کوردیدا بۆ مانگەکانی شوبات و مارت و نیسانی ١٩٦٤، کە زیاتر بو لە روبعە ملیونێک دیناری عێراقی.."[٦٦].

---

[٦٤] بریان ڕۆبەرت گیبسن ئەرێ کورد بوونە بەردەباز، ل ١٧٥.

[٦٥] دیفید ئەدمسن، الحرب الكردية و انشقاق ١٩٦٤ل ٥٥.

[٦٦] شكيب عقراوی، سنوات المحنة في كردستان..١٩٥٨-١٩٨٠، ل ١٦٠.

دوای ڕێکەوتنی بارزانی و حکومەت، مەکتەبی سیاسی هەوڵێکی تریدا بۆ ڕێکەوتن لە نێوانیاندا، لە نیسانی هەمان ساڵدا، عەلی عەبدوڵا و سەید عەزیزی شەمزینی، کمال محێدین سەردانی بارزانیان کرد بۆ ئەوەی هەوڵێک بدەن ئاشت ببنەوە و گۆڕانێک لە ڕێکەوتنەکەدا بکەن، لەم بارەیەوە مام جەلال دەڵێ "کە وەفدەکە چون بۆ لای مەلا مستەفا، نەک پێک نەهاتن و ڕێکنەکەوتن، بەڵکو مەلا مستەفا تورە بو، عەلی عەبدوڵا و کەمال محێدینی خستە زیندانەوە، سەید عەزیز لەبەرئەوی ماڵی نەهری بو تەوقیفی نەکرد و سواری جێبێکی کرد و ناردیەوە بۆ حاجی ئۆمەران و تەسلیمی ئێرانی کرد، کە کوری سەید عەبدوڵا فەندی لەلای ورمێ دادەنیشێ و گوتی: ئەوە کوڕەکەت بالای خۆت بێت، بەو شێوەیە سەید عەزیز لە عێراق دەرکرا"[٦٧].

جێی سەرسورمان نەبو، کە بارزانی ئەو هەڵسوکەوتەی لەگەڵ ئەو دو ئەندامەی مەکتەبی سیاسی کرد، چونکە پێش چەند رۆژێک ئەوان لە کۆنفرانسەکەی خۆیاندا لە ماوەت، لە ١٩٦٤/٤/١٩ بڵاوکراوەیەکی ١٨ لاپەڕییان دەرکرد لە ژێر ناوی (ئایە ڕێکەوتنی عارف – بارزانی پەیمانی ئاشتیە، یان خۆبەدەستدانە - إتفاقیة المشیر – بارزانی صلح أم إستسلام؟) لەو رونکردنەوەیەدا نامەکانی عەبدولسەلام و بارزانینان بڵاوکردبۆوە و هەمو ئەو تێبینیانەی لەسەر ڕێکەوتنەکە هەیانبو و نامەکانی نێوان دەزگاکانی میری و بروسکەکانی بارزانی بۆ دەزگاکانی هێزی پێشمەرگە کە فەرمانیان پێدەکات کە ناوەرۆکی ڕێکەوتنامەکە جێبەجێ بکەن، هەر لەوێدا بارزانیان لەسەرۆکی حیزب دورخستبۆوە و کۆمەڵێک وشە و رستەی نەگونجاویان ئاراستەی بارزانی کردبو، لەبەرئەوە ئەو رەدفیعلەی بارزانی، چاوەروانکراو بو، چونکە بارزانی هەر لەسەرەتادا پەیوەندی لەگەڵ مەکتەبی سیاسی باش نەبو، کە هێشتا بە ئاشکرا باسی ئەویان نەدەکرد.

بارزانی زۆر بەلایەوە مەبەست بو، کە ئاگربەست لە نێوان هێزی

---

[٦٧] مام جەلال، دیداری تەمەن، بەرگی یەکەم، ل ٣٠٢.

پێشمەرگە و حکومەتدا بگاتە ئەنجامێک یان هەرهیچ نەبێت شەڕ نەبێتەوە، بۆ ئەو مەبەستە، هەندێ جار لە نامەکاندا کە بۆ کاربەدەستانی حکومەتی ئەنارد رەنگی ئەدایەوە، بۆ نمونە چەند جارێک نامەی بۆ کاربەدەستانێکی ئاسایی نوسیوە، کە ئەبو ئەو وەک سەرۆکی حیزبێک نەینوسێت، وەک موتەسەریفی سلێمانی، ئامر فەوجێک یان عەقیدێک، هەروەها لە چەند نامەیەکدا لە جیاتی ناوی پێشمەرگە، ناوی "چەکدارانی کورد" لە جیاتی شۆڕشی کوردستان وشەی "جولانەوی سەروو"ی بەکارهێناوە، هەروەها داخوازییەکانیشی ئەوەندە بچوک کردۆتەوە، کە لە نامەیەکدا بۆ موتەسەریفی سلێمانی لە ١٩٦٤/٥/٦دا، داوای بەردانی تاکە کەسێک دەکات کە بە "یەکێک لە خۆمان" ناوی دەبات بەناوی لەتیفی حەمەرەش"[٦٨].

هۆیەکی گرنگیش لە هۆکانی کە پاڵی ناوە بە بارزانیەوە، ئەو رێکەوتنە قبوڵ بکات، دەگەڕێتەوە بۆ زیادبونی دەسەلات و ناوبانگی بارزانی، "هەندێ لە ئەندامانی (م.س). پێیانوابو، ئەو کابرایە لە منداڵدانی شورشەوە دروست بوە، لە ناوچەیەکی روت و شاخاوی و کەم سەوزایی گەشەی کردوە، شورش تاقە رێگا بوە بۆ بژێوی ژیان، لەبەرئەوە یەکەم خاڵ دوای وەستانی شەڕ لە ١٩٦٤دا، دەسکەوتی مالی بوە لە حکومەت، ئەوانیش مانگانە ٣٠ هەزاد دیناریان ئەدایە، سەرەڕای ئەوەش، شەڕکەرە بارزانییەکان، ئەوانیش سودمەند بون لەو رێکەوتنە، چونکە ١٥٠٠ کەسیان مانگانەی خۆیان وەردەگرت"[٦٩].

جگە لەوەی بارزانی هەوڵی ئەدا گفتوگۆی نێوان خۆی و حکومەت سەرکەوێت، بەلام نەهات ئەو گفتوگۆ و رێکەوتنەکانی نێوانیان تۆمار بکات، وەک هەمو رێکەوتنێک، کە لە لایەن دو هێزی ناکۆکەوە دەکرێت و لە کۆتاییدا ئەگەنە ئەنجامێک، "گفتوگۆکان لە دانیشتنی عەشایری دەچون، پر بو لە

[٦٨] وثائق الحركة القومية الكوردية التحررية، ملاحضات تاريخية و دراسات آولية، الدكتور عبدالفتاح علي يحى البوتاني، ص ٢٩٩.

[٦٩] ديفيد ادامسن، الحرب الكردية و انشقاق ١٩٦٤. ل ٥٨.

موجامەلات، قسەی خۆش و پیاهەڵدانی یەکتری و گێڕانەوەی نوکتە، چاو قاوە دانیشتنەکانی گەرم دەکرد و دوایی کاتی نانخواردن ئەهات و ئەچون بۆ نان خواردن..هیچ کەسێکیش گرنگ نەبو بەلایەوە کە وردەکاری کۆبونەوەکە تۆمار بکات، نوێنەرانی حکومەتیش ئەم شێوە کۆبونەوانەیان ئەویست و خۆیان لە نوسینەوەی مەحزەری دانیشتنەکان ئەپاراست، بۆئەوەی ئەم گفتوگۆیانە نەچێتە ناو بەڵگەنامەکانی عێراقەوە، بۆ ئەوەی رۆژێک بەکار نەیەت، بەڵکو کۆبونەوەکان و ئەنجامەکانیان بە شاراوەیی و تەماویی بمێنێتەوە"[٧٠].

---

[٧٠] .جرجيس فتح الله، زيارة للماضى القريب، ل ٥٠.

## کۆنفرانسی ماوەت وەک سەرەتای دابەشبونی پارتی

مەکتەبی سیاسی بڕیاریدا لە ١٩٦٤/٤/٤ کۆنفرانسێک لە ماوەت ببەستێ و هەڵوێستی خۆی دەربارەی ڕێکەوتنی نێوان بارزانی و بەغدا رونبکاتەوە. بێگومان زۆربەی ئەوانەی کە بانگ کرابون، لەوانە بون کە پشتگیری (م.س) یان دەرکرد، کە ٦٧ ئەندام بون و نوێنەرانی هەر ٥ لقی پارتی بون، ئەمە جگە لە ئەندامانی سەرکردایەتی، جگە لە مام جەلال، عومەر دەبابە، ساڵح یوسفی، شەمسەدین موفتی، عەبدولحسێن فەیلی، هاشم عەقراوی و ناهیدەی شێخ سەلام بەهۆی جیاوازەوە ئامادەی کۆنفرانسەکە نەبون.

زۆربەی ئەندامانی کۆنفرانسەکە، پشتگیری ڕاپۆرتی سکرتێری پارتی (ئیبراهیم ئەحمەد)یان کرد، جگە لە نوێنەری بەغدا عەلی سنجاری نەبێت، کە رەخنەی لەوە هەبو، کە تائێستا ئاگاداری ئەو ناکۆکیانە نەبوە، کە لە نێوان سەرۆک و سکرتێری حیزب هەبوە، رەنگە دوری بەغداش هۆیەک بوبێت. هەروەها رەخنەی لە شێوەی بەستنی کۆنفرانسەکە گرت، کە بە پێی پەیرەوی ناوخۆی حیزب، پێویستە سەرۆکی حیزب بانگهێشتی ئەندامان بکات و پێویست بو ئەویش ئامادە بێت، تا راوبۆچونی خۆی دەربارەی کێشەکان دەرببڕێت[٧١].

بەستنی کۆنفرانسی ماوەت، ئیشارەتێک و زەنگێکی ئاشکرا و دیار بو، بەسەرەتای لەتبونی پارتی و هەنگاوێک بو بۆ سەرەتای ناکۆکیەکی توندی درێژی خوێناوی کوردی – کوردی، سەرەتای شەڕێکی ناوخۆی درێژەخایان کە برینەکانی تا داهاتویەکی درێژ سارێژ نابن و بە ئاسانی کاریگەریەکانی ناسرێنەوە.

هەرچەندە بارزانی پێش کۆنفرانسەکە، کەوتبوە خۆ ئامادەکردن و پەیوەندیکردن بەو دۆست و هەڤاڵانەی کە لە خۆیەوە نزیک بون و نامەی زۆری بو چەندەها کەس و لایەن نوسیبو، بڕیاری دابو کە بە جدی هەوڵ

---

[٧١] دیفید ئەدمسن، الحرب الكردية و انشقاق ١٩٦٤، ل٤٢.

بدات پارتی بۆ خۆی رابکێشێت و وەک سەرۆکێکی راستەقینە کاری بۆ بکات.

بارزانی چاوەڕێی ئەو رۆژە بو لە مەکتەبی سیاسی رزگاری بێت و خۆی سەرکردایەتیەک و مەکتەبێکی سیاسی دابنێت، کە دەستەمۆی خۆی بن و ئەو هێزەیان نەبێت کە رای جیاوازیان هەبێت، یان ترسی لادانیان لێبکات. ئەو لە تاقیکردنەوەی کارکردنیدا لەگەڵ مەکتەبی سیاسی بەسەرۆکایەتی ئیبراهیم ئەحمەد زۆر شت فێربوبو، کە بە هیچ شێوەیەک نەی ئەویست ئەو روداوانە جارێکی تر دوبارە ببنەوە..Europa Archiv, Frankfurt/M

(٢٥,٦.١٩٦٥ ) S. ٤٦٥-٤٧٥- Arnold Hottinger.

لە نامەیەکدا پێش کۆنگرە، کە بارزانی بۆ ئامرهێزی رەواندزی نوسیبو و کەوتبوە دەست مەکتەبی سیاسی، "داوایان لێدەکات نوێنەریان بنێرن بۆ کۆنگرە، بەڵام دۆست و ئەوانە نەبن کە سەر بە مەکتەبی سیاسین یان لە ژێر کاریگەری سکرتێری پارتی، یان نوێنەرانی دوژمنانی گەلی کورد، ئێمە رزگارمان دەبێت لێیان"[٧٢].

یەکێک لەو خاڵانەی کە پەیوەندیەکەی نێوان بارزانی و (م.س) زیاتر ئاڵۆزکرد، دەرکردنی بەیانامەی (صلح ام استسلام، رێکەوتن یان خۆ بەدەستەوەدان) بو، کە بە ناوی (م.س) دەرکرا، دەربارەی ئەو بەیانە حیلمی عەلی شەریف، ئەندامی مەکتەبی سیاسی دەنوسێ: "سکرتێری پارتی ئەو کاتە، بەرێز ئیبراهیم ئەحمەد، روونکردنەوە و پەرچدانەوەیەکی بە زبانی عەرەبی لە ژێر سەرناوی (صلح ام استسلام) دا بلاوکردەوە، کە دەقەکەی بووە بە پاشبەندی ئەم باسە، راستیەکەی سەرەرای راست و دروستی ناوەرۆکەکەی، نەئەبو سکرتێری پارتی، ئەو هەڵەیەی جەنابی مەلا مستەفا دوبارە بکاتەوە، بەڵکو پێویست بوو هەمو کۆمیتەی ناوەندی بۆ لێکۆڵینەوە و نرخاندنی ئەم هەنگاوە و هەڵوێستی مەلا مستافا کۆبیکردایەوە و ئۆبالی هەر کارو کردەوەیەک، کە بۆ پەرچدانەوەی ئەم کارە ئەکرا، بخرایە ئەستۆی کۆمیتەی ناوەندی"[٧٣].

---

[٧٢] دیفید ئەدمسن، الحرب الكردية و انشقاق ١٩٦٤ ٥٤.

[٧٣] حیلمی عەلی شەریف، بەراوردێک لە نێوان ١٩٦٦ و ١٩٩٦، ل ١٧.

## کۆنگرەی پارتی لە قەڵادزێ بە سەرۆکایەتی بارزانی

کۆنفرانسی ماوەتی مەکتەبی سیاسی، دەرگای گرتنی کۆنگرەی پارتی بە سەرۆکایەتی بارزانی کردەوە و کۆنگرەکەیان ناونا کۆنگرەی شەشەم، کە لە ١ی تەموزی ١٩٦٤دا لە قەڵادزێ بەسترا و نزیکی شەش سەد نوێنەر ئامادە بون، بێ ئەوەی زۆربەی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی بەشداربن تێدا.

کۆنگرە بڕیاری دەرکردنی هەمو ئەندامانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسیدا، جگە لە ساڵح یوسفی و هاشم عەقراوی. بارزانی سەرکردایەتیەک و مەکتەبێکی سیاسی نوێی دانا، کە گوێڕایەڵی خۆیبون، زۆر لەوانە، هیچ کاتێ خەویان بەو پۆستانەوە نەدەبینی کە وەریان گرتبو، لەبەرئەوە ناچار بون وەک فەرمانبەری بارزانی کار بکەن، جەرجیس فەتحوڵا دەنوسێ "ئەو کەسانە ئینسجامیان لە نێواندا نەبو، چونکە لە ئەنجامی هەڵبژاردنێکی دیموکراتیانە نەهاتبونە پێشەوە، چونکە سەرۆکی پارتی پێویستی پێیان بو کە لەو شوێنەبن، بۆ نمونە سکرتێری نوێی پارتی، تازە بە نەهێنی لە بەغداوە هاتبو، لەپڕ زانی ئەندامی سەرکردایەتی و سکرتێری پارتیە، بێ ئەوەی لەناو شاخ و بەشداری شەڕی کردبێت، ئەندامانی تری سەرکردایەتی هەریەکە لە ناوچەی خۆی کەوتە کاری حیزبی و ئیداری. کۆبونەوەی دەوری مەکتەبی سیاسی، باسی بڕیاری گرنگی تێدا نەئەکرا، بەوردی باسی کاروباری پارت و چالاکیەکانیشی تێدا نەئەکرا..لەبەر بێهێزی ئەو سەرکردایەتیە و دوای کێشەی ١٩٦٤، پارتی سومعە و قورسایی خۆی لەدەستدا، بە تایبەتیش لای هێزی پێشمەرگە، سەرۆکی پارتی و لێپرسراوی یەکەمی هێزی پێشمەرگە هانی ئەندامانی پارتی نەئەدا بچنە ناو هێزی پێشمەرگەوە، لە ترسی دوبارەکردنەوەی ناکۆکیەکانی جاران لە نێوان خۆیی

و سەرکردایەتیە مەدەنیەکەی، پارتیش خۆی هیچ هەوڵێکی نەدا بۆ چونە ناو هێزی پێشمەرگەوە نمونەی ئازایەتی و قوربانی بنوێنن، زیاتر ئەندامانی لە پشتەوەی بەرەکان خەریکی کاری حیزبی و دەرکردنی بڕیار بون، کە زۆربەی جێبەجێ نەئەکرا"[74].

هەر دەربارەی هەڵبژاردنی مەکتەبێکی سیاسی نوێ، کە سەرەرای ئەوەی زۆریان ئەو پوستەیان بە بەر زۆر گەورە بو، بەڵام زۆر گرنگ بو، کە گوێرایەڵی بارزانی بن: "ئەو کەسانەی کە پۆستی باڵایان دەویست لە حیزبدا، لە روانگەی ئەوەوە هەڵدەبژێران، چەند دڵسۆزی بارزانین، نەک لەسەر بناغەی بۆچونی سیاسی و قورسایی ئایدۆلۆجیان"[75].

کۆتایی کۆنگرەی شەشەم، بەسەرەتای شەڕی ناوخۆ دائەنرێت، سکرتێری نوێی حیزب باسی سەرەتای ئەو شەڕە دەکات و دەنوسێ "دوای کۆنگرە، سەرکردایەتی نوێ داوای کەلوپەل و چەکەکانی پارتی لێکردن، بەڵام ئەوان ئامادە نەبون بیدەنەوە، و بڕیارياندا بەربەرکانی چەکداری لە ماوەت بکەن، لەبەرئەوە پارتی بڕیارِیدا (تەمێ)یان بکات، بۆیە هێزی پێشمەرگە لە ماوەت هێرشی کردە سەریان، ناچار کران لەگەڵ چەند سەد کەسێکدا هەڵبێن بۆ ناو خاکی ئێران"[76].

سکرتێری نوێی پارتی (بارزانی)، تا خۆتەسلیمکردنەوەی بە بەغدا لە ١٩٧٥دا، بە عەرەبی ئەدوا و ئەی نوسی و فێری کوردی نوسین نەبوبو، تا دو مانگ پێش گرتنی کۆنگرەکە و هەڵبژاردنی وەک سکرتێر، هەڵوێستی زۆر خراب بو دەربارەی بارزانی، لە نامەیەکدا کە لە ١١ی مایسی ١٩٦٤دا بە عەرەبی نوسیویەتی، واتا چەند هەفتەیەک پێش کۆنگرەکە، ئاراستەی شەمسەدین موفتی کردوە دەڵێ "بارزانی و هەمو ئەو ساکار و دواکەوتوە

---

[74] جرجيس فتح الله . لماذا تبقى الحقائق مكتومة، ل ٩.

[75] آوفرا بينغيو، كرد العراق، بناء دولة داخل دولة،دار ئاراس، ساقى ٢٠١٤، ص ٤٨.

[76] حبيب محمد كريم، تاريخ الحزب الديمقاطى الكوردستانى، العراق، فى محطات رئيسيه، ١٩٤٦– ١٩٩٣، ص ٩٢.

و ئینتیهازیانە لە لایەکن و پارتی و کەسە رۆشنبیرەکانی لە لایەکی ترن، ئەو بەو عەقڵیەتە تاکەکەسیە، عەشایریە دەرەبەگیە، لەسەر هەندێ کاروباری ناڕێک لەگەڵ حکومەت رێک کەوتوە، هێزەکانی هێرش دەکەنە سەر بارەگا و لقەکانی پارتی و ئەندامە ناسراوەکان دەگرن و کادێرەکان لە چەکەکانیان دائەماڵن و لە هەندێ شوێن لیژنەی ناوچە لەسەر شێوەی (داود صائغ)دا ئەنێن، لەسەر بەرنامەیەک کە پارتی کوێرانە شوێنی بکەوێت و ببێت بە ئامرازێک بە دەستیەوە و چۆن بیەوێت ئاوا بەکاری بهێنێت"[٧٧].

هەروەها دەبارەی پرۆسەی هەڵبژاردنی سکرتێری نوێی پارتی (بارزانی) جەرجیس فەتحولا دەنوسێ: "حەبیب لەسەر داوای بارزانی لە بەغداوە گەرایەوە کوردستان، عەلی سنجاری ئەڵێ لە سەنگەسەر یەکترمان بینی و لێی پرسیم: "ئەمە چیە؟ راستە کۆنگرەتان بەستوە و لیژنەی ناوەندیتان هەڵبژاردوە و منیشی تێدام؟ ..دوای ئەوەی ناکۆکی بۆ سکرتێری مەکتەبی سیاسی لە نێوان حەبیب و هاشم عەقراویدا دروست بو، ئێمە (جەرجیس فەتحولا، د. مەحمود، ئیسماعیل عارف، د. فواد جەلال) پشتگیری حەبیبمان دەکرد بۆ سکرتێر، ئەو وتی: من ئەو پوستەم ناوێت و بۆ من بەسە بوم بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی، بەڵام سکرتێری حیزب بۆ من گونجاو نیە، کارێکی حیزبی ترم بەرەورو بکەنەوە، من لە بەغدا فەرمانبەرم و ئەمەوێت لەوێ بمێنمەوە و لەوێش کاری حیزبی خۆم بکەم"[٧٨].

---

[٧٧] نەوشیروان مستەفا، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، ل ٨٢.

[٧٨] جرجيس فتح الله. زيارة للماضي القريب، ص ١٢٦.

# یەکەم شەڕی ناوخۆی پارتی

هێرشکردنە سەر بارەگاکانی مەکتەبی سیاسی لە ماوەت، دەستپێکردنی شەڕی کورد – کورد بو، یەکەمجار بو، لە دوای مێژویەکی ناکۆکی سیاسی درێژ، کێشە سیاسییەکان بە چەک چارەسەر بکرێن، بێگومان ئەندامانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی نوێ رۆڵیان هەبو لە زیاتر گرژکردنی پەیوەندییەکاندا، چونکە لە بارودۆخێکی ئاساییدا، ئەوان بە هیچ شێوەیەک ئەو پلە حزبییەیان بە خۆیانەوە نە ئەبینی، لەبەرئەوە هەمو هەوڵێکیان داوە کە بارودۆخەکە و پەیوەندیەکەی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی ئاڵۆزتر بکەن، بۆ ئەوەی ئەوان ئەو پۆستە نوێیانە لەدەست نەدەن.

کریس کۆچێرا، لەو بارەیەوە نوسیویێتی: "لە ناوەڕاستی تەموزی ١٩٦٤ هێزی سەر بە جەنەراڵ بارزانی، بە سەرکردایەتی عوبەیدوڵای کوڕی (لە ڕاستیدا لوقمان) بو، چونە ناوچەیەکەوە کە تا ئەو کاتە لە ژێر دەسەڵاتی حیزبدا بو، هێرشیان کردە سەر بارەگای ماوەت. یەکەمین شەڕ لە رۆژی ٧/١٧ روویدا، کە کوژراوێک و چەند بریندارێکی لێکەوتەوە"[٧٩].

ئاشکرایە کە بارزانی هەمو هەوڵێکی خۆی خستبوە گەڕ کە لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی رزگاری بێت و بتوانێت سەرۆکێکی دەستکراوەی حیزب و شۆڕش بێت، لە دوای کۆنگرەکەوە سەرکردایەتی بو بە دەزگایەکی کارتۆنی بێ گیان، ئەو ئەیزانی هەتا ئەو کاتەی کە مەکتەبی سیاسی مابن لەناو پارتیدا، ئەو ناتوانێت ئەوەی دەیەوێت بە ئازادانە بیکات، لەبەرئەوە زۆربەی ئەوانەی ئاگاداری بارودۆخی پارتی و شۆڕش بون، ئەیانزانی کە پەیوەندی بارزانی و مەکتەبی سیاسی کاتیە و رۆژێ دێت کۆتایی دێت، بەڵام هەمو کەس بیری بۆ

---

[٧٩] کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەم دا. ل ٣٢٤.

ئەوە نەئەچو بە چەک کۆتایی بێت.

لەو بارەیەوە مام جەلال، وەک فاکتەرێکی دیار و کاریگەری ناو پارتی و شۆڕش، جگە لە رەخنە و تێبینیەکانی لەسەر هەڵسوکەوتی بارزانی و بەکارهێنانی چەک بۆ چارەسەرکردنی کێشەی سیاسی، باس لە تێبینیەکانی خۆی دەکات دەربارەی مەکتەبی سیاسی و دەڵێ: "ئەو کاتە مەکتەبی سیاسی هێزی خۆی زۆر بە گەورە و بەهێز تەقدیر دەکرد، واتا زیاد لە پێویست تەقدیری هێزی خۆی ئەکرد، وەک پێویست تەقدیری هێز و جوڵانەوەی مەلا مستەفای نەدەکرد! وای ئەزانی مەلا مستەفا زاتی ئەوە ناکات شەڕ بکات و شەڕی براکوژی بنێتەوە و پەلاماری حیزب بدات و لە مەکتەبی سیاسی بدات و هێز بەکاربهێنێت لە چارەسەری ناکۆکیەکاندا"[80].

دەربارەی هەڵەکانی مەکتەبی سیاسی، نەوشیروان مستەفا نوسیویێتی: "مەکتەبی سیاسی لەگەڵ هێزەکانی خۆشیدا رەفتاری باش نەبو، بە پێچەوانەی مەلا مستەفاوە، کە هەمیشە لە گەڕاندا بو بە ناو خەڵک و پێشمەرگەدا، ئەوان لە ئەشکەوتی مالومە و دواتر لە عیساوێ دایان کوتابو، فەرمانیان بۆ پێشمەرگە دەرئەکرد، بێ ئەوەی تێکەلاویان ببن و لە گیروگرفت و سکالا و گلەییەکانیان تێبگەن و هەوڵی چارەسەریان بدەن. وەکو پێویست رێزی فەرماندەکانیان نەئەگرت"[81].

دەربارەی هەڵوێستی بنەماڵەی بارزانی بەرامبەر بە مەکتەبی سیاسی، مەسعود بارزانی نوسیویێتی: "من ئێستاش لەگەڵ خۆمدا لە خۆم دەپرسم: دەبێ ئیبراهیم ئەحمەدی رۆشنبیر و ئەدیب و سیاسی دنیادیدە تا چ رادەیەک لای وا بوبێ دەمگۆیەکی سادە و ساویلکانەی وەک ئەمەی ئەو دروستیکرد، لەناو تێکڕای کۆڕ و کۆمەڵە میللییەکانی کوردەواریدا باو پەیدا دەکا و چەند باوەڕی پێدەکرێ و، چەندی لەباردا دەبێ پایە و پلەی بارزانی

[80] مام جەلال، بەرگی یەکەم- دیداری تەمەن، ل ٢٩٧.

[81] نەوشیروان مستەفا، پەنجەکان یەکتر ئاشکێنن، ل ٧٩.

لەق بکا، یان قەدر و حورمەتی لە دڵی گەلی کورددا لاواز و کەم بکاتەوە..[82].

هەر دەربارەی ئەو جیابونەوەی نێوان پارتی لە روانگەی کۆمەڵناسییەوەی رۆبیرت میشێل، وەک ئەوەی باسی ناکۆکی نێوان پارتی کردبێت، نوسیویەتی، "هەندێجار لە ئەنجامی بەیەکگەیشتنی دو گروپی لێک دژ لەناو پارتێکی سیاسی، کە لایەکیان بەهۆی ئەو ناوبانگەی کە لە دەرەوەی ئەو پارتەوە بەدەستی هێناوە، لایەکەی تریش ئەو سەرکردانەن بە هەوڵی خۆیان و لە ئەنجامی کاری حیزبییەوە بەدەستیان هێناوە، دوای ماوەیەک ئەم دو گروپە بەرەوروی یەک دەبنەوە، ئەو بەریەککەوتنەش دەبێتە سەرپۆشێک بۆ ئەو ململانێ هەمیشەییەی کە بۆ دەستهێنانی سەرکەوتنی زیاتر لە نێوان ئەم گروپانە روئەدات"[83].

## چونی مەکتەبی سیاسی (م.س) بۆ ئێران

کۆتایی کۆنگرەی قەڵادزێ، واتای سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی ناوخۆ بو، هەر دوای کۆنگرە، بارزانی هێزێکی گەورەی بەسەرۆکایەتی لوقمانی کوری کۆکردەوە و چوە سەر بارەگای مەکتەبی سیاسی لە ماوەت، شەڕێکی کورت رویدا و مەکتەبی سیاسی بەرگری نەکرد و ناچاربو، بچێتە دیوی ئێران، لەم بارەیەوە مام جەلال دەڵێ: "کە پەلاماری مەکتەبی سیاسیاندا، هیچ رێگایەکمان نەبو، یان ئەبو شەڕ بکەین و شەڕێکی ئیبادە و یەکتر کوشتن، یان ئەبو بکشێینەوە بۆ ئەودیوی ئێران بۆ دیوی ئالان، پێی دەڵێن ئالانی عێراق و ئالانی ئێران، روبارێکی بچکۆلە لە نێوانیاندا هەیە، زیاتر لە زستاندا ئەبێتە روبار و هاوینان ئاوێکی کەمی پێدادێت. ئەوەبو لەمبەری روبارەکەوە چوینە ئەوبەری، واتا جیاوازیەکە ئەوەبو لە گوندی ئەمبەرەوە چوینە

[82] مەسعود بارزانی، بەرگی سێیەم بەشی یەکەم، ل ١٧٣.

[83] کاوە تەیب جەلال، کەرتبوون لە نێو پارتە سیاسییەکان لە باشوری کوردستان ١٩٦٧-١٩٨٨، دەزگای ئایدیا، لە کتێبی کۆمەڵناسی حیزبە سیاسییەکان، ٢٠١٧، ل ٢٠.

گوندەکەی ئەوبەر"[84].

هەروەها یەکەم شەڕی ناوخۆی کورد لە شورشی نوێدا لە ١٣ناوەراستی ١٩٦٤ رویدا و دورۆژی خایاند، (م.س). ئەوەی بۆیان نەبرا بۆ ئێران، لەناویان بردن و سوتانیان.

یەکێک لەو کەسایەتیانەی کە لە پرۆسەکەدا بەشدار بو، حیلمی عەلی شەریف بو، بەم جۆرە باسی دەکات: "مەکتەبی سیاسی و هێزە چەکدارەکەی بەرگەی تەوژمی هێزی بارزانی و لەشکری کۆکراوە هێرش بەرە پشت بەستوەکەی بە یارمەتی و هێز و پشتیوانی حکومەت نەگرت، لەبەرئەوە بەناچاری خۆیان کرد بە دیوی ئەو دیودا، تەنانەت منداڵە وردەکان و هەرزەکارانی سلێمانی بە شەقام و کۆڵانەکانی شاری سلێمانیدا ئەگەڕان و بەدەم گۆرانیەوە ئەیانووت (لە ترسان و لە برسان، بارزانی بوو بە فرسان)"[85].

چونی مەکتەبی سیاسی و نزیکی چوارسەد پێشمەرگەیەکی سەر بەوان بۆ ئێران، سەرەتای ئاشکرای لەتبونی پارتی و هێزی پێشمەرگە بو، هەر بە گەیشتنی ئەوان بۆ ناو خاکی ئێران، دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتە زۆر بە نابەدڵی پێشەوازیان لێکردن و لەسەرەتادا ٤٨ سەعاتیان ماوە دابونێ و داوایان لێکردبون بگەڕێنەوە ناو خاکی عێراق. دوای ماوەیەک و جێگۆرکێ زۆر، لە ئەنجامدا پێشمەرگەکان لە هەمەدان و زۆربەی لێپرسراوەکان لە تاران جێگیر بون.

عەیسا پژمار، نوێنەری ساواکی ئێران لە کوردستان، لەو بارەیەوە نوسیویێتی: "شا فەرمانی داوە، بۆ ماوەیەکی کورت چەکەکانیان بدەن بە سوپای ئێران، لەسەردەشتەوە برۆنە هەمەدان و لەوێ دامەزرێن. دەستوری پێویست بۆ ساواکی هەمەدان درا، پێیان رابگەیەنن: ئەگەر سەرکردەکانی حیزب و پێشمەرگەکانیان چەک نەکرێن، دەوڵەتی ئێران ناتوانێ بەناوی

---

[84] مام جەلال، دیداری تەمەن، بەرگی یەکەم، ل ٢٩٧.

[85] حیلمی عەلی شەریف، بەراوردێک لە نێوان ١٩٦٦ و ١٩٩٦، ل ١٩.

پەنابەر وەریان بگرێ، ئەبێ لە سنوری ئێران وەدەرکەون، دوای ئەنجامدانی ئەم شـتانە سەرلەشـکر فـروغ نیـا فەرمانـدەی هێـزی کرمانشـا کە لە کوردستانی عێراق بوو، چوە دیداری مەلا مستەفا تا چاکتر لە مەسـەلەکە تێبگات و لە بـارزانی بپرسـێ کە ئەو دژایەتیە لە کوێوە سـەرچاوە دەگرێ، هەروەها شای ئێران رای گەیاندوە ئەگەر دەیانەوێت هێزی باکور کز بکەن و کەند و کۆسپ بۆ ئێمە و خۆیان بەدی بهێنن، ناتوانین یارمەتیان بدەین"[86].

گروپـی (م.س) نزیکـی سـالێک لە ئێـران مـانەوە، لە تەمـوزی ١٩٦٤ تـا تەموزی ١٩٦٥، هـاتنی کوردی عێراق بۆ ئێران و پەیوەنـدی بەسـتن لەگەڵ رژێمی شادا، کارێکی نوێ نەبو، ئەوەی کە نوێ بو، بەشێک لە هێزی پارتی و بێ پلانێکی دارێژراو بە ژمارەیەکی زۆرەوە ناچاربن روبکەنە ئێران.

باڵێکی پارتی رای کردبو بۆ ئێران، باڵەکەی تری پەیوەندی لەگەڵ ئێراندا خەسـت دەکـردەوە، واتـا هەردو بـاڵەکەی هەوڵیـان ئەدا باشـترین پەیوەنـدی لەگەڵ تاراندا دروست بکەن. دوای ئەم روداوانە، بـارزانی نوێنەرایەتیەکە لە تارنەوە گواسترایەوە بۆ کوردستان "سـەرهەنگ مەنسـورپوور لەگەڵ کوێخـا برایمـی بوێران چـوون بۆ گونـدی هێرۆ چاویـان بە بـارزانی کەوت. بەدوای ئەو چـاوپێکەوتن پەیوەنـدییەکانی ئێـران لەگەڵ شـۆڕش گواسـترایەوە بـۆ نـاوچەی سـەرکردایەتی شـۆڕش. لەیەکەم هەنگـاودا لە جیـاتی بـنکەی (شابادین) بنکەیەک بۆ پەیوەندییەکانی شۆڕش لە ناوچەی حاجی ئۆمەران کرایەوە...سـەرهەنگ عەلـی مودەریسـی کـرا بە نـوێنەری سـاواک لە لای شۆڕش"[87].

---

[86] عیسی پژمار، نەهێنیەکانی بەستنی پەیمانی ١٩٧٥ی ئەلجەزائیر، لە ئارشیفی تەواو نهێنی ساواک، وەرگێرانی: ناسر ئیبراهیمی، سوئێد ١٩٧، ل ٧١.

[87] حامید گەوهەری، مستەفا بارزانی، پێشمەرگە و سەرۆک،، ل ٦٣٦.

## گەڕانەوەی (م.س) لە ئێران

مـامەڵەی خراپـی کاربەدەسـتانی ئێـران و بـێ هیـوایی پێشـمەرگە و سـەرکردایەتی لە ئایندەی خۆیان لە غەریبایەتی، بیریان هەر لە گەڕانەوە بو بۆ کوردستان.

یەکێک لەو پێشمەرگانەی کە لەوێ بو، لە کتێبێکیدا دەنوسێ "ئەو هێزەی کە لە هەمەدان بـون، لە رووی بـاری دەرونـیەوە لە بـارودۆخێکی خراپـدا دەژیـان، زۆر دور بـون لە کەس و کـار و دەنگوباسـیان، سەربەسـتی و ئازادیەکی ئەوتۆیان نەبوو لە گەڕاندا و دەبوایە بۆ چونە ناو شار پسوڵەی ڕێگەدانیان وەرگرتایە، ڕێگەیان نەبوو شاران بگەڕێن، هەمو بێ دەرامەت بـون، زۆربەیـان کەوتبـونە فرۆشـتنی سـەعاتی دەسـتیان و رادیـۆ و ئەنگوستیلەی دەست و ئەڵقەی پەنجە"[٨٨].

لە ئێـرانەوە مەکتەبـی سیاسـی دەسـتیکرد بە پەیوەنـدی بە دۆسـت و لایەنگیرانیانەوە لە کوردستانی عێراق و ناردنەوەی هەندێ لە کادیرەکانیان بۆ نـاو شـار و شـارۆچکەکان و نـاردنەوەی چەنـد مەفرەزیەکـی پێشـمەرگە کە مەبەست لێی تەنها خۆ نیشـاندان بو وەک هێزێکی چەکدار و هەوڵێک بدەن، کە جێپێی خۆیان لەو دیو قایم بکەن.

دەربـارەی خـۆ ڕێکخسـتنەوەی پـارتی لە کوردسـتانی عێراق، نەوشـیروان مستەفا دەنوسێ: "دوای کشانەوەی ئەوان بۆ ئێران، چەند کەسێکی کۆمیتەی

---

[٨٨] ئیبراهیم جەلال، خوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول، بنیاتنان و هەڵتەکاندن، ١٩٦١ – ١٩٧٥، ل ١٩٨.

ناوەنـدی، کە لە کوردسـتانی عێـراق مـابون، لەوانە: عەلـی عەبـدولا، نـوری شاوەیس، زەبیحی لە بەغدا مەکتەبی سیاسیان پێکهێنایەوە، گۆڤارێکیان بە ناوی (پێشرەو) بە کوردی و لقی بەغداش بە عەرەبی (باهوز)یان دەرئەکرد. ئەحمەد عەبدولا لە بادینان، محەمەدی حاجی تایەر لە سلێمانی و مەلا عەبدولا ئیسماعیل لە هەولێر..درێژەیان بە کاری رێکخراوەییدا. لە کوردستانی عێراقدا دو رێکخراو بە ناوی پارتیەوە کاریان ئەکرد، هەردوکیان خۆیان بە (شەرعی) ئەزانی"[٨٩].

بارودۆخی پێشمەرگەکانی مەکتەبی سیاسـی لە ئێران، رۆژ بە رۆژ بەرەو خراپتـر دەرۆشـت و هەمویـان بیریـان دەکـردەوە، کە بە زوتـرین کـات و لە فرسەتێکی گونجاودا، ئەوێ بەجێ بهێڵن و ئامادەبون بگەڕێنەوە ناو عێراق و مامەڵەی کاربەدستانی بەغدایان زۆر پێ باشتر بو لە هی تاران.

فرسـەتێک هـاتە پێشـەوە و لە بەهـاری ١٩٦٥ دا، پەیوەنـدی حکـومەت و بـارزانی بەرەو ئاڵۆزی رۆشت و شـەڕ دەسـتپێکردەوە، لەو کـاتەدا مەکتەبی سیاسی لە ئێرانەوە وەفدێکیان نارد بۆ لای بارزانی و ئامادەییان نیشـاندا کە لە کاتی دەستپێکردنەوەی شەڕ لە نێوان کورد و حکومەتدا، ئەوان ئامـادەن بگەڕێـنەوە و لەژێـر سـەرکردایەتی بارزانیـدا خەبـات بـکەن، بەمەرجـێ لە ماوەی شەش مانگدا، پێشـمەرگە و کـادیر و سـەرکردەکانیان لێپرسـراوێتیان بدرێتێ یان دوای ماوەیەک حیزبێکی سیاسی بۆ خۆیان دامەزرێنن، بـارزانی پەیمانی دابونێ کە یان لە ماوەی شەش مانگدا رێک دەکەون یاخود ئەتوانن پـارتێکی سـەربەخۆ بۆ خۆیـان دروست بـکەن، هەر لە گەڕانەوەشـیاندا ئەو ئیسـتگەیە و چەنـد چەکێکـی قورسـیان لا هەبـو، گەرانیـانەوە و دایـان بە بـارزانی، هەمـو مەکتەبی سیاسـی و ئەو پێشـمەرگانەی لەوێ بون، گەڕانەوە، جگە لە ئیبراهیم ئەحمەد نەبێت.

ئیبـراهیم ئەحـمەد لەو بـارەیەوە دەڵـێ: "لە ئێـران ئەوان رێککەوتـن، کە بگەڕێنەوە و لەگەڵ مەلا مستەفا رێکبکەونەوە و ببنەوە بە پارتەکەی جاران و

---

[٨٩] نەوشیروان مستەفا، لە بناری دانوبەوە، ل ٨٧.

هیچ جیاوازیەک نەمێنی. بۆ ئەو مەبەستەش، خۆی (بارزانی) نوێنەری نارد بوو، سێ کەس بون، ساڵح یوسفی و نووری شاوەیس و نازانم کێی دیکەیان لەگەڵ بوو، لە نزیک تەوەکەل یەکدیمان بینی، قسەمان کرد و ڕێککەوتین، کە هەمو بگەڕێینەوە، هەر من نەگەڕێمەوە، منیش وتم بەسەرچاو من ناگەڕێمەوە"[90].

دوای گەڕانەوەیان، ئەو چاوەڕوانیەی ئەوان لە بارزانی هەیان بو، بەدی نەهات و نەتوانرا ئەو پەیوەندییەی جاران دروست بێتەوە، بە تایبەتیش، کە ژمارەیەک کادێری مام ناوەندی جاران، هەمو پلە و پۆستی حیزبی و پێشمەرگانەیان وەرگرتبو، لەبەرئەوە زۆر پۆستی بەتاڵ نەمابو، کە ئەندامە گەڕاوەکان وەریبگرن، سەرەڕای ئەوەی، کە ئەو ناکۆکیانە پاشماوەی سیاسی و نەفسی زۆری بەجێهێشتبو کە بە ئاسانی نەئەتوانرا بازی بەسەردا بدرێت.

مام جەلال دەربارەی شێوەی گەڕانەوەکەیان دەڵێ: "دو پێشنیازمان پێشکەشکردن، یەکێکیان ئەوە بو، با مەلا مستەفا ڕێگای ئێمە بدات بچینە بارزان بۆ لای شێخ ئەحمەد و لای ئەو دادەنیشین. ئەگەر مەلا مستەفا شەڕی دژی حکومەت کردەوە، ئەوە دێینەوە پێکدێینەوە، ئەگەر مەلا مستەفا پێکهات لەگەڵ حکومەت، ئەوا ئێمە بۆ خۆمان سەربەست ئەبین لەو کارەی کە ئەیکەین، ئەوەبو کە مەلا مستەفا ئەو مەرجەی قبوڵ نەکرد"[91].

یەکەم گروپ کە گەڕانەوە بۆ لای بارزانی لە ١٩٦٥/٧/٦ بو، لە دوای ئەوانیش ئەوەی لەوێ مابونەوە، گەڕانەوە، ئەم گەڕانەوەیە لە کاتێکدا بو، کە بارزانی هەست و بۆچونی خۆی نەئەشاردەوە و لە زۆر جێگا هێرشی دەکردە سەر (م.س) "بارزانی لەو کاتانەدا، بڕوای وابو کە گەڕانەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی کارێکی باش نیە، ئەو گروپە دڵسۆز نابن بۆی، بارزانی بڕوای بەو باڵە نەمابو، زۆربەیجار بە ئاشکرا هێرشی دەکردنە سەریان"[92]، کە

---

[90] پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا، ل ٥٣.

[91] دیداری تەمەن، بەرگی یەکەم، ل ٢٩٩.

[92] شكيب عقراوي، سنوات لمحنة، ص ١٧٥.

مەکتەبی سیاسی گەڕانەوە، بارزانی ئەو بارزانیەی جاران نەمابو کە کاریان لەگەڵدا دەکرد و زۆرجار ناچار بو نەرمی بنوێنێت لەگەڵیاندا، ئەم جارە بارزانی تاقە سەرکردەی بێ ڕکابەر و سەرکردەی حیزب و شۆڕش و سەرجەم دەزگاکانی حیزب و شۆڕشی لەژێر ڕکێفی خۆیدا بو، بە هیچ کلۆجێک ئامادە نەبو جارێکی تر دەسەلآت دابەش بکات، بە هیچ جۆرێک ئامادە نەبو وەک جاران، ڕێگا بدات کە پارتی و شۆڕش دو سەرکردەی هەبێت.

هەروەها بارزانی خۆی بەسەرکەوتوی یەکەم دەزانی، بە ئاسانی ناکۆکیەکانی بیر نەئەچۆوە و نەیئەویست کە مەکتەبی سیاسی گەڕانەوەکەیان بکەن بە دەسکەوت و سودی لێوەرگرن، بەڵکو ئەیویست کە بچوکیان بکاتەوە و وایان لێبکات کە جارێکی تر نەتوانن بەرەنگاری ئەو ببنەوە. مام جەلال لەوبارەیەوە دەڵێ: "مەلا مستەفا لە هەمو ئەو شتانەی، کە خۆی پەیمانی بە ئێمە دابو پەشیمان بۆوە..یەکێک لەوانە بەردانی عەلی حەمدی و مەحمودی حاجی تۆفیق لەگەڵ هەندێ کادیری تر کە گیرابون...شەش حەوت مانگی پێچو، هیچ دیار نەبو، واتا بەڵێنەکانی مەلا مستەفا هیچی دیار نەبو، ئێمەش هەر لەوێ مابوینەوە، کاتی خۆشی ئێمە وامان بڕیار دابو، ئەگەر پاش شەش مانگ مەلا مستەفا کار نەدا بە برادەرانی سەرکردایەتی و لەگەڵمان پێک نەهات، ئەوا برادەرانی سەرکردایەتی رابکەن و بچنە شارەکان لەوێ ڕێکخستن و خەباتی نەهێنی بکەن و لەبەردەستی مەلا مستەفا نەمێنن"[93]، ئەوەی چاوەڕوان دەکرا، بارزانی خواستەکانی مەکتەبی سیاسی نەهێنایەدی و ئەندامە سەرکردایەتیەکانیان و کادیرە دیارەکانیان، جگە لە کمال موفتی کە کرا بە فەرماندەیی هێزی قەرەداغ و محەمەد ئەمین فەرەج کرا بە فەرماندەیی هێزی کاوە، ئەوانەی تر، کاریان وەرنەگرت و لە دۆڵە ڕەقە چاوەڕێ بون و بێ ئیشوکار مابونەوە، زیارتر دانیشتن و چاوەڕێی ئەوە بون کە کارێکیان

[93] مام جەلال، روداوی تەمەن، بەرگی یەکەم، ل ٣١١.

بدرێتێ، بارزانی بەم هەڵوێستە ئەیویست لەناو هێزی پێشمەرگە و جەماوەر سووکیان بکات. چیرۆکی هەمە جۆر زۆرە، کە بە شێوەی جیاواز ناووناتورەیان لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی دەنا و گەیشتە جنێودان پێیان، لەسەر هەموویانەوە، بارزانی کە جنێوی زۆر سوکی پێئەدان، نمونەی ئەوەی کە هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی بۆ جەژن داوایان لە بارزانی کردبو کە ڕێگایان بدات سەردانی ماڵ و منداڵیان بکەن، ئەویش لە جیاتی ڕێگەیان بدات، کۆمەڵێک جنێوی باشیان بۆ دەنێرێت..ئەمەش عادەتێکی بارزانی بو، کە زۆرجار جنێوی بە هەڤاڵانی خۆی داوە.

هەندێ لەسەرکردایەتی (م.س) بە فەرمانی بارزانی لە ناوچەی پڵنگانی لای عەباسی مامەند ئاغا بون و بارزانی پەیمانی دابونێ کە دێتە لایان و کێشەکان چارەسەر دەکات. بارزانی بە نیازی بینینی چەند کاربەدەستێکی ئێرانی هاتبوە ئەو ناوچەیە و لە شەوێکدا لەگەڵ (مام جەلال، عەلی عەسکەری، نوری شاویس، عومەر دەبابە، حیلمی عەلی شەریف و نوری ئەحمەدی تەها) کۆبوبۆوە و حیلمی عەلی شەریف دەیگێڕێتەوە: "شەوێک لە پەنا ئەشکەوتێک دانیشتنەکە لەدوای چاوەڕوانکردنێکی زۆر، پیکهات، ئەوەی شایانی باسە، ئەم هەڤاڵانە بە عباس ئاغایان وتبو، کە بە مەلا مستەفا بڵێت، جنێویان پێ نەدات، چونکە وەڵامی جنێوەکەی ئەدەنەوە و بێگومان ئەو چەکدارە و ئەمان بێ چەکن، ئەیانکوژێت و خۆ ئەگەر نیازی کوشتنیانی هەیە، دانیشتن پێویست ناکات. دوای دانیشتن و هەندێ قسەی سەرپێی وتی: (سەداقەت و شەرافەتی میللەتی کورد ئەوە نەبو ئێوە ئەمەتان لەگەڵ مندا کرد!) بەهەرحاڵ وەڵامی ئەم فەرمایشەی لە پێناوی شۆڕشی کوردا نەدرایەوە، ئەمەش لەچاو جنێوفرۆشی مەلا مستەفادا خوێی چێشت بوو. دەی دەرگای باس خرایە سەر پشت، وتی: "بۆ ئەوەی بتوانن لەگەڵ مندا بن، پێویستە بەیاننامەیەک بڵاوبکەنەوە و بڵێن ئێمە خیانەتمان کردوە!) سێ هەڤاڵ وەڵامیان دایەوە، خوا لێخۆشبوو نوری شاوەیس وتی (ئەزبەنی،

ئەگەر ئێمە بە خۆمـان بڵێن خـائین، ئیتر نە بەکەڵکی تۆ دێین نە بەکەڵکی کـورد، لەبەرئەوە هەر دە پەنـجەکەم ببـڕن بەیاننـامەی وا دەرنـاکەم، ئەمە مەئساتە!) . مەلا مسـتافا وتـی: (نـوری ئەمە مەهـزەلەیە) وتـی: (نەخێر نـاڵێم مەهزەلەیە، ئەڵێم مەئساتە) ئینجا یادی بەخێر نـاڵێم خوا لێخۆشبوو، چونکە هەر لەناوماندایە شـەهید عەلی عەسکەری وتـی: (مەلا مستەفا، شـەرت بێ لەمەولا نەک هەر نـاڵێم کـوردم، تەبـریەش لە حەقیقەتـی دەکەم) سـەبارەت بەوەی ئەو قارەمانە کوڕی شێخەکانی مەزهەبی هەقە بوو، ئینجا مام جەلال وتـی (ئەزبەنـی ئەگەر بەیاننـامەیەکی وات بـۆ دەربکەین، ئیتـر لێمـان خـۆش ئەبیت؟) لە وەلامـدا وتـی: (مـومکینە) مـام جەلال وتـی (مـومکینە خۆشـیش نەبیـت) مەلا مسـتەفا وتـی (بەلـێ) مـام جەلال وتـی (کەواتە دەرکردنـی بەیانامەیەکی وا بۆچی باشـە؟) بۆ رزگارکردنی وەزعەکە، مام جەلال وتـی: (ئەزبەنـی چارەسـەرێکی تـر هەیە، رێگامـان بدە ئەگەڕێینەوە ئەو ناوچـانەی حکومەت داگیری کردونەتەوە، بە مەرجێک یەک پێشمەرگەی ژێر دەسـەلاتی سەرکردایەتی تۆ لای خۆمان قبوڵ نەکەین، ئەگەر هەر ناوچەیەکمان رزگار کرد، ئەیخەینە ژێر دەسـەلات و سـەرکردایەتی تۆوە، ئەگەر ژێر کەوتین و کـوژراین، ئەوا رزگـارت ئەبێـت لە دەسـتمان) لە وەلامـدا وتـی: (یەعنـی ئەتانەوێت ببن بە جەنەراڵ)، لە ئەنجامدا وتی من پێتان ئەڵێم (هەتا ئەچم بۆ باياوە و دێمەوە، ئەگەر بەیاننامەیەک بڵاونەکەنەوە، تێچونی تێدایە!)"[٩٤].

[٩٤] بەراوردێک لە نێوان ١٩٦٦ و ١٩٩٦، ل ٢٦.

# جیابونەوە و دابەشبونی پارتی

رۆژ بەرۆژ پەیوەندی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی ئاڵۆزتر دەبو، بە تایبەتی کە بارزانی ئاگادار بو کە ئەوان خەریکی کاروباری رێکخستنی حیزبی خۆیانن و بە جۆرێک لە جۆرەکان پەیوەندیان بە حیزبی بەعسەوە کردوە، لەبەرئەوەی ئەو پەیوەندی و ئەو خۆرێکخستنەوەیە نەبێت بە مەترسی بۆسەر بارزانی و پارتەکەی، بڕیاری دابو کە رزگاری بێت لێیان و مام جەلال بەم شێوەیە دەیگێرێتەوە: 'کانونی دوهەمی ١٩٦٦ بو، هەر ئەوەندەمانزانی رۆژێک هەشت نۆ بارزانی پەیدا بون و سلاویانکرد و نامەیەکیان لە کاک ئیدریسەوە پێ بو بۆ من و حیلمی عەلی شەریف.. لە نامەکەدا نوسیبوی (لەسەر فەرمانی بارزانی ئێوە هەردوکتان ئەبێ بێن بۆ لای ئێمە و لە ناوچەی ئێمە بن)، واتا ئێمە جیا ببینەوە لە برادەران و بارەگا بەرینە ئەوێ. لێپرسراوی ئەو کۆمەڵە، یەکێک لەو بارزانیانە بو کە لە روسیا خوێندبوی، حیزبی بو.. لێم پرسی ئایە ئێمە بچین؟ ئەو گوتی: (وەڵڵا کەیفی خۆتانە، بەلام حەز ئەکەن یەک دو رۆژ ئیجازەتان ئەدەینێ بۆ ئەوەی خۆتان ئامادە بکەن)، ئێمەش گوتمان زۆر باشە. ئێوارە عەلی عەسکەری جیاکردبۆوە و پێی گوتبو (کاک عەلی سوێندم بۆ بخۆ قسەیەکت پێ ئەڵێم، بەو مەرجەی ناوم نەهێنی و باسم نەکەی) ئەویش سوێندی بۆ خواردبو، گوتبوی ناوت ناهێنم: (ئێمە پێمان گوتراوە، حیلمی و مام جەلال بەرین و لە رێگا بیانکوژین و بڵێین رایان کردوە، ئێمەش هاوارمان لێکردن، بەلام نەگەڕانەوە، بۆیە

ناچاربو تەقەیان لێبکەین)"[٩٥]، هەر لەو بارەیەوە و بڕیاری لێکترازانی تەواوی، مـام جەلال دەڵـێ: "شـەوێک لە دوایـان نـاردم و گوتیـان کۆبونەوەمـان هەیە، هەردو نوریەکە (نوری ئەحمەدی تەهـا و نـوری شـاوەیس)، هەردو عەلیەکە (عەلی عەسکەری و عەلی عەبدولا)، عومەر دەبابە و حیلمی عەلی شـەریف و من، مامۆستا برایم لە تاران و سـەید عەزیز لە ئێران بون. عەلی عەسـکەری باسـی مەسـەلەکەی بـۆ کـردین، بـاس لەوە کـرا، ئێمە چـی بکەیـن؟ لە دوای گفتوگۆیەکی زۆر بڕیارمان دا کە نەچین، هەر حەوتمان بە کۆمەڵ بڕیارماندا، ئێمە نەچین بۆ لای بارزانی"[٩٦].

بۆ ڕاسـتی ئەم وتـانەی تاڵەبـانی، مەسـعود بـارزانیش بە هەمـان نـاوەڕۆک ئەو گێڕانەوەیە پشتڕاست دەکاتەوە و دەڵێ: "ئەوە بو لە دوای سـاڵی ١٩٦٥ دا کە هێشـتا بـارزانی لە پێنجـوین بـو، عەبـاس ئاغـا بروسـکەیەکی بۆ کـرد، تێیدا ئاگـاداری کـرد، کەوا تـاقمەکەی ئیبـراهیم ئەحـمەد پەیوەنـدیەکیان بە بەغـداوە هەیە و بەرژەوەنـدی لەوەدایە کە لە دۆڵە ڕەقەوە بگـوێزرێنەوە بـۆ نـاوچەی گەلاڵە. بـارزانیش بە بروسـکەیەک وەلامـی دایەوە و وێنەیەکیشـی لێنـارد بـۆ ئیدریسـی بـرام و تێـدا ڕایسـپارد کەوا شـوێنی نیشـتەجێبونیان لە گەلاڵە بـۆ ئامـادە بکـات. لە هەمـان کاتیشـدا عەبـاس ئاغـا تـاقمەکەی جەلالـی ترسـاند و ئاگاداری کردن کە بارزانی نیـازی چیە لە گەڵیـانـا و، پێویسـتە خۆیـان ڕزگـار کەن چونکە گەیشتنە گەلاڵەیان واتا بڕانەوەیان"[٩٧].

هەروەها بارزانی نەیئەشاردەوە، کە دەیەوێت ئەندامانی (م.س) لەناوبەرێت و ڕزگاربێت لێیان، وەک حیلمی عەلی شەریف دەگێڕێتەوە، "شێخ لەتیفی شـێخ مەحمـود بە تـایبەتی یەکێکـی نـارد، کە ئەم هەڤـالانە تێبگەیەنێـت مەلا مسـتافا ئەیانکوژێـت.. بەڕێـز مسـتەفا قەرەداغـی کە ئەوسـا سـەرۆکی (مەجلیسـی

---

[٩٥] دیداری تەمەن، بەرگی یەکەم، ل ٣١٥.

[٩٦] هەمان سەرچاوە، ل ٣١٥

[٩٧] مەسعود بارزانی، بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ل ٢١١.

تەنفیـزی) لای مەلا مسـتەفا بـوو بە عـومەر میراویـدا بە مـام جەلالـی راگەیاندبوو، کە مەلا مستەفا پێی وتووە کە ئەمانە ئەکوژێت"[98].

لەبەرئەوە ئەمـان نەچـون بۆ لای بـارزانی، واتـا چـون بـۆ لای حکـومەت و گەڕانەوە بـۆ نـاو شـارەکان، ئاشـکرایە مانەوەیـان لە ناوچەکـانی نزیـک بە هێزەکانی بارزانی، مانای هەڵگیرسانی شەڕی نیشان ئەدا، چونکە ڕەتکردنەوەی داخـوازی بـارزانی ئاسـان نەبـو، نەشـی ئەویسـت ئەوان بە نـاوی پـارتیەوە لە تەنیشتیەوە کاری حیزبی بکەن و هێزی تایبەتی پێشمەرگەی خۆیان هەبێت.

نەوشـیروان مسـتەفا باسـی هـاتنی مەکتەبی سیاسـی بۆ ناوچەکـانی ژێـر دەسـەڵاتی ڕژێـم بەم شـێوەیە دەکـات: "مـام جەلال و هاوڕێکـانی وا ڕێـک ئەکەون جـارێ ئەوانەی مەترسـیان لەسـەرە، هەڵبـێن و، ئەوانەی تـریش لە نزیکتـرین هەلـدا خۆیـان دەربـاز بـکەن. مـام جەلال، عـومەر دەبـابە، عەلـی عەسکەری، حیلمی عەلی شـەریف بە ٤ قۆڵی لە ٢٨ی کانونی دووەمی ١٩٦٦دا هەڵاتن و، لە پێشەوە لە سلێمانی دا، لە چەند جێگایەک کە بۆ خۆحەشاردانیان ئامـادەکرا بـو، خۆیـان شـاردەوە. پـاش مـاوەیەک حیلمـی بـۆ بەغـدا و علـی عەسکەری بۆ کەرکوک"[99].

ئەندامانی مەکتەبی سیاسـی و کـادیر و ئەنـدامەکانیان، ڕویـانکردە نـاوچەی سـلێمانی و کەرکـوک و گەرمیـان و شـارەزور و شـارباژێڕ، ئەویـش بەهـۆی ئەوەی ئەوان دەمێـک بـو لەو ناوچـانە چالاکیـان هەبـو، تـۆڕی ڕێکخسـتنیان دروسـتکردبو، پەیوەنـدیان لەگەڵ دانیشـتوانی ئەو ناوچـانە بە هەمـو تـوێژ و گـروپە جیاوازەکـانەوە پەیـداکردبو. ئەمە سـەرەتای ئەو جیـابونەوە جوگرافیایەیە کە تا ئیمڕۆ بەردەوامە لە نێوان ناوچەی سۆران و بادینان، هەر لەو کـاتەوە نە پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان تـوانی شـوێن جێپێـی خـۆی لە پارێزگـای سـلێمانی و کەرکـوک قـایم بکـات و نە یەکێتـی نیشـتیمانی تـوانی

[98] حیلمی علی شەریف. بەراوردێک لە نێوان ١٩٦٦ و ١٩٩٦، ل ٢٨.

[99] نەوشیروان مستەفا. لە کەناری دانوبەوە، ل٩١.

نفـوزی سیاسـی لە بادینـان پەرە پێبـدات.. ئەمە سـەرەرای ئەوەی هەردولا هەوڵی زۆریانداوە و ئەیدەن کە ئەو سنورە جوگرافیە سیاسیە بشکێنن، بەڵام نە سەرکەوتو بون و نە سەرکەتو دەبن.

دابەشـبونی جوگرافیـای سیاسـی لە نـاو حیـزبە سیاسـیەکاندا، سـیمایەکی کوردی نیە، بەڵکو جیهانیە و لە پرۆسەیەکی چەندەهاساڵیدا نـاوچەیەک لەبەر کۆمەڵێک هۆی سیاسـی و کۆمەلایەتی و کەسـایەتی، ئەبێتە شـوێنی سـەرەکی هێزێکی دیاری ئەو ناوچەیە و بە نیوە داخراوی ئەمێنێتەوە، ئەم دابەشبونە لە زۆر ولایەتـی ئەمریکـا هەیە، کە یـان بـۆ دیموکراتەکـان یـان بـۆ کۆماریەکـان قۆرخ کراوە، یاخود هەنـدی نـاوچە لە خـواروی ئیتاڵیـا یـان سـەروی ئیتاڵیـا بە هەمـان شـێوە یـاخود لە ئەڵمانیـا، کە نـاوچەیەکی گەورەی وەک باڤاریـا لە دوای جەنگـی جیهـانی دوهەمەوە بـۆ کریسـت دیموکراتەکـان بـڕاوەتەوە، جـگە لە پایتەختەکەی میونخ کە چەندەها ساڵە لەدەست سۆسیال دیموکراتەکانە و زۆر شوێنی تر لە ولاتی جیاواز.. نمونەی زیندو ئەوەیە، کە لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردسـتان لە ١٩٩٢ دا، یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان، کەمتـر دەنگـی هێنـا لە نـاوچەی بادینـان لە ژمـارەی ئەنـدام و ئەو کەسـانەی کە چەکـی ئەوانیـان وەرگرتبو، یان لەوان سودمەند بون.

## ئایە زەمینەی جیانەبونەوە لە ئارادا بو؟

زۆر کەسـایەتی جیـاواز لەسەرانسـەری کوردسـتاندا هەوڵیانـدا، کە ئەو دابەشبونە رونەدات، بەڵام چونکە زەمینەکەی لەبار بو، هەروەهـا پرۆسـەیەک بو کە چەند ساڵێکی خایاندبو، ئەبو ئەو دابەشبونە روبدات، بارزانی شەخسـی خۆی، پێی نـاخۆش نەبو، چونکە لەو بـاودۆخە سیاسـیەدا نەئەتوانرا پێکەوە کاری هاوبەش بکەن. هەرچەندە بارزانی زۆر مەبەستی بو، ئیبراهیم ئەحمەد لە گۆڕەپانەکە دوربخاتەوە، بەڵام مەبەستیشی بو کە مام جەلال بۆ لای خۆی رابکێشێ، چونکە سەرەڕای پەیوەندی شەخسی هەردوکیـان، رۆڵـی سیاسـی و

پێشمەرگانە و دبلۆماسی مام جەلالی بە گرنگ وەرگرتبو، بۆیە بارزانی لە کۆتایی جیابونەوەکەدا نامەیەکی شەخسی و عاتیفی لە ٥ی نیسانی ١٩٦٤دا بۆ مام جەلال دەنوسێ لە هەندێ بڕگەیدا دەڵێ: "تۆ تەرەفداری دوژمنانی مەسڵەحەتی کورد و کوردستانی یاخود لەگەڵ برای حەقیقی خۆت دەبی؟ من بە خصوصی تەبیلغت دەکەم (یا بنی ارکب معنا ولا تکن مع الکافرین).. جلال أطلب منک بصفتي رئیس الحزب الدیمقراطي الکردستاني و بصفتي إني قائد ثورة کردستان، بصفتي انی ممثل الشعب الکردي. وەرە لام بانگت دەکەم وەک کوڕی عەزیز بۆ خۆم و کوردستان بە قسەی هیچ کەسی تر مەکە، وەرە بۆ لای شەعب، مەچۆ بۆ لای ئەوان...وە ئەمەش بۆ تاریخی کوردستان طلب دەکەم، هەقی خۆت بە خۆتە، وەرە بۆ لام، وەرە بۆ لام، مەچۆ بۆ لای غەڵەت، مەچۆ بۆ لای غەڵەت، مەچۆ بۆ لای غەڵەت.."[١٠٠].

دەربارەی شێوەی گەڕانەوەی مەکتەبی سیاسی لە ئێران و مانەوەیان لە کوردستان و کێشەی مانەوەیان لەگەڵ بارزانی و ئینجا بڕیاری چونە ناو شارەکان و پەیوەندیان لەگەڵ رژێم، مەسعود بارزانی زۆر بە کورتی باسی کردوە و دەڵێ: "سەرئەنجامیان ئەمە بوو، تا تەمووزی ١٩٦٥ لەوێ مانەوە، پاشان ئەوەی بارزانی جاڕیدا کەوا لێیان خۆش بووە و ئەوانیش گەڕانەوە بۆ کوردستان"[١٠١]، هێزە ناوخۆیی و دەرەکیەکان، کەم و زۆر هانی ئەو دوبەرەکیەیان ئەدا و مەبەستیان بو، کە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، دابەش ببێت و یەک سەرکردایەتی نەبێت، بۆئەوەی بەهێز نەبن و ئەوان بتوانن بە ئاسانی مەرامی خۆیان جێبەجی بکەن.

ئێران و عێراق، پەیوەندیان لەگەڵ هەردولا هەبو، هاوکاری هەردولایان دەکرد، بەڵام ئێران زۆر مەبەستی بو، زیاتر لە بارزانی نزیک بێتەوە، چونکە ئەوان بەهێزتر بون و بڕیاری سیاسی و حزبایەتی و پێشمەرگایەتی هەموی

---

[١٠٠] گۆڤاری سەدەی یەک، ژمارە ٩، ل ٤٤.

[١٠١] مەسعود بارزانی، بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ل٢٠٥.

لە دەست تاقە کەسێکدا بو، ئەویش بارزانی بو، بەڵام مەکتەبی سیاسی، هێزێکی حزبی بون کە شێوەی بڕیاردان تێدا بە زۆرایەتی و کەمایەتی بو، هەروەها شێوەی فکریان، جیاواز بو، کە ئەمان لە بارزانی چەپتر بون و پەیوەندیان لەگەڵ هێزە کوردی و چەپە ئێرانیەکان باشبو، ئەمەش بۆ خۆی جێی قبوڵکردن نەبو لای شا.

عێراقیش مەبەستی بو لە جیاتی ئەوەی کە مامەڵە لەگەڵ یەک حیزبی بەهێزدا بکات، مامەڵە لەگەڵ دو حیزبی بێهێزدا بکات. لەو ماوەیەدا هەستی پێکردبو، کە مامەڵەکردن لەگەڵ بارزانیدا ئاسانترە وەک لەگەڵ مەکتەبی سیاسی، چونکە ئەو ڕێکەوتنانەی لەگەڵ بارزانی ئەیانکرد، مەکتەبی سیاسی پێی رازی نەئەبو.

حیزبی بەهێزی ئەو ڕۆژەی عێراق، حیزبی شیوعی بو، ئەویش سەنگی مەحەکی بۆ هەڵوێستەکانی لە ڕوانگەی سۆڤێتەوە بو، ئەو کاتەی سۆڤێت پشتگیری هەر هێزێکی سیاسی بکردایە، ئەوا شیوعییەکانیش ئۆتۆماتیک لەگەڵیدا ئەبون و ئەوانیش پشتگیریان دەکرد. یەکێتی سۆڤێتیش لە بارزانیەوە نزیکتر بو، چونکە مەبەستی بو کە بارزانی لەگەڵ عێراقدا ڕێک بکەوێت. هەروەها کۆمۆنیستەکان، چاکەی بارزانیان لەبەرچاو بو، کاتێ بەعسیەکان لە شوباتی ١٩٦٣ دا هەوڵی لەناوبردنیان دان و بارزانی گرتنیە خۆیی و هاوکاری کردن.

## چونی (م.س) بۆ شارەکان

هاتنی مەکتەبی سیاسی بۆ ناو شارەکان، سەرەتای دەستپێکردنی پەیوەندی ئاشکرای نێوان ئەوان و حکومەتی بەغدا بو، هەروەها سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی ڕاگەیاندن و ئینجا شەڕی تەواوەتی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی بو.

پێش هەڵهاتنی مەکتەبی سیاسی بۆ شارەکان و پچڕاندنی پەیوەندیان بە بارزانیەوە، بارزانی هەوڵی خۆی لەگەڵ مام جەلالدا کە لای ئەوان بمێنێتەوە، ئەمە لە کاتێکدا، بارزانی مەرجی هەبو کە مەکتەبی سیاسی لە ئێران بگەڕێتەوە، بە مەرجێ ئیبراهیم ئەحمەد لەگەڵیاندا نەبێت و لە ئێران بمێنێتەوە، لەم لاشەوە، بارزانی نامەی بۆ تاڵەبانی دەنوسێ و تکای لێدەکات، کە بەجێی نەهێڵێت و بە کوڕی خۆی ئەیداتە قەڵەم، بەڵام مام جەلال ئەو داخوازیە کەم وێنەیەی بارزانی ڕەتدەکاتەوە، زۆر کەس دەپرسێت بۆچی؟ مام جەلال خۆی لە وەڵامدا دەڵێ: "لە سەنگەسەر چومە ماڵی مەلا مستەفا و گوتم: وەڵڵا ئەمشەو هاتوم هەندێ قسەی جدی و تایبەتیم هەیە لەگەڵ جەنابت و هیوادارم هەروەک هەمو جارێک، ڕێم بدەی بە سەربەستی قسەکانم بکەم و وەڵامی سەربەستانەش وەرگرم... گوتی: باشە بەسەرچاو، زۆر قسەی کرد، گوتی: تۆ لای من خۆشەویستیت و لە کوڕەکانم نزیکتریت، ئەوەی ئەتۆ پێم ئەڵێیت کەس نەیوێراوە بیڵێت...، زۆر سوپاسم کرد و گوتم: من شانازی بەوەوە ئەکەم، پێشمگوت کە تا ئەوکاتەش مەلا مستەفا لای من هەر سەرۆکی حیزب و شۆڕش نەبو، بەڵکو پەیوەندیەکی ڕۆحیشم لەگەڵیدا هەبو، ئەتوانم بڵێم وەک باوکێکی ڕۆحی تەماشام ئەکرد..من پرسیارم کرد، کە (ئەو ڕێکەوتنامەیە بەرەو کوێمان

ئەبات، نەخشەت چیە؟ ئەوە تەکتیکە؟ ئەوە بۆ کات کوشتنە لەگەڵ حکومەت، یان بڕوایە بە مەسەلەکە؟ ئێمە چی ئەکەین و ئەمە چیە؟)، مەلا مستەفاش گوتی: (من ڕەئێ خۆمت بە رونی پێ دەڵێم، من پێموایە وەکو خۆت ئەزانی، لە یەکەم ڕۆژەوە ئێمە شۆڕشمان نەویستوە، حکومەت بەسەریدا سەپاندین، ئێستا هەلێک هاتۆتە کایەوە، ڕێمان ئەدەن خەڵکەکە بچێتەوە سەر کاروباری خۆی، ئێمەش دائەنیشین، ئەوە دوکانمان بۆ چوڵ ئەکەن و ئەماندەنێ، ئەچینە دوکان دائەنیشین، ژیان و گوزەرانمان تەئمین ئەبێت، بزانین دوای ئەوەش خوا چی ئەکات)! منیش گوتم: (ئەی مەسەلەی حکمی زاتی و دەوری حیزب؟) گوتی: (وەڵلاهی جەلال خۆت ڕەئی من ئەزانی، من حوکمی زاتی بە خەیاڵ ئەزانم و نایەتە دی! حیزبیش وەڵلاهی من بەزۆر کرام بە سەرۆک، عەبدولکەریم قاسم و ئێوە بە زۆر منتان کرد بە حیزبی، دەنا من نە حیزبی بوم، نە باوەڕیشم بە حیزب هەیە، لەبەرئەوە سیاسەتی من ئەوەیە، من ڕێکەوتنەکەم پێ ڕاستە). ئەو گفتوگۆیە منی گەیاندە ئەو قەناعەتەی کە مەلا مستەفا ئەیەوێت ئاشبەتاڵ بکات، من ئێستاش بۆ مێژو ڕەئیم وایە، مەلا مستەفا دو ئاشبەتاڵی کرد، ئاشبەتاڵێک لە ١٩٧٥دا، ئاشبەتاڵێک لە ١٩٦٤"[١٠٢].

---

[١٠٢] دیداری تەمەن، بەرگی یەکەم، ل ٢٨٤.

# قۆناغی دوای دابەشبونی پارتی

هاتنی مام جەلال و هاوڕێکانی بۆ ناو شارەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەت لە کۆتایی کانونی دوهەمی ١٩٦٦، بەسەرەتایی دابەشبونی پارتی و هێزی پێشمەرگە و شەڕی ناوخۆ دائەنرێت.

لە ١٩٦٦ تا دەستپێکردنی گفتوگۆ لە نێوان پارتی (بارزانی) و بەعسیەکان لە کۆتایی ١٩٦٩، زۆربەی کاتەکان، شەڕ و پێکدادان رویداوە لە نێوان هەردو باڵەکەی پارتیدا، سەرەڕای ئەوەی هەردو باڵەکە پەیوەندییان لەگەڵ حکومەتی بەعس هەبوە و یارمەتی هەمەجۆریان لێوەرگرتون و هەردولاش نوێنەریان لە کابینەکەدا هەبو. بەعسیەکانی ویستویانە و ئامانجیان ئەوەبوە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، پارچە پارچە بێت، چونکە لە پارچە بونی بزوتنەوەکەدا، ئەوان دەتوانن ئامانجەکانیان بە ئاسانی بهێننە دی و هەردولاکە بێ هێز بکەن، بەرنامەی بە کوردکردنی شەڕ و مانەوەی شەڕەکەش لە کوردستان، ئامانج رژێم بوە، بۆ ئەوەی شەڕەکە دوربێت لە ناوچەکانی ناوەڕاست و خواروی عێراق.

"سەرکردایەتی بەعس لە بەغدا دەیویست شەڕی ناوخۆ گەرم بکات، ئەویش بەهۆی یارمەتی کۆمەڵی مامۆستا جەلال تاڵەبانی بە پارە و چەک و بە هاوکاری سوپای عێراقیش بتوانن بەسەر بارزانیدا سەرکەون، هەروەها ئەو سەرکردایەتیە تازەیەی بەعس وایاندەزانی، کاتێ کە بەسەر بارزانیدا سەردەکەون، ئەوکاتە ئەتوانن زۆر بە ئاسانی جەلال تاڵەبانی و کۆمەڵەکەی لەناوبەرن و بزوتنەوەی کوردی خامۆش بکەن و ئەو کێشەیە لەناوی بەرن"[١٠٣].

---

[١٠٣] شکیب عقراوی، سنوات المحنة، ص ٢٥٣.

ئەبات، نەخشەت چیە؟ ئەوە تەکتیکە؟ ئەوە بۆ کات کوشتنە لەگەڵ حکومەت، یان بڕوایە بە مەسەلەکە؟ ئێمە چی ئەکەین و ئەمە چیە؟)، مەلا مستەفاش گوتی: (من ڕەئێ خۆمت بە رونی پێ دەڵێم، من پێموایە وەکو خۆت ئەزانی، لە یەکەم ڕۆژەوە ئێمە شۆڕشمان نەویستوە، حکومەت بەسەریدا سەپاندین، ئێستا هەلێک هاتۆتە کایەوە، ڕێمان ئەدەن خەڵکەکە بچێتەوە سەر کاروباری خۆی، ئێمەش دائەنیشین، ئەوە دوکانمان بۆ چوڵ ئەکەن و ئەماندەنێ، ئەچینە دوکان دائەنیشین، ژیان و گوزەرانمان تەئمین ئەبێت، بزانین دوای ئەوەش خوا چی ئەکات)! منیش گوتم: (ئەی مەسەلەی حکمی زاتی و دەوری حیزب؟) گوتی: (وەڵلاهی جەلال خۆت ڕەئی من ئەزانی، من حوکمی زاتی بە خەیاڵ ئەزانم و نایەتە دی! حیزبیش وەڵلاهی من بەزۆر کرام بە سەرۆک، عەبدولکەریم قاسم و ئێوە بە زۆر منتان کرد بە حیزبی، دەنا من نە حیزبی بوم، نە باوەڕیشم بە حیزب هەیە، لەبەرئەوە سیاسەتی من ئەوەیە، من ڕێکەوتنەکەم پێ ڕاستە). ئەو گفتوگۆیە منی گەیاندە ئەو قەناعەتەی کە مەلا مستەفا ئەیەوێت ئاشبەتاڵ بکات، من ئێستاش بۆ مێژو ڕەئیم وایە، مەلا مستەفا دو ئاشبەتاڵی کرد، ئاشبەتاڵێک لە ١٩٧٥دا، ئاشبەتاڵێک لە ١٩٦٤"[١٠٢].

---

[١٠٢] دیداری تەمەن، بەرگی یەکەم، ل ٢٨٤.

## قۆناغی دوای دابەشبونی پارتی

هاتنی مام جەلال و هاورێکانی بۆ ناو شارەکانی ژێر دەسەلاتی حکومەت لە کۆتایی کانونی دوهەمی ١٩٦٦، بەسەرەتایی دابەشبونی پارتی و هێزی پێشمەرگە و شەری ناوخۆ دائەنرێت.

لە ١٩٦٦ تا دەستپێکردنی گفتوگۆ لە نێوان پارتی (بارزانی) و بەعسیەکان لە کۆتایی ١٩٦٩، زۆربەی کاتەکان، شەر و پێکدادان رویداوە لە نێوان هەردو باڵەکەی پارتیدا، سەرەرای ئەوەی هەردو باڵەکە پەیوەندییان لەگەڵ حکومەتی بەعس هەبوە و یارمەتی هەمەجۆریان لێوەرگرتون و هەردولاش نوێنەریان لە کابینەکەدا هەبو. بەعسیەکانی ویستویانە و ئامانجیان ئەوەبوە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، پارچە پارچە بێت، چونکە لە پارچە بونی بزوتنەوەکەدا، ئەوان دەتوانن ئامانجەکانیان بە ئاسانی بهێننە دی و هەردولاکە بێ هێز بکەن، بەرنامەی بە کوردکردنی شەر و مانەوەی شەرەکەش لە کوردستان، ئامانج رژێم بوە، بۆ ئەوەی شەرەکە دوربێت لە ناوچەکانی ناوەراست و خواروی عێراق.

"سەرکردایەتی بەعس لە بەغدا دەیویست شەری ناوخۆ گەرم بکات، ئەویش بەهۆی یارمەتی کۆمەڵی مامۆستا جەلال تاڵەبانی بە پارە و چەک و بە هاوکاری سوپای عێراقیش بتوانن بەسەر بارزانیدا سەرکەون، هەروەها ئەو سەرکردایەتیە تازەیەی بەعس وایاندەزانی، کاتێ کە بەسەر بارزانیدا سەردەکەون، ئەوکاتە ئەتوانن زۆر بە ئاسانی جەلال تاڵەبانی و کۆمەڵەکەی لەناوبەرن و بزوتنەوەی کوردی خامۆش بکەن و ئەو کێشەیە لەناوی بەرن"[١٠٣].

---

[١٠٣] شکیب عقراوی، سنوات المحنة، ص ٢٥٣.

هاتنی حکومەتی عەبدولسەلام عارف لە ١٦ی ئەیلولی ١٩٦٥ و هاتنی براکەی عەبدولرەحمان لە ١٣ی نیسانی ١٩٦٦، گرژی نێوان هەردو باڵەکەی پارتی کەم نەکردەوە، بەڵکو زیادیکرد.

گفتوگۆی چەند جارەی نێوان بارزانی و حکومەت لە ١٦ی حوزەیران و گەیشتنی هەمولاکان بە رێکەوتنامەی ٢٩ی حوزەیران، هەنگاوێک بو بۆ ئاشتەوایی نێوان بارزانی و حکومەت لە لایەک و زیادبونی گرژی لە نێوان هەردوباڵەکەی پارتیدا لە لایەکی تر.

شەڕی ناوخۆ لە گفتوگۆکانی نێوان پارتی بە سەرۆکایەتی بارزانی و بەزاز و سەرۆک کۆمار لە ١٩٦٦/١٠/٢٨، جگە لە خاڵە سیاسییەکان، خاڵێکی گرنگتریش رەنگی دابۆوە، ئەویش کاتێ بارزانی داوای چەککردنی باڵی مەکتەبی سیاسی لە رژێم دەکرد.

"حکومەتی عەبدولرەحمان بەزاز رەزامەندی لەسەر وەستانی شەڕ دەربڕی و (پلانی بەزاز)ی راگەیاند کە بریتی بو لە ١٢ خاڵ، لەو کاتەدا بە تەنازولێکی گەورە بۆ کورد دائەنرا، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو پرۆژەیە ناوی ئۆتۆنۆمی تێدا نەبو بە ئاشکرا"[١٠٤].

خاڵێکی سەرەکی کە بارزانی هاندابو، بکەوێتە گفتوگووە لەگەڵ حکومەت، کێشەی (م.س) بوە، کادیرێکی سەرەکی پارتی (بارزانی) بەم شێوەیە باسی دەکات: "لەسەرەتای حوزەیرانی ١٩٦٦ دا، بارزانی هەستیکرد کە واقعێکی ترسناک هەیە، ئەویش ئەوەیە کە حکومەتی عێراق دەیەوێت و خەریکە پارە و چەکی زۆر ئەدات بە نەیارەکانی و بارودۆخەکە بەرەو ترسناکی دەڕوات، لەبەرئەوە بارزانی بریاری وەستانی شەڕی دژی بە حکومەتدا، بۆئەوی لە هێز و توانای خۆی بۆ لایەک تەرخان بکات، ئەویش بۆ دژایەتی باڵی کۆنی پارتی دیموکراتی کوردستان (باڵی مامۆستا جەلال تاڵەبانی) تەرخان بکات"[١٠٥].

---

[١٠٤] آوفرا بينغيو- كرد العراق، بناء دولة داخل دولة، دار ئاراس- ساقي ٢٠١٤، ل ٢٨.

[١٠٥] شكيب عقراوي. سنوات المحنه، ص٢١٣.

واتا گفتوگۆ لە پێناوی بەدەستهێنانی مافی کورد نەبوە، بەڵکو لە پێناوی ئەوەی بەغدا هاوکاری نەیارەکانی (م.س) نەکات و ئەوان بەهێز نەبن، بە وەرگرتنی پارە و چەک (م.س) ئەیتوانی ژمارەی هێزەکانیان زیاد بکات، ئەوە مانای گۆڕانی تەرازوی هێزە لە سودیان و ئەوکاتە ئەوان ئەتوانن ببن بە هێزێک کە نوێنەرایەتی کورد بکەن و حکومەتیش مامەڵە لەگەڵ ئەواندا بکات.

حکومەتی عێراق نە ئەیویست خواستەکانی کورد جێبەجێ بکات، ئەو بەڵێنانەی بە بارزانی دابو، هیچیانی جێبەجێ نەکرد، بە ئاشکرا دەیویست سود لە ناکۆکیەکانی نێوان ریزەکانی پارتی وەرگرێت و شەڕی نێوانیان گەرمتر بکات، هەردولاش زۆر بە لاوازی خۆیان بەرامبەر بە رژێم نیشان ئەدا، بارزانی لە نامەیەکی پێنج لاپەڕییدا بۆ سەرۆک کۆمار عەبدولرەحمان عارف و سەرۆک وەزیران ناجی تالیب لە ١٩٦٦/١١/٢٨ تەنها بە وشەیەکیش ناوی (کوردستان)ی نەهێناوە، بەڵکو لە جیاتی ئەوە وشەی (شمال)ی بەکارهێناوە و تێبینیەکانی خۆی لە کەموکوڕیەکانی رژێم و جێبەجێنەکردنی رێکەتنامەکان دەردەبڕێت و رەخنە لە هاوکاریەکانی رژێم بۆ باڵی مەکتەبی سیاسی دەرئەبڕێت.

## دو کۆنفرانسی پارتی

هەردو باڵەکەی پارتی ئەوەی بۆیان کرابێت، ئاڵوزکردنی بارودۆخەکە و گەرمکردنی جەوی شەڕی نێوان خۆیان بوە، کۆنفرانسی پارتی (م.س) لە ٢٨ی ئەیلولی ١٩٦٦ و کۆنگرەکەیان لە کەلار لە ٣٠ی مارتی ١٩٦٧، جگە لە ئاگر خۆشکردنی شەڕی ناوخۆ و قوڵکردنەوەی ناکۆکیەکان هیچی تری تێدا نەبو، ئاو و هەوای ئەوکاتە و ئەوەی بیویستایە خۆی خۆشەویست بکات، یان ببێت بە پاڵەوانی ناو هۆڵی کونگرە، پێویست بو ئاگری شەڕ خۆش بکات، کەم کەس هەبو بوێرێت بەرنامەیەک بۆ هێمنکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ باڵەکەی تری پارتی و هەنگاونان بۆ ئاشتی لە کوردستان و کۆتایی

بە شەڕی ناوخۆ پێشکەش بکات.

هەروەها کۆنگرەی حەوتەمی پارتی (بارزانی) لە ١٩٦٦/١١/١٥ لە گەلاڵە، هیچی کەمتر نەبو لە کۆنگرەکەی باڵەکەی تر لە کەلار، ئەوانیش بەهەمان شێوە ئاگری شەڕی ناوخۆیان زیاتر گەرمکرد، سەردەم سەردەمی هاندان بو بۆ زیاتر کوشتنی هاوڕێیانی دوێنێیان و خۆشکردنی شەڕی ناوخۆ.

شەڕی ناوخۆ جگە لە ماڵوێرانی و بەکوشتدانی هەزاران هاوڵاتی کورد بو مەسەلەیەکی ناڕەوا، کلتورێکی ناشایستەشی هێنایە ناو کۆمەڵگای کوردیەوە کە هەوڵدان بو بۆ شەرعیەتدان بە شەڕی ناوخۆ و بینینی هاوڕێیانی دوێنێی سەنگەرەکانیان بە جاش و خۆفرۆش و پیاوی بێگانە.

ئیبراهیم جەلال وەک کادیریکی پارتی و پێشمەرگەیەک لەو بارەیەوە نوسیویێتی: "نە باڵی سەرکردایەتی (م.س) لە پێناوی مەسەلەسەرەکیەکەی کورددا، نەرمیان نواند و بە ڕابەڕی بێ چەند و چوونی بارزانی قایل بون، مەلا مستەفاش کە کلیلی چارەسەرکردنی ململانێ ناوخۆکەی بەدەست بوو، هەوڵی نەرمی نواندن و ڕێکەوتنی لەگەڵ باسکی سەکردایەتی نەدا و بەگیانی سەکردەیەکی بەرپرسیار لە ئایندەی کورد ڕەفتاری لەتەک نەکردن. هەردولایان بە ڕەفتارە ناسیاسی و ناکوردایەتیە بونە هۆی هەڵگیرسانەوەی شەڕێکی ناوخۆی سەخت، کە تا دەهات برینەکان قووڵتر دەبونەوە و ریزەکانی گەل و شۆڕش پتر لێک دەترازان. ماڵوێرانی گەلی کوردیش وەک بەرهەمی ئەو سیاسەتە چەوتە تا دەهات پتر تەشەنەی دەکرد، تا وایلێهات بووە نەریتێکی درێژەپێدراو و لە بڕانەوە نەهاتوو، دەرچون لە قالبی سیاسەت و چوونە ناو قالبی دوژمنایەتی خێڵەکی و کەسایەتیەوە"[١٠٦].

هەروەها شەڕی کورد – کورد، کومەڵێک زاراوەی زۆر ناشایستەی هێنایە فەرهەنگی سیاسی کوردییەوە، وەک، جەلالی، مەلایی، بلە، جەلە، جاشی ٦٦، مەلا چۆمی، جاشی ئێران، چەتۆڵەی ناپاک و ئەو زاراوانەی کە

---

[١٠٦] ئیبراهیم جەلال، خواروی کوردستان و شۆرشی ئەیلول، ل ٢٤٦.

نزیک بون لە جنێو و دوربون لە ناوەڕۆکی سیاسی، ئەگەر لایەک زیانی گیانی هەبوایە، دەیان گوت: ئەوەندە پێشمەرگەی قارەمانمان گیانی پاکیان بە کوردستان بەخشی، بەڵام بە لاکەی بەرامبەریان دەگوت: ئەوەند جاش کورد چون بۆ دۆزەخ!.

## لەناوبردنی ئەندامانی یەکتر و ئازاردانی چالاکوانان

سیمایەکی قێزەوەری ئەو ناکۆکیە، شەڕی تیرۆرکردنی ئەندام و دۆستانی یەکتر بو، پارتی (بارزانی) هەر پێش گەرمبونی ناکۆکیەکان، چەندین کادیر و ئەندامی سەر بە (م.س) وەک عەلی حەمدی، محەمەدی حاجی تۆفیق، سدیق میران، ئەحمە عەبدوڵا و خالید کۆکۆیی و عوسمان عوزێرییان لەناوبرد.

کوشتنی نەیارەکانی یەکتر، بوبو بە بەشێ لە ململانێی سیاسی، کۆمەڵێک لە پێشمەرگەی پارتی (بارزانی) لە کانی ماسی نزیک سلێمانی بارەگایان دانابو، بە ئاشکرا و بێ هیچ سڵکردنەوەیەک هاوڵاتیانی ئاساییان دەفراند و پارەیان لێدەسەندن و سەر و برۆ و قژیان ئەتاشین، هەر لەوێ نۆ کادێری شیوعییان تێرۆرکرد و بە شێوەیەکی دڕندانە ئەشکەنجەی کۆمەڵێکی تریان دان، ئەم هەڵسوکەوتانە بو بە پەڵەیەکی رەش بە مێژوی پارتیەوە لە ناوچەی سلێمانی، ئەوانەش بریتی بون لە (عوسەی ئامە، سالە سیک، حسەین و ئەمینی فارس، سەلاحی فاتە قەمور، ئەحە سێ سەر، بەکری خانم).

"دوای شەڕ وەستانی شوبات، ئەندامانی حیزبی شیوعییان بەند دەکردن، راویان ئەنان و لەناویان ئەبردن، ئەم کارانە نەک لە لایەن دەسەڵاتدارانی عارفەوە دەکرا، بەڵکو لە لایەن چەکدارانی پارتی دیموکراتی کوردستان، (مەبەست باڵی بارزانی) لە سلێمانی ئەنجام ئەدران، شەش کۆمۆنیستیان کوشت بێ هیچ تاوانێک و بەشێوەیەکی دڕندانە"[١٠٧].

باڵی (م.س) یش ئەوەی بۆی کرابێت، دریخی نەکردوە لە لەناوبردنی

---

[١٠٧] الدكتور خليل جندي، حركة التحرر الوطني الكردستاني. ١٩٣٩ – ١٩٧٨، ص ١٦٠.

کادیرانی باڵەکەی بارزانی، لەوانە کوشتنی سیامەن، مەلکۆ، عومەر شەریف لە تۆڵەی عوسمان عوزێری کە خوشکەزای حاجی برایمی چەرمەگا بو، هەروەها باڵی مەکتەبی سیاسی هەریەک لە عەلی حەمکۆ و عەزیز حەمکۆی برای، سەید عەبدوڵلا و ئیقبال هورەماری لە کۆتایی ١٩٦٧ دا لە هەولێر کوشت.

بارزانیش بۆ تۆڵەی سیامەند و مەلکۆ کە بارزانی بون، دوای بەیانی ئازاری ١٩٧٠، بانگهێشتی خێڵی حاجی برایمی چەرمەگایان کرد و لە ڕێگایاندا بۆ سەرکردایەتی بارزانی لە نزیک خەلەکان دایان بەزاندن و مەجید ڕۆستەم کە کەسایەتیەکی دیاری ئەو خێڵە بو لەگەڵ ١١ کەسی تریان بەیەکەوە ڕەمی کردن. ئەم کوشتن و تۆڵە سەندنەوانە، سیمایەکی کۆمەڵگای عەشایری کۆن بو، کە خوێن بەرامبەر بە خوێن دەوەستێت.

خدر مەرەسەنە، کادیرێکی پێشکەوتووی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا) دەربارەی هەڵوێستی بارزانی و کوردانی ئێران دەنوسێت: "بۆ یەکەمجار گرتن و تەحویلدانەوەی مەلا ڕەحیم وردی، مەشهور بە مەلا ئەحمەد، لە سنوری بانە بە ڕژێمی شا لە لایەن سەدیقە فەنی فەرماندەیەکی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، دواتریش شەهیدکردنی کاک سەدیقی هەنجیری و تێرۆرکردنی قادر شەریف بە پلانی شا و ساواک، هەروەها گرتنی کادر و ئەندامانی حزب لە لایەن پارتیەوە و تەسلیمکردنەوەیان بە ڕژێمی ئێران. کە هەرگیز بە فکری هیچ یەک لە ئەندامانی حزبی دیموکراتدا نەدەهات کە ڕۆژێک پارتی ئاوا نا مەسئولانە بکەوێتە ژێر تەئسیری سیاسەتی شا و ساواک کە هیچ کوردێک چاوەڕوانییەکی ئەوتۆی لە پارتی و بارزانی نەبوو"[١٠٨].

شەڕی ناوخۆ، وای لە هەردو باڵەکە کرد، کە پەنابەرنە بەر نەیارانی کورد، باڵی (م.س) چەک و پارە و هاوکاری لە حکومەتی بەغدا وەرئەگرت و بارزانیش باشترین پەیوەندی لەگەڵ ئێراندا بەست و ئەویش جگە لە پارە و

---

[١٠٨] خدر مەرسەنە، ئاوێنەی ڕاستییەکان (١٩٣٩-١٩٧٩) د. یاسین سەردەشتی، سلێمانی ٢٠٠٢، ل ٧٨، ل ٥٣١.

چەک، (جاشی کورد) ی ئێرانی کە بە (چریک) ناویان ئەبردن ئەنارد بۆئەوەی لەگەڵ هێزەکانی بارزانیدا شەڕ بکەن، ناردنی ئەوانە تەنها بۆ ئەوە بو شەڕی باڵەکەی تر بکەن و کورد بە کوشت بدەن..باڵی (م.س) کۆمەڵێک لەو جاشانەی گرت و لە لۆریدا بەناو شاری سلێمانی ئەیانگێڕان.

## دژایەتی پارتی (بارزانی) بەرامبەر بە کوردی ئێران

دژایەتی پارتی (بارزانی) بۆ بزوتنەوەی کوردستانی ئێران بە گشتی و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە تایبەتی زۆر ئاشکرا بو، ئەم هەڵوێستە باجی یارمەتی و هاوکاری ئێران بو بۆ پارتی. ئێران داوای لە پارتی کردبو بە هیچ جۆرێک ڕێگای جموجۆڵی کوردانی ئێران نەدات لە کوردستانی عێراق و لێپرسراوەکانیان بگرێت و تەسلیمی ئێرانیان بکات، دەربارەی ئەوەی کە بۆچی ئەندامانی حیزبی دیموکراتیان دەگرت و دەکوشت، عەبدولای حەسەن زادە دەڵێ: "هەر لەبەرئەوەی (حیزبی دیموکرات) مخالیف بوو، دژی ئێران بوو، ئەو حەرەکەتەی نێوان پارتی و حیزبی دیموکرات، یەکێک بو لە لاپەڕە ناخۆشەکانی مێژووی بزوتنەوەی کورد، چونکە هەر ئەوە نەبوو کە لێرە گرتیانن و تەحویلیان دانەوە، بەڵکو پێشمەرگەی پارتی هاتبون لە نێو کوردستانی ئێرانیشدا، بەدوای کادرانی حیزبی دیموکراتدا دەگەڕان، لە واقیعدا کادرەکانی حیزبی دیموکرات خۆیان لێ بواردن."[١٠٩]

هەروەها کەریمی حسامی لە بیرەوەریەکانیدا زۆر بە درێژی باس لە تیرۆرکردن و بەدەستەودانی پێشمەرگە و کادیرانی حیزبی دیموکرات و هێزەکانی تر دەکات، کە رادەستی ئێران کراون و وێنەی چوار نامە نیشان

---

[١٠٩] حەقیقەتی مێژوو، دیدار لەگەڵ عەبدوللا حەسەن زادە، تایبەت بە مێژووی حزبی دیموکرات و ڕۆژهەلاتی کوردستان و گەلی کورد، بێژەن ساعدی، چاپی یەکەم ٢٠١٩، ل ١٠٣.

ئەدا کە تەنها لە مانگەکانی ٣/٦-٢١/١٠-٢٩/١٠-١٨/١١/١٩٦٨ دا ئاراستەی بارزانیان کردوە، بۆ ئەوەی کوردەکانی ئێران رادەستی رژێمی شا نەکات[110].

دژایەتی بارزانی بەرامبەر بە کوردەکانی ئێران، هەڵوێستێکی شاراوە نەبوە و هەر لەو بیرەوەریانەدا، کە چوار بەرگە و ٢٨٧٧ لاپەرەیە، چەندین و چەندەها نمونەی تێدایە، کە بارزانی دژی کوردەکانی ئێران بە گشتی و (حدکا) بە تایبەتی بوە، ئەمە لە کاتێکدا کە کەریمی حسامی لە هیچ لاپەرەیەکدا بەبێ ڕێزی باسی بارزانی ناکات و هەمیشە وەک سەرۆک باسی دەکات.

دوژمنایەتی بارزانی بەرامبەر بە حیزبی دیموکرات و ئەو هێزانەی تر، کە بەرەنگاری رژێمی شایان دەکرد، زۆرجار ئەگەیشتە ئەوەی کە داوای لەناوبردنی سەرکردەکانیان بکرێت، ئەمە جگە لەوەی کە بارزانی نەی ئەویست لە کوردستاندا، هیچ هێزێک هەبێت کە دژی رژێمی شاهەنشایی خەبات بکات، خاڵێکی تر، رەنگە ئەوە بێت، کە بارزانی نەی ئەویست هێزێکی جەماوەری گەورە و سەرکردەیەکی کوردستانی ناودار دروست ببێت و مونافەسەی پارتی و ناو و ناوبانگی بارزانی بکات، حسامی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ بارزانی دەیگێڕێتەوە و دەڵێ : "بارزانی وتی: قاسملو چی بۆ کورد کردوە؟ توانیوێتی لەم وڵاتە ئیشتراکیانە میلۆنێک دۆلار بۆ شۆڕشی کورد پەیدا بکا؟ نەیتوانیوە، کەوابوو هیچی نەکردوە، ئێوە کە خزمەت بە کورد دەکەن بۆ ...نایکوژن، ئەو سەگبابە دەبێ بکوژرێ، خائینی کوردە"[111].

---

[110] کەریم حیسامی، بەرگی یەکەم، ل ٦٦٣-٦٦٤-٦٦٧-٦٧٢.

[111] کەریمی حیسامی، لە بیرەوەریەکانم، بەرگی ٢، ٢٠١٨، ل ٧٦٦.

# ڕۆڵی سۆڤێت و وڵاتانی دەرەوە لە شەڕی ناوخۆدا

جگە لە ئێران و عێراق، یەکێتی سۆڤێتیش ڕۆڵی هەبو بۆ پەرەسەندنی گرژی لە نێوان هەردو باڵەکەدا، لە جیاتی ئەوەی نفوزی خۆی بەکاربهێنێت بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە و نزیککردنەوەی هەردوباڵەکە، ئەو بە ئاشکرا پشتگیری بارزانی دەکرد، "سەرەڕای ئەوەی کە ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی، نوێنەرایەتی باڵی چەپیان دەکرد بە نسبەت مەلا مستەفاوە، بەڵام یەکێتی سۆڤێت پشتگیری بارزانی ئەکرد"[١١٢].

هەر دەربارەی ڕۆڵی یەکێتی سۆڤێت لەو لەتبونە، د. مەحمود عوسمان دەڵێ: "سۆڤێتییەکان ئەو لەتبونەی ناو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانیان پێخۆش نەبو، لەبەرئەوەی سەرۆکایەتی سۆڤێت ئەیان ویست کە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی یەکگرتو بێت بۆ ئەوەی وەک یەک هێز و بەیەکەوە بتوانن لەگەڵ بەغدا بگەنە ئاشتیەکی ڕاستەقینە، بەڵام کاتێ کەرتبونەکە ڕویدا، پەیوەندیان لەگەڵ مەلا مستەفا بە پتەوەی مایەوە، پێیان باشبو کە پەیوەندی و هاوکاری لەگەڵ ئەو بکەن نەک لەگەڵ کۆمەڵی (ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی) لەسەرەتاشەوە، پەیوەندی یەکێتی سۆڤێت لەگەڵ بزوتنەوەی کوردیدا لە ڕێگای مەلا مستەفاوە بوە، نەک لە ڕێگای مەکتەبی سیاسی، لەبەرئەوەش کە کەرتبونەکە ڕویدا، سۆڤێتەکان بەلای بارزانیدا دایانشکاند"[١١٣].

پەیوەندی و هاوکاری سۆڤێت بۆ بارزانی، بە نهێنی نەمابۆوە، حکومەتی

---

[١١٢] میهان محمد حسین البامرنی، سیاسة الاتحاد السوفیتي تجاه الحرکة التحرریة في کوردستان الجنوبیة (١٩٤٥-١٩٦٨) ص ٢٦٧.

[١١٣] هەمان سەرچاوە.

عێراق نارازی بو بەو پەیوەندیە، هەر لەبەرئەوە کاتێ وەزیری دەرەوەی عێراق، عەدنان پاچەچی لە نیسانی ١٩٦٧دا سەردانی یەکێتی سۆڤێتی کرد، باسی زۆر خاڵی گرنگی لەگەڵ وەزیری دەرەوەی سۆڤێت، ئەندریە گرۆمیکۆ کرد، لەسەرو هەموویانەوە، نارەزایی حکومەتی عێراق بو، دەربارەی هاوکاری بەردەوامی یەکێتی سۆڤێت بۆ بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد "[١١٤].

سۆڤێتەکان، بە ئاشکرا پشتگیری چارەسەری کێشەی کوردیان دەکرد، رۆژنامەی (پراڤدا) کە زمانحاڵی حیزبی شیوعیی سۆڤێت بو، لە ١٩٦٦/٢/٧ دا وتارێکی لە ژێر ناوی (گوێ لە دەنگی ئەقڵ بگرە) بڵاوکردەوە کە تێدا هاتبو: "ئەوەی تەواو ئاشکرایە کە کاری سەربازی ناتوانێت کێشەکە چارەسەر بکات، پێویستە جەنگ لە دژی کورد کۆتایی پێ بێت بۆ بەرژەوەندی گشت گەلی عێراق"[١١٥].

یەکێتی سۆڤێت پەیوەندیەکەی هەر لە بواری سیاسیدا نەهێشتبوە، بەڵکو، هاوکاری مادی پارتی یاخود بارزانیشی کردوە، مەسعود بارزانی نوسیوێتی: "ئەوەندەی من ئاگاداربم، یەکێتی سۆڤێت، لەسەرەتای شۆڕشەوە، واتا لە کۆتایی ١٩٦١ ەوە، مانگانە ٣٦٠ هەزار دۆلار، کە ئەو کاتە دەیکردە ١٢٠ هەزار دینار، ئەم هاوکاریە لە ١٩٦٨دا زیادیکرد بۆ نیو ملیۆن دینار لە ١٩٦٩ تا ١٩٧٢، دوای ئەوەی کە ئەمریکیەکان هاتنە سەرخەت، ئەوان یارمەتیەکەیان بڕی"[١١٦].

هەر دەربارەی هاوکاری دەرەوە بۆ بارزانی جرجیس فەتحەلا دەڵێ: "لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٧، بارودۆخی شۆڕش کەمێ باشبو، شای ئێران

---

[١١٤] هەمان سەرچاوە، ل ٢٨١.

[١١٥] کورد لە بەڵگەنامە نەهێنیەکانی بریتانیادا، ١٩٦٦- ١٩٧٩، محەمەد مستەفا قەرەداغی لە ئینگلیزیەوە کردویە بە کوردی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای دوارۆژ، چاپی یەکەم ٢٠١٧، ل ٤٧.

[١١٦] مسعود البارزاني، البارزاني و.... الجزء الثالث، ١٩٦١- ١٩٧٥، ص ٣٩٥.

یارمەتی دارایی نارد بۆ مەلا مستەفا، سەرۆکایەتی شۆڕشی کورد توانی یارمەتی سەرف بکات بۆ پێشمەرگە بە بۆنەی جەژنی رەمەزانەوە، کە رێکەوتی مانگی کانونی دوهەمی ١٩٦٧ی دەکرد، هەروەها یارمەتی بەبۆنەی جەژنی قوربانەوە، کە دەکەوتە مانگی مارتی هەمان ساڵەوە، بەو بۆنانەوە، ئیدریس بارزانی بە بۆنەی جەژنی رەمەزانەوە و مەسعود بە بۆنەی جەژنی قوربانەوە سەردانی بەغدایان کرد بۆ گەیاندنی پیرۆزبایی بارزانی بەسەرۆک کۆمار عەبدولرەحمان عارف بە بۆنەی جەژنەکانەوە"[١١٧].

بارزانی هەمو هەوڵێکی ئەدا بۆ بەدەستهێنانی یارمەتی و هاوکاری بۆ خۆیی و حیزبەکەی، چەند جارێک بارزانی نامەی بۆ سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا ویلسن نوسیوە، لەوانە لە ١٩٦٦/١/١٥ و کۆتایی شوباتی ١٩٦٦، بەڵام حکومەتی بەریتانیا هیچ هەڵوێستێکی ئیجابی نەبو و وەڵامیشی نەدایەوە، لە وەڵامی نامەیەکی سەفارەتی بەریتانیادا بۆ بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی وەزارەتی دەرەوە لە ١٩٦٦/٤/١٥دا، دەنوسن: "هیچ گۆڕانکاریەک لە سیاسەتی ئێمەدا نیە، ئێمە پەیوەندی رەسمیمان لەگەڵ کورددا نیە، بەڵام رێ بە خۆمان دەدەین پەیوەندیەکی نارەسمی سەنگینمان لەگەڵیاندا هەبێت، کەواتە ئەم نامەیەی مەلا مستەفا دەبێت بە وەڵامنەدراوەیی بمێنێتەوە...تۆ ئەتوانیت بڵێیت کە ناوەرۆکی نامەکە لەبەرچاو گیراوە و لە کاتێکیشدا هەرچەندە حکومەتی خاوەنشکۆ ناتوانێت هەڵوێستی هەبێت لە شتێکدا کە مەسەلەی ناوخۆیی عێراقە.."[١١٨].

بارزانی زۆر باوەڕی بە وڵاتانی دەرەوە هەبو، ئەوانی بە تاقە دڵسۆز و دۆست و پاڵپشتی خۆی دائەنا و هەر لە پێناوی بەردەوامی ئەو پەیوەندیە زۆرجار هەندێ کردەوەی دەکرد، کە لەگەڵ هەڵسوکەوتی بارزانیدا رێک نەئەکەوت. ئەفسەری گەورەی ئیسرائیلی لیوا رەحبعان زئیفی دەڵێ: "کاتێ

[١١٧] شكيب عقراوي، سنوات المحنة، ص ٢٢١.

[١١٨] کورد لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی بریتانیادا، ١٩٦٦-١٩٧٩، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای دوارۆژ، چاپی یەکەم ٢٠١٧، ل ٧٣.

لە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٦٦ لە تەورێزەوە هاتین بۆ سەر سنور، تاریکی ناوچەکەی داگیرکردبو، بە سەیارەیەکی جێب لە ئێرانەوە هاتین، وەک دیاریەکیش لە ئیسرائیلەوە بو سەرکردەی جیاخوازەکان هانیبومان و بە تاریکی لێمان دەخوڕی، بۆ ئەوەی نەبینرێین، لەپڕ سەیرمان کرد کۆمەڵێک خەڵک هاتبون بۆ پێشوازیمان و یەکێکیان ماچی کردم و بە عیبری وتی (شالۆم) سەیرم کرد کە ئیسرائیلیە (تسوری) لەگەڵ (م) کە بەشێ بون لە راوێژکارانی فەنی ئیسرائیلی، تسوری پێی وتم: ئەوە بارزانیە، ئەو سێ سەعات لەگەڵ کوڕەکانی و پیاوەکانی لەسەر یەک بەپێ هاتون، بۆ ئەوەی پێشوازیتان لێبکەن، ئەمە بە هیچ جۆرێک لە رابوردو روی نەداوە"[119]. ئەمە نیشانی ئەدا بارزانی چەند نەرم و نیان بوە بەرامبەر بە بێگانە و چەند رەق و توند بەرامبەر بە هاولاتیانی خۆی ئەگەر نەیاریش بوبن!.

پەنابردن بۆ دوژمن بۆ لەناوبردنی نەیاری سیاسی، بو بە کلتورێک کە چەندەهاجار لە چەندەها شوێن چەندبارە بونەتەوە، لەوانە کاتێ بە فەرمانی بارزانی سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستانی تورکیا، سەعید کرمزی تۆپراک، کە بە دکتۆر شڤان ناسرابو لە ١٩٧١/١١/٢٦دا لەناوبرا، "دکتۆر شڤانیش لە لایەن پێشمەرگەکانی بارزانییەوە دەگیرێ و لە دادگایەکدا بە سەرۆکایەتی حەبیب کەریمی سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، دادگایی دەکرێ و ئیعدام دەکرێ،پارتی د. شڤانی بەوە تۆمەتبارکرد، کە سەعید ئاڵجی لەناوبردوە"[120].

هەروەها کاتێ کادیرەکانی کوردی ئێران وەک سلێمانی موعینی لە ١٩٧٨دا کە هاتبون خۆیان ئامادەبکەن بۆ کاری پێشمەرگایەتی لە کوردستانی ئێران، بارزانی کوشتی و لاشەکەی تەسلیمی شای ئێران کردن و ئەویش بە

---

[119] الموساد في العراق، ص ١٥٨.

[120] کریس کۆچێرا، ل ٤٤٠، کورد لە سەردەمی نۆزدە و بیستەمدا، شەمەندۆفێری میزۆپۆتامیا، جەنگیز چاندار، ل ٤٤٤.

شارەکانی کوردستانی ئێراندا دەیگێڕا، یان کاتێ پێشمەرگەکانی پارتی لەگەڵ سوپای ئێرانیدا دژ بە کوردەکانی کوردستانی ئێران دەجەنگان، یان کاتێ ١٩٩٦ یەکێتی نیشتیمانی ڕێگایدا بە سوپای ئێران، بارەگاکانی حیزبی دیموکرات لە کۆیە بۆردومان بکات. هەروەها کاتێ لە ٣١ی ئابی ١٩٩٦ دا، کە پارتی پەنای برد بۆ سەدام بۆ لەناوبردنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان. یاخود کە پارتی لە کۆتایی ١٩٩٧دا فڕۆکە و دەبابەی تورکی هێنا دژ بە هێزەکانی یەکێتی.

گرتنەبەری ئەم جۆرە سیاسەتە لە هەمو لاکانەوە تەنزیری فکری بۆ دەکرا و دەکرێت، کە چارەسەری کێشەی ناوخۆیی کوردی بە چەک، کارێکی نارەوانیە، یاخود هەندێجار ئەوترا کە دوژمن (ئێران، عێراق، تورکیا) ناکۆکی سەرەکی نین، بەڵکو ناکۆکی سەرەکی لەگەڵ هێزە کوردییە نەیارەکانە.

# شەڕی سەختی نێوان هەردو باڵەکە

شەڕی نێوان هەردوباڵەکەی پارتی لە کۆتایی ١٩٦٦ سەریهەڵدا، بەڵام شەڕە گرنگ و قورسەکانی نێوانانیان لە ١٩٦٨ دەستیپێکرد، لە هەندێ شەڕدا لایەک باڵا دەست دەبو، لە شەڕێکی تردا، ئەوەی تریان، بەڵام بە گشتی، نەخشەی جوگرافی ناوچەکە بۆ هیچ لایەک نەدەگۆڕا، واتا ناوچەکانی سلێمانی، کەرکوک، گەرمیان و پشدەر، دوکان، دەربەندیخان، شارەزور و شارباژێر هەر بە ناوچەی دەسەڵاتی باڵی (م.س) مانەوە و زۆر لە ناوچەکانی پارێزگای هەولێر و دهۆک لەژێر دەسەڵاتی باڵی (بارزانی) مایەوە، واتا کوردستان دابەشبو لە نێوان ناوچەکانی سۆران و بادینان، ئەو دابەشبونە تا ئیمڕۆ ماوە و دەمێنێت.

شەکیب عەقراوی، وەک کادیرێکی پارتی و کارمەندێکی ناسراوی دەزگای پاراستن، لە کتێبەکەیدا باسی دابەشبونی پارتی بەم شێوەیە دەکات "لقی یەکی پارتی لە پارێزگای موسڵ چونە پاڵ پارتی (بارزانی) لەگەڵ باڵە کۆنەکە ژمارەیەکی زۆر کەم مانەوە..لە لقی دو، جیابونەوەیەکی ئاشکرا رویدا و بون بە سێ باڵ، کەمێکیان لەبەر کەرتبونی پارتی وازیان هێنا، بەشەکەی تر لەگەڵ باڵە کۆنەکە مانەوە، بەشە زۆرەکەی (تقریبن) پشتگیری باڵە نوێەکەیان کرد بە سەرۆکایەتی بارزانی، بە هەمان شێوە لە قەزاکانی مەخمور، شەقڵاوە و رەواندز، لە کۆیەش هەمو رێکخستن لەگەڵ باڵە کۆنەکە مایەوە و لە دێهاتەکانی کۆیە، بون بە دو بەشەوە لە نێوان کۆن و نوێکەدا.

لە لقی سێی کەرکوک، بون بە سێ بەشەوە، بەشێکیان وازیان هێنا، بەشێکی تریان لەگەڵ باڵە کۆنەکە مانەوە، بەشەکەی تر کە زۆرینە بون لەگەڵ باڵە

نوێیەکە مانەوە، لە قەزا و ناحیە و دێهاتەکاندا بەشێوەی یەکسان دابەشبون.

لە لقی چوار لە سلێمانی چارەکی ئەندامان لەگەڵ بارزانی مانەوە و سێ لەسەر چواری ڕێکخستنەکان لەگەڵ باڵە کۆنەکە مانەوە، لە قەزا و ناحیەکانیش جیابونەوە ڕویدا، بەڵام زۆربەی دێهاتەکان پشتگیری بارزانیان دەکرد.[121]

سەرژمێرییەکی ورد و باوەڕپێکراو نیە، کە چەند پێشمەرگە لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆ کوژراو و برینداربون، چونکە هەر لایەک ژمارەی زیانەکانی خۆی کەم دەکردەوە و زیانی بەرامبەرەکەی زۆر زیاتر نیشان ئەدا.

زۆربەی شەڕە گەورەکان بە دەستپێشخەری هێزەکانی بارزانی بون، ئەم هێرشانەش لە کاتێکدا بون، کە هیچ جۆرە پێکدادانێک لە نێوان هێزەکانی پارتی (بارزانی) و ڕژێمدا نەبوە.

پارتی (بارزانی) هەمو هەوڵێکی ئەدا، کە بەسەر پارتی (م.س)دا سەرکەوێت یاخود زۆر بێهێزیان بکات، "بارزانی بڕیاری لێدانی جاشەکانی ٦٦ی دا، بۆ ئەو مەبەستە، ڕۆژی ١٩٦٧/١٠/٩ بە هێزەکانی دەشتی هەولێر، سەفین و کاوە ڕاگەینرا، هەر کامیان بە نیوەی یەکەکانیان بەرەو سلێمانی بچن. بارزانی ڕۆژی ١٩٦٧/١٠/١٠ لەگەڵ هێزی هەڵگورد و چەند هەزارێک پێشمەرگەی هێزی باڵەک بەرەو سلێمانی کەوتەڕێ کە بەکرەجۆ مەڵبەندی گشتی جاشەکان پاک بکاتەوە"[122].

لە ماوەی شەڕی ناوخۆدا، هەردو باڵەکەی پارتی پەیوەندیان بە بەغداوە بەردەوام بو، چەندین جۆر یارمەتیان لێوەردەگرتن، ئەگەرچی ناوبەناو شەڕ لە نێوان (بارزانی) و حکومەتدا ڕوی ئەدا، بەڵام هیچ لەو شەڕانە

---

[121] شكيب عقراوی، سنوات المحنة فی كردستان، اهم الحوادث السياسية والعسكرية في كردستان و العراق من ١٩٥٨ – ١٩٨٠، مطبعة مناره، اربيل ٢٠٠٧، ص ١٥٩.

[122] حامید گەوهەری، مستەفا بارزانی، پێشمەگە و سەرۆک، ستۆکهۆڵم ٢٠١٧، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ل ٤٥١.

شەڕی یەکلاکەرەوە نەبون، بەڵکو زۆر لەو شەڕانە لە سودی حکومەتدا بو، چـونکە پـارتی (م.س) ئەوانـیش هاوکـاری حکومەتیـان دەکـرد. " رژێـم هاوکـاری مـالی و سـەربازی تاڵەبـانی دەکـرد، بـۆ ئەوەی توانـای شـەڕی هەبێـت لەگەڵ بارزانیـدا، بەپێـی هەنـدێ سـەرچاوەی جیـاواز، هێزەکـانی تاڵەبانی لە نێوان ۲۰۰۰ تـا ٤۰۰۰ کەس دەبـون. بەغداش مانگـانە ١٤ دینـار موچەی بۆ هەریەکەیان بڕیبۆوە"[١٢٣].

لە کاتی شەڕی گەرمی نێوان هەردوباڵەکە، پارتی بە سەرۆکایەتی بارزانی هەوڵـی ئەدا، پەیوەنـدیەکانی لەگەڵ بەغـدا باشـتر بکـات و رژێمـیش هەمـو کارئاسانیەکیان بۆ دەکرد، لەو کاتانەدا ڕێگەیاندا ڕۆژنامەی (التآخي) بە زمانی عەرەبیش لە بەغدا بە ڕەسمی دەربچێت، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا خۆشکردنی شەڕی ڕاگەیاندن بو لە دژی باڵەکەی تر.

لە کاتێکـدا شـەڕی گەرم لە نێـوان هەردو بـاڵەکەی پارتیـدا گەرم بـو، لەو کاتانەدا هەردو باڵەکە چالاکی ئاسایی خۆیان لە بەغدا ئەنواند و هەریەکەیـان ئەوەی تـری بە (جـاش) دائەنـا، لەو کاتـانەدا پـارتی (بـارزانی) لە ١٩٦٧/٤/٢٩ ڕۆژنـامەی (التـآخی) یەکەم ژمـارەی دەرکـرد، ئەمە لە کاتێکـدا پـارتی (م.س) ڕۆژنامەی (النـور) دەردەکرد، دو ڕۆژنـامەی دوبـاڵی کـوردی لە یەک شـاردا، هەریەکە جنێوی بەوەی تر ئەدا و دەسەڵاتدارانی بەغداش بە خۆشـی سـەیری ئەم شەڕە گەڕەکەیان دەکردا.

لە نـامەیەکی سـەفیری بەریتانیـا لە بەغـدا بـۆ بەشـی ناوەڕاسـتی وەزارەتـی دەرەوەی خۆیـــانی لە ١٩٦٦/٦/١٨ دا نوســـیوە: "جەلال تاڵەبـــانی لە ١٧ی حوزەیراندا لە ماڵەوە هات بۆ لام تـاکو دوایین ڕەوشـم پـێ بڵێت، دو ئەندامی کۆمیتەی بەغدادی پارتی کۆن، عەبدەلرەحمان زەبیحـی و ئەسـعەد خێلانـی، لە تەکدا بـون. جەلال گـوتی، بەزاز نـاردویەتی بە شـوێنیدا و لە ١٤ی حوزەیران

---

[١٢٣] آوفرا بینغیو، کرد العراق، بناء دولة داخل دولة، دار ئاراس، ساقی، ٢٠١٤، ص ٥٢.

ئەو و سەرۆکی بینیوە، رۆژێک بەر لە راگەیاندنی تەلەفزیۆنی و رادیۆییەکەی بەزاز کە بە شێوەیەکی سەرەکی سەبارەت بە کێشەی کورد بو. هەروەها جەلال رۆژێ دواتر وەزیری بەرگری دیوە. وای بۆ دەچو کە ئەویش لە ئێستادا چارەسەرکردنی پێ باش بێت. لە گفتوگۆیدا لەتەک بەزازدا، تاڵەبانی لیستێکی توند تر لە دوانزە خاڵیەکەی بارزانی پێداوە. جیاوازی سەرەکی ئەوەیە کە دەبێت ژمارەیەکی زۆرتری پێشمەرگە رێیان پێبدرێت چەکەکانیان بمێنێتەوە و نابێت لەگەڵ هێزە عێراقیە رەسمییەکانی سنوور یان هێزەکانی پۆلیس تێکەڵ بکرێن. تا رادەیەک بۆ سەرسامی تاڵەبانی بەزاز لە بنەڕەتدا ئەو مەرجانەی (پدک)ی (کۆن)ی پەسەند کردوە و وا دەرکەوتوە کە ئەو راستگۆبێت لە ئارەزووەکەیدا بۆ گەیشتن بە چارەسەرێکی زوبەزویی. مەبەستی سەردانەکەی تاڵەبانی بۆ لای من بۆ پرسی ئەوەبو ئاخۆ حکومەتی خاوەن شکۆ ئامادەیە کە فشار بخاتە سەر بارزانی بۆ ئەوەی کۆتایی بە (چەوساندنەوەی)ی پارتیی (کۆن) بهێنێت.."[124].

شەڕی ناوخۆ کۆمەڵێک زاراوەی ناشیرینی هێنایە کایەوە، پارتی (بارزانی) بە پارتی (م.س) یان ئەوت جاشی ٦٦، بێگومان ئەوانیش بەوانیان ئەوت جەماعەتی مەلا چۆمبی، بەهەرحاڵ هەریەکە ناوناتوری بۆ لاکەی تر دۆزیبۆوە، لەوبارەیەوە کە بۆ پێیان دەگوترا جاشی ٦٦، مام جەلال دەڵێ: "بەڵی بۆ ئەوان جائیز بو، بەلام بۆ ئێمە جائیز نەبو! بۆ ئەوان جائیز بو کە پەیوەندیان هەبێت، مانگانە موچە و یارمەتی وەربگرن، وەزیر و رۆژنامەیان هەبێت، بەلام نابێ ئێمە پەیوەندی بکەین! ئەوان بە یارمەتی حکومەت شەڕی ئێمەیان ئەکرد، لەشکرەکەیان بەناو شاری سلێمانیدا تێپەراند، بە چەک و فیشەک و هاوکاری حکومەت شەڕی ئێمەیان دەکرد"[125].

---

[124] کورد لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی بریتانیادا، ١٩٦٦- ١٩٧٩، محەمەد مستەفا قەرەداغی لە ئینگلیزیەوە کردویە بە کوردی، لە بلاوکراوەکانی دەزگای دوارۆژ، چاپی یەکەم ٢٠١٧، ل ٩٠.

[125] دیداری تەمەن، بەرگی یەکەم، ل ٣٢٦.

تای ناکۆکی و جیابونەوە، تەنها کێشەیەکی کوردی نەبو، بەڵکو پەلی هاویشتە ناو هێزە عێراقیەکانەوە، گەورەترین هیزی عێراقی ئەو قۆناغە، ناکۆکی و جیابونەوەی تێکەوت، لە ١٩٦٧/٩/١٧ حیزبی شیوعی عێراق بون بە دوبەشەوە، باڵێکیان لێ جیابۆوە بەناوی (سەرکردایەتی ناوەندی حیزبی شیوعی عێراق) بەسەرۆکایەتی (عزیز الحاج) کە بڕوایان بە خەباتی چەکداری هەبو لە عێراقدا.

کاتێ لە ناوەڕاستی ١٩٦٨ دا، کابینەی نوێ دروستکرا و بەعسیەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست، نوێنەری هەردو پارتەکە تێدا ئامادەبون، سەرەڕای ئەوەی نوێنەرانی بارزانی بڕیاریان دابو لە کابینەکە بکشێنەوە، لەبەرئەوەی وەزیرێکی سەر بە (م.س) تێدابو (تەها محێدین مەعروف)، بەڵام تا بەیانی ئازاری ١٩٧٠ بە رەسمی نوێنەرانی بارزانی وەک وەزیر مابونەو و هەمو ئیمتیازاتی وەزیریان وەردەگرت، بەڵام دەوامیان نەئەکرد.

موحسین دزەیی یەکێک بو لەو وەزیرانەی باڵی بارزانی، بەم شێوەیە باسی دەکات: "لە ژورەکەی ئەحمەد حەسەن بەکر، باس هاتە سەر تەها محێدین و ئەو هەڵبژێراوی جوداخوازەکانە، بەکر لە شوێنی خۆی هەڵسایەوە و لێی پرسیم تۆ موسڵمانی؟ وتم: سوپاس بۆ خوا، دەستی بۆ قورئانەکەی بەردەمی درێژ کرد و وتی: بەو قورئانە ئەمەم نەزانیوە، بەم جۆرە دیدارەکەمان بێ ئەوەی بگاتە هیچ ئەنجامێک کۆتایی هات.. مانگی ئاب یان ئەیلولی ئەمساڵە بوو (١٩٦٩) لەگەڵ ئیحسان شێرزاد لە بارەی بارودۆخەکە قسەمان کرد، هەمو ئیمتیازێکی وەزیرمان هەبو، موچەمان لە وەزارەت بۆ دەبەسترا، بەڵام دەوامان نەدەکرد.. لەسەرئەوە رێکەوتین کە بە رەسمی داوا لەسەرۆک کۆمار بکەین دەست لەکارکێشانەوەمان قبوڵ بکات.. تا ئیمزاکردنی رێکەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠، هیچ وەرامێکمان دەست نەکەوت"[١٢٦]، بەپێی ئەم گێڕانەوەیە، باڵی بارزانی لە کودەتای بەعسیەکانەوە

---

[١٢٦] موحسین دزەیی، وێستگەکانی ژیانم، بەشی دووەم، ل ١٩١.

تا بەیانی ئاداری ١٩٧٠ پەیوەندی رەسمیان لەگەڵ رژێم هەبوە و وەزیریان بە فەرمی لە کابینەکەدا هەبوە!

سەرەرای ئەوەی لەسەرەتای ١٩٦٩ وە، پەیوەندی نێوان بارزانی و حکومەت بەرەو ئاڵۆزی دەرۆشت و دۆخی شەڕ، بە ئاسمانی کوردستانەوە دیاربو، بەڵام پەیوەندی نەپچرابو، لە ١١ی کانونی دوەمدا، براگەورەی بارزانی (شێخ ئەحمەد) سەرۆک عەشیرەتی بارزان لە بەغدا کۆچی دواییکرد، وەزیری بەرگری عێراق حەردان تکریتی بە فڕۆکە تەرمەکەی ناردەوە بۆ دێی بارزان.

## رۆڵی ئیسرائیل لە شەڕی دژ بە رژێم

لەو ماوەیەدا تا بەیانی ئازار، دو شەڕی دیار دژ بە حکومەتی عێراق کە پارتی (بارزانی) کردبێتی و هەمیشە شانازی پێوە دەکات رویاندا، ئەوانیش شەڕی چیای هەندرێنە لە ١٤ی مایسی ١٩٦٦ و لێدانی بیرەنەوتیەکانی کەرکوکە لە ١ی مارتی ١٩٦٩دا. شیوعییەکانی عێراق شەڕی هەندرێن بە دەسکەوتێکی گەورە دائەنێن لە مێژوی خەباتی پێشمەرگایەتی خۆیاندا.

شاراوە نیە کە حکومەتی ئیسرائیل بە گشتی و دەزگای موساد بە تایبەتی، لەسەرەتای شەستەکانەوە بە خەستی لە کوردستان بون و جۆرەها هاوکاریان پێشکەشکردوە، لەوانە رێنمایی لە بواری شەڕی پارتیزانی و کردنەوەی دەورەی سەربازی، هێنانی چەک و تەقەمەنی، کردنەوەی نەخۆشخانە و بەشداری ناڕاستەخۆ لە شەڕدا.

"بەگوێرەی قسەی (ئێلیازەر تسافریر) کە لە شەستەکاندا بەرپرسی ئۆپەراسیۆنەکانی موساد بو لە عێراق، پەیوەندی پەیداکردن لەگەڵ کورد لە ١٩٦٤ دا دەستپێکرد، ئەو کاتەی یەکێک لە نوێنەرانی بارزانی لە پاریس بە ناوی (ئەمیر کامەران بەدرخان) لە باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە پاریس نزیککەوتەوە و و داوانامەیەکی بۆ یارمەتی و کۆمەک پێشکەشکردن. بە

فریــوی ئەو ڕوانــگەیەی کەوا لە نێــوان عێراقــدا هاوپەیمــانێکی ســتراتیژی پەیــدابوو، دەســتبەجێ داوانــامەی بــارزانی گەیەنــرایە تەلئەبیــب و چــووە بەردەســتی (بنگوریــۆن)، ئەویــش کاربەدەســتانی مۆســادی ڕاســپارد تــا ئەو تەونەی پەیوەندی رابچێنن. ئیدی دوای ئەوە، زۆری پێنەچوو، ئیسـرائیلیەکان (بەدرخان)یــان بانگهێشــت کــرد ســەردانی ئیســرائیل بکــا، لەوســاوە وەک دیفاکتۆیەک کورد و ئیسرائیلیەکان بونە هاوپەیمان"[١٢٧].

"کوردەکــان هەســتیان بەوە کردبــو، کە ئیســرائیلیەکان لە ئێرانیەکــان راســتگۆترن لەگەڵیانــدا، چــونکە ئیسـرائیلیەکان هەڵوێســتەکانیان دەربــارەی کێشەی کورد نەگۆڕە، وەک ئێرانیەکان نین، لەبەرئەوەی چاوەڕێ ناکرێت ئیســرائیل پەیوەنــدی خــۆی لەگەڵ عێراقــدا چــاک بکــاتەوە، بەڵام چــاوەڕێ دەکرێت ئێران پەیوەندی سیاسی خۆی لەگەڵ عێراقدا ئاسایی بکاتەوە"[١٢٨].

ئەوەی چەندەهاجار باسکراوە، کە ئیسرائیلیەکان راستەوخۆ و ناڕاستەخۆ بە باشی بەشداربون لە نەخشەی شەڕ و هێنانی چەک و تەقەمەنی بۆ گرتنی چیــای هەنــدرێن و بــێ هاوکــاری ئەوان، ئەو دەســکەوتە نەدەهــاتەدی کە تــا ئیمڕۆ پارتی و شیوعییەکان شانازی پێوە دەکەن.

بەڵام مەسعود بارزانی بەم شێوەیە باسی شەڕی هەندرێن دەکات: رۆژی ١١ی ئایار، پێشمەرگە داستانێکیان لە نازدارترین داستانەکانی گەلی کورد لە هەمو مێژوویدا تۆمارکرد، ئەو داستانەی ئەو رۆژە، نمونەیەکی میسالی کەم وێــنەی هاوکــاری پــتەو و هاوئــاوازەیی تەواوی نێــوان هێزەکــانی پــارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراقی بوو"[١٢٩]، هەروەها مەسعود بــارزانی لە هەمــان کتێبــدا و لە لاپەرەی ٢٥٦ هاوکــاری ئیســرائیلیەکان لەو شەڕەدا رەتدەکاتەوە.

---

[١٢٧] بریان رۆبەرت گیبسن، ئەرێ کورد بوونە بەردەباز، ل ٢١٧.

[١٢٨] آوفرا بینغیو، کرد العراق- بناء دولة داخل دولة، ل ١٠١.

[١٢٩] مەسعود بارزانی، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ل ٢٢١.

تاکو ئێستا کێ بەشداری سەرەکی شەڕی هەندرێن بوە جێی مشتومڕە، حشـع لە زۆربەی نوسـینەکانیاندا بەشـداریان لە شـەڕی هەنـدرێن بە دەسکەوتێکی گەورە و مەزنی خۆیانی دەزانن، کە ٣ شەهید و ٧ بریندایان داوە، یەکێک لە بریندارەکان مستەفا چاورەش بو. بەهادین نوری یەکێک لەسەرکردەکانی حشـع لەو نـاوچەیە، ئەوە رەتـدەکاتەوە کە پـارتی رۆڵـی سەرەکیان لەو شەڕەدا هەبوبێت "پارتی باش دەزانێت کە خاوەنی داستانی هەندرێن حشعە، بەڵام بەزۆر ئەو داستانە دەکات بە هی خۆی"[١٣٠].

هەروەها مستەفا چاوڕەش، وەک پێشمەرگەیەکی حشع، لە یادەوەریەکانیدا ل-٥٠- هەمان بۆچون دوبارە دەکاتەوە،کە حشع رۆڵی هەرە سەرەکی هەبو لەو شەڕەدا.

بۆ زیاتر رونکردنەوە، شەپۆل فاخیر مێرگەسوری لە کتێبی (زمانی تاوان) ل ٦٧-٧٠ هەمان بۆچون بە درێژی دەسەلمێنێت.

گرنگ ئەوەیە، کە داستانی هەندرێن، یەکێکە لە لاپەرە گەشەکانی مێژوی خەباتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، ئەوەی دیار و ئاشکرایە کە حشع رۆڵی ئاشکرا و دیاری هەبوە، سەرکردایەتی شۆڕشیش لەدەست پارتیدا بوە و هاوکاری تەکنیکیش لە لایەن ئیسرائیلیەکانەوە ئامادەکراوە..ئەتوانرێت وەک شانۆگەری سەیری بکەی، کە نوسەر و دەرهێنەر و کۆمەڵێک کەسانی تری یاریدەدەر شانۆکە ئامادەدەکەن..

شەڕێکی تر، کە زۆر باسی لێوە دەکرێت، لێدانی بیرە نەوتیەکانی کەرکوک بو، ئەم شەڕە وەک ئیسرائیلیەکان باسی دەکەن بە هاوکاری ئەوان ئەنجام دراوە، بەڵکو نەخشە و پلان و ئەمادەکردنی و شێوەی جێبەجێکردنی لێدانەکە لە ئیسرائیلەوە بوە. وەک ئیسرائیلیەکان باسی دەکەن، کارێکی وا ترسناک و قورس لە دەسەلاتی کوردا نەبوە جێبەجێی بکات و سەرکەوێت تێیدا. نوسەری

---

[١٣٠] بهادین نوری لە ژێر ناوی "کێ شەڕی هەندرێنی کرد؟ حشع یان پارتی" سایتی ئاگا پرێس ٢٠١٩/٥/١٦.

کتێبی (الموساد فی العراق..) شلۆمۆ نکدیمۆن دەنوسێ: "ئیسرائیل راستەوخو بەشداربو لەو کردەوە تێکشکێندەرەدا، نەخشەی دەستپێکردنی چالاکیەکە لە کوردستان نەبو، بەڵکو لە کیبوتسی (دجانیە - آ) بو لە ئیسرائیل. لێدانی بیرەنەوتیەکان ناونرا بە چالاکی (ئەسکەندریە) و کارەکانیش وەک چۆن پلانی بۆ دانرابو ئاوا ئەنجام درا"[131]، ئەو نوسەرە زۆر بە وردی باسی ئەو لێدانە دەکات، کە ئەو کارە ئەوان نەبونایە بە هیچ جۆرێک ئەنجام نەئەدرا، هەتا باس لەوە دەکات کە دوای چالاکیەکە ئیسرائیلیەکان هەمو ناوچەکەیان پاک کردۆتەوە و نەیان هێشتوە قاوغە فیشەکێک لەوێ بمێنێتەوە..

مەسعود بارزانی باسی رۆڵی پێشمەرگە دەکات لە لێدانی بیرە نەوتەکانی کەرکوک، بێ ئەوەی دورو نزیک رۆڵی ئیسرئیل باس بکات، دەڵێ: "ئەوە یەکەمینجار بوو کە کردەوەگەلێکی وابوێرانە بکەین. ئامانج لەم کردەوەگەلە ئەوەبوو، کارێکی واتایی بکەینە سەر ورەی رژێم زیاتر لەوەی کە زیانی مایەکی (ئەبێت مەبەست مادی بێت) پێ بگەیەنین. نامەیەکی ئاشکرامان نارد بۆ رژێم کەوا شۆڕشی کورد دەتوانێ دەستی خۆی بگەیەنێتە گەورەترین سەرچاوەیەکی ئابووری ژیواریی پشت پێ بەستراو"[132] .

پەیوەندی کورد و ئیسرائیل تا ماوەیەکی درێژ بە نەهێنی مایەوە، سەرەڕای ئەوەی چەند جارێک یەکێتی نیشتیمانی کوردستان باسی ئەو پەیوەندییەی دەکرد و بەتایبەتی لە ١٩٨١ پەرتوکێکی ٩٠ لاپەریدا لە ژێر ناوی (پەیوەندی سەرکردایەتی بارزانی بە ئیسرائیل و دەزگا جاسوسیەکەی، موساد) بە زمانی عەرەبی دەرکرد و کۆمەڵێک وتاری تێدا بڵاوکرایەوە کە باس لە پەیوەندی کورد و ئیسرائیل دەکات.

ئیسرئیلیەکانیش نەیان توانی بۆ ماوەیەکی درێژ پەیوەندی خۆیان و کورد بە نەهێنی بهێڵنەوە، "بۆ یەکەمجاریش ئیسرائیل بە رەسمی دانی نا بەوەی کە

---

[131] موساد فی العراق، ص ٢١٩.

[132] مەسعود بارزانی، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ل ٢٦٠.

هاوکاری کوردەکانی کردوە، ئەویش دومانگ دوای هەڵگیرسانی شەڕی ئێران و عێراق، لە ٢٩ /١٩٨٠/٩دا سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی ئیسرائیل مناحیم بێگن وتی: "ئەوان لە نێوان ١٩٦٥-١٩٧٥ یارمەتی کوردەکانیان داوە لە شۆڕشەکەیاندا دژ بە عێراق، هەروەها ئەمەریکا ئاگاداری ئەم ڕاستیە هەیە، هەروەها بێگن دەڵێ: ئیسرائیل مەشقپێکەر و چەکی بۆ ناردون، بەڵام هێزی سەربازی نەناردوە"[١٣٣].

هاوکاری ئیسرئیل بۆ کورد، سەرەڕای ئەوەی کە لەسەرتادا نەهێنی بو، بەڵام لە سودی کورد نەبوە کە ئاشکرا ببێت، ئەویش لەبەر پەیوەندی کورد لەگەڵ دنیای عەرەب و ئیسلامی بە گشتی و فەڵەستینییەکان و وڵاتانی دراوسێی ئیسرائیل بە تایبەتی، بەڵام دوای ساڵەکانی هەشتا و نەوەدەکان، دوای ئەوەی چەند وڵاتێکی عەرەبی و ئیسلامی دەستیان کرد بە پەیوەندی ئاشکرا و نەهێنی لەگەڵ ئیسرائیل، ئیتر باسکردنی پەیوەندی کوردی-ئیسرائیلی بڤە نەبو..ئەم پەیوەندیە لای ئیسرائیلیەکان بوبو بە هێڵێکی ئیستراتیجی و کاریان بۆ دەکرد.

"ئیسرائیل هەوڵی ئەدا هاوکاری و دۆستایەتی ئەو نەتەوە و گروپ و کۆمەڵانە بکات کە لەگەڵ ڕژێمە عەرەبیەکاندا لە ناکۆکیدان یان لە شەڕان." دیڤید بن گۆریون (کە بە باوکی ڕۆحی ئیسرائیل ناسراوە، سیاسەتی ستراتیجی (strategic periphery) لە ١٩٥٠ کاندا هێنایە ئاراوە، ئەم دیدەی بن گۆریون پێی دەگوترێت دۆکترین یان پرنسیپی پەراوێزی ستراتیجی، ئەم مەبدەئە بریتی بوو لەوەی کە گرنگە ئەو هێزانەی کە لە ڕۆخ (پەراوێز)ی ڕۆژهەڵاتی ناوەراستدان و دەوڵەتی نا عەرەبین (بە زەرورەت دۆستی عەرەب نین) وەک تورکیا، ئێران و ئەثیوبیا دۆست و پشتگیری ئیسرائیل بن. کوردستان و کورد وەک بونێکی نادەوڵەتی، بەشێکی زۆری (راستتر

[١٣٣] آوفرا بینغیو، کرد العراق- بناء دولة داخل دولة. دار النشر ئاراس-الساقی- ٢٠١٤، ل ١٠٣.

بڵێــین بەشــی ڕۆژهەڵات و بــاکووری کوردســتان) دەکەوێــتە ئەو ڕۆخە ستراتیژیەی ئیسرائیلەوە"[١٣٤].

هەر دەربــارەی ئــاڵۆزی و ناکۆکییەکــانی نێــوان هەردو بــاڵەکەی پــارتی، شــەڕی قــورس لە نێوانیانــدا، لە ١٩٦٩ تــا ٢٤ی کــانونی دوهەمــی ١٩٧٠ ڕویداوە، بارزانی دەیویست هەمو ئەو جێگایانەی پارتی (م.س) داگیر بکات کە لێین بە تــایبەتی ناوچەکــانی هەولێر، کۆیە، هەڵەبــجە، چیــای شــنروێ، ناوچەی شوان، کەرکوک، قەرەداغ و دوکــان .. ئەم شــەڕانەش وەک زۆربەی زۆری شەڕەکانی تر بە ســودی لایەک کۆتــایی نەئەهــات، لە شــەڕێکدا لایەک ســەردەکەوت و لە شــەڕێکی تــردا لاکەی تــر، ئەوەی هــاوبەش بــو لەم شەڕانەدا، هاولاتی کورد بون کە دەبون بە قوربانی شــەڕێکی نەگریس و لە پێناوی هیچدا، سودمەندی یەکەمیش تەنها و تەنها دەسەڵاتدارانی بەغدا بو.

ســەیر لەوەدایە کە شــەڕی نێــوان پــارتی (بــارزانی) و حکــومەت خــامۆش بوبو، بەڵام شەڕی ناوخۆ لە پەرەسەندندا بو، "تا کۆتــایی ١٩٦٨ جگە لە چەند تێکهەڵچونێک لە نێوان شۆڕش و حکومەتی بەعسدا رووی نەدا"[١٣٥].

---

[١٣٤] د. بورهــان آ یاســین، د. ســەردار عەزیــز- دەوڵەتــی ســەربەخۆی کوردســتان، لە ناوەوە بونیادنان، لە دەرەوە دانپیانان، ل ١٩٧، چاپی یەکەم ٢٠١٧.

[١٣٥] حامید گەوهەر، مستەفا بارزانی، پێشمەرگە و سەرۆک، ل ٤٥٨

## بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠

ڕێکەوتنی مارتی ١٩٧٠، گۆڕانێکی بنەڕەتی بو لە مێژوی پەیوەندی نێوان بارزانی و حیزبی بەعسدا، بارزانی ئەیزانی تەنها لە ڕێگای ڕێکەوتنێکی بنەڕەتیەوە ئەتوانێت ئاشتی لە کوردستان بێنێتە دی و خۆیی ببێت بە پێشەوای جوڵانەوەی کورد و پارتەکەی ببێت بە ژمارە یەک لە کوردستاندا. هەروەها حکومەت چەندەها دەستکەوتی سیاسی، دبلۆماسی، دارایی لەسەر بناغەی ئۆتۆنۆمی بۆ پارتی بەسەرۆکایەتی بارزانی سەلماند.

ڕژێمی بەغدا، هەستی کردبو کە ئاشتی لە کوردستاندا بێ ڕێکەوتن لەگەڵ بارزانی نایەتەدی و پارتی بە سەرۆکایەتی بارزانیشی پێ لەناوناچێت.

پێش ئازار ڕژێم بیری لەوە کربۆوە، کاتیەکە لەسەرچاوەکەیەوە لێڵ و تێک بدات و بچێت گفتوگۆ لەگەڵ شای ئێراندا بکات بۆئەوەی ئێران یارمەتی بارزانی ببرێت، ڕژێم ویستی دوچۆلەکە بە بەردێک بکوژێت، سنورێک بۆ یارمەتی ئێران بۆ کوردە دژەکان دابنێت. وەفدێکی عێراقی لە پایزی ١٩٦٩دا گەیشتنە تاران و هەوڵیان دا کە شا ناچار بکەن، هاوکاریەکانی بۆ بارزانی بوەستێنێت، لە بەرامبەردا عێراق لە دوارۆژدا، تەنازول بۆ ئێران بکات، بەڵام شا ئەو پێشنیازەی ڕەتکردەوە، لەبەرئەوە هیچ چارەیەک لەبەردەم بەغدادا نەمابو، جگە لە ڕێکەوتن نەبێت لەگەڵ کوردەکان"[١٣٦].

حکومەتی بەعسیش نەی ئەتوانی لە شەڕدا دژ بە کورد بەردەوام بێت، گەیشتبوە ئەو باوەڕەی کە بە شەڕ کێشەی کورد چارەسەر ناکرێت و

[١٣٦] آوفرا بينغيو- كرد العراق، بناء دولة داخل دولة. ل. ٥٣- دار ئاراس-ساقی، ٢٠١٤.

ئاشـتیش لە کوردسـتان بەبـێ ڕێکەوتـن لەگەڵ بـارزانی بەرقەرار نابێـت و هەروەها ویستی کارتی کوردی لەدەست ئێران دەربهێنێت.

بەعسیەکان گەیشتبونە قەناعەتێک، ڕێکەوتنیان لەگەڵ باڵی (م.س) کاتیە و ئاشـتی لە کوردسـتان نـاهێنێتە ئـاراوە. بەعـس لەم هەنگـاوەدا کە بەسـەرکەوتنێکی گەورە بـۆ بـارزانی و خیانەتێـک بـو هاوپەیمـانی دوێنێـی گەڕایەوە، سیاسەتێکی نوێی گرتەبەر کە لە بەرژەوەندی خۆیدا بو.

یەکێتی سـۆڤێت، وەک دۆسـتێکی عێراق و کـوردیش لە ڕێگـای ئەفیگـین بریماکۆڤەوە، کە نوێنەری ڕۆژنـامەی پراڤدای روسـی بـو لە عێراق، هەوڵـی زۆریدا کە شەڕ بوەستێت و ئاشتی لە نێوان کورد و بەغدادا بێتەدی.

سـەرەتای گفتوگـۆ، بە دەستپێشـخەری بەعسـیەکان بـو، لە ئـابی ١٩٦٩ دا، کاتێ مورتەزا حەدیسی، وەک ئەندامی ناوەندی حیزبی بەعس، دو خۆێنکـاری کوردی بانگ کرد کە لە یەکێتی قوتابیانی کوردستانی (بـارزانی) چـالاک بـون، ئەوانیش ئەنوەر عەبدوڵا و قـادر حەمەئەمـین، کە یەکێکیـان لە زانکـۆی موسـڵ بو، ئەوەی تریان لە بەشی کوردی زانکۆی بەغدا بو، پێی ڕاگەیاندن، کە ئەوان ئەزانـن، کە ئەمـان سـەر بە پارتی (بـارزانی) ن و پێویسـتیانە کە پەیوەنـدی بە سەرکردایەتی پارتەکەیانەوە بکەن بۆ مەسەلەی گفتوگۆ.

پـارتی هەوڵیـدا پەیوەنـدی بەسـەرکردەکانی حیزبـی بەعسـەوە بکـات، لە ١٩٦٩/١٢/٢٤ دارا تۆفیـق بە یـاوەری عەبـدولخالق سـامەرایی و مـورتەزا حەدیسـی لە بەیـروت چاویـان بە میشـیل عەفـلەق، وەک ئەمینـداری حیزبـی بەعـس کەوت و ئەویـش ڕەزامەنـدی لەسـەر ڕێکەوتنـی بەعـس و پـارتی (بـارزانی) دەربـڕی، دەربـارەی بـاڵی مەکتەبـی سیاسـی وتبـوی: "کـۆمەڵێکی ڕۆشـنبیر هەن کە نـوێنەری ڕۆشـنبیرانن وەک کـۆمەڵی ئیبـراهیم ئەحـمەد و جەلال تاڵەبـانی، ئەوانەی کە زۆر خـاڵی هاوبەشـیان لەگەڵ حیزبـی بەعسـدا دۆزیەوە لەوانەی تر و پشتگیری بەعسیشیان هەبو، ئێمە هەست دەکەین کە جۆرێک لە ئیلتیزامان پێوەیان هەیە، بێ ئەوەی ئەوان بە نـوێنەری بزوتنەوەی

شۆڕشی کورد بزانین، لەبەر سەرکردایەتی بارزانی قورسایی شۆڕشەکەیە و کۆمەڵی ئیبراهیم نوێنەری بەشێکی رۆشنبیرن"[137].

دارا تۆفیق لەو سەفەرەیدا لە ١٩٦٩/١٢/٢٣ نامەیەک بۆ بارزانی دەربارەی ئەنجامی گفتوگۆکانی لەگەڵ حیزبی بەعس دەنێرێت و جەخت لەسەر دژایەتی پارتی (م.س) دەکات و دەنوسێ " یەکێک لەو قسانەی ئەحمەد حەسەن بەکر پێی وتم، ئەوە بوو کە جەلالیەکانیش برامانن و منیش بە هەمو رونیەک بەرپەرچمدایەوە و وتم :ئێمە ئەوانە بە دوژمنی خۆمان دەزانین و چاوپۆشیان لێناکەین.."[138].

ئەمە بۆچونی یەکێکە لە ئەندامەکانی سەرکردایەتی پارتی،کە لە دەرەوەی وڵات خوێندنی تەواو کردوە، لە کاتێکدا ئامادەیە ئاشتی لەگەڵ حکومەتی بەعس مۆر بکات، بەڵام نەیارەکانی و هەڤاڵانی دوێنێی بە دوژمن ئەداتە قەڵەم!.

بارزانی هەنگاوێکی ئازایانەی نا، کە هەوڵی رێکەوتنی لەگەڵ بەعسدا، چونکە لەوکاتانەدا، پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ ئێران و ئیسرائیل هەبو، وە هەردو دەوڵەتەکە پێیان باش نەبو، ئەو رێکەوتنەی لەگەڵ بەعس بە ئەنجام بگات، "بارزانی و شێخ بابە عەلی شێخ مەحمود رۆژی ١٩٧٠/١/١٥ بەرەو تاران چوون و رۆژی ١٩٧٠/١/١٦ لە لایەن شای ئێرانەوە پێشوازیان لێکرا. لەو دیدارەیدا شا بە بارزانی گوت: "ئەم رێکەوتنە لە بەرژەوەندی حیزبی بەعس و یەکێتی سۆڤێت دایە، و بە ناوی خۆی و بەناوی کاربەدەستانی ئەمریکاوە بەڵێنی بە بارزانیدا، کە ئەگەر ئەو رێکەوتنە قبوڵ نەکات، هەمو جۆرە یارمەتیەک دەدا بە شۆڕش، تەنانەت ئەگەر لە رووی سەربازیشەوە بێت"[139].

بارزانی بە راشکاوانە پێش راگەیاندنی بەیانی ئازار و لە ١٩٧٠/٢/٦ دا، لە چاوپێکەتنێکدا لەگەڵ نوێنەرانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان، کە سەردانیان

---

[137] زیارة للاماضی القریب، ص ١٥١.

[138] مستەفا بارزانی، پێشمەرگە و سەرۆک، ل ٤٩٧.

[139] هەمان سەرچاوە، ل ٥٠٨.

کردبو لە گوندی قەسرێ، لەسەر پرسیاری هەڵوێستی شای ئێران دەربارەی ئەو ڕێکەوتنامەیە دەڵێ: "ئێمە بەرژەوەندی خۆمان لەسەر هەمو بەرژەوەندیەک دادەنێین، ئەوەی ئێمە پێی هەڵساوین بزوتنەوەیەکی داکۆکی کردنە لە خۆمان، ئەگەر هاتو زوڵم و زۆرداریمان لەسەر نەما، ئەوکاتە قبوڵی ئاشتی دەکەین، بەڵام لێرە من پێتان دەڵێم بە هیچ شێوەیەک بڕواو متمانەم بە (شا) نیە" (فەرهاد عەونی، بیرەوەری، ڕۆژگارم ئاوا تێپەڕی. هەولێر ٢٠١٦، ل ٢٠٥)

## ڕۆڵی دەوڵەتانی دەرەوە لە بەیانی ئازاردا

بێگومان نە شای ئێران و نە ئیسرائیل و نە ئەمەریکاش دڵخۆش نەبون بە ڕێکەوتنی نێوان بارزانی و بەغدا، سەرەڕای ئەو ناڕەزایانە، بارزانی ئەو هەنگاوەی نا، کە بە هەنگاوێکی نەترس و سەربەخۆیانە ئەژمێردرێت: "ئێران و ئیسرائیلیەکانیش لێبڕاوانە بڕیاریان دابوو ڕێگە لە ڕێکەوتنی کورد-عێراق بگرن، لەسەرەتای مانگی مارتدا کاربەدەستانی ساواک پەیوەندییان بە بارزانییەوە کرد و داوایان لێکرد بۆ دەمەتەقێ و تاوتوێکردنی باسەکان نێردەیەک ڕەوانەی تاران بکا، ئەوە بوو لە چواری مارتدا کوڕی مەلا مستەفا (ئیدریس بارزانی) گەیشتە تاران، چاوی بە نوێنەرەکانی ئێرانی و ئیسرائیلیەکان کەوت. بە گوێرەی سی ئای ئەی بێ، ئیسرائیلیەکان فشاری زۆریان ئەوە بو، کە شەڕ و کوشتار لە باکووری عێراق دەستپێبکرێتەوە و بەڵێنی ئەوەشیان بە کورددا، چەکی دژە ئاسمانی، تۆپخانەی سووک، ترومبێلی زرێپۆش، ترومبێلی نەفەر هەڵگری گولەنەبڕ و تەنانەت تانکیشیان پێدان.."[١٤٠].

[١٤٠] ئەرێ کورد بوونە بەردەباز؟ بریان ڕۆبەرت گیبسن، سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا، عێراق کورد و جەنگی سارد، ١٤ی تەمموز ١٩٥٨ تا ٢٠ی ئازاری ١٩٧٥- ل ٢٩١- و: شەفیقی حاجی قادر، ٢٠١٩.

سەرەڕای ئەوەی ئێرانیەکانیش بەڵێنی زیادکردنی هاوکاریان بە بارزانیدا، لەبەر ئەوە ئەو هەنگاوەی بارزانی بە ڕەتکردنەوەی ئەو بەڵێنانە جگە لە هەڵوێستێکی نیشتیمانی سەربەخۆ نەبێت، هیچ لێکدانەوەیەکی تر هەڵناگرێت.

لێکدانەوەی ئەمەریکیەکان دەربارەی ڕێکەوتنی ئازار لە ڕوانگەی کێشەکانیان لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتەوە لێکئەدایەوە، کە بە پیلانی سۆڤێتیان ئەدایە قەڵەم، بۆئەوەی سوپای عێراقی لە کوردستان بکشێتەوە و بەرەو سنورەکانی ئیسرائیل بچێت.

دوای هاتوچونێکی زۆر لە نێوان بەغدا و کوردستاندا، کە سیاسەتمەداری عێراقی و دۆستی کورد، عەزیز شەریف ڕۆڵی دیاری تێدا بینی، هەنگاو بە هەنگاو لە ١١ مارتی ١٩٧٠ دا بەیانی هاوبەش لە نێوان مەلا مستەفا بارزانی و سەدام حوسێندا مۆرکرا. سەدام لەناو بەعسدا بە ئەندازیاری ڕێکەوتنامەکە دەژمێرێت، ئەویش بە پشتبەستن بە بڕیاری کۆنگرەی حەوتەمی قوتری بەعس بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ بارزانی بۆ چارەسەری کێشەی کورد، ئەگەر سەدام خۆی نەچوایە بۆلای بارزانی و قورسایی سیاسی خۆی نەخستایە سەر ئەو ڕێکەوتنە، بەدڵنیایەوە، ١١ ئازار بەو شێوەیەی بینیمان، دەرنەئەچو. (Frankfurter Allgemeine ٢٧/١/١٩٧٠)

بەیانی ئازار، کۆتایی بە شەڕی ناوخۆی کورد هێنا کە نزیکی پێنج ساڵی خایاند. ڕێکەوتنامەکە گۆڕەپانی سیاسی و پێشمەرگایەتی لە کوردستان بۆ پارتی بەسەرۆکایەتی بارزانی ساغ کردەوە، بونەوە بە تاکە هێزی بێ ڕکابەر.

پارتی کۆمەڵێک دەستکەوتی سیاسی و ئیداری لە بەیانی ئازاردا بەدەست هێنا، بەڵام ئەوەی لە هەمویان گرنگتر بو دەسەلاتی بنەماڵەی بارزانی لەناو پارتیدا پتەوتر کرد. کاتێ ئیدریس و مەسعود بارزانی ڕۆڵی سەرەکیان هەبو لە ئامادەکردن و مۆرکردنی بەیانەکەدا، هیچ پۆستێکی حیزبی باڵا و دیاریان نەبو، بەڵکو لە کۆنگرەی هەشتەمی پارتیدا لە ١ تەموزی ١٩٧٠ کە لە ناوپردان گیرا، وەک ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێران.

لەو کۆنگرەیەدا، هەندێ وەک ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بە پێشنیازی ئیدریس و مەسعود بارزانی هەڵبژێران، کە شایستەی ئەو شوێنە نەبون، "لە لیستەکەدا هەندێ کەسی نەخوێندەواری تێدابو، کە تا ئەو کاتە کاریان لە بواری سیاسیدا نەکردبو، بەڵام ئەوانە تەنها سەرکردەی پێشمەرگە بون، بەڵام لە کاتی ئاشتی و دوای ڕێکەوتنی ئازار شوێن و کارەکانی پێشمەرگایەتیان لەدەست دابو، نەئەتوانرا پۆستی حکومی وەربگرن، لەبەرئەوە وەک نوێنەری پێشمەرگە لەسەرکردایەتیدا هەڵبژێران..هەروەها هەندێ ئەندامی نوێ لە کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێران، کە تازە بوبون بە ئەندام، هەرچەندە پەیڕەوی ناوخۆی پارتی دەڵێ ئەو ئەندامەی کە خۆی بۆ کۆمیتەی ناوەندی هەڵدەبژێرێت، ئەبێ بەلای کەمەوە دو ساڵ بەسەر ئەندام بونیا لەناو پارتی بەسەرچوبێت"[141].

## بەیانی ئازار و چەسپاندنی دەسەڵاتی خانەوادە

دوای ئەم ڕێکەوتنامەیە، خانەوادەی بارزانی هەوڵی خۆیاندا، دەسەڵاتیان لەناو هەمو دەزگاکانی پارتی و شورش بچەسپێنن، هەنگاوی یەکەم گەشەپێدانی بارەگای بارزانی بو، کە بە دەسەڵاتترین دەزگای شۆڕش دەناسرا و سەرپەرشتی هەمو کاروباری پێشمەرگە، سیاسی، ڕاگەیاندن و دارایی و پەیوەندیەکانی دەکرد. هەروەها دانانی ئیدریس بارزانی وەک لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری و مەسعود بارزانی وەک سەرۆکی دەزگای پاراستن.

دروستکردنی ئەم دەزگایانە و خستنە ژێر ڕکێفی ماڵی بارزانیەوە، هیچ مانایەکی بۆ حیزب و دەزگاکانی وەک مەکتەبی سیاسی یان کۆمیتەی ناوەندی نەهێشتەوە، چونکە هەمو کارە گرنگەکان لەو شوێنانە بون کە لە ژێر دەسەڵاتی خانەوادە بارزانیدا بون، ئەگەر هەر کارێکی تریش هەبوایە لە

---

[141] جرجیس فتح الله- زیارة للماضي القریب، ل ٦٦.

دەرەوەی ئەو دەزگایانە، ئەوە بێ رەزامەندی ئیدریس و مەسعود نەئەچو بەرێوە، بە تایبەتی دەزگای پاراستن، پەلی بۆ ناو هەمو جومگەکانی پارتی و دەرەوەی پارتی کێشابو، کە پەیوەندیان بە پارتی و شۆڕشەوە هەبو. هیچ دەزگایەکی حیزبی یان پێشمەرگایەتی یان کۆمەلایەتی نەبو کە پاراستن نوێنەری تێدا نەبێ، حکومەتێک بون لەناو حکومەتێکدا، بەهۆی ئەم کارانەوە رۆژ بەرۆژ قورسایی و سەنگی سیاسی و رۆڵی پارتی وەک حیزب کەم دەبوەوە. ئەندامێکی ئاسایی پاراستن چەندەهاجار رۆڵی لە کادیریکی بەرزی پارتی زیاتر هەبو، مەکتەبی سیاسی و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیان بە کاروباری لاوەکیەوە خەریک کردبو.

مەسعود بارزانی، لەوبارەیەوە نوسیویتی "لە ئایاری ١٩٦٦ دا، بارەگای بارزانی پێکەوەنرا و ئیدریسی برام بەرپرسی ئەو بارەگایە بوو، کارەکەی وا رێکخرا کە من یارمەتیدەری بم، ئەم بارودۆخە تا ١٩٦٧ بەردەوام بو،کە من تێگەیشم پێویستمان بە دەزگایەکی ئاسایش و هەواڵگری (ئەمن و ئیستیخبارات) هەیە، بۆ شۆڕش، کاری پێکەوەنانی ئەم دەزگایە بەمن سپێرا"[١٤٢].

جرجیس فەتحولا بەم شێوەیە باسی سەرکرایەتی ئەو کاتەی پارتی دەکات "سەرکردایەتی نوێی پارتی ئینسجامیان لە نێواندا نەبو، لە ئەنجامی هەڵبژاردنی دیموکراتی دەرنەچوبون، دانرابون لەبەرئەوەی سەرۆکی حیزب پێویستی پێیان بو، کاروبارەکانیان بریتی بو لە کاروباری نوسین و ئیداری لە ناوچەکانی خۆیان، کۆبونەوەکانی مەکتەبی سیاسی، باسی بڕیاری شکڵی دەکرا و بڕیاری گرنگ لەوێ نەئەدرا..حکومەت هەوڵی ئەدا بکەونە دنیای گەندەڵیەوە، بۆ نمونە رێیاندابو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ئۆتۆمبیل لە دەرەوە بێ گومرگ بهێنن، ئەوانیش شەڕیان لەسەر دەکرد بۆ کڕینی و دوایی بۆ فرۆشتنەوەی بە نرخێکی زۆر بەرزتر، یەکێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی

[١٤٢] بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، ل ٢٣٣.

ئۆتۆمبیلێکی کری و فرۆشتیەوە و خانویەکی پێ کری[143].

بۆ جێبەجێکردنی خاڵەکانی ڕێکەوتنامەی ئازار، لیژنەیەک لە نێوان بەعس و پارتیدا دروست بو، بە ناوی (لیژنەی ئاشتی)، شارەزای کێشەی کورد (حازم جواد) دەنوسێ: "هەر کاتێ پێویست بوایە، ئەم لیژنەیە لە حاجی ئۆمەران بە ئامادەبونی هەردو کوڕەکەی بارزانی، ئیدریس و مەسعود کۆدەبونەوە بۆ باسکردنی شێوەی جێبەجێکردنی هەمو خاڵەکانی ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازار. هەمو ئەندامانی لیژنەکە و جێگرەکانیان بەو ئۆتۆمبیلانە ئامادە دەبون، کە ئاڵای عێراقی پێوە ئەشکایەوە، ئەو ئۆتۆمبیلانە هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی گفتوگۆوە تا کۆتاییەکەی، بە جانتای سامسۆنایتی نایابیەوەو، کە سەفتە دینار و دۆلاری تێدابو، جارێک لە سەرۆکی بەتەمەنەوە (ئەحمەد حەسەن بکر) و جارێکی تر لە سەرۆکی گەنجەوە (سەدام حسێن)، ئەمە دەها جار دوبارە بۆتەوە"[144].

---

[143] جرجیس فتح الله. لماذا تبقى الحقائق مكتومة، ل ٩، ١٥.

[144] القدس العربي، ذكريات حازم جواد- ع ٥٣٨٥ -٢٠/٩/٢٠١٦.

# یەكگرتنەوەی هەردوباڵەكەی پارتی

بەیانی ١١ ی ئازار، بە سەرەتای كۆتایی شەڕی ناوخۆ دائەنرێت، هەر بە خوێندنەوەی بەیانەكە، گۆڕەپانی سیاسی كوردستان گۆڕانی بنەڕەتی بەسەرداهات، نەک هەر شەڕی ناوخۆ نەما، بەڵكو شەڕی پارتی و عێراقیش نەما و پارتی و بارزانی بون بە هێز و سەرۆكی یەكەمی بێ ركابەر لە كوردستاندا.

لەو ماوەیەدا كوردستان هێمنی و ئارامیەكی بەخۆیەوە بینی كە زۆر دەمێک بو، تامەزرۆی بو، هەروەها لەو ماوەیەدا گەشەكردنێكی رۆشنبیری، كۆمەڵایەتی بەخۆیەوە بینی، بەڵام ئازادی سیاسی بەرتەسک ببوەوە و لە كوردستاندا، جگە لە پارتی، هیچ هێزێكی تری كوردی نەبو بتوانێ بە ئاشكرا چالاكی سیاسی بنوێنێت.

لەم كاتەدا كە بارزانی كەسایەتی یەكەمی بێ مونافیس بو، هەستا بە دەستپێشخەریەک بۆ ئاشتەوایی گشتی كە بە هەنگاوێكی گەورەی نیشتیمانی دائەنرێت، كە رێكەوتن بو لەگەڵ باڵی (م.س)، ئەو رێكەوتنە كۆتایی بە شەڕی پێنج ساڵەی ناوخۆی كورد هێنا، مام جەلال لەو بارەیەوە دەڵێ: "پاش ماوەیەک، مەلا مستەفا ناردی بەشوێن مندا، فاخر مێرگەسۆریی نارد، فاخر مێرگەسۆریی پەیوەندی پێوەكردم و گوتی: (مام جەلال ئەمەوێ بێم بۆ زیارەتت و راسپاردەی جەنابی بارزانیم پێیە)، منیش گوتم بەخێربێیت، گوتم: كەی دێیت؟ گوتی: سبەینێ، گوتم: كەواتە سبەی نیوەڕۆش لە ماڵی مامۆستا ئیبراهیم بەیەكەوە نان ئەخۆین، ئەویش گوتی زۆر باشە. كە فاخر هات ١٠ كەسی لەگەڵدابو، زۆر رێزمان لێگرتن و دوای نان خوادن، گوتی: (وەڵڵا دو قسەم هەیە پێم خۆشە بەتەنیا بیكەین)، چوین جیابوینەوە و

گوتی: (مەلا مستەفا ناردومی بۆ لای تۆ، گوتویەتی: بە جەلال بڵێ بێت بۆ لام، هەندێک قسە هەیە پێی ئەڵێم، وەعدی ئەدەمێ وەعدی پیاو، ئەگەر نەگەیشتینە ئەنجام بەسەلامەتی، بگەڕێتەوە)، گوتم: فاخر من تۆ بە پیاو ئەزانم و بەقسەشت ئەکەم، لەسەر مسئولیەتی تۆ ئەوەش ئەکەم، بەڵام بەشەرەفت ئایا مەلا مستەفا بەڕاستی نامگرێت؟ گوتی: (بەشەرەفم بەڕاستیتی و ناشتگرێت). فاخر گوتی: (من خۆم دێم لەگەڵتدا)، فاخر هات و منیش بە ٥ -٦ چەکداری خۆمانەوە لەگەڵ فاخیر ڕۆیشتم بۆ لای مەلا مستەفا.

ئێوارە گەیشتینە بارەگای بارزانی ئەوەندەمان زانی بارزانی هات و چاک و چۆنیەکی گەرمی لەگەڵ کردم، سامی عەبدولرەحمان و کوڕەکانی بارزانی هەمویان دانیشتبون و زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنیان کردم. مەلا مستەفا ڕوی تێکردم و گوتی: (جەلالە شێت، تۆ ئەبوایە دەمێک بوایە لێرە بویتایە، فەرمو ئەها چیت بەسەر من هێنا و چیت بەسەر خۆت هێنا)؟.

دوایی بەجەماعەتی گوت: (من و جەلال، کۆنە ڕەفیقین، بۆخۆمان ئەچینە ئەم ژورە، قسەی تایبەتیمان هەیە).

چوینە ژورەکە و دەستی بە قسەکردن کرد، مەلا مستەفا عادەتێکی هەبو، شتێکی چەند جارێک ئەگوتەوە، ئەبوایە دەنگ نەکەی هەتا لێ ئەبێتەوە. کۆمەڵێک قسەی کرد، کە ئێمە چیمان کردوە و چیمان گوتوە و لەو جۆرە قسانە. ئەو هەمو قسەکانی خۆی کرد، کە لێبۆوە منیش گوتم: زۆر بە گرنگی نازانم ئەو قسانە بڵێمەوە، بەڵام هەموی خەتای یەک ئینسان بو کە ناوی مەلا مستەفای بارزانیە! من کۆمەڵێک بیرەوەریم هێنایەوە یادی لەوانە مەسەلەی سەنگەسەر، گوتم: تۆ واتکرد، خەتای تۆ بو دەنا ئەوە نەدەقەوما، ئاخرجار فوئاد عارفم نارد بۆلات، هەمو ئەو قسانەم کرد، گوتی: (بەڵێ ئەو قسانەی تۆش ڕاستە)، لەبەرئەوە گوتی: (باشە ئێستا ئەڵێیت چی)؟ گوتم: من هاتوم بۆلای جەنابت تۆ ئەڵێیت چی؟ گوتی: (باشە جەلال تۆ ڕەئی خۆت بڵێ)، منیش گوتم: ئێمە ئێستا حیزبێکی بچکۆلەین و جەنابیشت حیزبێکی گەورەت هەیە، ئێمەش دێینەوە لە کوردستان لە

ژێر قیادەی تۆ حیزبایەتی خۆمان ئەکەین، وەک حیزبی خۆما. من لێم پرسی بۆچونی ئێوە چیە؟ ئایا ئەم ڕێککەوتنەی ئازار سەرئەکەوێ و مەسەلەی ئێمە بەرەو کوێ ئەڕوات؟ ئەویش گوتی: (چەند خاڵێک هەیە گرنگە کە بیزانیت:

یەکەم: بەعسیەکان بەڕاستیان نییە، ئەوە فرت و فێڵە لێمان ئەکەن، من زۆر بە ترسناکی ئەبینم، خۆم قەت وەکو ئەمڕۆ لە خەتەردا نەدیوە، خەڵک وا ئەزانێ، ئێمە سەرکەوتوین، بەڵام من وای نابینم.

دوەم: بە ئیبراهیم ئەحمەد و عومەر دەبابە بڵێ، ئەوانە خۆیان بە سیاسی ئەزانن بەڵام هیچ لە دنیا نازانن، وەڵڵا وەبیلا وەتیلا، ئەو ڕۆژەی مەلا مستەفا لە بەغدا هەڵدەواسرێ و لە سێدارە ئەدرێت دەستی ڕاستی ئیبراهیم ئەحمەد هەڵواسراوە، دەستی چەپی جەلالە شێت هەڵواسراوە، ئەولاتریش عومەر دەبابەیە، ئێوە خراپ لەوە گەیشتون، ئێمە چارەنوسمان پێکەوە بەستراوە و ئەو حکومەتە دژی هەمو کوردە)"[145].

مەسعود بارزانی، بە شێوەیەکی تر، باسی نزیک بونەوەی بارزانی و پارتی (م.س) دەکات: "لە یادمە یەکێک لە نیشتیماپەروەرە دڵسۆزەکان کە ناوی ڕەشید بو، هاتبوو بۆ بارەگای لقی چوار داوای دیتنی منی کردبوو، منیش محەمەد عەزیزم نارد بزانم چی ئەوێ، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو هیچی بۆ باس بکات و سوربوو لەسەر ئەوەی دەبێ من خۆم بیبینم، منیش بانگم کردە لای خۆم و پێی گوتم: جەلال و تاقمەکەی منیان ناردوە تا بە زمانی ئەوانەوە پێتان بڵێم دەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ باوەشی شۆڕش و هیوایان وایە بارزانی لێیان خۆش ببێ.."[146].

مام جەلال دەربارەی گێڕانەوەکەی مەسعود بارزانی دەڵێ: "ئەمە دورە لە ڕاستیەوە، موبادەرەکە لە خودی بارزانی خۆیەوەبو، ئێمە کەسمان نەناردوە و لەسەرەتادا ئاشتبونەوەمان نەئەویست و هیچ بڕیاریشمان نەبو کە لەگەڵ

---

[145] مام جەلال- بەرگی یەکەم. دیداری تەمەن، ل ٣٦٥.

[146] مەسعود بارزانی و بزوتنەوەی... بەرگی سێیەک، بەشی دووەم، ل٥٨.

مەلا مستەفا ئاشت ببینەوە، بەڵکو بڕیارمان وابو، کە خەباتی سیاسی بکەین و دابەشببین بەسەر دەرەوە و ناوەوەدا، بارزانی خۆی موبادەرەی کرد"[147].

هەر دەربـارەی شـێوەی نزیکبـونەوی هەردوبـاڵەکەی پـارتی، شـەکیب عەقـراوی، وەک سـەرکردەیەکی دیـاری دەزگـای پاراسـتن، بەم شـێوەیە دەیگێڕێتەوە: " لە مانگی ئایاری ١٩٧٠ دا، مامۆستا جەلال تاڵەبانی، لە ڕێگای خوالێخۆشبو، فاخیر محمەد ئاغای مێرگەسوری پەیوەندی بە بارزانیەوە کرد، بە مەبەستی گەڕانەوەی بۆ ناو ڕیزەکانی شۆڕش، بارزانیش خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بە گەڕانەوەی ئەو و هاوڕێکانی"[148]. شەپۆل کچی فاخیر مێرگەسوری، لە کتێبی (زمانی تاوان- ل ٥٠) گێڕانەوەکەی مام جەلال پشتڕاست دەکاتەوە، کە بارزانی باوکی ڕاسپاردوە بۆ ناوبژی لەگەڵیدا.

بۆ ئاشتی گرنگ نیە، کێ دەستپێشخەری کردوە، یان نەیکردوە، گرنگ ئامانجەکەیە، ئەم دەستکەوتە لە کۆتاییدا بە هەنگاوێکی جوامێرانە بۆ بارزانی دەگەڕێتەوە، ئەو لە کاتێکدا دەستی دۆستایەتی و ئاشتبونەوەی بۆ پارتی (م.س) درێژکردوە، کە خۆی بوبو بە کەسایەتیەکی گەورە و سەرکەوتوی کورد لە ناوەوە و لە دەرەوە و حسابی بۆ دەکرا و پارتەکەشی بە پارتە سەرکەوتوەکە ئەژمێرا..بە پێچەوانەشەوە پارتی (م.س) بە دۆڕاوی گۆڕەپانی سیاسی کوردستان ئەدرایە قەڵەم.

د. مەحمود عەلی عوسمان دەربارەی هەڵوێستی بارزانی بۆ یەکگرتنەوەی هەردو باڵەکەی پارتی دەڵێ: "لە کاتی دەنگدان بۆ گەڕانەوەی کۆمەڵی مەکتەبی سیاسی بۆ ناو پارتی، ئێمە دەستێکمان بەرز کردەوە، بەڵام مەلا مستافا بارزانی، هەردو دەستی بەرزکردەوە بۆ گەڕانەوەیان. دەڵێت: "لە مستەفا بارزانیمان پرسی، بەڕێز بۆ هەردو دەستت بەرزکردەوە؟ مستەفا

[147] دیداری تەمەن- بەرگی ١، ل ٣٦٥.

[148] سنوات المحنة.. ل ٣٠٦.

بارزانی گوتی: ئەوانە برای ئێمەن، بێنەوە بۆ لای خۆمان لەوە باشترە كە دوژمن سودیان لێوەربگرێت"[١٤٩].

چونی مام جەلال و هاوڕێكانی بۆ لای مەلا مستەفا، لاپەڕەیەكی نوێی لە نێو ریزەكانی پارتی دیموكراتی كوردستاندا هەڵدایەوە و كۆتایی بە شەڕێكی خوێناوی ناوخۆ هێنا، كە هەمولاكان كەم و زۆر بەشیان تێدا هەبوە و هیچ لایەكی سیاسی نەبو بە كراسی سپی پاكەوە هاتبێتە دەرەوە.

دەربارەی كۆتایی شەڕی ناوخۆ، مام جەلال بەم شێوەیە باسی دەكات: "شەڕی سالانی ١٩٦٦ تا سالی ١٩٦٩ مەلا مستەفا سەپاندی و ئەبوایە بكرایە، ئێمە دو رێگامان لەبەردەمابو، یان تەسلیم بین، یان بەرگری بكەین، لەبەرئەوە هیچ چارەیەك نەمابویەوە، ئایا ئەوكارە چاكترە كە رویدا، نەخێر، ئەوە كارە باشەكە نەبو، نەخێر باشتر ئەوەبو، لەسەرەتاوە شەڕ نەبێ، راستتر وابو ئێمە و مەلا مستەفا هەركەسە چالاكی سیاسی خۆی و حیزبی خۆی هەبێت و بیروباوەڕی خۆی هەبێ"[١٥٠].

دوای گەڕانەوەی مام جەلال لە ناوەڕاستی تشرینی یەكەمی ١٩٧٠ دا، وەفدێكی تر كە بریتی بون لە ئیبراهیم ئەحمەد، عەلی عەسكەری و عومەرد دەبابە چون بۆ لای بارزانی و بەگەڕانەوەی ئەوان زەمینەی یەكگرتنەوە هاتەكایەوە و تەنها هەنگاوە شكڵیەكان بۆ باڵی مەكتەبی سیاسی مایەوە، كە بریتی بو لە بەستنی كۆنگرەیەك.

لە ٢٧ تشرینی دوهەمی ١٩٧٠ لە بەغدا بە ئامادەبونی سەد ئەندامێك كۆنگرەیەك بەسترا، لەسەرەتادا ناوی پارتی گۆڕا بۆ (پارتی شۆڕشگێری كوردستان) و كۆنگرە پێشنیازی ئەندامانی (م.س) یان قبوڵكرد بە هەڵوەشانەوەی پارتەكەیان و چونە ناو ریزەكانی پارتی دایك، پارتی دیموكراتی كوردستان.

---

[١٤٩] نەجم سەنگاوی، باشوری كوردستان، ل ٣٦٧.

[١٥٠] دیداری تەمان، بەرگی ١. ل ٣٧١.

مـــام جەلال دەربـــارەی شـــێوەی یەكگـــرتنەوەی هەردو بـــاڵەكە لە چاوپێكەوتنێكـدا دەڵـێ: "دوای دانوســـتانێكی درێـــژ، بڕیـــاردرا كە رێـــژەی بەشداربونمان لە هەمـو دەزگاكـانی حیزب و رێكخـراوە جەماوەریەكاندا ٤٠٪ بـۆ ئـێمە و ٦٠٪ بـۆ ئەوان بێت، سـەركردەكانمان بـۆ مـاوەی یەک سـاڵ لای ئەوان بمێننەوە".[151]

دەربارەی یەكگرتنەوەی هەردوباڵەكە، یـان حەلكردنی باڵی (م.س) حیلمی عەلی شـەریف وەک ئەندامی بـاڵی (م.س) دەڵێ " فـاخیر مێرگەسۆری وتبوی بـۆیە منـی بـۆ جێبەجێكردنـی ئەم فەرمـانە نـاردوە، ئەم كـارە گـرنگەی پێسپاردوم، چونكە كاربەدەستانی پارتیەكەی هـاتنەوەی ئێوەیـان پێناخۆشـە و وائەزانـن كە جێگەیـان پـێ لەق ئەبێـت، لەبەرئەوە، ئەگەر ئەوان ئاگـاداربن و بـكەونە بەیـنەوە لە بریتـی یەكخسـتن، تێكـی ئەدەن. ئەم كـارە سـەركەوت و پارتی دیموكراتی كوردستان (م.س) بە چەند سەعاتێک نـاوی خـۆی گۆری بە پـارتی شۆڕشـگێری كوردسـتان و لە كـۆنگرەی حەوتـدا بڕیاڕیاندا تـێكەڵ بە پـارتی دیمـوكراتی كوردسـتانی مەلا مسـتەفا ببـنەوە و ئەم نـاو گـۆڕینە دەستكردەش هەر بۆ ئەوەبو، نەڵێن پارتی تێكەڵی پارتی ئەبێتەوە".[152]

رۆژنامەی (التآخي) زمانحاڵی پارتی لە ژمارە ٦٥٩ ی ١٩٧١/٢/١١ دا لەژێر ناوی (پارتی شۆڕشگێری كوردستان خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە و دەچێتەوە ناو پارتی دیموكراتی كوردستان).

بە گەڕانەوەی بـاڵی مەكتەبـی سیاسـی بـۆ نـاو پـارتی بە سـەرۆكایەتی بـارزانی، لاپەرەیەک لە شـەڕی نـاوخۆ كۆتایهـات و تەنهـا یەک پـارتی لە كوردستان مایەوە كە بە دەسەلاتترین هێزی بێ ركابەر بو.

لە دوای یەكگرتنەوەی هەردو باڵەكە، بارودۆخێكی هێمن تا مارتی ١٩٧٤ هاتە كایەوە، هیچ شـەڕێكی چەكداری گەورە روی نەدا لە نێوان هێزەكانی

---

[151] گۆڤاری الوسط، ژ. ٣٥٥ی ١٩٩٨/١١/١٦.

[152] بەراوردێک لە نێوان ١٩٦٦ و ١٩٩٦، ل ٤٧.

کوردستانی عێراق و رژێمدا، هەروەها شەڕێکی دیار روی نەدا لەگەڵ هێزی تری کوردی یان عێراقی، چونکە هیچ هێزێکی چەکداری ئاشکرا لە گۆڕەپانی ئەم ناوچەیە نەمابو، هەموی کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی تەواوی بارزانی و پارتیەوە.

## کورتەی شەڕی ١٩٦٤-١٩٧٠

سەرەڕای ئەوەی شەڕی ناوخۆی نێوان بارزانی و باڵی (م.س)، کە بەرەو کۆتایی رۆشت، بەڵام کاریگەرییەکانی ئەو شەڕە بەشێوەی جیاواز تا ماوەیەکی درێژ مایەوە و دەمێنێتەوە.

لەم نوسینەدا باس لە هۆکار و ئەنجامەکانی شەڕەکە کراوە، ئەوەی ماوە بوترێت، ئەوەیە کە ئایا ئەتوانرا ئەو شەڕە، دەست پێنەکات؟ یاخود ئەوەندە نەخایەنێت؟.

"ئەو کێشانەی پەیوەندیان بە بنیاد و پەیکەری پێکهاتەی پارتیەوە هەبووە، پارتی هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە تووی ناکۆکی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو، ئەم ناکۆکیانەش وا دەرکەوت کە ئەمری واقیع بن، چونکە پارتێک کە بیەوێت ئەندامەکانی بریتی بن لە هێزە نەتەوەیەکان و دیموکراتخوازەکان و کۆمۆنیستەکان، هەندێک لە سەرکردایەتیەکەشیدا گەورە پیاوانی موڵکداربن کە ئەرکەکانی بەڕێوەبەرن، شتێکی سروشتی دەبێت، کە لە ریزەکانی ئەو پارتەدا جیاوازی لە نێوان رەگەزە ناگونجاوەکانیدا بێت و ناکۆکی تێدا سەرهەڵبدات"[١٥٣].

شۆڕشی کورد یان بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، لەسەرەتای دەستپێکردنی خەباتی چەکدارییەوە تا هەرەسی ئازاری ١٩٧٥، لەژێر

---

[١٥٣] کاوە تەیب جەلال، ل ٢٤، کەرتبون لە نێوان..لە کێشەی کورد لە عێراق، د. حامید مەحمود عیسی.

کاریگەری دەوڵەتە بێگانەکاندا بوە، بە تایبەتی ئێران، ئەمریکا، ئیسرائیل. هاوکاری ئەو دەوڵەتانە بۆ ئەوە نەبوە کە کورد سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، بەڵکو بۆ ئەوەبوە کە لە ڕێی شۆڕشی کوردەوە ڕژێمی عێراق لاوازبێت و هەمیشە کێشەی ناوخۆیی هەبێت. "تەنانەت ئێران بە هیچ جۆرێک نەیدەهێشت شۆڕشگێرانی کورد لە بەشی سێ ڕۆژ زیاتر تەقەمەنی و تفاقی جەنگیان لەبەردەستا بێت، بۆ ئەوەی نەتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر درێژە بە جەنگ بدەن"[١٥٤].

دەوڵەتانی دراوسێ، سەرەڕای کێشەی نێوانیان، خاڵی هاوبەشیان ئەوەبوە کە نەهێڵن تەبایی و یەکریزی لە نێوان کوردا دروست ببێت، جگە لەوەی کە ئێران هاوکاری پارتی (م.س) کردوە دژ بە بارزانی، لە قۆناغێکی تردا، هەر ئەو دەوڵەتە هاوکاری بارزانی کردوە دژ بە پارتی (م.س). کاتێ لە دوای ١٩٦٤ وە حکومەتی عێراق هاوکاری بارزانی دەکرد دژ بە باڵی (م.س) هەر ئەو دەوڵەتە لە ١٩٦٦ تا ١٩٧٠ هاوکاری مادی و سەربازی پارتی (م.س) دەکرد.

"ساواکی ئێرانی هانی باڵی مەکتەبی سیاسیدا کە جیابینەوە، پارە و چەکیان دانێ بۆ لێدانی باڵی بارزانی، هەروەها حکومەتی عارف – یەحیا ئەوانیش هانی دابەشبونی پارتیاندا، حکومەتی عارف دەستیکرد بە نزیکبونەوە لە بارزانی و بە ئاشکرا هانی ئەدا دژ بە باڵی (م.س) و بە کۆمەڵێک موشاغەبەچی و ئاژاوەچی ناویان ئەبردن"[١٥٥].

وڵاتانی ئەوروپی، زۆر حەماسیان نەبو، کە هاوکاری پارتی بکەن، ئەوان نەوت و بەرژەوەندی عێراقیان لا مەبەستتر بوە، وەک هاوکاری کورد، بۆ نمونە هەڵویستی بەریتانیا، وەک نمونەیەک بۆ زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا، لە

---

[١٥٤] فاروق محەمەد محەمەدئەمین، سیاسەتی ئێران بەامبەر جولانەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشوری کوردستان، ١٩٧٥-١٩٨٩، ل ٥٥.. لە کتێبی کوردستانی عێراق لە کتێبی گەلێک پەژموده و نیشتیمانێکی پەرت. عیسمەت شەریف وانلی، سوید ١٩٩٨، ل ٣١٥.

[١٥٥] هەمان سەرچاوە، ل ١٦٧.

نامەیەکدا کە (جۆرج تۆمسن) لە باڵوێزخانەی بەریتانیا لە بەغدا ئاراستەی لێپرسـراوی بەشـی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتیان لە وەزارەتـی دەرەوە لە ١٩٦٧/٢/٢٢ کردوە و دەڵێ : "بۆ زانیاری ئێوە ئەو نێردراوانەی کورد (وەک د. مەحمود عوسمان) کە سەردانی لەندەن دەکەن، بە شێوەیەکی ئاسایی پەیوەنـدی بە وەزارەتـی دەرەوە دەکەن. بەهـۆی پەیوەنـدیمان لەگەڵ حکومەتی عێراقدا و لەبەر هەستیاری ئەوان بەرامبەر بە مەسەلەی میوانە کوردەکان، ئێمە ناتوانین بە ڕەسمی پێشوازیان لێبکەین، بێگومان ئەگەری ئەوەش نـیە کە وەزیرەکـان ئەوە بـکەن، بەهەرحـاڵ ئەوانەی سـەر بە وەزارەتـی دەرەوەن لە ئاسـتی تـا ڕادەیەک خـوارەوە و لەسـەر بنەمـای کـۆمەڵایەتی و ناڕەسـمی لە شـوێنێکی دی بەدەر لە خـانوبەرە فەرمیەکـان چاویان پێیان دەکەوێت"[156].

لە هەمو قۆناغی شەڕی ناوخۆدا، کاریگەری دەرەوە بە تایبەتی وڵاتانی دراوسێ لەسـەر بڕیاری سیاسـی هەردو باڵی پارتی بە زەقی دیاربو، بە واتایەکی تر، هیچ لایەکیان نەیان ئەتوانی بڕیاری ئازایانەی سەربەخۆی چارەنوسساز بدەن و کورد لە شەڕی ناوخۆ دوربخەنەوە، هەروەها نە عێراق و نە ئێران بە شێوەی جیاواز ڕێگریان ئەکرد کە هەردوباڵەکە لەیەک نزیک بەکەونەو، لەبەرئەوەی یەکڕیزیی ماڵی کورد لە هیچ قۆناغێکدا لە بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتاندا نەبوە و پێیان باش نەبوە هێزێکی یەکگرتوی تۆکمەی کوردی دروست ببێت.

ئەو دەستپێشخەری و نەرمیەی بارزانی و (م.س) دوای ئازاری ١٩٧٠ کە بۆ یەکتریان کرد، ئەتوانرا لە ١٩٦٦ بکرایە، ئەگەر ئەو کاتە بکرایە، بێگومان نەخشەی ئیمرۆی کوردستان جۆرێکی تر دەبو، یاخود کەمترین ڕۆڵەی

---

[156] کورد لە بەڵگەنامە نەهێنیەکانی بریتانیادا، ١٩٦٦-١٩٧٩، محەمەد مستەفا قەرەداغی لە ئینگلیزیەوە کردویە بە کوردی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای دوارۆژ، چاپی یەکەم ٢٠١٧، ل ٢٣٨.

کورد بەناهەق لەناو نەئەچون. زۆربەی کات پارتی (م.س) زیاتر ئامادەی ئاشتبونەوەی لە باڵەکەی تر هەبوە، هێزە گەورە و بە دەسەلاتەکە، بارزانی بوە کە دەیویست باڵەکەی تر لە ڕێگای چەکەوە لەناوبەرێت یاخود بە چۆکیاندا بهێنێت و ئالای تەسلیمبونیان پێ هەڵ بکات.

ناکۆکی نێوان بارزانی و هەندێ لە ئەندامانی (م.س) و بەتایبەتی سکرتێری پارتی، ئیبراهیم ئەحمەد، کۆنتربو لەوەی کە لە ئەنجامی ڕێکەوتنی بارزانی و حکومەتی عێراق لە ١٩٦٤ سەری هەڵدابێت، ئێمە لەوەوپێش باسی ئەو ناکۆکیەمان کردوە، خاڵە سەرەکییەکە، ئەوە بو کە پارتی نەیئەتوانی دو سەرۆک و دو بەرنامەی سیاسی هەبێت، ئەبو یان بارزانی یان ئیبراهیم ئەحمەد بێت، و هیچ کام لەو دوانە، ئامادەنەبون واز لە پۆستەکەیان بهێنن بۆ ئەوەی تر، لەبەرئەوە هەر وەکو لە دوایشدا لەناو شۆڕشی کوردا دەرکەوت، کە ناگونجێ دو سەرکردەی وەک یەک بە هەمان دەسەلات لە هەرەمی یەک حیزبدابن، قوتابخانەیەک تەنها یەک بەڕێوەبەری دەبێت.!

شەڕی گەرمی نێوان هەردو باڵەکەی پارتی لە ١٩٦٨ دەستیپێکرد تا ١٩٧٠، لەو قۆناغەدا جگە لە شەڕی چیای هەندرێن و لێدانی بیرەنەوتەکانی کەرکوک، هیچ شەڕێکی قورس روی نەداوە لە نێوان پارتی (بارزانی) و حکومەتدا، بەلام شەڕی قورس و شەهید و برینداری زۆر لە نێوان هەردو باڵەکەی پارتیدا هەبوە و حکومەتی عێراقیش بە خۆشیەوە سەیری ئەم شەڕەی کورد-کوردەی کردوە، واتا شەڕ لە نێوان هێزە کوردیەکاند و ئاشتیش لە نێوان کورد و ڕژێمدا، شانۆگەریەکی خەماوی.

## قۆناغی ١٩٧٠ تا هەرەسی ١٩٧٥

سەرەڕای ئەوەی کە بەیانی ١١ ئازار بەدەسکەوتێکی سیاسی گەورە دەژمێردرێت، بەڵام بێگومان بێ کەم و کورتی نەبوە، بەشی توێژینەوە لە یەکەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا لە بارەی بەیاننامەی ئازارەوە نوسیویتی: "ئەو پانزە خاڵەی پێشنیازەکەی ١٩٧٠ یانزەیان دوبارەبونەوەی ئەوانەی ساڵی ١٩٦٦ن بە شێوازێکی کەمێک جیاواز یان کەمێک زیاتر جەختکردنەوە. بەهەرحاڵ، باس لەوە دەکرێت کە کورد بەوە قایلە و ئەو خاڵانە بەرەو پێشچونن لە ئاستی ئەوانەی ١٩٦٦دا و گوایە بارزانی گوتویەتی گشت داواکاریەکانی ئەوان دەستەبەرکراون تەنیا ئاڵای تایبەتی خۆیان و پشکی دیاریکراو لە داهاتەکانی نەوت و نوێنەرایەتیان لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا نەبێت"[١٥٧].

ناو و ناوبانگی بەیانی ئازار، تەنها لەوەوە نەهاتبو کە شەڕی نێوان پارتی (بارزانی) رژێم کۆتایی پێهات، بەڵکو سەرکەوتنێکی نەتەوەیی بو بۆ کوردستانی عێراق، سەرەڕای ئەوەی زۆربەی زۆری خاڵەکان، پێش ١٩٧٠ بڕیاری لەسەر درابو، وەک لێبوردنی گشتی بۆ هەمو ئەوانەی کە لە کوردستان پێشمەرگەبون بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق (٢٦٧، ٣٢٤، ٥٩ی ١٩٦٨/٦/٣٠ و ١٩٦٨/١٠/١٣، ١٩٦٨٩/٨/٥،

[١٥٧] کورد لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی بریتانیادا، ١٩٦٦-١٩٧٩، محەمەد مستەفا قەرەداغی لە ئینگلیزیەوە کردویە بە کوردی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای دوارۆژ، چاپی یەکەم ٢٠١٧، ل ٤٧٥.

دروستکردنی لیوای دهۆک (۲۱۱ی ۱۹٦۹/٥/۲۷) خوێندن بە زمانی کوردی تا کۆتایی ئامادەیی (٤٤٦ ی ۱۹٦۹/۹/۲۸) و بەکارهێنانی زمانی کوردی لە هەمو دەزگا حکومیەکانی پارێزگاکانی هەولێر، سلێمانی و کەرکوک و دروستکردنی زانکۆی سلێمانی و ڕێگەدان بە دانانی چەند دەزگایەکی رۆشنبیری کوردی لە کوردستان و لە بەغدا، ئەم دەستکەوتانە لە دوای بەیانی ۲۹ حوزەیرانی ۱۹٦٦ هاتنەکایەوە، کە هەردو باڵەکەی پارتی شانازی پێوە دەکەن، بەڵام باڵی مەکتەبی سیاسی زیاتر بە دەسکەوتی خۆی دەزانی.

لە مارتی ۱۹۷۰ تا مارتی ۱۹۷٤، بە قۆناغی تا رادەیەک ئاشتی و هێمنی و تەبایی نێوان ماڵی کورد دائەنرێت لە لایەک، کورد و حکومەتی عێراق لە لایەکی تر، لەبەرئەوەی پارتی گەورەترین و بە دەسەلاتدارترین هێزی کوردستانی بو، هیچ هێزێک نەبو لە کوردستاندا بەربەرەکانی ئاشکرای بکات، ئەو هێزانەی کە لەو کاتانەدا هەبون، بریتی بون لە: کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان کە لەسەرەتای خۆ دروستکردندا بو، زۆر بە نەهێنی چالاکی سیاسی و خۆ رێکخستنەوەی ئەنجام ئەدا، خۆیان لە کێشە لەگەڵ پارتی لا ئەدا و زۆربەی ئەندامەکانی لە ریزەکانی پارتی و رێکخراوە پیشەیی و جەماوەرییەکانیدا وەک (یەکێتی لاوان و قوتابیان) کاریان ئەکرد.

دەزگای پاراستنی پارتی کەمێک ئاگاداری جموجۆڵیان هەبو، لەبەرئەوە بەشوێن لایەنگرەکانیاندا ئەگەران و شکیان لە هەر یەکێک هەبوایە، کێشەیان بۆ دروستدەکرد، یان ئەیانڕفاند و دیلیان دەکردن. (وەک چۆن عومەری سەید عەلیان چەند رۆژێک پێش جەژنی رەمەزانی ۱۹۷٤ رفاند و دوای ماوەیەک ئازادیان کرد).

هێزێکی تری وەک (کاژیک) کە زۆربەی کادێرەکانیان بە نهێنی لەناو دەزگا گرنگەکانی پارتیدا کاریان دەکرد، هەندێکیان چەند پۆستێکی بالایان لەناو پارتی وەرگرتبو، زۆر مەبەستیان بو، کە لەو پۆستانەدا بمێنەوە و پارتی لە خۆیان رازی بکەن، هێزێکی ئەوتۆیان نەبو، کە مەترسی بۆسەر پارتی دروست بکات.

لقی کوردستانی حیزبی شیوعی عێراق لە کوردستان هەبون، پەیوەندیان لەگەڵ پارتی باشبو، لە هەمان کاتیشدا لە کابینەی حکومەتی بەغدادا بەشداربون. ئەوانیش ئەو هێزە نەبون کێشە بۆ پارتی بنێنەوە، مەبەستیان بو بە هێمنی لە کوردستان کاری سیاسی خۆیان بکەن و پارتی دەست نەهێنێتە ڕێیان و شەڕیان پێنەفرۆشێت. بەڵام دوای ئەوەی کە حیزبی شیوعی لەگەڵ بەعسدا لە ١٦/٧/ ١٩٧٣ بەرەیەکیان دروستکرد و پارتی بەشداری تێدا نەکرد، پەیوەندیان لەگەڵ پارتی بەرەو گرژی ڕۆشت: " لە ١٩٧٣/١١/١٥ دا، کۆمیتەی ناوەندی حشع بەیانێکی دەرکرد و پارتی تاوانبارکرد کە (شەڕی لەناوبردن) دژ بە ئەندامان و ڕێکخراوەکانی حشع دەکات، ئەم دژایەتیەش لە دوای دامەزراندنی بەرەی نیشتیمانی عێراقیەوە زیادیکردوە".

لە ٩٧٣/٨/١٥ دا، (عیسا سوار) فەرماندەی هێزی پارتی لە زاخۆ ١٢ ئەندامی حیزبی شیوعیی عێراق – سەرکردایەتی ناوەند لە سنوری بادینان دەستگیرکرد و هەمویانی لەناوبردن، ئەمانە لە دەروەی عێراق گەڕابونەوە بۆ خەبات دژ بە ڕژێم و چاوەڕیی هاوکاریان لە پارتی دەکرد نەک کوشتنیان.

هەر لەو قۆناغەدا، بارزانی و ئیدریس و مەسعودی کوڕی، هەوڵیاندا کە هەمو نەیارەکانی خۆیان لە کوردستان و لەناو ریزەکانی پارتیدا لەناوبەرن، بەتایبەتی بنەماڵەی حەمەد اغای مێرگەسوری،"دایکی مەلا مستەفا، پوری باوکی حەمەد اغا بووە، مەحبوبەی ژنی مەلا مستەفا دایکی عوبیدڵلا و ئەوان پوری حەمەد اغا بووە...لە تەموزی ١٩٧١ پاراستن لە ناو هەولێر جەمیلی حەمەد اغای کوشت و لە تەموزی ١٩٧٢ فاخیر و سەعیدی برای و خەڵو برادۆستی گیران و بێ سەروشوێن کران.. لە نیسانی هەمان ساڵدا حەمەد اغا و کورەکانی: رەشید، ئەسعەد، مەجید و جەوهەر لە زیندانەکانی رایات و خەلان زیندان بوون شەوی ٢٢ی ئازاری ١٩٧٥واتا سێ ڕۆژ دوای راگەیاندنی ئاشبەتاڵ لە لایەن بارەگای بارزانیەوە گولەباران کران، تەرمەکانیان فڕێ دان، دوای چەند ڕۆژێ سۆراخ خێزانەکانیان تەرمەکانیان

دۆزینەوە* (بهادین نوری، پرسی کورد و ئەزموونی کوردستانی عێراق. بیرەوەریەکانی ل ١١٩).

قۆناغی ١٩٧٠ تا ١٩٧٥، بە قۆناغی چەسپاندنی دەسەڵاتی خێزانی بارزانی و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی پارتی دائەنرێت، لەم ماوەیەدا ئیدریس و مەسعود بارزانی و خزمەکانی وەک (زوبێر ئاغا) خاڵی مەسعود، کە سەردەمانێکی زۆر جاشی حکومەتی عێراق بون، ئەوانە هەمو دەسەڵاتی رەهایان هەبو، بڕیارەکان بێ گوێدانە بڕیاری حیزبی وەردەگیرا، پلە و پایەی پێشمەرگانە و حزبی و ئیداری کەوتبوە دەست بارەگای بارزانیەوە نەک دەزگا حیزبییەکان.

رەنگە رێکەوت بێت، کە ئەو قۆناغە، بە قۆناغی چەسپاندنی دەسەڵاتی سەدام حسێن و برا و خزمەکانیشی دەژمێرێت (بارزان، وەتبان، سەبعاوی، هەروەها خەیروڵا تلفاح و عەدنانی کوری و زاوەکانی سەدام خۆی ..)
ئەم دو بنەماڵەیە هەمو هەوڵێکیاندا لەوکاتەی دەسەڵاتیان گرتە دەست تا هەرەس یان بە نیسبەت عێراقەوە تا ٢٠٠٣، هەژمونی خۆیان بەسەر تێکرای بوارەکانی ژیانی حوکمرانی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، سەربازی بسەپێنن و هەوڵ بدەن هەمو نەیارەکانیان پاک بکەنەوە یاخود لە رێگای تۆقاندن، سەرکوتکردن، داپڵوسین، خۆسەپاندن و زەبروزەنگەوە، هیچ کەسێ یان گروپێک نەتوانێت لە رێگایاندا بوەستێت.

دوای بەیانی ئازار پارتی گەشەی بە پەیوەندیەکانی دەرەوەیدا، پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئیسرائیل و ئێران روی لە ئاسایی بونەوە کرد، لە نیسانی ١٩٧٢ دا، ئەمەریکا بۆ یەکەم جار بڕیاریدا کە یارمەتی کورد بدات، هۆکەشی نزیکبونەوەی سۆڤیێت و عێراق بو، ئەو نزیک بونەوەیە هاندەرێک بو بۆ ئەو گۆڕانکارییەی کە لە سیاسەتی ئەمەریکادا رویدا و ئەوان پرۆژەیەکی هاوکاریان بۆ کورد لەگەڵ ئەردەن و عەرەبی سعودیە و ئیسرائیل و ئێران دارشت.

## هەرەسی ١٩٧٥ و ڕۆڵی ئێران

ڕێکەوتن لە نێوان ئێران و عێراقدا، کارێکی حەتمی بو، ئەوەی چاوەڕێی نەکردبێت کە ڕوئەدا، مانای وایە ئاگای لە سیاسەتی دەرەوە نەبوە، ڕێکەوتنی دو لایەن، هەمیشە بە سود بۆ لایەنی سێهەم ناگەڕێتەوە، پێویست بو سەرکردایەتی کورد زۆر لەوە ژیر تر و چاوکراوەتر بوایە و بیزانیایە کە لە ئەنجامی ئەو ڕێکەوتنە، زەرەرمەندی یەکەم تەنها و تەنها، گەل و شوڕشی کورد دەبێت.

لە سەرەتای ١٩٧٥ەو باس لە دانیشتنی نەهێنی نێوان نوێنەرانی ئێران و عێراق دەکرا، کە لە چەند وڵاتێک یەکتریان بینیوە، لە ٦ ئازاری ١٩٧٥دا تەنها پرۆتۆکۆڵەکە ئیمزاکرا، پێش ئەو مێژوە، وەزارەتی دەرەوەی هەردووڵات ئامادەیان کردبو: "وەزیری دەرەوەی عێراق و ئێران، سەعدون حەمادی و عەباس خەلعەت بەری لە ڤیلایەکی نزیک شاری ئەستنبوڵ لە تورکیا بە نەهێنی چاویان بەیەک کەوت بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی کێشەی سنوری نێوان هەردولایان، کە چەند ساڵێکە سەری هەڵداوە".[١٥٨]

بە هەرەسهێنانی شۆڕشی کورد لە ئەنجامی ڕێکەوتنی جەزائیری ١٩٧٥، کۆتایی هێنانیش بو بە خەباتی چەکداری پارتی بەرسەرۆکایەتی بارزانی و هەمو دامودەزگا سیاسی و پێشمەرگایەتی و مالی و ئیدارییەکانی شۆڕشیش.

زۆر کەس چاوەڕێیان لە بارزانی دەکرد، کە بە نوسین، یان بە

---

[١٥٨] آوفرا بينغيو، كرد العراق- بناء دولة داخل دولة. دار النشر ئاراس-الساقي- ٢٠١٤، ل ٥٦-٥٩.

چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی یان هەر رێگایەکی تری گونجاو هەڵوێستی خۆی لەسەر رێکەوتنی شا و سەدام دەرببڕێت و هیچ نەبێت رەخنە لە هەڵوێستی شا بگرێت، چونکە بارزانی ئەیزانی کە خۆی نەخۆشە و ئاسۆی گەڕانەوەی بۆ کوردستان و بەشداری لە خەباتی نوێی پێشمەرگایەتی و سیاسی زۆر تاریکە، بۆیە گرنگ بو هەڵوێستێکی ئازایانەی دەرببڕیایە، بە تایبەتی ئەو کاتە هەمو جیهان، هاوخەم بون لەگەڵ گەلی کورد و لەگەڵ سەرۆکەکەی.. ئەگەر ئەو کاتە بە زمانێکی تر قسەی بکردایە، ئەوا ئەو قسانە ئەبون بە بەشێ لە مێژوی ئازایەتی بارزانی، بەلام کاتێ (سەرۆکی گەلی کورد) بە شا دەڵێ "ئێمە میلەتی تۆین، مادەم تۆ بە رێکەوتنی جەزائیر رازیت و بەرژەوەندی ئێران ئەپارێزێت، کە ولاتی دایکی ئێمەیە، ئێمە هیچمان دژی نیە، ئێمە لەژێر فەرماندەی تۆداین، ئەگەر وتتان بمرن، ئەوا دەمرین ئەگەر وتان بژین ئێمە دەژین. ئێمە لە رابوردودا موخلیست بوین و لە داهاتوشدا وا دەمێنینەوە، هیوادارین کە پارێزگاریت بۆ ئێمە و بۆ مەسەلەکەمان بەردەوام بێت"[159]. وەا ( Der Tagesspiegel ٢٥/٣/١٩٧٥)ی ئەڵمانی.

شا نەک دەستی کوردی بڕی و بەرژەوەندیەکانی خۆی لە رێگای شۆڕشی کوردەوە هێنایەدی، بەڵکو بە نابەدڵی ئامادەبو لە ١٩٧٥/٣/١١ دا چاوی بە بارزانی بکەوێت، یەسەدولای عەلەم وەزیری بیلاتی شا ( ١٩٧٩-١٩٧٨) لە بیرەوەریەکانیدا دەنوسێت، کە شا دەردە دڵی لای ئەو کردوە و وتویەتی: "بە بێ پشتگیری ئێمە، ئەوان تەنیا دە رۆژیش خۆیان لەبەر عێراقیەکان نەدەگرت...هێشتاش شا بە دو دڵیەوە قایل بوو، کە لە ١١ی ئازاردا بارزانی لە تاران ببینێ...هەراسان بو بەوەی روبەرو چاوی بە کابرا بکەوێ"[160].

---

[159] د. مەحمود عوسمان، تقییم مسیرة الثورة الکردیة و انهیارها و الدروس و العبر المستخلصة منها، ١٩٦١- ١٩٧٥، تقدیم د. بشیر علی اکبر، ل ٧٢.

[160] ئەرێ کورد بوونە بەردەباز؟ بریان ڕۆبەرت گیبسن، سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا، عێراق کورد و جەنگی سارد، ١٤ی تەمموز ١٩٥٨ تا ٢٠ی ئازاری ١٩٧٥، ل ٥٦٧.

هەر دەربارەی ئەو چاوپێکەوتنە، موحسین دزەیی کە یەکێک بوە لە ئەندامانی شاندەکە نوسیویتی: "چووینە شوێنی حەوانەوەی شا لە کۆشکی نیاوەران، لەگەڵ جەنەراڵ نەسیری لە هۆڵێکی تایبەتدا چاوەڕێی هاتنی شامان دەکرد، دوای ماوەیەکی کەم، شا بە لمۆزی بەرزیەوە کە پێی ناسراوە، هاتە ژوەرەوە و سڵاوی لە ئامادەبوان کرد، ئینجا دەستی بە قسەکردن کرد و وتی: برادەرەکانی گلەییان لێدەکرد، بۆیە ئەو رێکەوتنامەیەی ئیمزا کردوە، ئەگەر چیتر یارمەتی کورد نەدات، ئەوا عێراق سیاسەتی خۆی دەگۆڕێت، هەروەها وتی من لەسەر ئەو رێگایە دەرۆم و ئێوەش سێ رێگاتان لە پێشە، یەکەم: عێراق لەسەر داواکاری من لێبوردنی گشتی بۆ هەموان دەرکردوە و دەتوانن بگەڕێنەوە، دوەم: لە ئێران ببنە پەنابەر، سێیەم: دەتوانن شەڕ بکەن بەڵام ئێمە هیچ یارمەتیەکتان نادەین و لە کۆتایی مانگی ئاداردا سنور دادەخەین"[١٦١].

هەر دەربارەی هەڵوێستی ئێران و کاربەدەستانیان دەربارەی شۆڕشی کورد، هەژار موکریانی وەک هاورێیەکی بارزانی و یاوەری لە هەندێ چاوپێکەوتنی بارزانی کە لە تاران ئەنجامیداوە، دەیگێڕێتەوە: "شەوێک ژەنەراڵ نەسیری (لێپرسراوی دەزگای هەواڵگری ساواک) هاتە لای بارزانی، وەک هەمیشە ماچی کرد و دانیشت و زۆر قسەی خۆشی کرد، لە پڕ هەڵیدایە و وتی: (بیستومانە موشەکی وای لە روسیا وەرگرتوە کە نۆ میتر درێژە، هیچتان ناهێڵن و قرتان دەکەن)، دکتۆر مەحمود وتی: (ئێمە فێرە مردن بوین، لەو شتانە ناترسین)، گوتی: (دوکتۆر تۆ نازانی قسە بکەی، ئەعلا حەزرەتیش هیچ کەیفی بە قسەی تۆ نەهاتوە، من هاتوم شتێکتان پێڕابگەیەنم: ئێرانی شاهەنشاهی بە سەدەها هەزار دۆلاری یاریدەی شۆڕشیداوە، بەچەک و سەربازی خۆشمان هاتوینە یاریدەتان، ئێوە هیچ بەهرەتان پێوە نەماوە، گەورەکانی لەشکرتان هەمو دزن، هەر خەریکی گیرفانی خۆیانن. چەند جارمان گوتوە (حەسۆ میرخان)، (عەلی شەعبان)، (رەشید سندی) و کێ و

[١٦١] موحسین دزەیی، ویستگەی ژیانم، ل ٢٤٠.

کێ دز و خاینن بە شۆڕش، دەریان کەن، بە قسەتان نەکردوین، ئێستاش لەم شەڕە هەرەیەدا هەرچی سەرانی شۆڕش و فەرماندەی هێزەکانتانن لە شارانی ئێران را دەبوێرن و کەسیان لە جەبهە نین. پەنجا هەزار گولە تۆپمان لە داوێنی جیای (زۆزک) تەقاند و سەنگەرمان بە عەرەبان بەجێ هێشت، پێشمەرگە نەچون سەنگەرەکان داگیر کەن"[١٦٢].

ڕێکەوتنەکەی ئازار وەکو خۆر ئاشکرا بو، کە هاوکاری شا بۆ شۆڕشی کورد، لەبەر خاتری چاوی کورد نەبو، بەڵکو لەبەر بەرژەوەندی خۆی بوە، ئەیویست لەرێگای شۆڕشی کوردەوە، عێراق لاواز بکات و داخوازیەکانی خۆی بەسەریدا بسەپێنێت، ئەو داخوازیانەش لە ڕێکەوتنەکەی جەزائیردا هاتنەدی. ئەگەر هەڵویستی شا لە ماوەی چەند مانگێکدا، سەیر بکەین، واتا پێش جەزائیر و دوای جەزائیر زۆر بە ئەشکرا دەردەکەوێت، کە چەند گۆڕانی بەسەردا هاتوە.

لە دو چاوپێکەوتنی جیاوازی سەفیری بەریتانیا لەگەڵ شادا، یەکێکیان لە ١٩٧٤/٥/٣٠ بەم شێوەیە دەدوێ: "ئەو (شا) ناتوانێت دەستبەرداری کوردەکان بێت لەبەر یەک شت، کە لە روی پرنسیپەوە دەبێتە هەڵە، سەربارەی ئەوە ئەو پێویستی بەوەش هەیە کە رەوشی کورد بە زیندویی بهێڵێتەوە، وەک ئامێرێکی گوشار دژ بە حکومەتی عێراق تا وەکو بتوانێت لە هەر کاتێکدا بیخاتەکار، بۆیە ئەو بەردەوامە لە دابینکردنی بڕێکی زۆر چەک و تفاق بۆ کوردەکان" لە نامەیەکی تری سەفیری بەریتانیادا بۆ وەزارەتی دەرەوە، دەربارەی ئەو چاوپێکەوتنەی کە لەگەڵ شادا لە ١٩٧٥/٣/١٠ دا کردویەتی، واتا دوای کەمتر لە ١٠ مانگ کەبەسەر چاوپێکەوتنی یەکەمدا تێپەڕیبو، شا ئەمجارە بە تەواوی هەڵوێستی گۆڕیوە و بەم شێوەیە دواوە:

"١. من ئەم بەیانیە پیرۆزبایم لە (شا) کرد بۆ ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ سەدام

---

[١٦٢] چێشتی مجێور، هەژار، چاپی یەکەم، پاریس ١٩٩٧، ل ٥٥٣. ڕێکەوتننامەی جەزائیر و رەهەندەکانی لەسەر کێشەی کورد لە کوردستانی باشوور، کامەران جەمال بابان زادە، سلێمانی ٢٠١٣، ل ١٨١.

حوسێن و پرسیارم لێکرد ئاخۆ دەتوانێت وردەکارییەکانی باس بکات.

٢. شا گوتی ئەو بڕیاریداوە هەوڵێکی زۆر بدات بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی لەگەڵ عێراقدا لەبەر سێ هۆی سەرەکی:

یەکەم : ئەوە لە بەرژەوەندی نەتەوەی ئێرانە، کە چارەسەرێکی پەسەند بۆ کێشەی شەتولعەرەب دەستەبەر بکات.

دوەم: گەلێک کەس پێیان گوتوە، کە عێراق بۆ هەلێک دەگەڕێت تا خۆی لە یەکێتی سۆڤێت رزگار بکات. میسرییەکان و جەزائیرییەکان و ئوردونییەکان گوشارێکی زۆریان خستە سەری لەو روەشەوە ئەویان بە بەڵگە دەهێنایەوە، کە دەشێت مێژوو بە باشی بیسەلمێنێت ئەو نەیتوانیوە هەلێک بقۆزێتەوە کە هەڵناکەوێتەوە ئەگەر ئەو لەگەڵ عێراقییەکاندا نەگاتە چارەسەر لەم بارودۆخەی ئێستادا.

سێیەم: کوردەکان پێیان گوتوە کە ئەوان ناتوانن لە بەرگریکردندا بەردەوامبن ئەگەر ئێران ئاستی پشتگیری سەربازیەکەی زۆرتر نەکات. ئەو بە کوردەکانی گوتوە، کە ئەو کارە واتای جەنگێکی کراوەی نێوان ئێران و عێراق دەگەیەنێت، کە ئەویش ئامادە نیە ئەو کارە بکات" هەر لەو بارەیەوە هەمان سەفیر لە نامەیەکی تردا دەنوسێت، کە لە ١٩٧٥/٢/١٢، واتا پێش رێکەوتنی جەزائیر، ئەو سەرۆکی ساواک جەنەراڵ ناسری و سەرۆکی هەواڵگری سەربازی، جەنەراڵ موقەدەم-م بینیوە و بەم شێوەیە باسی مەسەلەی کوردیان کردوە: " ئەو (جەنەراڵ ناسری) بڕوای وەهایە کوردەکان لای خۆیانەوە بۆ پێنج دەقیقە بەرگەی ناگرن و گومانیشی لەوە هەبو ئاخۆ ئێرانیەکان دەتوانن وەها بکەن کوردەکان لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بن بەبێ ئەوەی ئاستی پشتگیریکردنەکەیان بەرز نەکەنەوە"[١٦٣].

فەرەنسۆ حەریری دەربارەی هەڵوێستی بارزانی لەسەر بەردەوامبونی

---

[١٦٣] کورد لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی بریتانیادا، ١٩٦٦-١٩٧٩، محەمەد مستەفا قەرەداغی لە ئینگلیزیەوە کردویە بە کوردی، ل ١٤٩،١٥٢، ١٧٣.

بەرگری، دەڵێ: "بارازانی ئەمر بانگی کردم و فەرمووی خۆت دەزانی کە تەمەنم لە حەفتا ساڵ زیاترە و تەمەنی من بۆ شەڕی پارتیزانی ناگونجێ، چونکە ئەم جۆرە شەڕە پێویستی بە مرۆڤی لەشساغ هەیە، ئەگەر کەسێک هەبێ ئەم کارە بخاتە ئەستۆی، من هەمو ئیمکانیەت و توانای خۆم دەخەمە ژێر دەسەڵاتی ئەو، بەڵام تا ئێستا هەستم نەکردوە کەسێ هەبێ، ئەو بڕیاری داو هەمویان ئەڵێن ئەگەر جەنابت بڕیار بدەیت لە خزمەتت دەبین و دەشزانم شەڕی پارتیزانی پێویست بەوە ناکات زۆر خەڵکم لە دەوروبەربن، چونکە هەر دەبێت خەریکی خۆ شاردنەوە بین"[١٦٤].

هەر لەو بارەیەوە، مەسعود بارزانی نوسیوێتی لە ١٩٧٥/٣/١٢ بارزانی لە تاران گەرایەوە و لە کۆبونەوەیەکدا وتی: " لە کۆبونەوەی ئەم هەمو بێویژدانانە دژمان، دەترسم بەتەنها خۆمان لە گۆڕەپان بمێنینەوە..من خۆم کە گەیشتومەتە ئەم تەمەنە، تەمەنم یارمەتیم نادات بۆ شەڕی پارتیزانی کە پێویست دەکا مرۆڤ بە پەلە و شەو و رۆژ لەم شاخەوە بگوێزێتەوە بۆ ئەو شاخ. بۆیە لام وایە بەرژەوەندیمان لەوەدا نیە بەردەوام بین لە شەڕ...ئەگەر کەسێکیش هەیە دەتوانێ ئێستە سەرکردایەتی شەڕی پارتیزانی بگرێتە دەست، من ئامادەم هەموو یارمەتیەکی بدەم" (مەسعود بارزانی، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەرگی٣ بەشی ٢-ل ١٧٢)

رێکەوتنی جەزائیر، روداوێکی کتوپڕ نەبو، پێویست بو هەمو لاکان بیریان لەوە بکردایەوە، کە رۆژی دێت ئەو دو دەوڵەتە دراوسێییە ئاشت دەبنەوە و ناکۆکیەکانیان بەلادا دەنێنن، ئاماژەی نزیکبونەوەی هەردولا لە ١٩٧٤/٨/٢١ دەرکەوت کە وەزیرانی دەرەوەیان بەیاننامەیەکیان دەرکرد: " کە ئەوان لەسەر ئاستی وەزیری کاروباری دەرەوەیاندا لە میانەی کۆبونەوەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان لە تشرینی یەکەمدا درێژە بە گفتوگۆکانیان دەدەن"[١٦٥].

---

[١٦٤] مێژووی شۆرشی گوڵان ١٩٧٦/٥/٢٦، ئەسعەد عەدۆ، هەولێر ٢٠١٥، ل ٤١.

[١٦٥] ئەرێ کورد بوونە بەردەباز؟، بریان رۆبەرت گیبسن، ل ٤١٦.

# ڕۆڵی ئێران و ئەمەریکا دوای هەرەس

هەر لەو کاتانەدا، هەست بە ساردی پەیوەندی نێوان ئەمەریکا و شۆڕشی کورد دەکرا، کاتێ بارزانی لە ١٩٧٥/١/٢٢ نامەیەکی ئاراستەی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا هێنری کسنجەر کرد، کە ئایە ئەتوانێت خۆی یان نوێنەرێکی سەردانی ئەمەریکا بکات بۆ ئەوەی باسی کێشەکان بکات؟: " هەرچەندە دو بڕگەی نامەکەی هەندێک تەمومژاوی بوو، کەچی سی ئای ئەی و ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتیمانی بڕوایان وابو، کە بارزانی ویستویەتی بە خۆی سەردانی واشنتن بکا"[١٦٦]، ئەوە بو ئەمەریکیەکان رازی نەبون کە بارزانی خۆی سەردانی ئەمەریکا بکات و داوایان لێکرد نوێنەرێک بنێرێت.

لە ناوەڕاستی ١٩٧٤ تا ئازاری ١٩٧٥، کۆمەڵێک کۆبونەوە و دانیشتن و چاوپێکەوتنی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە نێوان عێراق و ئێراندا رویدا، لەبەرئەوە ڕێکەوتنی جەزائیر، کتوپڕ نەبو و پێویست بو لەسەر بارزانی هەستی بکردایە کە ڕێکەوتنێک لە ئایندەیەکی نزیکدا روئەدا، لەبەرئەوەی هێماکان شاراوە و نەهێنی نەبون، بەڵکو ئاشکرا بون، بەڵام بۆچی هەستیان نەکرد و خۆیان بۆ ئەو هەرەسە ئامادە نەکرد، ئەوە پرسیارێکە کە وەڵامەکەی لای خانەوادەی بارزانیە.

ئەمریکیەکان لە لایەن شاوە ئاگادارکرابونەوە، کە ئەو نیازی هەیە لەگەڵ بەغدا بگاتە ڕێکەوتنێک، لە ١٨ی شوباتیشدا، شا لە میانەی کۆبونەوەیەکدا لە

[١٦٦] هەمان سەرچاوە، ل ٤٣٤.

شـاری زیـوریخی سویسـرا، هێنـری كیسـنجەری ئاگـاداركردەوە، كە بەنیـازە لەگەڵ عێراقیەكان لەسەر شەتولعەرەب رێك بكەوێت، لەبەرئەوەی كوردەكان هێزی بەرگرییان بێ هاوكاریەكی زۆری دەرەكی تێدا نەماوە.

بـارزانی دوای رێكەوتنـی جەزائیـر، بڕیـاری دابـو، ناتوانێـت لە خەبـاتی پێشـــمەرگایەتی بەردەوام بێــت، بێگومـــان كێشــــەی تەمەن و تەندروســـتی باسكردوە، هەروەها هۆ گرنگەكە ئەوەبوە، كە بڕوای تەواوی وابو، بەرگری بێ هاوكاری دەرەوە یان ئێران بە ئەستەم ئەزانی. "مەلا مستەفا سـەرۆكێكی سیاسی جەماوەری كوردی عێراق بوو، باڵام سەرۆكێ بوو لە شێوازی كۆنی عەشـایری تاكەكەسـی، نەیتـوانی مـیلەتەكەی خـۆی، كە سـیقەی پێـدابوو، بە شـێوەیەكی راسـت و دروسـت ئاراسـتە بكـات. ئەم مـیلەتە سـتەم دیـدەیە لە كاتێكدا كە بەتەمای سەركەوتنێكی گرنگ بوو، بـرایە هەڵدێرێكی ترسناك و لە بارزاییەكی هەزار بە هەزارەوە كەوتە خاورەوە" (بەهادین نوری، پرسی كورد و ئەزموونی كوردستانی عێراق، بیرەوەریەكانی،ئابی ٢٠١٨، ل ٣٨)

"ئەوەی لای هەمــو ئەوانەی ئاگــاداری مێــژوی ئەم جــوڵانەوەیە بــون دەزانن، كە یارمەتی ئێران هەنگا و بە هەنگاو بو بە بنـاغەیەكی سـەرەكی كە جـوڵانەوەی كـوردی پشـتی پێدەبەسـت، هەمـو جـۆرە یـارمەتیەك وەرگیـرا، بەڵام كـاتێ كە ئەم یارمەتیـانە وەسـتا، جـوڵانەوەكە لە مـاوەیەكی كورتـدا هەرەسـی هێنـا، كە نمـونەی نەبـوە لە مێـژوی بـزوتنەوەی رزگـاریخوازی گەلانـدا..ئەمە لەبەرئەوەی كلیلـی جـوڵانەوەكە لەدەسـت ئێرانـدا بـو، نەك لەدەست سەركردایەتی كوردیدا"[١٦٧].

هەر دوای بڵاوبـونەوەی بەیـانەكەی نێـوان سـەدام و شـا، ئێـران كەوتە ئەوەی جـگە لە بڕینـی هەمـو هاوكـارییەك بـۆ شـۆڕش، هەمـو ئەو چەك و

---

[١٦٧] المســألة الكورديــة -البــديل اليمقراطــي- تجــارب سياســة ١٩٧٤-٢٠٠٩، الــدكتور عبدالمصور بارزاني، دهوک ٢٠١٦، ص ٢٩-٣٠.

آوفرا بينغيو، كرد العراق- بناء دولة داخل دولة. دار النشر ئاراس-الساقي- ٢٠١٤، ل ١٨٨.

تەقەمەنیانەی بەسود بون و دابوی بە شۆڕش کشانیەوە بۆ ناو خاکی ئێران: "دوای ئەوەی چەند کاتژمێرێک بەسەر ڕێکەوتنەکەدا تێپەری، ئێران هەمو جۆرە یارمەتیەکی لە کوردەکان بڕی و سنورەکانی داخست، سەربازە ئێرانیەکان و چەکە قورسەکانیان کێشایەوە بۆ ناو خاکی ئێران"[١٦٨].

حسێن عارفی نوسەر، لە کاتی هەرەسەکە لە ناو شۆڕش بوە و ئەندام و دۆستی حیزبی شیوعیی عێراق (سەرکردایەتی ناوەندی) بوە، بەم شێوەیە ڕۆژانی هەرەس باس دەکات، ئەم باسە، ئاوێنەی ناوخۆی دڵی زۆربەی زۆری کورد بوە، ئەم لەجیاتی زۆربە بەم شێوەیەی دایرشتوە: "ئای!!..چی دەبیستم؟!. چ بروسکە و هەورە تریشقەیەکە وڕوکاسم دەکا؟! ئایە ڕاستە؟! جێی باوەڕە؟! ئەقڵ دەیگریێ؟! هەر تەواو وایە و واتەواتێکی درۆ نییە؟!..قاوێک نییە داکەوتبێ؟!..نا..نابێ و ڕێی تێناچێ.نا. دەبێ هەڵەیەک.. چەواشەییەک..فەرامۆشکردنی پیتێک یا وشەیەک، لە ڕاگەیاندنی هەواڵەکەدا هەبێ. تۆ بڵێیت وابێ؟!. نا.نەء..ئەمیش نییە. هەواڵ نییە و فەرمانە..فەرمانی سەرکردایەتی شۆڕش و بەسەرانسەری کوردستان ڕاگەیندراوە. بە هەمو هێزەکانی (پ.م)..ڕێکخراوەکانی پارتی ..ئەمانەتەکان..بە هەمو لایەک و بە نوسین ڕاگەیەنراوە و ئەوەتا لە جێبەجێکردنیشدایە!. ئای هەواڵێکی دڵپروێنە. ئای کە بڕیارێکی بە جەخار و گورچکبڕە. بگرە هێندەش سەرسوڕهێنەرە، کە هەرکەس دەیبیسێ، بۆ ماوەیەک لە جێی خۆی وشک هەڵدێ و لە ورتە و جوولە دەکەوێ و تاسێکی قوڵی وادەیباتەوە، کە بە درێژایی تەمەنی تووشی نەبوبێ و تا مردنیش لە بیری نەچێتەوە..."[١٦٩].

---

[١٦٨] سیاسەتی ئێران بەرامبەر جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشوری کوردستان، فاروق محەمەد محەمەدئەمین، ١٩٧٥-١٩٨٩، ل ١٤٥.

[١٦٩] حسێن عارف- بیرەوەری/ تەمەنێک لە بندەستی، ڕووداو و کارەساتەکان. بەرگی یەکەم- سلێمانی ٢٠١٨.

هەڵوێستی ئێران بەرامبەر بە کورد و شۆڕشەکەی شاراوە نەبوە و زۆربەی لایەنەکان ئەیانزانی کە ئەم پەیوەندییە، هاوپەیمانییەکی کاتییە و هەرکاتێ ئێران، بەرژەوەندییەکانی لەلایەن عێراقەوە، بێتەدی، ئەوا هاوپەیمانییەکە دەگۆڕێت و هەردو دەوڵەت رێک دەکەون و لایەنی زەرەرمەند تەنها کورد دەبێت، بەڵام سەرکردایەتی کورد، حەزی نەئەکرد ئەم ڕاستیە ببیستێت، شای ئێران لە چاوپێکەتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەنوسی میسری ناودار محەمەد حەسەن هەیکەل کە لە کۆتایی مایسی ١٩٧٥ کردویەتی و دەنوسێ: "بەڕاستی پێت دەڵێم، ئێمە یارمەتی شۆڕشی کوردماندا، لەم ماوەی دواییەدا، ئێمە هێزی سەرەکی بوین لە پشتیەوە، کاتێ ئێمە پشتگیریەکەمان کشانەوە، ئەوە رویدا کە رویدا، ئەمەوێت پێت بڵێم، من شۆڕشی کوردم دروست نەکردوە، بەڵکو وەک ڕاستیەک بینیومە و هەبوە، ساڵانێکی زۆر رژێمی عێراق دژایەتی کردوین، من لە شۆڕشی کورد فرسەتێکم دۆزیەوە، لە خۆمم پرسی: بۆ بەکاری نەهێنم؟ واشم کرد، بۆ نا..! بەڵێ یارمەتی شۆڕشی کوردمدا دژ بە حکومەتی عێراق، ئەمەش وەک ردفعلێک بۆ ئەو کارانەی کە عێراق دژ بە ئێران ئەیکرد"[١٧٠].

---

[١٧٠] (زيارة جديدة للتاريخ)، دار الشروق- قاهره، ل ٣٢٤.

# رۆڵی خانەوادەی بارزانی دوای ڕێکەوتنی جەزائیر

کاتێ خانەوادەی بارزانی هەڵهاتن و چونە ئێران، هەرچی پارەوپولی شۆڕش هەبو لەگەڵ خۆیان بردیان، کە بریتی بون لە پاشماوەی هەمو ئەو یارمەتیانەی کە لە وڵاتانی ئەمریکا، ئێران، ئیسرائیل و سعودیە و ئەوروپا وەریان گرتبو، هەروەها داهاتی فرۆشگاکانی شۆڕش، کە بە زیاتر لە ٢٠ ملیۆن دینار دەخەملێنرا. د. مەحمود عوسمان ئەندامی مەکتەبی سیاسی و باوەرپێکراوی بارزانی دەنوسێ: "ئەوەی لە میزانیەی شۆڕش مابۆوە، کە چەند ملیۆنێک بو، دوای ئەوەی بە ئارەزوی خۆیان پارەیەکی زۆریان لێسەرف کرد، لە بارودۆخی هەرەسی شۆڕشدا بۆ هەندێ مەسەلە کە هیچ پەیوەندی بە شۆڕشەوە نەبو، بە شێوەیەک سەرفیان دەکرد، وەک ئەوەی پارەی تایبەتی خۆیان بێت.."[١٧١].

ڕۆژنامەنوسێک باسی ئەو ڕۆژانەی بارزانی دەکات لە کوردستانی ئێران و دەنوسێ: "پاش ئەوەی بارزانی سنووری ئێرانی بڕی، لە کێڵگەیەکی نەغەدە نیشتەجێ کرا، ڕۆژنامەنوسێک لەو جێگایەی سەردانی بارزانی کردوە، ڕاپۆرتێکی دەربارەی سەردانەکەی لە ڕۆژنامەیەکی ئیسرائیلی بڵاوکرۆتەوە. تێدا هاتوە، دەڵێت: "بارزانی لە ژێر پاسەوانییەکی توندی ئێرانیەکاندایە، جل و بەرگە کوردییەکەیان گۆڕیوە بە قات و بیجامەیەکی هەرزان بەهای ڕەساسی، کە زۆر فشە لە بەریدا، سەرەتا

---

[١٧١] هەڵسەنگاندنی ڕێرەوەی شۆڕشی کوردی و هەرەسهێنانی و ئەو وانانەی لێوەی فێر دەبین ١٩٦١-١٩٧٥، پێشکەشکردنی د. بەشیر عەلی ئەکبەر، ل ٦٤.

لێپرسراویەتیەکەی خستە سەر سیاسەتی جیهانی، پاشان لێپرسراویەتیەکەی کورتکردەوە لەسەر یەکێتی سۆڤێت کە چەک و فڕۆکە و تانک و راهێنانی بە عێراقیەکان کردوە و فرۆشتوە [١٧٢].

هەر لەو رۆژانەدا، بارزانی، چەند چاوپێکەوتنێکی کورتی لەگەڵ رۆژنامەنوسانی بێگانە کردوە، لە یەکێکیاندا دەربارەی ئەوەی کە هۆی هەرەسهێنانی شۆڕش دەڵێ: " هەرەسەکە لە ئەنجامی شەڕەوە نەبوە، پێشمەرگەکانمان، گۆڕەپانی شەڕیان بێ شەڕ بەجێ هێشت، سوپای عێراقی سەرەڕای بەهێزی سوپاکەی لەماوەی ساڵێکدا نەیان توانی هیچ سەرکەوتنێک بەدەست بهێنن، سەرەڕای شکاندیان لە زۆر بەرەدا، هۆی هەرەسەکە، سەربازی نەبو، بەڵکو سیاسی بو، " دەربارەی پلانی بۆ ئایندە و ئایە داوای پەنابەریتی لە ئەمەریکا کردوە، وەڵام ئەداتەوە و دەڵێ: مـن لای میلەتەکەم دەمێنمەوە، لە بەرەی ئەوان دەمێنمەوە تا کۆتایی ژیانم [١٧٣].

هەروەها بارزانی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ئەمیری تاهیری، سەرنوسەری رۆژنامەی (کەیهان) لە ١٩٧٥/٥/٣ کە ٩٠ دەقیقەی خایاندوە، دەڵێ: " کاری من تەواو بوو، ئیتر هەرگیز نامەوێت ببمەوە بە ڕابەری کوردەکانی عێراق...هەرگیز بە ئەندازەی ئەمرۆ هەستم بە تەندروستی و ئارامی نەکردوە....پێشتر هیچ زانیارییکی لەسەر ڕێکەوتنەکەی ئێران و عێراق نەبووە لە جەزائیر. بەڵام پشتگیری ئەو ڕێکەوتنە دەکات بۆ ئەوەی ئاشتی بۆ ئێرانییەکان بهێنێت، هەرچی خێری تێدابێت بۆ ئێرانییەکان، لای کوردەکان جێگای رەزامەندییە..( نەبەز گۆران- دیدارەکانی مەلا مستەفا. ل ٢٣٢- سلێمانی ٢٠١٧- لە کتێبی، برتارک طوفان- تاران ٢٠١٦)، بارزانی لەو چاوپێکەوتنەدا کۆمەڵێک قسەی کردوە، کە چاوەڕێ نەدەکرا سەرۆکی گەورەترین بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەو شێوەیە بدوێت!.

---

[١٧٢] کاوە تەیب جەبار، کەرتبوون لە نێو پارتە سیاسیەکان، ل ٩٦.

[١٧٣]. Die Welt ١/٤/١٩٧٥.

هیچ چاوپێکەوتنێکی بارزانی نیە، کە ئۆباڵی سەرەکی هەرەسی شۆڕشی کوردی خستبێتە ئەستۆی خۆی و وەک کەسی یەکەم لە شۆڕش و حیزبدا، نیشانی دابێت، کە ئەو و کوڕەکانی و خانەوادەکەی بەرپرسن یان بەشی لە بەرپرسیاریتی ئەو هەرەسە و ئاوارەبونەی هەزارەها هاوڵاتی کورد هەڵدەگرن .

مەسعود بارزانی دەربارەی ئەو رۆژانەی، کە هەمو سەرگەردان و سەرلێشێواو بون، دەنوسێت: "پاش نەکسەی ١٩٧٥ زۆر کەس رایان کرد لە مەیدان و پێش ئەو کاتە بە هەمو شت رازی بون، بەشداربون لە هەمو بڕیارەکاندا، باش یان خراپ و دەوری باڵایان هەبوو و زۆر لە بارزانی نزیک بون، و نزیکبونەوەیان سوودی شەخسی خۆیانی تێدا بوو، بەڵام پاش نەکسە نەک هەر لە بارزانی دور کەوتنەوە، بەڵکو بە هەمو جۆرێک هەوڵیاندا مەسئولیەت بخەنە سەر شانی ئەو، بەس..هەمو قیادە مەسئول بووە و ئەمە واقع و حەقیقەتە"[١٧٤].

چەندین سەرچاوە باسی هەڵهاتنی خانەوادەی بارزانی و سەرکردەکانی پارتی و پێشمەرگە بۆ دیوی ئێران بەم شێوەیە دەکرد: "لە ٢٥ ئازار ١٩٧٥ دا بارزانی بارەگای خۆی لە حاجی ئۆمەران بەجێهێشت و لەگەڵ چەند پاسەوانێکی کەم و ئەندامانی خانەوادەکەیدا لە سنور بەرەو ئێران پەرینەوە، هاوکات لەو سەربەندەدا نزیکەی (٩٠) هەزار کەس وەک پەنابەر لە بەرپرسان و پێشمەرگە و خانەوادەکانیان چوونە ناو خاکی ئێرانەوە، کە نزیکەی (٣٠) هەزاریان پێشمەرگە و هێزی چەکدار بون، پۆل پۆل لە سنور پەرینەوە، دوای ئەوەی لەسەر سنور چەکەکانیان رادەستی حکومەتی ئێران دەکرد، ئینجا رێگەیان پێدەدرا بچنە ناو خاکی ئێرانەوە. دوای داماڵینیان لە چەک لە پەنابەرە مەدەنیەکان جیا دەکرانەوە"[١٧٥].

---

[١٧٤] بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد، عەلی تەتەر نێروەی، هەولێر ٢٠٠٨، ل ٥٩.

[١٧٥] سیاسەتی ئێران بەامبەر جوڵانەوەی.. ل ١١١.

# هەرەس و هەڵسانەوە

هەر لە ڕۆژانـــی هەرەســـدا، کۆمەڵێـــک پێشـــمەرگە و سیاســـی، کە هەر گروپەیـان سـەر بە ڕەوتێکی سیاسـی بـون، بیریـان لەوە دەکـردەوە، کە چۆن ئەتوانن بەردەوامبن لە خەباتی سیاسی و پێشمەرگەیاتی. لەوانە کادیرەکانی کۆمەڵەی مارکسی-لینینی کوردستان (کۆمەڵە)، کادیرانی پارتی کۆمونیستی عێراقـی (سـەرکردایەتی ناوەنـد)، کـادیرانی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و کۆمەڵێک سەرکردەی پێشمەرگە و سیاسی دیار.

فـاروقی مەلا مسـتەفا، لێپرسراوی کوردستانی پارتی کۆمونیستی عێراقی (سەرکردایەتی ناوەند)، باسی ئەو ساتانە دەکات: "بێجگە لە ئێمە کە پێشـەنگی بانگدانی بەرهەڵستیکەر بووین، شـەهیدان عەلی عەسکەری و تـاهیری عەلی والـی بەگ لە ریـزی پێشـەوەی ئەو تێکۆشـەرانە بـون، کە هەوڵـی بەرهەڵسـتی (مقاومەمە)یان ئەدا... من هەڵوێسـتی حیزبمـان بۆ ئەوان ڕونکردەوە و کەوتینە هەڵســـەنگاندنی هەمـــو ڕووداوەکـــان و ئەو هێـــز و توانایـــانەی پشـــتیان پێئەبەســـترێت لە بەرهەڵســـتیکردندا. هاوکـــات لەگەڵ ئەو بینیـــنەدا، لەگەڵ هاوڕێیانی کۆمەڵەی مارکسی- لینینی کوردستان کە بە نهێنی کاریان ئەکرد، یەکترمـــان دی و ڕواو بۆچـــوون و پێشـــبینینی ئەو ڕۆژە و داهاتومـــان ئەگـۆڕیەوە. شـــەهید شـــەهاب شـێخ نـوری و کـاک فەریـدون عەبـدولقادر هەڵوێستی کۆمەڵەیـان بـۆ ئـێمە دەربـڕی و ڕێککەوتـین ڕۆژانە یەک ببینـین و کار بۆ بەرهەڵستی و شۆڕش بکەین".[١٧٦]

---

[١٧٦] فاروق مەلا مستەفا، بیرەوەریەکانم، بەرگی یەکەم، لوبنان- شوباتی ٢٠١٧، ل ٣٤٢.

هەر دەربارەی بڕیاری هەرەس و راکردن بۆ ئێران یان عێراق، فاروقی مەلا مستەفا دەنوسێت: " لە پڕ شەهید دارا تۆفیق سەری لێداین و راسپاردەیەکی کاک ئیردیس بارزانی پێ راگەیاندین، کە ئەوەی لە بینینەکانی پێشوودا لەسەری رێکەوتبوین، نایەتەدی، پارتی بڕیاری کشانەوەیداوە بۆ ئێران، با قیادەی مەرکەزیش هەوڵ بدات خۆی بگەیەنێتە سوریا". دەربارەی چاوپێکەتنیشی لەگەڵ بارزانی باوکدا نوسیویتی: "من بۆ چاوپێکەوتنی بارزانی چووم و چەند سەعاتێک بە ئامادەبونی زۆربەی ئەندامەکانی لیژنەی ناوەندیی پارتی لە گەڵیدا دانیشتم، ئێش و ئازار و حەسرەتێکی زۆر لە رەنگ و دەنگ و چاویدا دیاربوو...بارزانی گوتی: راست ئەکەن ئەمە پلانێکی گەورەیە، بەڵام هەرچۆنێک لێکی ئەدینەوە، ناتوانین ئێستا بەرهەڵستی شالاوی عێراق و دوژمنایەتی ئێران بکەین، ئەم شەڕە لەمەودوا زۆر دەکەوێت لەسەرمان، من لەم بارەی دێتە پێشەوە بە مەسلەحەتی نازانم لەمە زیاتر کوڕی کورد بە کوشت بدەین، دنیاش زۆری بە بەرەوەیە.."[١٧٧].

حیزبی شیوعیی عێراق (لیژنەی مەرکەزی)، هەڵویستی لەگەڵ رژێمدا نزیک بو، لەبەرئەوەی هەردوکیان لەبەرەیەکدا بون، بەهادین نوری سیاسەتمەداری دێرینی کۆمونیست و یەکێ لەسەرکردەکانی ئەو کاتەی حشع لە کوردستان دەنوسێت: "کە شیوعیەکانی هەرێمیش داوایان لەسەرکردایەتی حشع کرد: (با لوولەی چەکەکانمان وەرگێڕین دژ بە رژێمی بەعس و بەرگری لە مافی رەوای میللەتەکەمان بکەین)، عەزیز محەمەد و زەکی خێری و باقر ئیبراهیم وەڵامیان دانەوە: (دەبێ خوشحاڵی خۆمان دەربڕین بەسەرکەوتنی ڕژێمی پێشکەوتوخوازی بەعس بەسەر جێبی عەمیلدا)"[١٧٨]، هەر لەو بارەیەوە، عامر عەبدولا، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی شیوعیی عێراق لە کۆبونەوەیەکی

---

[١٧٧] فاروق مەلا مستەفا، بیرەوەریەکانم، بەرگی یەکەم، لوبنان- شوباتی ٢٠١٧، ل ٣٤٤.

- شەکیب عقراوی، سنوات المحنة.ل ٤١٥

[١٧٨] سایتی پەرەگراف، ٢٠١٩/٨/١٩.

جەماوەری لە ئەنبار دەڵێ: " ئەو سەرکەوتنە مەزنەی بەسەر (الجیب العمیل) لە کوردستان، سەرکەوتنێک بو کە پێشبینی دەکرا بۆ دورخستنەوەی سەرکردایەتی (الجیب العمیل) لە دژی بەرژوەندی میللی گەلی کورد و وەستان بۆ بەرەنگاربونەوەی ڕێرەوی پێشکەوتنخوازانەی گەل و شۆڕش"[179].

حیزبی شیوعی درێخی نەکردوە لە هێرش بۆسەر شۆڕش و پیرۆزبایی دەکرد لەسەرکردایەتی بەعس کرد بۆ هەرەس هێنانی شۆڕشی کورد، نەی ئەزانی کە ئەو ماستاوانە هیچ سودێکی بۆ ئەوان نیەو، ئەو کاتەی کە بەعس دەستی کەمێ کراوە بو، کەوتە گیانیان و ڕاونانیان و تێرۆرکردنی کادێرەکانیان. شیوعییەکان سەدەها وتار و نوسینیان دژ بە شۆڕشی کورد و پشتگیری حیزبی بەعس نوسیوە، سکرتێری حیزبیش (عەزیز محەمەد) لەو بارەیەوە دەڵێ: "پیرۆزبایی لە حیزبی بەعس دەکەم، بۆ هەمو ئەو سەرکەوتنە پێشکەوتوخوازانە کە لە ساڵی ڕابوردو بەدەستیهێناوە، بە تایبەتی سەرکەوتن بەسەر (تمرد الرجعی) لە کوردستان دا"[180]، ئەم قسانەی سکرتێری گشتی حشع لە کاتێکدا بو، دادگای بەعس لە ١٩٧٥/٦/١٨، واتا مانگێک پێش ئەم وتانە، بڕیاری لەسێدارەدانی بەسەر ٢١ ئەندامی حشع دا دەرکرد و دوای ٣ ساڵ، لە ١٩٧٨/٥/٢٤ دا، هەر هەمویانی هەڵواسی، بە بیانوی ئەوەی هەوڵیان داوە کە ڕێکخستنی حیزبی شیوعی لەناو سوپای عێراقدا دروست بکەن. حشع بە چەندەها شێوە دژایەتی پارتی و شۆڕشی کوردیان دەکرد و لە کۆنگرەی ٣ هەمی حیزبیاندا کە لە ٤- ١٩٧٦/٥/٦ لە بەغدا گیرا، عزیز محەمەد هێرشی زۆر توندی کردە سەر پارتی و شۆڕش بە کۆنەپەرست و بەکرێگیراوی بێگانەی وەسف ئەکرد و هەمو هەوڵێکی ئەدا کە دڵی حیزبی بەعس ڕازی بکات.

حیزبی شیوعی بە تەنها نەبو، کە پشتگیری بەعسی دەکرد و پشتی کردبوە

---

[179] طریق الشعب، العدد ٢٤، ١٩٧٤/٩/٢٥.

[180] طریق آلشعب، العدد ٥٦١، ١٩٧٥/٧/١٤.

شۆڕشی کورد، بەڵکو هەمو هێزەکانی میحوەری سۆڤێتی هەمان هەڵوێستان هەبو، گۆڤاری AIB لە بەرلینی رۆژهەڵات، زنجیرەیەک وتارای دەنوسی کە هەموی دژ بەکورد و شۆرشەکەی و پیاهەڵدان بو بە حیزبی بەعس و هاوپەیمانێتی لەگەڵ حشع دا، بۆ نمونە Wolfram Brönner زنجیرەیەک وتاری دژ بە کورد نوسی، لەوانە لە تشرینی دوهەمی ١٩٧٤ لە وتارێکی لە ژێر ناوی (دەربارەی ئەو روداوانەی کوردستانی عێراق) نوسیبو وهێرشی توند بو بۆ سەر پارتی و پشتگیری تەواوی بۆ بەعس و حیزبی شیوعی عێراقی بو.

یەکێتی سۆڤێت، هەمیشە پشتگیری بۆ رژێمی بەعس دوبارە دەکردەوە و لە وتارێکی رۆژنامەی (پراڤدا) زمانحاڵی حیزبی شیوعی سۆڤێتی، لە ژێر ناونیشانی ( جموجۆڵی گروپی توندرەو، یەکێتی عێراق ئەخاتە مەترسیەوە) ' Nezes Deutschland- ١٥/٥/١٩٧٤'، وتارەکە باس لە هەڵگیرسانی شۆرش دەکا و پشتگیری بەعس و حشع و بەرەکەی نێوانیان دەکات.

بەرامبەر بەو رۆژنامانەی سەر بە یەکێتی سۆڤێت، زۆر لە رۆژنامەکانی بەرلین و ئەڵمانیای رۆژئاوا و ئەوروپی، وتاری پشتگیریان دەربارەی بارودۆخی کوردستان و کێشەی کورد و شۆرشەکەی وەک خۆی دەنوسی.

بارزانی لە دوای ٦ ی مارت هەوڵی دا پەیوەندییەک لەگەڵ بەغدا دروست بکات و لە ١٩٧٥/٣/١٨ بروسکەیەکی ئاراستەی حکومەتی عێراق کرد و داوای دانوستانی نوێی لیکردن، وەک چاوەڕوان دەکرا، حکومەتی بەغدا بە خێرایی و رۆژی دوای نامەکە، واتا لە ٣/١٩ وەڵامی دایەوە و بە ناونیشانی (ئەوەی پێی دەڵێن مەکتەبی سیاسی یاخیبوان، بروسکەتان لە رێگای فەرماندەی فیرقەی دوەوە گەیشت..) لە بروسکەکەدا بە لوتبەرزی وەڵامیان داوەتەوە و وەڵامەکەش ئەنجامی لایەکی سەرکەوتو نیشان ئەدات بەرامبەر بە لایەکی شکستخواردو و بروسکەکەیان بەم شێوەیە تەواو دەکەن، "لە ئێستادا بەهۆی ئەزموونی تاڵی رابوردو، دەرفەت نەماوە مەبەستان تاقی بکەینەوە، متمانەمان نەماوە، تاکە دەرفەت لەبەردەمتان، کە رێگر بێت لە خوێن رشتن،

بەبێ هیچ مەرجێک سود وەرگرتنە لەو لێبوردنە گشتییەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، کە لە ١ی نیسان کۆتایی دێت.."[١٨١].

ئەم هیوا و هەوڵانە هیچیان سەریان نەگرت، لەبەرئەوەی سەرکردایەتی پارتی و بارزانی، بەتەواوی بڕیاری هەرەسیان دابو داوایان لە هەمولایەک کرد، یان بگەڕێنەوە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی رژێم یان روبکەنە ئێران و لەوێ بمێننەوە، ئەمە لە لایەک لە لایەکی ترەوە هەرچی چەک و تەقەمەنی هەمەجۆر هەبو، بردیان بۆ ئێران یان تەقاندنیانەوە و هەرچی پارە و خواردەمەنی و کەلوپەلی تر هەبو، بە فەرمانی کورانی بارزانی بردیان بۆ ئەو دیو سنور. هەمو فرۆشگاکانی شۆڕش تاڵان کران و پارە و کەلوپەلەکانیان برد بۆ خۆیان.. لەبەرئەوە کەشوهەوایەکی وایان دروستکردبو، کە زۆر کەم بیریان لەوە دەکردەوە بەردەوام بن لە شۆڕش و شەڕی پارتیزانی بە شێوەیەکی جیاواز لە جاران دەست پێ بکەنەوە، چونکە زەمینەکە زۆر گونجاو نەبو بۆ ئەوان.

بارەگای بارزانی لە ١٨-١٩٧٥/٣/١٩ بروسکەی کۆتاییان بۆ هەمو هێزی پێشمەرگە لێدا کە بە زەنگی (ئاشبەتاڵ) ناوبرا و تێدا هاتبو: "شۆڕش توشی پلانێکی دەولی ترسناک بۆتەوە، بە جۆرێ ئەستەمە درێژە بە شۆڕش بدرێ، گەلەکەمان بەرەو ڕووی کاولکاری وماڵوێرانی بۆتەوە.. بۆیە هەمو پێشمەرگە و هاوڵاتیان ئاگادار بکەنەوە، ئەگەر ئارەزو دەکەن سود لە بڕیاری لێبوردن وەربگرن و بگەڕێنەوە بۆ عێراق..بەڵام سەبارەت بە کادیرە حیزبی و بەرپرسە سەربازییەکان، ئەوە باشترە بکشێنەوە بۆ سەربازگەکانی پەنابەران لە ئێران، چونکە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ عێراق هیچ زەمانەتێکی گیانییان نیە"[١٨٢].

---

[١٨١] ڕێکەوتننامەی جەزائیر و رەهەندەکانی لەسەر کێشەی کورد لە کوردستانی باشوور، کامەران جەمال بابان زادە، سلێمانی ٢٠١٣، ل١٧٤.

[١٨٢] ڕێکەوتننامەی جەزائیر و رەهەندەکانی لەسەر کێشەی کورد لە کوردستانی باشوور. کامەران جەمال بابان زادە، سلێمانی ٢٠١٣، ل١٧٤.

لەم کاتانەدا، زۆربەی زۆری پێشمەرگە گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی رژێم و زۆری سەرکردەکانی پارتی چون بۆ ئێران و هەندێکیان خۆیان تەسلیمی عێراق کرد لەوانە، ساڵح یوسفی، عەبدولی سۆران، سدیق ئەمین و کۆمەڵێکی تر لە فەرماندەی هێز و بەتالیۆنەکان و سکرتێری پارتی حەبیب محەمەد کەریم لە قاهیرە و دارا تۆفیق ئەندامی مەکتەبی سیاسی لە بەیروتەوە خۆیان تەسلیمی بەغدا کرد..

هەندێ باسی ئەوەیان دەکرد، کە هەندێ سەرکردە ویستویانە وەک پەنابەر روبکەنە یەکێتی سۆڤێت، لەم بارەیەوە رۆژنامەکانی ئەڵمانیا دەربارەی داخوازی سەرکردەکانی کورد کە وەک پەنابەر لە یەکێتی سۆڤێت نوسیانە: "یەکێتی سۆڤێت داخوازی ١٠ سەرکردەی کوردیان رەتکردەوە، دوای ئەوەی شۆڕشەکەیان هەرەسی هێنا"[١٨٣].

رێکەوتنی نێوان عێراق و ئێران، چاوەڕواننەکراو نەبو، ئەو دوژمنایەتیە ئەبو رۆژێک بەرەو کۆتایی بڕوات، لەبەرئەوەی نەک هەرلەبەرئەوەی سنورێکی درێژیان لەگەڵ یەکدا هەبو، بەڵکو لەبەرئەوەش، کە هەردوکیان ئەندامی رێکخراوی ئۆپێک بون و هەردو دەوڵەتەکەش کێشەیەکی هاوبەشیان هەبو، کە حیزبە شیعیەکان بون، کە ببون بە کێشە بۆ هەردو دەوڵەت و کۆمەڵێک دەوڵەتی عەرەبی هەوڵیان ئەدا کە پەیوەندییان باش بێت و لە کۆنگرەی حەوتەمی لوتکەی دەوڵەتانی عەرەبی کە لە ریبات لە ٢٦ تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ گیرا، ئەو کێشەیە خاڵێکی گرنگ بو بۆ باسکردن لە کۆنگرەکە و زۆربەی ئامادەبوان لەگەڵ نزیکبونەوەی عێراق و ئێران بون.

لە کۆتایی ١٩٧٤ ەوە، نیشانەی نزیک بونەوەی هەردو دەوڵەت دەستیپێکردو لە ئەنجامدا لە ٦ی مارتی ١٩٧٥ لە کۆنگرەی ئۆپێک لە جەزائیر کۆتایی پێهات. بە هەرەسهێنانی شۆڕشی کورد، قۆناغێکی نوێ هاتەکایەوە.

---

[١٨٣]. Die Welt ٤/٤/١٩٧٥-AFP, dpa.

## دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان

یەکەم هێز کە لە کوردستان و دەرەوە دوای هەرەس دروست بو، یەکێتی نیشتمانی کوردستان بو، مام جەلال داینەمۆی دروستکردنەکەی بو، هەروەها کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان کە پاشان ناوەکەی خۆی گۆڕی بۆ کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، کەوتە خۆرێکخستنەوە و یەکەم هێزی سیاسی بو لە کوردستان کە گروپی چەکداری نارده شاخ.

یەکێتی لە دەرەوە دەستیکرد بە خۆ رێکخستن، مام جەلال هەوڵیدا لەناو ئاوارەکانی ئێران و کۆنە پارتیەکان و کوردەکانی دانیشتوی ولاتانی ئەوروپا و ئەمریکا ئەو کەسانە کۆبکاتەوە، کە باوەڕیان بە هەڵسانەوەی شۆڕش هەبو. وە هاورێ و دۆست و ناسیاوی خۆی بون، مەبەستی بو کە ئەو رێکخراوە نوێیە تێکەڵەیەک بێت لە جەلالی و مەلاییە کۆنەکان، بۆ ئەوەی رەنگی جەلالی بەسەر رێکخستنە نوێیەکەدا نەرژێت.

ئەم رێکخستنە لە سوریا دروست بو، سوریای ئەو کاتە مەڵبەندی کۆکردنەوەی هێزی بەربەرەکانی و چەپەکانی عێراق بو، مام جەلالیش سودی لەو بارودۆخە بینی و لەسەرەتاوە یەکێتی بو بە ئەندامی کۆمەڵەی نیشتیمانی عێراقی (التجمع الوطني العراقي).

سوریا زۆر هاوکاری یەکێتی لە بواری سیاسی و لۆجیستیدا کرد و هەمو دەرگاکانی بۆ ئاوەلا کردبو، وە لیبیای قەزافی هاوکاری مادی و مەعنەوی یەکێتی کرد، ئەو یارمەتیانە زەمینەیەکی باشی بۆ یەکێتی رەخساند کە لە ماوەیەکی کەمدا رێکخستنێکی فراوان دروست بکات و شام بکات بە مەڵبەندی کۆکردنەوەی هەمو ئەوانەی ئەیانویست بەشداربن لە

خەباتێکی نوێ و بە سەرکردایەتیەکی نوێوە.

بێگومان چالاکی سیاسی و پێشمەرگانەی هێزەکانی نزیک لە یەکێتی، وەک کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان، نەخشەی سیاسی و پێشمەرگایەتی یەکێتی لە ناوەوە و دەرەوە تەواو کرد و بە مەبەستی دەستپێکردنی شۆڕشی نوێ، یەکێتی بڕیاریدا هەنگاو بنێت بۆ مەشق پێکردنی ئەو هێزانەی لە دەرەوەی کوردستان هەیبون.

یەکێتی لەسەرەتاوە، کاری لەسەر ئەو تیورییە دەکرد، کە خەباتی سیاسی و دپلۆماسی، بەبێ پشتیوانی خەباتی چەکداری، ئامانجەکانی ناهێنێتەدی.

ئێمە (لەم کتێبەدا) مەبەستمان نیە باسی سەرهەڵدانی شۆڕشی نوێ و مێژوی دروستبونی یەکێتی و سەرلەنوێ دروستکرنەوەی پارتی لە دوای هەرەسەوە، بکەین، لەبەرئەوەی کتێب و نوسین و بڵاوکراوەی هەمەجۆر لەسەر ئەو بابەتانە و سەرهەڵدانی هەردو هێزی سیاسی، پارتی و یەکێتی زۆر نوسراون.

وەک لە شوێنی تر باسمان کردوە، ناوەڕۆک و قورسایی بابەتەکەمان، شەڕی ناوخۆی کوردە بە گشتی و شەڕی نێوان یەکێتی و پارتییە بە تایبەتیش دوای هەرەسی ١٩٧٥.

## خۆ ڕێکخستنەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان (سەکردایەتی کاتی – س.ک)

دوای ماوەیەک لە دروستبونی یەکێتی، پارتی بەناوی (قیادەی موەقەتە، (ق.م) ەوە بانگی خۆ ڕێکخستنەوەی بە گوێی خەڵکدا دا، هەوڵیدا نیشانی بدات، ئەوەی هەرەسی هێنا، پارتی نەبوە، بەڵکو باڵی ڕاستڕەوی پارتی بوە، لە ژێر ناونیشانی (کوردستان مەیدانی ڕاستەقینەی خەباتە ئەی جەماوەرەکەمان خەبات بکەن و واقیعی نەکسە لابدەن) دەستیانکردەوە بە کار و ڕایانگەیاندن: "باری مەوزوعی کە دەوری پارتی و شۆڕشی گرتبو، هۆیەک بون بۆ ئەو بارودۆخەی کە تێکەوتوین، بەڵام بارودۆخی پارتی و شۆڕش ڕێگای خوشکرد و کاریگەریەکی گەورەی هەبو بۆ سەر ڕێبازەکەی، سەرکردایەتی پارتی ڕێکخستنی پارتی پشتگوێ خستبو، وەلای تاکە کەسی و تەبعیە نیشانە دیارەکانی ئەو قۆناغە بون و یەکێتی بیروڕا و ڕەخنە و ڕەخنە لەخۆگرتن لە ناو پارتیدا، هەروەها پارتی مەبدەئی دیموکراتی ناوەندی بەلاوە نابو، لە جیاتی ئەوە ڕۆحی بیرۆکراتیەت لەناو دەزگاکانی حیزبدا زاڵ بو، لەگەڵ هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان لەسەر حسابی بەرژەوەندی گشتی و لەدەستدانی پەروەردی شۆڕشگێرانە، سیمای ئەو قۆناغە بو. ئەمەش ئەنجامێکی ئاسایی بو، لەبەرئەوەی کۆمەڵێک کەسانی ئینتیهازی و خۆپەرست و گەندەڵ دەستیان بەسەر کۆمەڵێک دەزگای پارتی و شۆڕشدا گرتبو، بوبو بە مەڵبەندی گەندەڵی و ئاژاوەگێری"[١٨٤].

پارتی بانگی ئەوەی ئەدا کە خۆڕێکستنەوەی ئەم جارەیان، لە ناوەڕۆکدا

---

[١٨٤] بڵاوکراوەی پارتی دیموکراتی کوردستان–سەرکردایەتی کاتی، ١٩٧٥/١٢/١٠.

زۆر جیاوازترە لە پارتی شەست و حەفتاکان، لەسەرەتادا خۆیان لە ناوهێنانی خانەوادەی بارزانی بە دور دەخست، بەڵام هەمو چالاکی و جموجۆڵیان بە پارەی خانەوادەکە بو، زۆربەی سەرکردە دیارەکانیان، هەمان سەرکردە و کادیرە دیارەکانی پارتی بون. "لە نۆڤێمبەری ساڵی ١٩٧٥ لە دۆخێکی ناهەمواردا، سەرکردایەتی کاتی دروست بوو" (مێژووی جوڵانەوەی نەتەوەیی رزگاریخوازی گەلی کورد لە باشوری کوردستان ١٩٧٥-١٩٩١- د. دلێر ئەحمەد حەمە. ل ٥٥، لە راپۆرتی کۆنگرەی نۆهەمی پارتی ١٩٧٩)

پارتی چەندەها ساڵ لەسەر ئەوە راهاتبو، کە خۆی تاقە هێزی سەرکردە و بێ ڕکابەر بێت لە کوردستاندا و ئەو سەرکردەی شۆڕش و حیزب و جەماوەریش بێت، لەبەرئەوە دروستبونی هێزێکی تری سیاسی نوێ زۆر بە ئاسانی جێی قبوڵکردنی ئەوان نەبو.

لە ١٩٧٦/٨/١١ لە بەرلینی رۆژئاوا، پارتی توانی ٨٠ ئەندام و دۆستی کۆبکاتەوە و کۆنفرانسێکیان بەست و بەرنامەیەکی نوێیان پەسەندکرد، کە لەگەڵ بارودۆخی ئەو کاتەی ناو پارتی و هەرەسی شۆڕشی کوردا دەگونجا. بەیانەکە کاریگەری ئەوانەی زۆر پێوە دیاربوو کە خۆیان بە باڵی چەپی پارتی ئەدایە قەڵەم و دوایی لە پارتی جیابونەوە و پارتی گەلیان دروستکرد.

کۆنفرانسەکە بەرنامەی (سەرکردایەتی کاتی)یان پەسەندکرد کە پێش کۆنفرانسەکە دروستکرابو، بەڵام نەیتوانی کێشە و بۆچونە جیاوازەکانی نێوان ریزەکانی پارتی چارەسەر بکات و دوای ماوەیەک لە ١٩٧٧/٦/٩ دا سەرکردەیەکی پارتی (عەلی سنجاری) لە پارتی جیابۆوە و ریکخستنێکی نوێی بەناوی (یەکێتی دیموکراتی کوردستان) لە دیمەشق دامەزراند و "دواتر بەدیارکەوت کە ئەم حیزبە بە ئاگاداری و رەزامەندی مەسعود بارزانی، سامی شەنگاری، عارف تەیفور و وریا ساعاتچی دروست بوە"[١٨٥].

---

[١٨٥] بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە کوردستانی عێراق لە ساڵەکانی جەنگی عێراق و ئێراندا (١٩٨٠-١٩٨٨)، د. عەلی تەتەر نێروەی، هەولێر ٢٠٠٨، ل ٩١.

## دوهێزی دژ بەیەک

چۆن یەکێتی لەسەرەتادا، هێرشی دەکردە سەر سەرکردایەتی بارزانی و هەرەسەکەی ئەخستە ئەستۆی ئەو سەرکردایەتیە، بە هەمان شێوەش پارتیش دروستبونی یەکێتی دەبەستەوە بە مێژوی ناوەڕاستی شەستەکان و کێشەکانی نێوان بارزانی و جەلالی: "ئەگەر عەقڵیەتی ئیحتیکاری سیاسی یەکێتی کە لە مێژوی دێرینەوە هەیانە و پڕە لە هەڵوێست گۆڕین بە مەداری ١٨٠ دەرەجە، ئەوانەی کە لێپرسراوی یەکێتین و سەرکردایەتی دەکەن و پارەی ئەدەنێ هەمان (جەلالی)یە کۆنەکانن، چونکە ئەم ڕێکخستنە لە لایەن جەماوەری کوردستانەوە ڕەتکراوەتەوە".[١٨٦]

پارتی (ق.م) لە کۆتایی مارتی ١٩٧٧وە زۆر بە ئاشکرا، بە توندی دژایەتی خۆی بەرامبەر بە یەکێتی دەردەبڕی و لەو بارەیەوە نوسیویانە: "ئەو کۆمەڵە خاینەی کە بەخۆیان دەڵێن یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، تێکەڵەیەکی غەریبە لە کەسانی ئینتیهازی، گەندەڵ و خاینە دیارەکانن کە لەلایەن گەل و شۆڕشەکەیەوە ڕەتکراونەتەوە، لەسەرهەموشیانەوە، جەلال تاڵەبانیە..داوا لە هەمو خەڵکی کوردستان دەکەین، کە ئەم کۆمەڵە خاینە کەشف بکەن و لە ناوەڕۆکی ئامانجە خراپەکانیان بگەن، کە بە کراسێکی چەپ و پێشکەوتوخوازانە هاتونەتە پێشەوە، دڵنیاین لەو چەند کەسە کەمەی کە هەڵخەڵەتاون و شوێنیان کەوتون، دەگەڕێنەوە ناو بەرەی گەل و پارتە

---

[١٨٦] صدى خەبات، ص ١٤، نشرە دوریة تصدرها لجنة العلاقات الخارجیة للحزب الدیمقراطي الكوردستاني، عدد ٣، ایلول ١٩٧٧.

پێشرەوەکەیان (پارتی دیموکراتی کوردستان)". [187]

پارتی (ق.م) لەسەرەتاوە، بانگە دێرینیەکەی بەگوێی هاوڵاتیاندا ئەدا، کە پارتی پێشرەوی کوردە و هێزەکانی تر، هێزی لاوەکین، "پارتی دیموکراتی کوردستان (ق.م) گەورەترین دەزگای نیشتیمانیە لە مێژوی هاوچەرخی گەلی کوردا، ئەو سەرکردەی راستەقینەی شۆڕشە". [188]

دو هێزی سیاسی هاتبونە گۆڕەپانەکەوە، یەکێکیان یەکێتی، تازە دروست بوە و رەفزی رابوردوی دەکرت و هەرەسی مارتی ١٩٧٥ دەخستە ئەستۆی پارتی و بە بەرپرسی یەکەمی دەزانی بەرامبەر بەو کارەساتە و ئەوەی لێچاوەڕوان نەدەکرت، کە بتوانن جارێکی تر بەو خێراییە هەڵسێتەوە و سەرکردایەتی شۆڕش یان شۆڕشیان بۆ بەرێوە بچێت..

ئەوەی تریان، پارتییە، ئەیەوست بە دەنگ و رەنگ و شێوەیەکی نوێ خۆی رێکبخاتەوە و بێتەوە گۆرەپانی خەباتی سیاسی و چەکداری و سود لە مێژوی رابردوی وەربگرێت و رەخنە لە هەندێ هەڵوێستی سازشکارانی رابردو لە زۆر بواردا بگرێت و هەوڵ بدات ئەو رۆڵەی جاران هەیبوە بیبینێتەوە، لەسەرەتاشەوە رەخنەی توندی لە یەکێتی دەگرت و بە جەلالییە کۆنەکەی شەستەکانی ئەدایە قەڵەم، هەروەها خۆی بە تاقە هێز ئەزانی کە بتوانێت بەربەرەکانێی راستەقینە بکات، بەلام ئەم هەڵوێستە سیاسیانە لەگەڵ وتاری خانەوادەی بارزانی و دەستڕۆشتوەکانی پارتی، لەدوای هەرەس نەدەگونجا کە چەندەهاجار و لە شوێنی جیاواز، باسی ئەوەیان دەکرد، کە (کاری ئەوان تەواو بوە) و ئێستا کاتی شۆڕش نەماوە و زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتیان گەڕانەوە بۆ لای رژێم، یان چونە ئەمریکا و ئەوروپا یان لە ئۆردوگاکانی ئێران نیشتەجێ بون.

---

[187] صلاح خرسان، التيارات السياسية في كردستان العراق، قراءة في ملفات الحركات و الاحزاب الكردية في العراق ١٩٤٦-٢٠٠١. ص ٦٩٨، موئسسة البلاغ – بيروت.

[188] خەبات، ژمارە ٥٣٦، سەرەتای ئازاری ١٩٧٨.

چەند جارێک پارتی، ڕەشبینی خۆی نەشاردۆتەوە و دەیوت: "شەڕ لە پێناوی ئۆتۆنۆمیدا هاتوتە کۆتایی، جارێکی تر دەستی پێناکرێتەوە"[189].

هەروەها بارزانی لەسەرەتای هەرەسەوە، باسی لەوە دەکرد کە وازی لە سەرۆکایەتی پارتی هێناوە، وەک لەوەو پێش باسمان کرد، لە چاوپێکەوتنە دیارەکەی لەگەڵ ئەمیری تاهیری لە ڕۆژنامەی (کەیهان) دەڵێ: "من چیتر سەرۆک نیم، دوبارەی دەکەمەوە کە من ئیتر سەرۆک نیم و نابم بە سەرۆک، هیوادارم ناوم لەسەر لاپەڕەکانی مێژوودا بسڕێتەوە"[190] ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بارزانی لە ٢/٩ و ١٩٧٧/٣/٣ دا دو نامەی بە ناوی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، ئاراستەی جیمی کارتەری سەرۆکی ئەمەریکا کردوە و هەردو نامەکە بێ وەڵام مانەوە (دۆزی کورد ل. ١٥٤). بارزانی تا کۆچی دوایی لە ١٩٧٩/٣/١ وەک سەرۆکی پارتی مایەوە، بێگومان لەکاتی نەخۆشیدا لە ئەمەریکا، نەیتوانیوە ئەرکی سەرۆکایەتی جێبەجێ بکات، هەتا ئەو لە ژیاندا مابوم هیچ کەسێ لەناو پارتی یان لەناو خانەوادەکەی بە بیریاندا نەئەهات دودڵی بنوێنن لەسەرۆکایەتیەکەی، پارتییەکان بارزانیان نەک بەسەرۆکی حیزبەکەیان، بەڵکو بەسەرۆکی هەمو کوردیان دەزانی.

دروستبونی یەکێتی نیشتیمانی هاندەری سەرەکی بو، بۆئەوەی ئیدریس و مەسعود بارزانی بکەونە خۆیان و هێزێکی تری کوردی دروست نەبێت و جێگای مێژویی ئەوان بخاتە مەترسییەوە، یان ببێت بە بەدیلی ئەوان.

ڕۆژنامەنوسێکی بێگانە لەو بارەیەوە نوسیویێتی: "یەک لەسەرچاوەکان بونیادنانەوەی پارتی بەو خێراییە گێراوەتەوە بۆ دامەزراندنی یەکێتی، ئەو سەرچاوەیە ئاماژەی بەوە کردوە هەڵسوڕاوانی پارتی سەبارەت بەو

---

[189] آوفرا بينغيو، كرد العراق- بناء دولة داخل دولة. دار النشر ئاراس-الساقي- ٢٠١٤، ل ٢١١.

[190] مێژووی جولانەوەی نەتەوەیی رزگاریخوازی گەلی کورد لە باشوری کوردستان ١٩٧٥-١٩٩١- د. دلێر ئەحمەد حەمە، ل ٥٦.

خێراییەی تاڵەبانی لە پێکهێنانی یەکێتی توشی شوک بون، هەر بۆیە بە پەرۆشەوە گەڕانەوە کوردستانی عێراق"[191].

سەرکردایەتی کاتی پارتی هەمو هەوڵێکی دا کە لە خۆرێکخستنەوەدا جیاواز بێت لە پارتیەکەی جاران و لە بواری تیوری، هەتا گەیشتە ئەوەی جورئەت بکات رەخنە لە بارزانی باوک و هەمو دامودەزگاکانی پارتی و ئەو دەزگایانەی کە سەر بە خانەوادەی بارزانی بون بگرێت.

لە راپۆرتی سیاسی سەرکردایەتی کاتیدا کە لە کۆنفرانسی بەرلین لە ١١ - ١٥ ئابی ١٩٧٦ پەسەندکرا، نوسیویانە: "دەزگای پاراستن، بوبو بە حیزبێک لەناو حیزبێکدا، هەمیشە ناکۆکی هەبو لە نێوان پاراستن و دەزگا جیاوازەکانی تری حیزبدا، ئەندامانی پاراستن راستەوخۆ لە دەزگاکەی خۆیانەوە فەرمانیان وەردەگرت، ..لە ئەنجامدا تێکچون و هەرەسهێنانی پارتی لێکەوتەوە و بوەهۆی دروستبونی مەرکەزی دەسەڵاتی جیاواز و بەکارهێنانی دەسەڵات بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسی.. لەبەر ئەم هۆیانە پارتی سەرکردایەتی راستەقینەی شۆڕشی نەئەکرد، بەڵکو بوبو بە یارمەتیدەرێکی بارەگای بارزانی، لە زۆر کاتدا یارمەتیدەرێکی خراپ. بەرای ئێمە ئەمە یەکێک بو لە هۆ سەرەکیەکانی هەرسهێنانی شۆڕش....بارزانی وەک هەمو یەکێکی سەدەکەی خۆی و باودۆخەکەی، ئاسایی بو کە بەرەو بیرکردنەوەیەکی کۆنزەرڤاتیف چوە و خۆی نوێ نەکردۆتەوە لە شەست و حەفتاکانی تەمەنیدا، کاریگەری عەشایری لەسەری زۆر هەبوە و ئەویش نکوڵی لێنەکردوە.. دەزگای بارزانی رێکخراوێک بوە کە لەگەڵ ژیانی هاوچەرخدا نەگونجاوە، لەسەر بناغەی سەرۆک و سەرباز دروست بوە، دەسەڵاتی باوکانە بوە (پاتریاک) دەسەڵات لە باوکەوە بۆ کوڕەکانی شۆڕبۆتەوە"[192].

---

[191] کاوە تەیب جەلال، کەرتبون لە نێوان.. ل١٠٠.

[192] طريق الحركة التحرريه الكوردية، تقييم ثورة ايلول و البرنامج الجديد للحزب الديمقاطي الكوردستاني، "القيادة الموقتة"، ص ١٢ - ١٦.

بۆچونی جیاواز لە کۆنگرەی نۆهەمی پارتی زۆر بە ئاشکرا دیاربو، بە تایبەتیش لە نێوان بنەماڵەی بارزانی و تازە چەپرەوەکانی نێوان سەرکردایەتی کاتیدا: "کۆنگرە لە کۆتاییدا بەهۆی کێشەی هەڵبژاردنەوە، تووشی مەترسیەکی گەورە ببوو، لایەنی چەپڕەو لەژێر سەرکردایەتی سامی عەبدولرەحمان، پێیان وابوو کە دەبێت ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ٢١ کەس بن و هەر ١٥ ئەندامی سەرکردایەتی کاتی لەگەڵ ٦ کەسی تر هەڵبژێرنەوە و هەڵبژاردن بە لیست بێت واتە هەر دەنگێک کە یەکێک لە ئەندامانی سەرکردایەتی کاتی بچێت بۆ لیستی سەرکردایەتی کاتی بێت و ٦ کەسی تریش دەبێ سەرکردایەتی کاتی لەسەری ڕازی بێت... مەسعود بارزانی داوای لە ئیدریس بارزانی کرد، کە خۆی بۆ سەرۆکایەتی پارتی کاندیت بکات؛ بەڵام ئیدریس بارزانی بەهۆی ئەو هێرشە گەورەیەی کە بۆ سەری کرابوو و دەکرا، بە بەرژەوەندی دەزانی کە بۆ پاراستنی ریزەکانی پارتی، مەسعود بارزانی خۆی هەڵبژێرێت"[١٩٣].

سامی عەبدولرەحمان، قورسایی کارەکانی بۆ خۆ ڕێکخستنەوە خستە دەرەوەی کوردستان و باسی لە پارتێکی نوێی پێشرەو و پێشەنگی مارکسی لینینی کوردستانی ئەدا بەگوێی خەڵکدا و تا لە ١٩٨١/٦/٢٦ دا لە گوندێکی نزیک لە شاری ڤیەنا لە وڵاتی نەمسا کۆنگرەیەکیان گرت و (پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان) یان دامەزراند، کە زۆربەی هەرە زۆری سەرکردایەتیەکانیان، لەسەرکردایەتی پارتی بون یان کادیری دیار و ناسراوی پارتی بون.

کێشەکانی ناو سەرکردایەتی پارتی پینە و پەڕۆ نەدەکرا، جیابونەوەی باڵی چەپ یان باڵی سامی عەبدولرەحمان مەسەلەی کات بو، گرتنی کۆنگرەی نۆهەم، زەنگی جیابونەوەی ئەو باڵەشی لێدا و هەنگاو بە هەنگاو ئەو گروپە کاری خۆیان لەناو پارتیدا کردبو، کە هێزێکی نوێی چەپ دروست بکەن، کە

---

[١٩٣] بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد.. د. عەلی تەتەر نێروەی، ل ١٢١.

خۆیان بۆ سەرکردایەتی هەڵنەبژارد، بەڵێنیان بە مەسعود بارزانی دابوو، کە لە هەر بارودۆخێک بێت، ئەوان لەگەڵیدابن".[194]

ئەم رەخنانە لە لایەک و لە لایەکی ترەوە، مەسعود بارزانی هەوڵی ئەدا کادیرە دیارەکانی دەزگای پاراستن بەگەڕبخات و رۆڵیان پێبدات لەناو پارتە نوێکەدا: "لە یەکەم هەنگاویدا مەسعود بارزانی گرنگیەکی تایبەتی بە کادر و رەگەزی لاودا، بە تایبەتی کادیرانی دەزگای (پاراستن)".[195]

سەرکردایەتی پارتی لەسەرەتادا، کەمتەرخەم نەبون لە رەخنەگرتن لە سەرکردایەتی کاتی پارتی جاران و بە ئاشکرا ناویان دەبردن : "کۆمەڵی سەرکردایەتی کاتی پارتی، سڵیان نەئەکردەوە کە با ئاشکرا بڵێن: مەلا مستەفا کۆتایی هاتوە، ئەو پیر و نەخۆشە و شەڕ لەگەڵ مردندا دەکات. ئیدریس لە حیزب دەرکراوە و هیچ رۆڵێکی نیە.. رێگا بە عەبدولمسەور نادەین کە بە هیچ جۆرێک سیاسەت بکات، ئەو کەسەی کە لای ئێمە مەقبولە، مەسعودە".[196]

## شەڕی نێوان پارتی و کوردانی کوردستانی ئێران

پارتی لە ئێرانەوە دەستی بە خۆ رێکخستنەوە و چالاکی کرد، ئەم جوڵەیە، بەدەرنەبو لە کاریگەری حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لەسەریان: "ئەگەر سەیری رووداوەکان و هەریەک لە راپۆرتی سیاسی و بڕیارەکانی بەلاغی کۆتایی و ناو کۆنگرەی نۆیەمی پارتی و ئەنجامەکانی بکەین، دەبینین لە روی سیاسیەوە کەوتۆتە ژێر کاریگەری کۆماری

[194] بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد، د. عەلی تەتەر نێروەی، ل ٢٤٠.

[195] د. عەلی تەتەر نێروەی، دهوک ٢٠١٦، ل ٦٠.

[196] المسألة الكوردية- البديل اليمقراطي - تجارب سياسة ١٩٧٤-٢٠٠٩، الدكتور عبدالمصور بارزاني، دهوک ٢٠١٦، ص ٥١-٣٠.

ئیسلامی ئێرانەوە و بە ئاشکرا لایەنگیری ڕژێمی تازەی ئەو وڵاتەی پێوە دیارە.. هەروەها لە بەیاننامەی پارتیدا لە ١٩٧٩/١١/٢٤ دا نوسیویانە..پارتیمان پێیوایە پشتیوانی کۆماری ئیسلامی ئێران بەسەرکردایەتی ئیمام خومەینی ئەرکێکە لە گەردنمان.."[١٩٧].

سیاسەتی پشتگیری پارتی بۆ کۆماری ئیسلامی، ئەوەندە کاریگەری خراپی لەسەر پارتی هەبو، بۆنمونە لە کۆنگرەی نۆیەمی پارتی لە ١٩٧٩/١١/٤ دا بە زەقی ڕەنگی دابۆوە، ئەو هەڵوێستەی ئەوان وایکرد کە هیچ هێزێکی کوردستانی جگە لە هێزێکی بچوکی کوردستانی تورکیا بەناوی KUK و لەناو هێزە عەرەبی و عێراقی و ئێرانیەکان تەنها نوێنەری حشع ئامادەی کۆنگرەکەیان بون"[١٩٨].

وەک باس دەکرێت، هەمو پارتی لەگەڵ ئەوەدا نەبون، کە پشتگیری کۆماری ئیسلامی بکەن و دژ بە هێزەکانی کوردی ئێران بە گشتی و حدکا بە تایبەتی شەڕ بکەن: "لەو کاتەدا بۆچوونێک لە نێو هەندێک کادری پارتیدا پەیدا بوبو، کە پێویستە پێشمەرگەی پارتی هاوشانی پێشمەرگەی (حیزب دیموکراتی کوردستانی ئێران- حدکا) شەڕی ئێران بکات. بەڵام سەرکردایەتی پارتی بە تایبەتی مەسعود و ئیدریس بارزانی بۆ پاراستنی گیانی دەیان هەزار کوردی پەنابەر کە لە شارەکانی ئێراندا بڵاوکرابونەوە دژ بەم بۆچونە ڕاوەستان"[١٩٩].

---

[١٩٧] سیاسەتی ئێران بەرامبەر جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد، فاروق محەمەد محەمەدئەمین، ل ١٦٧-١٦٥.

[١٩٨] چەند لاپەرەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی کوردمان- بەرگی یەکەم، فاتیح رسول، سوید ١٩٧٩، ل ٢٦٤.

[١٩٩] بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد، د.عەلی تەتەر نێروەی، ل ١١٥.

## پەیوەندی نێوان پارتی و کۆماری ئیسلامی

پشتگیری پارتی بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران، بڕیارێکی تاکتیکی نەبو، بەڵکو قەناعەتێکی سیاسی تەواو بو، ئەم پشتگیرییە لە کۆنگرەی نۆهەمی پارتیدا بە ئاشکرا رەنگی دابۆوە: "پارتی هەر لە کۆنگرەی نۆیەم لە تشرینی دوهەمی ١٩٧٩ پشتگیری خۆی بۆ کۆماری ئیسلامی ئێران راگەیاندبوو؛ چونکە ئەو شۆڕشە رژێمی شای ڕووخاندبوو و دژایەتی گەورەترین دوژمنی کوردی دەکرد کە ئەویش سەدام حسین بوو. بۆیە شتێکی سروشتی بوو کە پەیوەندیەکانی پارتی و ئێران ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەشەکردندابن.." ئەمە لە کاتێکدا کە هەڵوێستی ئێران بەرامبەر بە کێشەی کورد دۆستانە نەبو: "کۆمەڵێک لە کوردی عێراق و پارتە سیاسییەکانی لە روانگەی ئێرانەوە دەچونە خانەی دوژمن، بۆیە سیاسەتی ئێران سیاسەتێکی یەکگرتو بەرانبەر بە شۆڕشی کورد نەبو، سەبارەت بە هەر گروپێک هەڵوێستێکی جیاوازیان هەبو، بەڵام بەرانبەر بە کورد و شۆڕشی کورد و ئامانجەکانی هەمان سیاسەتی ڕژێمی پێشوویان هەبو و دژ بە مافەکانی گەلی کورد بون"[٢٠٠].

نزیکبونەوەی پارتی و ئێران، لە سودی یەکێتی نیشتیمانی نەبو بۆیە یەکێتی هەوڵی ئەدا تەگەرەی بخاتە پێش ئەو نزیکبونەوەیە، لە نامەیەکدا کە یەکێتی لە تەموزی ١٩٧٩ ئاراستەی سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتەی ئێران (مەهدی بازرگان)ی کردوە، تێدا هاتوە: "لە ڕاستیدا پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ سەرکردایەتی کاتی و زیندوکردنەوەیان کارێکە دژی شۆڕشی ئیسلامی و

[٢٠٠] هەمان سەرچاوە، ل ٢١٨.

دەستکەوتەکانی و دژی ئێمەیە و دوژمنایەتی گەلی عێراقی و شۆڕشی عێراقیە کە ئێمە لە شاخەکانی کوردستان دەستمان پێکردوە، بەم بۆنەیەوە تکا دەکەین و هیواداریین دەرفەت بە ئەوانە نەدەن.."[201].

هاوکاری راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی ئێران بۆ سەرکردایەتی پارتی، بێ بەرامبەر نەبو، پارتی پێویست بو، هاوکاری ئێران بکات لە شەڕی راگەیاندن و شەڕی راستەخۆدا دژ بە کوردەکانی کوردستانی ئێران: "دەستپێکردنەوەی پەیوەندی لە نێوان پارتی و ئێراندا، هەندێ مەترسی ناوخۆیی تێدابو،، یەکێک لەوانە، لەدەستدانی ئەو سەربەخۆییەی پارتی بو، کە بەدەستی هێنابو، ببێت بە ئامرازێک بەدەست ئێرانەوە، ئەو پەیوەندییەی نێوانیان وایلێهات، کە پارتی هاوکاری ئێران بکات لە شەڕیدا دژ بە کوردەکانی ئێران و هاوکاری لەگەڵ حیزبی دەعوە بکات.."[202].

پشتگیری پارتی لە کۆماری ئیسلامی ئێران، تەنها سیاسی نەبو، بەڵکو سەربازیش بو، کاتێ کە هێرشی ئێرانی بۆسەر کوردی ئێران بە گشتی و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە تایبەتی هەڵگیرسا، حیزبی دیموکرات لە ١٩٧٩/٩/١ داوای پشتگیری لە پارتی، یەکێتی، حیزبی شیوعی و حسک کرد بۆ بەرەنگاربونەوەی ئەو هێرشە، پارتی نەک هەر هاوکاری حیزبی دیموکراتی نەکرد، بەڵکو شان بەشان لەگەڵ پاسداری ئێراندا شەڕی کوردی ئێرانیان کرد، لە کۆبونەوەیەک لە نێوان حیزبی دیموکرات، حشع و حسک دەربارەی ئەوەی چۆن هەمو بەیەکەوە بتوانن هێزێک پێکبهێنن بۆ بەرگری لە شارەکانی کوردستانی ئێران، ئەندامێکی ئەو دانیشتنە دەیگێڕێتەوە: "د. قاسم پێشوازی گەرم و پێخۆشحاڵ بونی خۆیانی دەربڕی و گوتی: "سەرکردایەتی پارتی ئامادە نابێ، بەڵگەیان ئەوەیە دەڵێن دەرسی تازەی

---

[201] سیاسەتی ئێران بەامبەر جولانەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشوری کوردستان، ١٩٧٥-١٩٨٩، فاروق محەمەد محەمەدئەمین، ل ١٧٩.

[202] آوفر بينغيو، كرد العراق، بناء دولة داخل دولة، ٢٠١٤، ل ٢٢٦.

باری ئێرانمان نەكردوە، نازانین بۆ چ لایەک دەچێ و نیاز و ئامانجی دور و نزیكی ئیمام خومەینی چیە؟ مەسعود بارزانی وا لە تارانە هەستمكرد ناكۆكی قوڵ هەیە لە نێوان سەركردایەتی پارتی و سامی و زۆربەی كادرە گەنجەكان و پێشكەوتوخوازەكان، كوڕەكانی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا و لایەنگیرەكانیان لە ریزی پارتی دەیانەوێ خۆیان بە رژێمی ئیسلامی تازەی ئێرانەوە ببەستنەوە، هەربۆیەش وا بێدەنگن بەرامبەر بە گشت ڕووداو و كارەساتە خوێناوییەكانی لە كوردستانی ئێران ڕو دەدات"[٢٠٣].

دەربارەی رۆڵی یەكێتی كە لەناو كوردی ئێراندا بە (هێزی پشتیوان) ناوی دەركردبو، هەمان كەسایەتی كە ئامادەی كۆبونەوەیەكی تر بوە، كە یەكێتیش ئامادەبوە، دەنوسێت: "جەلال تاڵەبانی وتی: سەركردایەتی ینک بڕیاری هەیە بە هەمو توانایەوە یارمەتی حدكا بدات، ئەوەی ئێمە لێمان داوا بكەن بە پێی توانا بۆتانی جێبەجێ دەكەین، دەزانین بەڵێنی چی دەدەین، پێش هەمو هەنگاوێک پێویستە سەركردایەتی حدكا بە قەناعەتی تەواو دان بەوەدا بنێت، چارەنووسی گەلی كوردی ئێران و عێراق بە یەكترەوە بەستراوە، بەهێزكردنی پەیوەندی كوردی عێراق بە ئێوەوە، لەسەرمان گران دەوەستێت لە لایەن سوریا و ڕژێمی خومەینی، هەردو لایان رازی نین ینک پەیوەندی بەهێزی هەبێ و هاوكاری لەگەڵ ئێوە بكات"[٢٠٤].

---

[٢٠٣] فاتیح رسول، چەند لاپەرەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی كوردمان- بەرگی یەكەم،- سوید، ل ١٣١، ١٩٧٩.

[٢٠٤] هەمان سەرچاوە.

## پارتی و یەکێتی لە نێوان پشتگیری و دژایەتی ئێران

لە شەڕی بەرفراوانی سوپای ئێران بۆ سەر هێزە سیاسیەکانی کوردستانی ئێران، خەریک بو، شەڕەکە دەبو بە (جیهاد) دژ بە (کوردە کافرەکان) و یەکێتیش وەک پشتیوانیەکی کوردی ئێران بەر ئەو شالاوە کەوتبو: "لە شەڕی (پاوە)ش لە ٩ ئابی ١٩٧٩ کە وەزیری بەرگری مستەفا چەمران بە خۆی لەم شەڕەدا بەشداربو، پێشمەرگەی یەکێتی بەشداری شەڕیان کردبوو، وتەبێژی سوپای پاسداران باس لە پێشمەرگەی یەکێتی لەناو هێرشبەراندا دەکرد...خومەینی لە ٢ ئاب جیهادی دژ بە کورد راگەیاندبوو و قاسملۆی لە ئەنجومەنی (خوبرگان) دەرکرد و حزبی دیموکراتی بە حزبی شەیتان ناو بردبوو"[٢٠٥].

هەر دەربارەی رۆلی یەکێتی لە هاوکاری کوردی ئێراندا عەبدولای حەسەن زادە دەنوسێت: "یەکێتی نیشتیمانی لەگەڵ ئەوەی وەک گوتم، مام جەلال گوتی: هیچ پەیوەندیەکمان لەگەڵ ئێران نیە، بەلام پێشی خۆش نەبو ئەوە زۆر زەق بێتەوە. ئەمن بەرپرسی بە قەولی ئێرە ئیعلام بوم. لە دیدارێکی نێوان دوکتۆر قاسملۆ و و مام جەلال دا کە بە میوانداری من بوو، گوتم ئەمن لەگەڵ گیروگرفتێک بەرەوڕوم، گوتیان چییە؟ گوتم ئەو هەموە فیداکارییە دەکرێ، شەهید دەبێ، بریندار دەبێ، بەلام ئێمە باسیان ناکەین. ئەوە بۆ من زۆر ناخۆشە، مام جەلال گوتی: کاکە لەبەر ئێمە نییە؟ ئێمە نامانەوێ، گوتم باشە ئەتۆ لەبەرخۆتە، ئەمنیش لەبەرخۆمە، ئەمن وەکوو

---

[٢٠٥] فاتیح رسول، چەند لاپەرەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی کوردمان- بەرگی یەکەم،- سوید، ل ١٣٩، ١٩٧٩.

بەرپرسی تەبلیغاتی حیزب ویژدانم لە عەزاب دایە، گوتی: قەیدی ناکا، دوایی گوتم: باشە ئەمن پێشنیار دەکەم ناویان لێبنێین هێزی پشتیوان، نەڵێین یەکێتی نیشتیمانی، گوتی: باشە. ئیدی ئەوجار بە هێزی پشتیوانمان ناو دەبردن"[206].

لە ١٩٧٩/٩/٤ هەریەک لە یەکێتی، حشع، حسک و حدکا کۆبونەوەیەکی هاوبەشی سەرکردایەتیان گێڕا و پشتگیری تەواوی خۆیان بە هەمو شێوەیەک بۆ خەباتی کوردی ئێران دەربڕی.

دوای شەڕی پارتی و سوپای ئێران دژ بە کوردی ئێران، هەمو هێزە کوردییەکانی ئێران هەڵوێستیان وەرگرت و شەڕیان کردن و لە ڕاگەیاندندا، بە زمانی زۆر زبر باسی پارتیان دەکرد، حیزبی دیموکرات لە ١٩٨١ دا بڵاوکراوەیەکیان دەربارەی پارتی و هەڵوێستەکانیان دەرکرد لە ژێرناوی (خیانەتەکانی قیادەی موەقەت) کە دوایی عەبدوڵای حەسەن زادە، کە ئەو کاتە ئەندامی مەکتەبی سیاسی حدکا بو دەڵێ: ئەو وتارانە وەختی خۆی بە شێوەی زنجیرە وتار لە ڕادیۆ بڵاو دەبۆوە دواتر کۆکراوەتەوە و وەک نامیلکە چاپ کراوە ئەمن نوسیومە"[207]، لەو نامیلکەیدا هاتوە: "لە ساڵی ١٩٧٩ دا، کاتێک ڕژێمی خومەینی ئیعلانی جیهادی بە دژی خەڵکی کوردستانی ئێراندا و هەڵسوڕێنەرانی قیادەی مووەقەت و چەکدارانی دارودەستەی بارزانی وا تێگەیشتن کە حیزبی ئێمە کزبوە، دەستبەجێ لە ناوچەی مەریوان شان بە شانی ژاندرمەکانی ئێران بە گژ پێشمەرگەکانی حیزبی ئێمەدا چون، لە شنۆ تەقەیان لە خۆپیشاندانی خەڵک کرد و شەش کەسیان کوشت لە ناوچەی ورمێ، دەرەبەگ و کۆنە ساواکیەکان بە پشتیوانی ئیدریس بارزانی نزیکەی هەزار ماڵی وەرزێر و زەحمەتکێشیان دەربەدەرکرد و هەر لەسەر پێشنیاری "ئیدریس" چەندین سەد نەفەر لەم ناوچەیەدا بە

---

[206] حەقیقەتی مێژوو- دیدار لەگەڵ عەبدوڵلا حەسەن زادە، ل ٢٩٢.

[207] هەمان سەرچاوە، ل ٢٦٧.

سەرۆکایەتی دەرەبەگەکان بون بە جاش ڕەسمی ڕژێمی خومەینی"[٢٠٨].

پارتی تەنها دژایەتی لەگەڵ حیزبی دیموکراتدا نەدەکرد، بەڵکو هەمو هێزە کوردییەکان و چەپەکانی ئێرانی گرتبۆوە، حیزبی دیموکرات نەرمترین هێزبون لە دژایەتیاندا بەرامبەر بە پارتی و لە ڕێکەوتنی زوربەی هێزە کوردی و ئێرانیەکاندا، کە لە چەند بەندێک پێکهاتبو، لە خاڵی هەشتەم، داوا دەکرا کە پارتی - قیادەی موقەتە، لە ئێران بکرێتە دەرەوە: "کاتێک نوێنەرانی دەوڵەتی کاتی (ئێران) موهەندیس بازرگان هاتنە مهاباد، تاقە نوێنەری حیزبی ئێمە (دیموکرات) لەو کۆبونەوەدا زۆر دژی بەندی هەشتی داخوازییەکان بو کە داوای دەکرد ئەفرادی قیادەی موقت لە ئێران دەربکرێن...لە کۆنفرانسی گەلان لە تارانیش کە نوێنەری زۆر لە حیزب و ڕێکخراوە سیاسی یە ناوچەیی و سەرتاسەریەکانی ئێرانی تێدابو، تەنیا ڕێکخراوێک کە دژی هێرشکردن بۆ سەر قیادەی موقت راوەستا حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو...کاتێک هێرشی دوژمن بە بەربلاوی لە هەمو ناوچەکان دا دەست پێکرا، لە ناوچەکانی شنۆ، نەغەدە و پیرانشار پێشمەرگەکانی ئێمە ناچاربون هێندێ بنکەی خۆیان لەسەر جادەکان چۆڵ بکەن، کەچی چەکدارەکانی قیادەی موقت، کە هەمیشە لە پێشەوەی هێزە سەرکوتکەرەکانەوە دەڕۆشتن بێشەرمانە تەواوی ئەو جێگایانەیان گرتەوە و تەنانەت ئازوقەی پێشمەرگەکانیشیان بە تالان برد"[٢٠٩].

پەیوەندیی پارتی و ئێران زیاتر قاڵبێکی سەربازی هەبو زیاتر لە سیاسی: "لە ئەنجامی کۆبونەوەی ئیدریس بارزانی لەگەڵ لێپرسراوانی ئێرانی لە وەزارەتی بەرگری و گروپەکانی تر، بەڵێنی دانێ کە ڕۆڵێکی گرنگ ببینن لە

[٢٠٨] نهێنیەکانی شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (١٩٧٩-١٩٨٢) لە بڵاوکراوەکانی ئەرشیفخانەی دیکۆمێنتەکانی کوردایەتی، ستۆکهۆڵم ٢٠١٦، ل ٨٧.

[٢٠٩] هەمان سەرچاوە، ل ٦٢-٦٥.

هێرشکردنە سەر کوردەکانی ئێران، ئەوانەی کە داوای ئۆتۆنۆمیان دەکرد، بەرامبەر بەوەی کە ئەوان پارە و چەکیان بدەنێ و ئاسانکاریان بۆ بکرێت بۆ کۆکردنەوەی هەمو ئەوانەی کە دەیانەوێت لە ئۆردوگای زێوێ و مانگانەش موچەیان بۆ ببڕێتەوە"[٢١٠].

دەربارەی شەڕی پارتی (قیادەی موەقەتە) دژ بە هێزەکانی کوردستانی ئێران و هێنانەوەی پاساو بۆ ئەو هەڵوێستەیان، فاتیح رەسوڵ دەنوسێت: "لە زۆربەی کۆبونەوەکانی دو قوڵی نێوان سەرکردایەتی (پدک) و (حشع) و کۆبونەوەکانی لیژنەی باڵای (جود) کە خۆشم لە گەڵیاندا بەشداریم دەکرد، باسی ئەو وانە گرنگە دەکرا کە لەسەر (م.س) پدک پێویستە هەنگاو بنێت هێزی چەکداری خۆی لەناو خاکی کوردستانی ئێران بکێشێتەوە، لەم تێکهەڵکشان و تێک ئاڵانەی لەگەڵ ئەرتەش و باسداران رزگاریان ببێ!

لەو شەڕانەی سوپای ئێرانی و قیادەی موەقت دژ بە کوردی ئێران کرا، ئەنجام زۆربەی زۆری ناوچەکانی هێزە کوردییەکان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی سوپای کۆماری ئیسلامی و زۆر لە بارەگا سەرەکیەکانی هێزە کوردی و چەپەکانی ئێران هاتنە ناوچەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە، دەربارەی ئەو بارودۆخە و دەرکردنیان لە خاکی خۆیان عەبدوڵای حەسەن زادە دەڵێ: "بەڵێ دەریان کردین ئیدی، جا بۆیە ئەوەی کە وەختی خۆشی گوتم ئەو غەدرە، زۆر غەدرە لە ئێمە دەکرێ، وەختی خۆی کە پارتی و یەکێتی لەگەڵ پ.ک.ک شەڕیان بوو، وتوویژم لەگەڵ کرا، هەر ئەو وەختی خۆ شەڕەکە لەگەڵ ئێمە نەبو، بەڵام گوتم هەر بۆ خۆی موهیممە ئەو شەڕە لە کوێ دەکرێ؟ پارتی و یەکێتی نەچوون لە تورکیا شەڕی پ.ک.ک بکەن، پ.ک.ک هاتوە لێرە شەڕی یەکێتی و پارتی دەکا، کەوابێ خەتای پتر بەلای ویدایە، لەوێش خۆ ئێمە نەهاتبووینە باشووری کوردستان، ئەوان هاتبون لە

[٢١٠] المشكلة الكردية في الشرق الاوسط، د. حامد محمود عيسى، مكتبة مدبولي ١٩٩٢، ص ٢٥٨.

خاکی خۆرهەڵاتی کوردستاندا شەڕی ئێمەیان دەکرد"[211].

بەڵام سەرکردایەتی (پدک) بە بەردەوامی بەرگریان لە هەڵوێستەکانی خۆیان دەکرد و بەڵگەی زۆریشیان دەهێنایەوە کە ئەرکی سەرشانیان گەلێ گران و سەختە، ژمارەی چل هەزار پەنابەر بە خاووخێزانیانەوە لە شارەکانی ئێران پەرِدەوازە کروان. (ینک) کۆسپ و تەگەرەی زۆریان دەهێنێتەوە پێش، شەڕیان پێ دەفرۆشێت، توانای دارایی و چەکییان کەمە..هتد. ئەو بەڵگانەی سەرکردایەتی پارتی دەیان خستنە ڕوو هێندێ ڕاستی تێدا بەدی دەکرا"[212].

داخوازی حدکا تەنها ئەوەبو، کە پاتی هێزە چەکدارەکانی لە کوردستانی ئێران بکشێنێتەوە و هیچی تر: "لە ١٩٨٢/٥/٢٣ دا نوێنەرانی دەفتەری سیاسی حدکا، شەهیدی نەمر د. قاسملۆ و کاک فەتاحی کاویان و سەید محەمەد گەیشتنە بارەگای (م.س) حشع، هاوڕێیان کەریم ئەحمەد و عومەر شێخ و ماجد عەبدولرەزاق و فاتیح رەسوڵ لە گەڵیاندا کۆبونەوە...د. عەبدولرەحمان قاسملۆ ڕایگەیاند کە: تاکە داوای (حدکا) لە (پدک) ئەوەیە چەکدارەکانیان بۆ ناو خاکی کوردستانی عێراق بگەڕێنەوە"[213].

هەرچەندە پارتی زەختێکی زۆری لەسەربو، بۆ کێشانەوەی هێزەکانی لە کوردستانی ئێران، بەڵام تا کۆتایی ساڵ شەڕ بەردەوام بو، لە ١٩٨٢/١١/٤ لە نێوان سەردەشت و پیران شەهر لە لایەن پێشمەرگەکانی یەکێتی و حدکا شەڕێک لەگەڵ سوپای پاسداران و قیادەی موقەتە ڕویداو، لەو شەڕەدا چەند پێشمەرگەیەکی قیادەی موەقەتە بەدیل گیران.

---

[211] حەقیقەتی مێژوو- دیدار لەگەڵ عەبدوڵلا حەسەن زادە، تایبەت بە مێژووی حزبی دیموکرات و ڕۆژهەڵاتی کوردستان و گەلی کورد، بێژەن ساعدی، چاپی یەکەم ٢٠١٩، ل ٢٨٠.

[212] فاتیح رسول، چەند لاپەرەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی کوردمان- بەرگی سێیەم، سوید، ل ٢٨- ١٩٩٤.

[213] هەمان سەرچاوە، ل ٩٩.

## سەرەتای شەڕ و ناکۆکی نێوان پارتی و یەکێتی

دو هێز لەسەرەتاوە، هەوێنی بەربەرەکانی یەکتریان لە ناخی خۆیاندا هەڵگرتبو، هەریەکەیان هەر فرسەتێکی بۆ هەڵکەوتبێت، دژی ئەوی تر هەڵوێستی وەردەگرت، لەبەرئەوە زۆر ئاسایی بو کە ئەو ناکۆکییە سیاسییە لە نزیکترین کاتدا، بتەقێتەوە و شەڕێکی نوێی ناوخۆیی لە دەرگای بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد بداتەوە.

سالی ١٩٧٦، سالی سەرەتای جولانێکی نوێی سیاسی بو لە دەرەوەی کوردستان، بە تایبەتی دوای دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و خۆ رێکخستنەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان. یەکێتی خۆی بەو هێزە دەزانی کە "شکستی بە ئاشبەتاڵ هێنا" و "یەکەم هێز بو کە دەستپێشخەری خەباتی چەکداربوە بانگی خۆ هەڵسانەوەیدا بە گوێی هەمو لایەکدا دا کە گەلی کورد شکست و هەرەسی نەهێناوە، ئەوەی شکستی هێناوە، سەرکردایەتی شۆڕشی کۆن بوە"

"دامەزران و کەوتنەگەڕی یەکێتی بو بە هۆیەکی گرنگی هەڵساندنەوە و بوژاندنەوەی کوردایەتی لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات و تەنانەت هەرەسهێنانی رابەرایەتی خێڵەکیش. بەڵام لە روی ئیستراتیجی و سەرەتاییەوە دەرگاش بە کراوەیی بەجێ ئەهێڵیت بۆ بوژانەوەی خەباتی شۆڕشگێرانەی رێکوپێک و هێنانەوەی کوردایەتی بۆسەر رێبازی راست و هاتنەوەکایەی هێزی دیموکرات و پێشکەوتو پێشرەوی کوردستانیش، بۆیە دامەزراندن و کەوتنە

گەڕی یەکێتی خوێنێکی گەشی نوێی لە لەشی کوردایەتیدا گێڕا..".[214]

لە ژمارە ١ی ڕۆژنامەی ڕێبازی نوێی، کانونی دووەمی ١٩٧٦ دا و لەژێر ناونیشانی باری ئێستای گەلەکەمان و ڕێکخستنی یەکێتی نیشتیمانی، هاتوە: "پێویستە هەڤالانمان زۆر هوشیارانە و وریایانە خۆیان بپارێزن لەو داوەی هەندێ لە پەیڕەوکەرانی (ڕەوتی خێلەکی) و خۆهەلپەساردوەکان بە پاشکۆی ڕابەرایەتی خێلەکیەوە بۆیان ئەنێتەوە، دوای وەرگێڕانەوەی ئەم خەباتەی ئەمڕۆ لەناو کوردستاندا هەیە، لە بەینی ڕێبازی خەباتی جەماهیریی شۆڕشگێرانە و ڕەوتی خێلەکی و دەرەبەگایەتی ڕزیودا و ئاوەژوکردنەوەی ئەم خەباتە و شێواندنی لە خەلک بە نیشاندانی هەروەک ژیاندنەوەی ئەو ناکۆکیە بێت لە سالەکانی ١٩٦٤-١٩٧٠ دا لە ناو ریزەکانی کوردایەتی و پارتی دیموکراتی کوردستاندا تەقینەوە و بۆ سوککردنی، ناوی مەلایی و جەلالیی لێ نرا. چونکە ئێمە بەوپەڕی سەربەستیەوە بلاوی ئەکەینەوە، کە یەکێتیەکەی ئێمە درێژەپێدانی هیچ یەکێ لەم دولایەنە نیە، بیروڕا و ڕێباز و هەلوێستەکانی لەگەل هەردولاکە زۆر جیاوازە و ئێمە خۆمان بە میراتگری هیچ لایەک نازانین"

لە هەمان ئۆرگاندا و لە ژمارە ٢ ی تشرینی دووەمی ١٩٧٦ دا و لەژێر ناوی (چەند ڕەئیەک لەسەر زیندوکردنەوەی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەژێر ناوی بیروڕای ئازاد، کادیرێکی یەکێتی نوسیویێتی: "ئەگەر خۆ ڕێکخستنەوەی لەمەولای پ.د.ک درێژەپێدان و لەسەر ڕۆشتنی ڕێبازی ژێرکەوتوی پێشوی پ.د.ک بێت، ئەوا زیندوبونەوەی زیان بە کورد ئەگەیەنێ و مەسەلەی کورد ئەخاتەوە داوی سەوداو مامەلەی دەولەتە گەورەکان و دام ودەزگا ئیمپریالیست و کۆنەپەرستەکانەوە".

یەکێک لە پێشمەرگاکانی مەفرەزە سەرتایەکانی یەکێتی بەم جۆرە باسی

---

[214] باری ئێستای خەباتمان، لە بلاوکروەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان – ٢، کانونی دوەمی ١٩٧٦، ل ٦– ١٢.

سەرەتای دەستپێکردنی خەباتی چەکداری یەکێتی دەکات: "شەوی ١٧-١٩٧٦/٧/١٨ چوینە گوندی ریشێن و خەڵکی گوندەکەمان کۆکردەوە و شێخ عەلی (عەلی کەشکۆڵ) قسەی بۆ کردن و باروودۆخی شۆڕشی بۆ باسکردن بە ناوی کۆمەڵەوە یان بەرەی رزگاری قسەمان دەکرد"[٢١٥].

یەکێتی نیشتیمانی پەلەی بو، لە دەرەوە هێز بنێرێتەوە بۆ کوردستان، بارەگای سەرەکی دەرەوەیان لە دیمەشق (شام) بو. بە هەمان شێوەش پارتی هەوڵی ئەدا هەوادارانی خۆی بنێرێتەوە بۆ کوردستان و زیاتر بۆ ناوچەی بادینان، لە هەمان کاتیشدا پەیوەندیان لەگەڵ هەندێ هێزی عەشایری کوردستانی تورکیا دروستکردبو، بۆئەوەی کارئاسانیان بۆ بکەن کاتێ هێزەکانیان سنور ئەبەزێنن و ئەچن بۆ ناوچەی بادینان.

نەوشیراون مستەفا، کە خۆی سەرپەرشتی ئەو هێزانەی یەکێتی دەکرد کە لە سوریاوە ئەنێردران بۆ کوردستانی عێراق، بەم شێوەیە باسی یەکەم پێکدادان و شەڕی ناوخۆی کوردی کوردی، لە دوای ئازاری ١٩٧٠ وە، دەگێڕێتەوە: "١ی حوزەیرانی ١٩٧٦ بە بۆنەی تێپەربونی ١ ساڵەوە بەسەر دامەزراندنی یەکێتیدا، نەقیبی موهەندیس ئیبراهیم عەزۆ محەمەد (جەبار) فەرماندەی دەستە چەکدارەکانی بادینان بو، یەکەمینجار لە نزیک روباری هیزل لە پشتی زاخۆ لەگەڵ پێشمەرگەکانی تردا یەکی گرتەوە و کۆبوەوە بۆ ریکخستنەوەی مەفرەزەکان و دابەشکردنی کار و فەرمان بەسەریاندا. ژمارەیان ٣٧ پێشمەرگە بو، بون بە چوار مەفرەزە: ئیبراهیم عەزۆ، عیزەت ئیسماعیل شەنگاری، عومەر ئیبراهیم رەشید، جەبار مەلا غەنی سندی، هەریەکەیان فەرماندەی مەفرەزەیەک بون.

ئەم ٤ مەفرەزەیە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان دابەشبون بەسەر ناوچەکانی زاخۆ، ئامێدی، دهۆک و کەوتنە چالاکی سیاسی، ریکخراوەیی، پێشمەرگەیی. مژدەی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداریان بە خەڵکی

---

[٢١٥] رۆژژمێری پێشمەرگەیەک، محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی ١، ل ٩.

بادینانـدا و پەیوەنـدیان لەگەڵ زۆر کەس لە گونـد و شـارەکان دامەزرانـد و هەندێ ناونیشانیان درابویە بۆ دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە لە سلێمانی، لەگەڵ ئەوانیش پەیوەندیان دامەزراندبو.

دەربارەی گەڕانەوەی هێزی پێشمەرگەی پارتی (سەرکردایەتی کاتی) بـۆ کوردستان، سامی عەبدولرەحمان لە ڕاپۆرتەکەیدا بـۆ کۆنگرەی پـارتی گەل دەنوسـێ: "لە تشـرینی یەکەمـی ١٩٧٧، یەکەمـین گروپـی چەکداری گەیشـتنە کوردسـتان کە لەلایەن سـەرکردایەتی ڕاسـتڕەوی پ.د.ک وە بەهاوکـاری و هەماهەنگی لەگەڵ سـاڤاکی ئێرانی نـاردرابون. لەگەڵ هەریەک لەم دەسـتانە، کۆمەڵێک پارەیان پێدرابو بۆ کرینی چەک بۆ خۆیان، ئەگەر یەکێ دودڵ بێت لەوەی کە ئەمگروپانە بە هاوکاری شـا و ساڤاک نەهاتبێتن، تەنها ئەوە بەسە بلێـین کە ئەو گروپـانە مانگـانە موچەیـان لەلایەن دەزگـای سـاڤاکەوە بـۆ دەهات، تا دوا ڕۆژانی کۆتایی هاتنی ئەم دەزگا ترسناکە".[٢١٦]

---

[٢١٦] البديل الثوري في الحركة التحررية الكوردية، التقرير السياسي للمؤتمر التأسيسي لحزب الشعب الديمقراطي الكردستاني، ص ٢٤.

# هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ

نەوشیروان مستەفا، بەم شێوەیە سەرەتای شەڕی ناوخۆ دەگێڕێتەوە: ١٥ی تەمـوزی ١٩٧٦، ئیبـراهیم عەزۆ بـۆ بەرێکردنـی پێشـمەرگەیەکی نەخـۆش و نـاردنی پۆسـتە دەربـارەی ئەنجـامی کارەکانیـان لەگەڵ مەفـرەزەکەی چـوە گوندی (نێروە) نـاوچەی گویی لە قەزای (ئولـودەرە) لە کوردسـتانی تورکیـا. پێشـتر (ق.م) کەوتبـونە چـاودێری و سـۆراخی ئەم پێشـمەرگانە لە نـاوچە سنوریەکانی ئولەدەرە، چەقرجە و خیلە. کوردەکانی ئەوێیان لێ هاندابون کە هەرکەسـێکیان لەو پێشـمەرگانە بەردەسـت کەوت بیـان گـرن، چەک و کەلوپەلەکانیـان بـۆ ئەوان و سەریشـیان بـۆ (ق.م) چـونکە ئەوان جاشـی سەددامن و بە فیتی سەددام ئەیانەوێ شۆڕش لە بارزانی تێک بدەن.

خەڵکی گوندی نێروە بە نـاوی میوانداریەوە لەنـاو ماڵێکدا دایـان ئەنـێن، دەوریـان ئەگـرن و، بەفێـڵ هەمویـان چەک ئەکەن، بە گیـراوی تەسـلیمی لێپرسراوەکانی (ق.م) : هاشم رەمەزان، کەریم سنجاری، جەوهەر نامیقیان ئەکەن.

مـاوەیەک بە گیـراوی لە گەور و گوڤەکـانی ناوچەکـانی گەیـی، قەشـوری، ئەتروش...سـوڕاندویاننەوە و (ق.م). گوێیـان نەدایە نامەکـانی مـام جەلال، ناوبژی و هەوڵەکانی سەرانی د.د.ک.د سەرئەنجام هەمویان کوشتن.

١ی ئابی ١٩٧٦، پاش ئەوەی چەند هەفتەیەک مەفرەزەکانی بادینان ئاگایان لە فەرمانـدەکەیان نـامێنێ، جـارێکی کە یەک ئەگـرنەوە بڕیـار ئەدەن: عێـزەت ئیسماعیل و عومەر ئیبراهیم بە خۆیان و مەفرەزەکانیانەوە بچن بۆ سۆراخی ئیبـراهیم عەزۆ و هاوڕێکـانی. جەبـاری مەلا عەلـی و مەفرەزەکەشـی لە ناوچەکەدا بمێنێتەوە بۆ درێژەدان بە کارەکانی خۆیان.

عێـزەت و عـومەر لەگەڵ مەفرەزەکانیـان، رو ئەکەنە نـاوچەی گـویی، دیسان تاقمێ لە خەڵکی گوندی (روبوزک) بەناوی میوانداریییەوە تەفرەیان دابون، دەوریان گرتبون و داوایان لێکردبون چەک دابنێن. عێزەت ئەکەوێتە دواندنیان بە قسـەی خۆش و نەرم زۆریـان لەگەڵ خەریک ئەبێ لەو بیرە چەوتە پەشیمانیان بکاتەوە، کەڵکی نابێ سەرئەنجام پێیان ئەڵێ: "من چەکم بۆ ئازادی کوردستان هەڵگرتوە، لە ئاشبەتاڵەکەوە تەمێ خواردو بوم، بەڵێنم داوە تا کوردستان ئازاد نەبێ جارێکی تر بە ساغی چەک بۆ هیچ کەس و تاقم و لایەک دانانیم، مەگەر بمکوژن ئینجا چەکەکەم ببەن"

ئەبێ بە میل راکێشـان، لەوێ دا عێزەت ئەکوژرێت، ئینجا لێیان ئەپرسن: "کێ مەسئولتانە؟" عومەر ئیبراهیم و قاسم محەمەد هەڵئەستن ئەڵێن: "دوای ئەو ئێمە مسئولین" عومەر فەرماندەی مەفرەزە و قاسم خوێندکاری کلیەی هەندەسەی زانستگای موسڵ و رابەری سیاسی مەفرەزەکەیان بو، هەر لەوێدا عومەر و قاسمیش ئەکوژن.

١٨ پێشـمەرگە کە پاشـماوەی هەردو مەفـرەزەکە بـون بە گیـراوی بـران تەسلیمی بارەگای (ق.م). کرا لە گوندی مەرهە لە نزیک ئەلودەروە.

١٥ ی ئابی ١٩٧٦ تاقمێ لە چەکدارەکانی (ق.م). بە سـەرکردایەتی عەبدوڵا رەمەزان. مەحمود گۆیی، یوسف گۆیی، پێشمەرگە گیراوەکانی مەفرەزەکانی عێززەت و عومەریـان دایە پـێش بەرەو ئەشـکەوتی (بـاقی) لە نزیـک گونـدی مەرگە هەمویان کوشتن و لاشەکانیان لە ئەشکەوتەکەدا بە جێ هێشتن..."[٢١٧].

گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە تاڵە تراژیدیایە، بە لێدانی زەنگی شەڕی ناوخۆ دائەنرێت و ئۆباڵی دەستپێکردنی ئەو شـەڕە قێزەونە لە ئەستۆی زۆر لایەنە، بەڵام لەسـەرو هەمویـانەوە، ئەو لایەنەی کە ئەوانەیـان کوشـت، کە هـاتبون بـۆ پێشـمەرگایەتی و خەبات و هەڵسانەوە لە کوردستانێک کە تروسکەی بەرگری بەدی نەئەکرا.

---

[٢١٧] لە کەناری دانوبەوە ..ل ١٢١.

دەربارەی سەرەتای شەڕی ناوخۆ و کوشتنی پێشمەرگەکانی یەکێتی، سەرکردەیەکی پارتی دەنوسێت: "لە شەڕێکی نێوان پارتی و یەکێتیدا لە ١٧ی تەموزی ١٩٧٦ ئەو مەفرەزەی یەکێتی دەکوژرێن و تەنیا چوار پێشمەرگەیان لێ ڕزگاردەبن کە ئەوانیش لە لایەن حکومەت دەستگیر دەکرێن و لە ٢٩ ئاداری ١٩٧٧ لە سێدارە دەدرێن. بەم شێوەیە لە جیاتی ئەوەی کە یەکەم مەفرەزەکان لە شەڕی بەرگری و دژ بە حکومەت ببنە قوربانی بونە قوربانی شەڕێکی خوێناوی ناوخۆ بەشێکی زۆری تواناکانی هەردولا لە ململانێی ناوخۆدا بە فیڕۆچوو"[٢١٨].

ئەمە سەرەتای قۆناغێکی خوێناوی لە شەڕی ناوخۆی کوردی نیشان ئەدات، کە تا ١٩٨٨ خایاند، تا ئێستا هیچ سەرچاوەیەکم لە هیچ لایەک دەستنەکەوتوە، ئەم گێڕانەوەیە نەوشیروان مستەفا بەدرۆ بخاتەوە.

کوشتنی یەکەم پۆلی پێشمەرگەی یەکێتی لە کوردستان، چاوترساندن و رقی رەشی کۆن نەبێت بەرامبەر بە هەر هێزێک، کە بیەوێت بێ رەزامەندی (ق.م) شوێنپێی خۆی لە بادینان قایم بکات، هیچ لێکدانەوەیەکی تر هەڵناگرێت، خراپی ئەم کوشتارە لە کاتێکدا بوە، کە گەورەترین شۆڕشی کورد لە چەرخی بیستەمدا هەرەسی هێنابو و کۆمەڵێک لاوی کوردی لەخۆبوردو هاتون لە دژوارترین بارودۆخدا دژ بە ئیرادەی هەرەس و هەڵهاتن وەستاونەتەوە..

مام جەلال لەبارەی کوشتنی هەردو پۆلە پێشمەرگەکانی خۆیان لە لایەن (ق.م). وە دەڵێ: (لە جیاتی ئەوەی یارمەتی و هاوکاریان بکەن، لە جیاتی ئەوەی پشتیوانیان لێبکەن، کەچی دەستیانکرد بە کوشتن و لەناوبردنی ئەو تێکۆشەرە قارەمانانەی چوبونەوە شۆڕش هەڵگیرسێننەوە، لەو کارە ناجوامێرانەدا هاوکاری تەواویان لە ئاغا و دەرەبەگە خائینەکانی کوردستانی تورکیا وەرگرت، زۆر بەداخەوە، هەرچەندە ئێمە هەوڵماندا کە

[٢١٨] بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە کوردستانی عێراق، ل ٨١.

دۆستایەتی لەگەڵ مەسعود و ئیدریس بارزانی دروستبکەین، بەلام بێئەنجام بو، ئیدریس لە کۆبونەویەکدا کە کۆمەڵێک کادیری تێدا بەشداربو، لەوانە: سەید کاکە و سەعدی گچکە و چەند کەسێکی تر، هەڕەشەی کردبو، گوتبوی: "راستە ئێمە شۆڕشمان پێنەکرا، بەلام دەتوانین شۆڕش تێکبدەین، ئەگەر شۆڕشمان پێ نەکرێ، شۆڕشمان پێ تێکدەدرێ، ئێمە ئاگاداری ئەو بزوتنەویە نین، کە ئێستا یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دەستیپێکردوە (ئەوەبو، لە بادینان تەهدیدەکەی خۆیان هێنایە دی و ئەو مەفرەزە سی و هەشت کەسییەی، گەڕابونەوە بۆ خەبات، لە ناویان بردن)"[٢١٩].

هەرچەندە مام جەلال لە ١٩٧٦/٨/١٤ دا نامەی بۆ ئیدریس و مەسعود بارزانی نوسی و لە لەندنیش لە ١٩٧٦/١٠/١٦ دا چاوی بە مەسعود بارزانی کەوت و لە ١ ی مارتی ١٩٧٧ دا رێکەوتنێکی سێ قۆڵی بە ئامادەبونی باقر یاسین بەناوی قیادەی قوتری عێراقی حیزبی بەعس مۆر کرا، کە ئیتر شەڕی یەکتر نەکەن و هاوکاری یەکتر بکەن، یەکێتی چەکیان بۆ پەیدا بکات و ئەوانیش پارەیان بدەنێ، بەلام هیچ یەکێک لەو نامە و رێکەوتنانە سودێکی نەبو، دیلەکانی یەکێتی کوژران و ناکۆکیەکان قوڵتر بونەوە.

یەکێک لە هۆکانی سەرنەگرتنی هەوڵەکانی نێوان ق.م. و یەکێتی، جگە لە هۆی سیاسی، هۆیەکی تری وەک مام جەلال باسی دەکات، مەلا مستەفا بوە، کە مەبەستی سەرنەگرتنی ئەو رێکەوتننامانە بوە و ئەیگێڕێتەوە "مولازم ئیبراهیم دزەیی، کە خۆی ئەو سەردەمە لەگەڵ مەلا مستەفا بو لە واشنتۆن وا دەردەکەوێت، مەلا مستافا دژی ئەو رێکەوتنامەیە بوە، هەواڵەکەی دراوەتێ کە مەسعود رێکەوتنی لەگەڵ من ئیمزا کردوە، لە جیاتی ئەوەی پێیخۆشبێت، گوتویەتی، {جەلال ئەویشی هەڵخەڵەتاند و مەسعودیشی بە فریوبرد} داوای لێکردوە بەتاڵی بکاتەوە"[٢٢٠].

---

[٢١٩] دیداری تەمەن، بەرگی ٢، ل ٥٦.

[٢٢٠] هەمان سەرچاوە، ل ٥٩.

جـــارێکی تـــر پـــارتی (ق.م) دەســـتێکی تـــری لە یەکێتـــی وەشـــان و سەرکردەیەکی پێشمەرگەی یەکێتی حەسەن خۆشناو و ١٠ لە هاوڕێیانی لە ١٩٧٦/١٠/١٣ دا لە گوندی باویان لەناوبردن، واتا دوای کوژرانی ئەوان ئینجا مـام جەلال و مەسـعود بـارزانی لە لەنـدەن چاویـان بەیەک کەوت، ئەمە لە کاتێکدا کە مام جەلال لەو کاتەدا ئاگاداری کوشتنی ئەو گروپەی یەکێتی نەبوە و داوای لە مەسعود بارزانی کردوە کە هەوڵ بدات کە ئازاد بکرێن.

کوشـتنی هەردو گروپـی یەکێتـی، کە بەسـەرەتای دەسـتپێکردنی شۆڕشـی نـوێی یەکێتـی دەژمێرێـت و یەکەم هەنگـاو بـوە بـۆ نـاردنەوەی پێشـمەرگە لە دەرەوە بۆ ناوەوە، جەزرەبەیەکی کوشندەبو، بەر یەکێتی کەوت.

کوشـتنی ئیبـراهیم عەزۆ و حەسـەن خۆشـناو و هاوڕێکانیـان، بەدەسـت (ق.م) و هاوکارەکانیان لە کوردستانی تورکیا، ئیشـارەتێکی رون و ئاشـکرابو، کە (ق.م) و خـانەوادەی بـارزانی نـاهێڵن هـیچ هێزێـک بـێ رەزامەنـدی ئەوان بچێت بۆ ناوچەی بادیان، یان بارەگا لەوێ دابنێت..

زۆر دەمـێکە پـارتی نـاوچەی بادینانیـانی بە برِبرِەی پشـتی خـانەوادەی بـــارزانی و پـــارتی زانیـــوە و ئەوە ئیســـتراتیجیەتیان بـــوە، ئەوێیـــان بە ناوچەیەکی داخراو داناوە کە مامەڵەی لەسـەر ناکرێت، بونی هەر هێزێکی دیکە بێ پرس و ڕاوەرگرتن لە پارتی مەحاڵ بو بەئاسانی بتوانێت بچێت بۆ ئەوێ یان لەوێ بمێنێتەوە.

پێویست بو، یەکێتی ئەو ڕاستیە بزانێت، کە نابێت ئەو هەوڵە بدات، ئەگەر بیشانویستایە بچن بۆ ئەو ناوچەیە، یاخود بارەگا لەوێ دابنێن، ئەوا باشتر بـو لەگەڵ پـارتی ڕێکبکەوتنـایە کە ئەوان مەبەسـتێکی وایـان هەیە، پـارتی ئەمەی تەنهـا لەگەڵ یەکێتیـدا نەکـردوە، بەڵکـو ڕێگـای نەداوە هـیچ هێزێکـی ڕکابەر لەو ناوچەیە گەشە بکات، هێزە کوردیەکـانی تر، بە تـایبەتی ئەوانەی لە بەرەی (جود) دا بـون، ئەوانە مەترسـیدار نەبـون لەسـەر پـارتی و پـارتی خـۆی ڕێگـای ئەدان، بە تـایبەتی ریگەی بە حشـع دابـو، ئەشـیزانی کە ئەوان،

هێزێک نین کە بتوانن بەربەرەکانی پارتی بکەن یان هەڵوێستێک وەرگرن کە لەگەڵ بۆچونی پارتیدا یەک نەگرێتەوە.

یەکێتی لە راگەیاندنەکانیدا، بڵاویدەکردەوە، کە ئەوان، تاقە هێزن کە پێشمەرگەیان لە کوردستان هەیە و هەندێ مەفرەزەش لە دەرەوە دەنێرنەوە بۆ ناوەوە، بەڵام (ق.م) باسی لەوە دەکرد کە مەفرەزەکانی ئەوانیش لە مایسی ١٩٧٦ ەوە لە کوردستانن و چالاکیان هەیە "شەوی ٢٥-١٩٧٦/٥/٢٦ چواردە پێشمەرگە لە مەفرەزەیەکدا بە فەرماندەیی سەید عەبدوڵا حاجی ئۆمەرانی لە پێگەی (گردی سەڵاواتان) لە ناوچەی حاجی ئۆمەران بەشوێن دوژمنەوە بون، کە خۆیان لە کەمینی دوژمن کەوتن و لە ئاکامدا سەید عەبدوڵا، فەرماندەی ئەو مەفرەزەیە و دو لە پێشمەرگەکان بریندار بون و دواتر سەید عەبدوڵا بەهۆی سەختی برینەکەی شەهید بو، رۆژی ٢٠١٣/٦/٥، لە چۆمان یادی ٢٦ی گوڵانی ١٩٧٦ کرایەوە..دو لە پێشمەرگە بریندارەکان بە ناوی عەلی مەلا و نەبی محەمەد پەنجەیان بۆ ئەو رۆژە و هەڵگیرسانی شۆڕشی گوڵان راکێشا"[٢٢١].

هەروەها رۆژنامەنوسێک و شارەزایەکی مەسەلەی کورد، نوسیویەتی" بە گەڕانەوەی دو کادری حیزبی دیموکراتی کوردستان (مەبەست پارتی دیموکراتی کوردستانە) کەریم سنجاری و سەلیم (مەبەست جەوهەر نامیقە) و بەدەستەوە گرتنی فەرماندەیی ٣٠٠ پێشمەرگەی پەڕاگەندە لە نێو کوردستان لە بەرواری ٢٦ی مەی ١٩٧٦ بە رەسمی دەست پێ دەکات"[٢٢٢].

دەربارەی کاتی گەڕانەوەی پێشمەرگە و کادیرەکانی پارتی بۆ ناو کوردستان، پێشمەرگەی دێرینی پارتی هاشم رەمەزان (ئەبو عەنتەر) نوسیویەتی: "لەسەر ئەمری کاک مەسعود لە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٥ من و عەبدوڵای برام (ئەبو نەوال) و (سەید حەسەنی) زاوامان بەرەو کوردستان

---

[٢٢١] مستەفا بارزانی، پێشمەرگە و سەرۆک، ل ٦٩٣.

[٢٢٢] کریس کۆچێرا، بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد، ل ٦١.

بەرێکەوتین بۆ پەیوەندیکردن بە هەڤاڵانمان لە ناو شار و ئەو پێشمەرگانەی سەر سنوری کوردستانی تورکیا و عێراق کە نەیانتوانیبو بگەنە ئێران"[223].

هەروەها پێشمەرگەیەکی پارتی دەربارەی یەکەم چالاکی پارتی بەم شێوەیە باسی دەکات: "محەمەد خالید بەصەڵی دەڵێ: هێرشی سەر سریە عەسکەریەکە بە یەکەم چالاکی مەفرەزەی ئێمە لە ١٩٧٦/٧/٩دا گرتنی ڕەبییەی (بەرۆژکێ) بوو.."[224]، هەروەها لە زۆر نوسینیدا دەربارەی گەڕانەوەی یەکەم مەفرەزەی پارتی بۆ ناو کوردستان، ناوی (سەید عەبدولا) وەک یەکەم قوربانی پارتی دێت کە لە ١٩٧٦/٥/٢٥ شەهید بووە.

ئەوەی کە ئاشکرایە، لە هەمانکاتدا، یەکێتی نیشتیمانیش دەستیکردوە بە چالاکی پێشمەرگایەتی و سیاسی لە کوردستان و ١٩٧٦/٦/٢٦ یەکەم مەفرەزەی یەکێتی دەستی بە چالاکی لە ناوچەی سۆران کردوە، پارتیش لە هەمان کاتدا هەوڵیداوە پێشمەرگەی خۆی بنێرێت بۆ ئەو ناوچانە و ئەوێ بەتەنها بۆ یەکێتی بەجێ نەهێڵێت، لەو بارەیەوە کمال کەرکوکی دەڵێ: "ڕۆژی ١٩٧٦/٥/١٢ بوو کە گەیشتمە گوندی (بێکڵۆ) سەر بە قەڵادزێ، بەر لە منیش کاک شێخ عەزیز چوبوە ئەو ناوچەیە.." دەربارەی ئەوەی ئایە ئەو چەکی پێبوە، دەڵێ: "تەنها یەک گۆچانێکم پێبوو، کەس کەسم لەگەڵ نەبوو، تەنها بووم.. لە ٥/٢٦ لەگەڵ کەریم خوڕخوڕەیدا لە نزیک شەدەڵە بوین لە گوندی مەولان،..کە ئێمە گەیشتینە ئەوێ ناوچەکە پێشمەرگەی دیکەی لێ نەبوو"[225].

کەمال کەرکوکی خۆی باسی گەڕانەوەی خۆی دەکات، بە تەنها و بێ چەک، ئەوەی کە یەکێتی لە ناوچەی سۆران باسی دەکات، باس لە مەفرەزە و هێزی چەکدار دەکات.. تۆ بڵێیت کێشەی کورد ئەوە بێت کە کام هێز، هەفتەیەک پێش ئەوەی تر، چوبێتە کام ناوچە! بەڵام ئەمە ڕاستییەکە کە باسکردنی پێویستە.

---

[223] مێژووی شۆڕشی گولان ١٩٧٦/٥/٢٦، ئەسعەد عەدۆ، ل ١٥.

[224] هەمان سەرچاوە، ل ٧٠.

[225] ئەسعەد عەدۆ، مێژوی شۆرشی گولان، ل ٧٠.

دو هێــزی چەکــداری دژ بەیەک، لە یەککاتــدا خۆیــان ڕێکــدەخەنەوە و دادەمەزرێن، لە هەمان کاتیشدا لە دەورەوە دەیانەوێت بێ ئەوەی هەمـاهەنگی لەگەڵ یەک بکەن، بگەڕێنەوە بۆ کوردسـتان. هەریەکەش ئەیەوێت دەریبخـات کە ئەو دەستپێشخەری یەکەمین چالاکی شۆڕشی نوێ بوە.

یەکێتـی و (ق.م)، سـەرەڕای ئەوەی کە دو هێزبون، تـازە بەم شـێوە نـوێیە هاتبونە گۆڕەپانی سیاسییەوە، بەڵام هەریەکەیـان، بە شـێوەیەک لە شـێوەکان گەرای نـاکۆکی و دوبەرەکیـان لەگەڵ خۆیـان هەڵگرتبـو، کە دەگەڕایەوە بـۆ ناکۆکی سیاسی قۆناغی جەلالی و مەلایی.

(ق.م) کە دوایـی بـوەوە بە پـارتە کـۆنەکە (پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان)، خـاڵی بەهێـزی ئەوە بـو، کە کێشــەی پارەیـان نەبـو، واتـا پـارەی شۆڕشـیان هێنابوە دەرەوە و بوبو بەسەرمایەیەک بۆیـان، هەروەهـا خـانەوادەی بـارزانی، بە هەمو دەزگاکانیانەوە لە پشت (ق.م) بون، بە تـایبەتیش ئەمە زیـاتر ئاشـکرا بو، کاتێ مەلا مستەفا بە نـاوی سـەرۆکی پـارتیەوە لە ١٩٧٧/٢/٩ دا نـامەیەکی بـۆ کـارتەری سـەرۆکی جـارانی ئەمریکـا نـارد و لە ١٤ ی هەمـان مانگـدا، نامەیەکیشی بۆ سیناتۆر و ئەندامانی کۆنگریسی ئەمریکی نارد.

# رۆڵی عەشایری کوردی تورکیا لە شەڕی ناوخۆدا

هەروەهـا (ق.م) یـاخود خـانەوادەی بـارزانی، توانیـان بە شـێوەیەک لە شـێوەکان سـود لە رابـردوی خۆیـان لای هەنـدێ عەشـایری کوردسـتانی تورکیا وەرگرن و دەزگا ئەمنیەتی "ساواک" ی ئێرانی و "میت" ی تورکیا، ناڕاسـتەوخۆ هاوکاریـان ئەکـردن، ئەو هاوکـاریە بـۆ ئەوە نەبـو پـارتی هەڵسـێتەوە و شـۆڕش بەرپـا بکـاتەوە بەڵکـو بـۆ ئەوەبـوە دژ بە یەکێتـی نیشـتیمانی بوەسـتنەوە، وەک هێزێکـی چەپ و دیمـوکرات تـازە هـاتبوە گۆڕەپـانەکەوە و پەیوەنـدی لەگەڵ هێـزە ئۆپۆزسـیۆنەکان تورکیـا و ئێـران زۆرباشبو.

هەردو دەوڵەت نەیـان دەویسـت، هێزێکـی چەپ لەسـەر سـنورەکانیان دروسـت ببێـت و چـالاکی بنـوێنن و کاریگەریـان لەسـەر هێـزە بەربەرەکـانی وڵاتی ئەوان هەبێت و ئەو بۆشاییەی کە لە ئەنجامی هەرەسی شۆڕشی کورد دروست بوبو، ئەوان پڕی بکەنەوە.

پەیوەندی دێرینی نێوان زۆر لە عەشایەری کوردستانی تورکیا و خـانەوادەی بارزانی، خـاڵێکی بەهێز بو بۆ (ق.م)، ئەوان رێنیشـاندەریان بون لە زۆر شـوێنی کوردسـتانی تورکیـا، ئەمە لە کاتێکدا کە دەوڵەتـی تورکیـا، هـیچ بەرپەرچێکیـان نیشان نەئەدا لەو هاوکارییە و جموجۆڵەی ئەوان لەناو خاکی تورکیادا ئەیانکرد.

خـاڵی بێهێـزی (ق.م) پەیوەنـدییە عەرەبییەکـانی بـو، یەکێتـی لەو بـوارەدا زۆر لەوان چالاکتر بو، هەرەوەها نەبونی هێزی چەکداری سەر بە پارتی لە قـولایی کوردسـتان، وەک هێزەکـانی کـۆمەڵە و بـزوتنەوەی سۆسیالیسـت کە زەمینەیەکی زۆر باشی دروستکردبو بۆ کۆکردنەوەی جەماوەر لە دەوری یەکێتی.

هەردو هێز (کۆمەڵە و بزوتنەوە) لە بەرنامەی سیاسیاندا زۆر نزیک بون لەیەک، یەکێتیش وەک هێزێکی چەپ و دیموکراتی کوردستانی هاتەکایەوە، لە هەمان کاتیشدا (ق.م) لە بەرنامەی سیاسیاندا وا خۆیان پیشان ئەدا، ئەگەر لە یەکێتی چەپتر و دیموکراتی تر و شۆڕشێگرتر نەبونایە، ئەوا بە دڵنیایەوە لەوان کەمتر نەبون.

لەو قۆناغەدا باو باوی چەپڕەوی و دیموکراتیەت بو، کەم هێز ئەیتوانی لەو هێڵە سەرەکیە لا بدات، بەڵام لە کاری رۆژانەدا، جۆرێکی تر مامەڵە دەکرا، ئەوە هەنگاو بە هەنگاو روون ئەبوەوە، کاتێ هێزە تازەکان لەگەڵ دەزگای هەواڵگری دەوڵەتانی ناوچەکە مامەڵەیان دەکرد و پشتیان بە عەشایری کۆنەپەرست ئەبەست، لەو کاتانەدا، چەپڕەوی روون ئەبۆوە.

سەرەتای دەستپێکردنەوەی شۆڕشی نوێ، بە شەڕی ناوخۆ دەستپێکرد، یەکێتی جەزرەبەیەکی کوشندەی بەرکەوت و پردی پێکەوەکارکردنی لەگەڵ (ق.م) پچڕاو و بۆ یەکێتی ئاسان نەبو بتوانێ چاوپۆشی لەو هێرشانەی (ق.م) بکات، بۆ بەرزکردنەوەی مەعنەویاتی ئەندام و دۆستەکانی پێویست بو بەرگری لە خۆی بکات، لەبەرئەوەی یەکێتی هێز و پشتیوانی لەسەرسنور و ناوچەی بادینان نەبو، ئەبو تۆڵەی خۆی لە (ق.م). لە ناوچەی سۆران بکاتەوە.

لەو کاتەوە تا رێکەوتنی واشنتۆنی ١٩٩٨، هەر شەڕێکی کورد – کورد بوبێت، زۆربەی هەرە زۆری لە ناوچەی سۆران بوە، زۆربەی کات ناوچەی بادینان لە شەڕی ناوخۆ پارێزراو بوە و وەک ناوچەیەکی داخراوی پارتی بە هێمنی و ئارامی ماوەتەوە، هەروەها گوند و شارۆچکەکانی ئەو ناوچەیە وەک ناوچەکانی تری کوردستان توشی دارمان و گوێزانەوە و سوتان لەناوبردن نەبون.

زۆربەی ناوچەکانی شەڕی ناوخۆ، کەوتونەتە پارێزگای سلێمانی و گەرمیان و هەندێ ناوچەی هەولێرەوە، یەکێتی مامەڵەی لەگەڵ (ق.م) بەو

شێوەیە دەکرد، "نابێ ئەوان لە بادینان پێشمەرگەکانی ئێمە بکوژن و ئێمەش لێرە لە پاڵ خۆماندا بیان حەوێنینەوە".

یەکێتی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی، سێ بژاردەیان لەبەردەم (ق.م) دانابو، یاخود واز لە (ق.م). بهێنن، یان ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی جێبهێڵن، یاخود ئەبێت خۆیان بۆ شەڕی یەکێتی ئامادەبکەن. ماوەیەکی زۆر، ناوچەی سۆران چۆڵ بو لە پێشمەرگەکانی (ق.م) و دو ناوچەی داخراو دروست بون.

## هەکاری لوتکەی شەڕی ناوخۆ

شەڕی هەکاری، بە دژوارترین شەڕ دەژمێرێت کە یەکێتی گورزێکی جەرگبڕی بەرکەوت و برینە سیاسی و سەربازیەکانی نێوان ئەو دولایەنەی زۆر زیاتر قوڵکردەوە و تا ماوەیەکی زۆریش یەکێتی نەیتوانی لە ئەنجامە سەلبیەکانی ئەو کارەساتە خۆی رزگار بکات.

یەکێتی نیشتیمانی بڵاویکردەوە کە پلانی دارشتوە، بارەگاکانیان و زۆر لە هێزەکانیان لە ناوچەی برادۆست کە دەکەوێتە ناوچەکانی ٣ سنوری (عێراق، سوریا، تورکیا) جێگیر بکات بۆئەوەی رێگای هاتوچۆیان ئاسان بێت و بتوانن بێ گیروگرفت چەک و تەقەمەنی بگوازنەوە.

هەروەها مەبەستیان بو، دوای ئەوەی لە دو هەوڵدا، چونیان بۆ بادینان سەرکەوتو نەبون، و کۆمەڵێک پێشمەرگە و کادێریان لەناوچون، ئەمجارە ویستیان بە هێزێکی گەورەی هەزار کەسیەوە ئەو خەوە بهێننە دی و هەوڵ بدەن بارەگا لەو ناوچانە دابنێن و لە رێگای هاتوچۆ دڵنیاببنەوە و زەمینەی خەباتی پێشمەرگایەتیان فراوان و گەورەتر بکەن.

پێش هێرشەکە، یەکێتی کومەڵێک پەیوەندی بە خانەوادەی بارزانی و کادێرانی پارتیەوە کرد: مام جەلال و عەلی عەسکەری سەرو نامەیان بۆ شێخ محەمەد خالید بارزانی و عەلی عەسکەری نامەی بۆ ئیدریس بارزانی و د.خالید سەعید نامەی بۆ دایکی مەسعود، و تایەری عەلی والی بەگ نامەی بۆ رەشید سندی و چەند کەسێکی کە نوسی[٢٢٦].

---

[٢٢٦] نەوشیروان مستافا، لە کەناری دانوبەوە بۆ خری نازەنگ، ل ٢٧١.

ناوەڕۆکی نامەکان بریتی بون لەوەی کە خانەوادەی بارزانی، هێمن بکەنەوە و ئاگاداریان بکەن، کە جوڵانی هێزەکانیان بۆ دژایەتی ئەوان نیە و تەنها مەبەستیان هێنانی چەک و گەیشتنە بە ناوچەی برادۆست پێش ئەوەی لەسەرەتای حوزەیران حکومەتی عێراق دێهاتەکانی سەر سنور ڕاگوێزێتەوە.

بەڵام لەبەرئەوەی پەیوەندییەکانی نێوان یەکێتی و خانەوادەی بارزانی و (ق.م) زۆر خراپ بو، ئەو نامانە هیچ سودێکیان نەبو.

عەلی عەسکەری، وەک سەرکردەیەکی دیاری هێزەکەی یەکێتی، نیازی شەڕو پێکدادانی نەبوە لەگەڵ پارتی، یەکێک لەوانەی لە هەکاری لەگەڵیدا بو دەڵێ: "کاک عەلی دەیوت ئێمە خۆمان لە شەڕی قیادە موەقەتە لا دەدەین، شەڕ نەبێت، شەڕ مەسڵەحەت نیە..کاک عەلیش بڕیاری دابوو، شەڕی قیادەی موقەتە نەکات تا نەیەنە سەرمان ئەو شەڕە نەکەین"[٢٢٧]، ئەمە دەیسەلمێنێت کە ئامانجی سەرکردایەتی یەکێتی ئەوە بوە، کە هەوڵ بدەن بێ شەڕ بچن بۆ بادینان.

مەبەستی سەرەکی یەکێتیش لە بەشێ لە نامەیەکی مام جەلالدا کە لە ١٩٧٨/٤/٢٠ دا بۆ کۆمیتەی سەرکردایەتی دەرەوەی وڵاتی یەکێتی نوسیوە دەردەکەوێت، کە مەبەستی چونیان ئەوە بوە کە ڕێگای چەکهێنان بکەنەوە: "هێزێکی باشمان لەسەر داوای پێشمەرگە سازداوە بۆ لای بادینان، هەڤاڵان، عەلی، خالید، تاهیر، سەید کاکە، شێخ حسێن سەرکردایەتیان دەکەن. (م.س)یش لە دوایانەوە ئەڕوات، بەڕاستی شێخ حسێن پیاو دەرچو. ئێستا خۆی و تاقمەکەی نموونەن لە هەمو کوردستاندا (واتا من بزەی سمێڵم دێ) ماڵی مەلا کەوتونەتە پەلە قاژێ، هاوار هاواری شەڕی برا کوژیانە! ئێمەش هەرچەندە سورین لەسەر سیاسەتی سڕینەوەی شوێنەواری خۆیان و جرائیمی گەورەیان، بەڵام پێمان ڕاگەیاندون، کە پێنج شەرت هەیە جێبەجێکردنیان ئەبێتە هۆی جواب دانەوەی تەنانەت سەلامیشیان کە بریتیە لە ١. بەردانی ڕێگاکانی ناو تورکیا..(زۆر رون نیە) ٢. بەردانی حەپسەکانمان

[٢٢٧] ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەک- محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی ١، ل ٩٤.

٣. دانەوەی چەکەکانمـــان ٤. دانەوەی ٣٢ هەزار دینـــاری کە گرتبوویـــان لە برادەرانی تورکیا وەختی خۆی ٥. تەسلیمکردنی موجریمەکان. ئەوسا قسـەیان لەگەڵ دەکەین و جوابی سـڵاویان ئەدەینەوە. ئەگینا ئەو هێزە رۆشـتووە بۆ پاککردنەوەی وڵات لێ یان، ئەمە دوا قەرارە، تکایە ئێوەش ئاگاداربن"[٢٢٨].

ئەم نـامەیە ئەوە دەگەیەنێت، کە یەکێتـی خـۆی بـۆ گـرژی لەگەڵ پـارتی ئامادەکردوە و بە خەیاڵی سەرکەوتن کەوتۆتە رێگاو و وردەکاری ناوچەکە و هەلومەرجەکەی و پەیوەندیەکانی پارتی و تورکیـا و هێزە عەشـایرەکانی باش هەڵنەسەنگاندبو.

لەوبارەیەوە، سامی عەبدولرەحمان دەنوسـێت: "ئەوان هـاتنە هەکـاری بـۆ لەناوبردنی سـەرکردایەتی کـاتی، نامەکـانی تاڵەبـانی کە بـۆ هەندێک کەس لە بـــاکوری کوردســـتان نووســـیبوو کەوتە دەســـت پـــارتی کە تێـــدا هـــاتبوو سەرکردایەتی کاتی (خـائین) لە پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکوک لەنێـوبراون و هێزێـک دەنێـرنە بادینـان تـا لەوێـش لەنـاو ببـرێن و داوای هاوکاریان لێ دەکات"[٢٢٩].

یەکێتـی دەسـتیکرد بە جێبەجێکردنـی پـلانەکەی، لەسـەرەتاوە چـاوەڕوانی ئەوەیـان دەکـرد، کە توشـی پێکـدادان بـن لەگەڵ (ق.م)، هەر بـۆیە بڕیاریانـدا "ئەگەر هێزەکـانی (ق.م) بەبـێ شـــەڕ بارەگاکـانی سـاڵی پێشـوی یەکێتییـان چـۆڵکرد، وا بەدوایـان نەکەون وازیـان لـێ بهێنن، ئەگەر چەکدارەکانی (ق.م) هاتنە سەر ریگەی هێزەکانی یەکێتی، وا بە توندی لێیان بدرێت"[٢٣٠].

هێزەکانی یەکێتی نزیکی هەزار پێشـمەرگەی چەکدار و بێچەک بون، سـێ بەش بون و لە ١٩/٤/ ١٩٧٨ دەستیان بە جوڵان کرد لە سنوری ئێرانەوە.

---

[٢٢٨] پشکۆیەک لە خۆڵەمێشدا، بەشێکی گرنگ لە ژیانامەی هۆمەر شێخمووس، ل ٣٦٣.

[٢٢٩] بزاڤی ڕزگـاریخوازی نەتەوەی کـورد لە کوردسـتانی عێـراق لە سـاڵەکانی جەنگـی عێراق و ئێراندا (١٩٨٠-١٩٨٨) د.عەلی تەتەر نێروەی، هەولێر ٢٠٠٨، ل ٩٨.

[٢٣٠] نەوشیروان مستافا، کارەساتی هەکاری، ل ١١.

## بۆچی یەکێتی لە هەکاری نوشستی هێنا؟

یەکێتی لەسەرەتاوە خۆیان بە باشی ئامادە نەکردبو، کۆمەڵێک هەڵەی کوشندەیان کرد، کە خواستە سیاسی و پێشمەرگەیاتیەکەی پێچەوانە کردوە و نەک ئامانجەکانیان نەهاتنەدی، بەڵکو کوشتارێکی زۆریان لێکرا و لە ناویاندا سەرکردەی هەرە ناسراوی وەک عەلی عەسکەری و د.خالید و حسێن بابە شێخ بونە قوربانی.

هەروەها لە هەڵە دیارەکانیان بریتی بون لە: "گۆڕینی پەیتا پەیتای بڕیارەکان و نوسین و ناردنی نامە، رادەی دوڵی سەرکردایەتی یەکێتی دەردەخات لە مەسەلەی لێدانی قم (قیادەی موقەتە)دا، دودڵی و ڕاڕایی لە بڕیاردانی جەنگیدا، بە تایبەتی لە کاتی ناسکدا، دەردێکی کوشندەیە و نەیار ئەتوانێت بە چاکترین شێوە کەڵکی لێوەربگرێ، لە کاتێکدا سەرکردەکانی قم. کە هەمو چەکدار و دۆست و لایەنگیرەکانی خۆیان بە گیانی دوژمنایەتیەکی سەخت و بێ ئەندازەی یەکێتی پەروەردە کرد بو، بۆ ئەوەی بێ سێودو لە رویدا رابوەستن و بە گژی دا بچن و ئەگەر بتوانن، یەکێتی وەک هێزێکی دوژمن بە خۆیان لە رەگوریشە دەربهێنن، کەچی گومان و دودڵی و ڕاڕایی خرابوە ناو هێزەکانی یەکێتیەوە کە: ئاخۆ ئەو شەڕە بکرێ باشە یان نەکرێ؟ ئەو شەڕە براکوژیە یان براکوژی نیە؟ قم لە یەکێتی نادەن ئیتر بۆچی یەکێتی لەوان بدات؟"[٢٣١].

یەکێتی تێبینی ئەوەی نەکردبو، کە لە کاتی شەڕی ناوخۆدا، وڵاتانی ئێران، تورکیا و عێراق، تا بۆیان بکرێت ئاگری شەڕەکە خۆش دەکەن و

---

[٢٣١] نەوشیروان مستافا، لە کەناری دانوبەوە..ل ٢٧١-٢٧٣.

یەک دەگرن بۆ لێدانی هەر هێزێک کە بیەوێت لە فەرمانی ئەو دەوڵەتانە دەرچێت، هەروەها دژایەتیان بەرامبەر بە یەکێتی، وەک هێزێکی چەپ نەئەشاردەوە کە نزیکە لە سنورەکانیانەوە.

رەچاونەکردنی هەڵویستی ئەو ولاتانە، بە هەڵەیەکی ستراتیجی گەورە دەژمێرێت، هەروەها هێزێکی هەزار کەسی و رێکخراوێکی کێشەدار و نەشارەزا بیەوێت دژایەتی ئەو ولاتانە و (ق.م) و عەشایری تورکیا بکات، و لە شەڕێکی نا بەرامبەردا سەرکەوتو بێت، ئەمە بە هەڵەیەکی کوشندە دەژمێرێت کە هەر لەسەرەتاوە، کۆتاییەکەی وەک مانگی چواردە دیاربو.

"ئێران رۆڵێکی گەورە و سەرەکی لە روداوی هەکاریدا هەبوو، لەسەروبەندی ئامادەکاری گواستنەوە بۆ هەکاری، ئێران فشارێکی زۆری خستبوە سەر یەکێتی و ئاگاداریان کردنەوە بارەگاکانیان لە (نۆکان) چوڵ بکەن و رۆژانە لە پاسگای (داوداوێ) وە لە پشتی نۆکان دەهاتنە سەر سەرکردایەتی (ی.ن.ک)، بەدەر لەوەش هێزێکی گەورەی تری حکومەتی ئێران لە شاخەکانی دەوروپشتی نۆکان و توژەڵە و گورەشێر دامەزرا و هەڕەشەی لێدانی هێزەکانی یەکێتی بە هێزی زەمینی و ئاسمانی دەکرد..".[232]

هەروەها یەکێتی پلانێکی وا گەورەی داڕشتبو، بێ ئەوەی بیر لەوەبکاتەوە، کە هەلو مەرجی ناو کوردستانی تورکیا و پەیوەندی نێوان (ق.م) و عەشایری تورکیا چۆنە، ئایە هێزەکانیان ئەوەندە شارەزای ناوچەکەن کە بتوانن بێ کێشە هاتوچۆی تێدا بکەن؟.

گەورەیی هێزەکە، درێژی و سەختی رێگاکە و نەشارەزایی، وای لێکردبون کە لەیەک بترازێن و نەتوانن ڕیزەکانی خۆیان رێک بخەن، جگە لەوە هێزەکە نەیان توانیبو ئازوقە و خواردەمەنی و پێداویستی رەوەکەیان بە باشی دابین بکەن، هەر لەبەرئەوە کە ماوەیەک بەسەر روشتنیاندا بەسەرچو، برسێتی روی تێکردن و زۆر لە پێشمەرگەکان، چەکەکانی خۆیان دەفرۆشت بۆئەوەی کەمێ خواردنی پێ پەیدا

[232] سیاسەتی ئێران بەامبەر جولانەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باشوری کوردستان، ۱۹۷۵-۱۹۸۹، فاروق محەمەد محەمەدئەمین، ل ۹۷.

بکەن، لەبەرئەوە یەکێتی نەیتوانیبو ئازوقە لە چەند شوێنێکی جیاواز تامین بکات.

نەشـارەزایی هێـزەکە و نەبـونی ڕێگانـاس لەگەڵیانـدا، وای لێکـردن کە بە ڕێگای هەڵەدا بڕۆن و زیاتر بچنە ناو قوڵایی خاکی کوردستانی تورکیاوە، کە بە هیچ جۆرێک شارەزا نەبون تێدا.

حەمەی حـاجی مەحمـود، کە خـۆی بەشـدار بـو لەو شـەڕانەدا، هەڵەکـانی یەکێتی بەم شـێوەیە بـاس دەکـات: "ئازوقەمـان نەبـو، شـارەزا نەبوین، خەڵکی ناوچەکەمان لەگەڵ نەبو، پێشمەرگە تەواو ماندوبوبو، پێڵاوی لە پێدا نەمابوو. هێزێکی برسـی، بێ ئازووقە، بێ جل و پێڵاو..بێ پارە..نەشـارەزا، لە بەر بێ پـارەیی دەمانچەکانیـان دەفرۆشـت سـودی نەبـوو..لە گونـدەکانیش نانیـان پێ نەدەدایین..بە فیشەک و چەک نەبێت".[٢٢٣]

لەسـەرەتادا حیزبێکی سیاسـی کوردسـتانی تورکیـا (دە دە کـا دێ DDKD) بەڵێنیان بە یەکێتی دابو، کە هاوکاری زۆریان دەکەن و ڕێ نیشـاندەریان دەبن، بەڵام ئەم بەڵێنـانەی ئەو هێزە وەک پێویسـت نەهـاتە دی، زیـاتر، عەشـایری ئەو ناوچانە کە لەگەڵ میتی تورکیا دەستیان تێکەڵاو کردبو، ڕۆڵـی سـەرەکیان بینـی لە دژایەتـی هێزەکـانی یەکێتیـدا، ئەوانە پەیوەنـدی کۆنیـان لەگەڵ خـانەوادەی بارزانی هەبو، (ق.م) کۆڵێک پروپاگەندەی دژ بە یەکێتی بڵاوکردبۆوە، لەبەرئەوە زەمینەی شەڕکردن و تاڵانکردنی هێزەکانی یەکێتی، زۆر لەباربو.

هەروەهـــا لە کشـــانەوەیاندا هەڵەی گەورەیـــان کـــرد: "کشـــانەوە لە هەلومەرجێکی سەختی وەهادا، بە هێزێکی ماندو و برسی و تینو و کەم ئومێد و کەم ورە و، نەشارەزای دور لە بنکەکانی خۆی و، بۆ شـوێنێکی نەزانـراو و تـاقینەکراوە، کـارێکی یەکجـار دژوار و زەحـمەت و ئـاڵۆزە، (کشـانەوەی ڕێکوپێـک) بـۆ ئەوەی جیـا بکـرێتەوە لە (هەڵاتنـی نارێکوپێـک) پێویسـتی بە ڕێکخستنێکی ورد و ورەیەکی بەرز و بـاوەڕێکی بەهێز و دیسـپلینێکی پۆڵاین

[٢٢٣] ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەک- محەمەدی حاجی مەحمود، بەرگی ١، ل٩٥.

و شارەزایەکی باش و، سەرکردایەتیەکی ژیر و لێوەشاوە هەیە".[٢٣٤]

ئەم مەرجانە لە هێزەکانی یەکێتیدا نەبو، کاتێ بڕیاری کشانەوەیاندا، لەبەرئەوە کشانەوەکەش بە زیانی گیانی و مادی گەورە گەڕایەوە بۆ یەکێتی، لە جیاتی ئەوەی بەرەو ئەو ناوچانە بکشێنەوە کە شارەزان، ئەوان زیاتر بەرەو قوڵایی خاکی کوردستانی تورکیا کشانەوە کە هیچ شارەزایەکیان تێدا نەبو.

## دوا ئەنجامی هەکاری و تۆڵەی ڤیناوی

شەڕی هەکاری شکستێکی سەربازی و سیاسی و مرۆیی گەورە بو بۆ یەکێتی، لەو شەڕەدا ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگەکانیان بونە قوربانی و کۆمەڵێکی زۆریش بریندار بون و ژمارەیەکی زۆریش تەسلیم بە عێراق و ئێران بونەوە و ئەوەی مایەوە، پەرش و بڵاوبونەوە.

شەڕی هەکاری بە لەناوبردنی سێ سەرکردەی ناوداری کورد، عەلی عەسکەری، د. خالید سەعید و حسێن بابە شێخ و بەدیل گرتنی دەیان کادێری سەربازی کۆتاییهات و ئەم شەڕە ناکۆکیەکانی نێوان پارتی و یەکێتی زۆر قوڵتر کردەوە.

سەرکردەکانی یەکێتی لە شەڕی بەرامبەردا نەکوژران، بەڵکو بە دیلی بە ئاگاداری و بە فەرمانی خانەوادەی بارزانی و سەرکردەکانی (ق.م) بڕیاری کوشتنیان بۆ دەرچو، ئیدریس بارزانی لە ژێر ناوی (چاک) لە نامەیەکدا کە ١٩٧٨/٦/١٨ بە عەرەبی و بە دەستوخەت نوسراوە، وەڵامی (جەمیل- واتا کەریم سنجاری) ئەداتەوە دەنوسێ: "نامەکەی ٦/١٠ تان گەیشت کە ئەنجامی یاریەکەی لەگەڵ فیرقەی (مام و ویس – مەبەست مام جەلال)ە کە بە سەرکەوتنێکی گەورەی فیرقەکەی ئێمە کۆتایی هات و ئەو سەرکەوتنەی کە هەمو دنیای سەرسام کرد..بیستم کە (عسکەری و سستەر) مەبەست

---

[٢٣٤] نەوشیروان مستەفا، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، ل ١٣٧.

(عەلی عەسکەری و د. خالید)ە کە کوژراون، ئەگەر وا بێت، ئەوا زۆر باشە، بەڵام ئەگەر لە نێوان میوانەکاندا بێت، من رای خۆمتان پێ دەڵێم و سورم لەسەر بۆچونەکەم و بە هیچ بەدیلێکی تر رازی نابم، ئەوەیش ئەوەیە کە بینێرنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە گەڕانەوەی نیە، ئەمە بە نیسبەت (سستەر) (د.خالید)یشەوە، ئەگەر لە نێوان میوانەکاند، کەسانی وای تێدایە کە لە مستەوای ئەوانن.. چونکە ئەوانە هاتون بۆ ئەوەی لە رەگو ریشەوە هەڵمان کێشن و لەناومان بەرن..دوبارەی دەکەمەوە کە هەر نەرمیەک بەرامبەر عەلی عەسکەری و د.خالید، و ئەوانەی لەگەڵیاندان، بنوێنن، مانای لەبیرکردنی خوێنی ئەوانەن کە بەجێیان هێشتوین و ئەوە تاوانێکە کە مێژو لێمان خۆش نابێت"[٢٣٥].

دو رۆژ پێش ئەم نامەیەی ئیدریس بارزانی، "(دادگای شۆڕش کە لە سلێمان، جوهر نامیق- احمد- سربست، ملازم عەبدولرەحمان پێداوی) پێکهاتوە لە ١٩٧٨/٦/١٦ بڕیاری ئیعدام کردنی عەلی عەسکەری ئەدا بە تاوانی ئەوەی ویستویەتی کە شۆڕش لەناوبەرێت و هاوکاری لەگەڵ رژێمی بەعسی فاشی و رژێمی شاهەنشاهی ئێراندا کردوە بۆ لەناوبردنی شۆڕش و کوشتنی چەند کەسایەتیەک وەک فاتیح شوانی و ٥ هاوڕێیی تریان"[٢٣٦].

دوای رۆژێک لە ١٩٧٨/٦/١٧ دا، (دادگای شۆڕش)، داوا لە (ق.م) دەکا، کە رای خۆیان دەربڕن، کە ئایە بڕیارەکە جێبەجێ بکەن و ئیعدامی بکەن، یان بڕیارەکە تانەی لێبدەن یان لێیان خۆش بن.

هەر هەمان دادگا، لە ١٩٧٨/٧/٥ بڕیاری ئیعدامکردنی هەریەک لە د. خالید و حسین بابە شێخ ئەدا بە ئیمزای هەریەک لە (سلیم، جوهەر نامیق- سربست، مولازم عەبدولرەحمان پێداوی، کمال کەرکوکی، دارا، ئازاد

[٢٣٥] صلاح خرسان، الوثيقة رقم ٣٧، ص. ٧٤٩

[٢٣٦] صلاح خرسان، وثيقة رقم ٣٩، ص. ٧٥٤

بەرواری) لە ١٩٧٨/٧/٧[٢٣٧]، (ق.م) داوا لە دادگاکەیان دەکات کە بڕیارەکەیان جێبەجێ بکەن و بڕیارەکانیش لە دادگا و لە سەرکردایەتی (ق.م) بە گشتی دراوە و هیچ کەسێک دژ نەبوە..

دوای کۆتایی شەڕەکان و ئیعدامکردنی سەرکردەکانی یەکێتی، مەسعود بارزانییش لە ١٩٧٨/٦/٢٨ دا لە نەمساوە لەژێر ناوی فواد، نامەیەک بۆ (سامی عەبدولرەحمان – لەژێر ناوی صالح) دەنێرێت دوپاتی دەکاتەوە کە پێویستە سەرکردەکانی یەکێتی ئیعدام بکرێن و کەمتەرخەمی تێدا نەکەن، و نوسیویێتی "برام صالح، دەنگی منیش بخەرە ریزی ئەو دەنگانەی کە داوای ئیعدامکردنی سەری خیانەت و لێپرسراو لە رشتنی خوێنی شەهیدان لە هەردو بەرە دەکەن، ئەمە کەمترین خواستە، کە پێشکەشی شەهیدانی بکەین، هەر دواکەوتنێک کێشەی راگەیاندن و دبلۆماسیمان بۆ دروستدەکات، داواتان لێدەکەم گرنگی بە مەسەلەکە بە خێرایی جێبەجێی بکەن"[٢٣٨].

دوای ئەوەی کە ئاشکرا بو، کە پارتی بە بڕیاری سەرکردایەتیان هەر سێ سەرکردەکەی یەکێتیان تیرۆر کردوە، پارتی خۆشی دانی بە کوشتنیاندا ناو و پاساوی بۆ لەناوبردنیشیان هێنایەوە، ئەسعەد عیدۆ، وەک کادیرێکی پارتی لەوبارەیەوە دەڵێ: "جێگەی سەرنج راکێشانە کە (مەلا بەختیار) و برادەرەکانی باس لە کوشتنی عەلی عەسکەری، دکتۆر خالید و شێخ حوسەین دەکەن، کەچی دورو نزیک باس لە کوشتنی مەلکۆ، سیامەند، عمر شریف ناکەن، هەروەها دور و نزیک باس لە تیرۆرکردنی عەبدولی سۆران، صدیقە فەندی، نوری حەمە علی، حەسەن فارس، عومەری مام کەریم ناکەن، ئەوە بانێکەودوهەوایە چیە؟!"[٢٣٩]، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، ئەگەر مەلا

---

[٢٣٧] صلاح خرسان، ص. ٧٥٧، ٧٥٦، ٧٥٤

[٢٣٨] صلاح خرسان، ل ٧٥١. پشکۆیەک لە خۆڵەمێشدا، بەشێکی گرنگ لە ژیاننامەی هۆمەر شێخمووس، ل ٣٨٦- ٣٩٤.

[٢٣٩] ئەسعەد عەدۆ، مێژووی شۆڕشی گولان، ئەسعەد عەدۆ .ل ١٨

بەختیار باسی ئەو کەسانەی پارتی بکردایە کە کوژراون، ئەوە قەیناکە باسی کوژراوەکانی یەکێتیشی بکردایە، نوسەر باسی ناعەدالەتی کوشتنەکە ناکات، باس لەوە دەکات بۆ باسی کوژراوەکانی پارتی نەکراوە!.

لەم شەڕە دژوارەدا و لە کۆی ٨٠٠ پێشمەرگەی یەکێتی تەنها ٨ یان توانیان بە چەکەکانیانەوە بگەنەوە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی، ئەوانەی تر، هەڵهاتن بۆ لای حکومەتەکانی عێراق، ئێران و سوریا، یان تەسلیم بە قیادەی موقەتە بون و زۆریش کوژران و بریندا بون و هەندێکێش هەڵهاتن بۆ شوێنی نادیار لە ناو شاخەکانی کوردستاندا.

بە کۆتایی شەڕی هەکاری و ئەو زیانە گیانی و سیاسیەی کە یەکێتی لێکەوت، پەیوەندی نێوان یەکێتی و پارتی کەوتە قۆناغێکی دژوارترەوە، دوای ئەوەی یەکێتی هەوڵیدا کە خۆی کۆبکاتەوە و سەرلەنوێ بژێتەوە و هەنگاو بەسەر نوشستەکەیدا بنێت، بڕیاریدا کە ئەو سیاسەتەی کە پارتی دەربارەی ئەوان گرتویەتیەبەر، بەوەی کە بەهیچ جۆرێک نەهێڵێت یەکێتی جێپێی لە بادینان قایم بکات، ئەوانیش هەوڵ بدەن نەهێڵن پارتی لە ناوچەی سۆران جێگیربن.

دوای هەکاری، یەکێتی ناچاربو، ریزەکانی خۆی رێک بخاتەوە و خۆی کۆبکاتەوە، لەبەرئەوە نزیکی دو ساڵ، شەڕی دیار و کاریگەر لە نێوان پارتی و یەکێتیدا روی نەدا.

# جیابونەوەی حسک

لەسەرەتای ١٩٧٩ وە، کێشە و ناکۆکی کەوتە ریزەکانی یەکێتیەوە، لە شەوی نەورۆزی هەمان ساڵدا، بزوتنەوەی سۆسیالیست بە سەرۆکایەتی رەسول مامەند، بارەگاکانی خۆیان لە زەڵێوە گوێزایەوە بۆ گورەشێر و د. مەحمود عوسمان کە کەسی یەکەمی (کۆمیتەی ئامادەکردنی پارتی دیموکراتی کوردستان) بو، لەگەڵیاندا رۆشت.

لە ١٩٧٩/٨/٣ کۆنفرانسێکی فراوانیان گرت و رێکخراوەکەیان ناونا "حیزبی سۆسیالیستی یەکگرتوی کوردستان - حسک" ئەمان نیازیان هەبو، ئەم رێکخراوە نوێیە دور لە کاریگەری جەلالی و مەلایی بێت و ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە کە لە ئەنجامی گرژی و دوژمنایەتی ئەو دو هێزە دروست بوبو.

جیابونەوەی حسک، زیانێکی گەورەی سیاسی بو لە یەکێتی کەوت، رەسول مامەند و هاورێکانی، زۆربەی زۆری پێشمەرگە و کادیرەکانی بزوتنەوەیان لەگەڵ رۆشت و ژمارەیەکی کەمی کۆنە جەلالییەکان مانەوە، لەوانە عومەر مستافا "دەبابە" و جەمال حەکیم و چەند سەرکردەیەکی کەم و ژمارەیەک لە پێشمەرگە، هەرچەند لەسەرەتادا، باس لە جیابونەوەی باڵێکی یەکێتی دەکرا، بەلام لە راستیدا، زۆربەی زۆری بزوتنەوە لەگەڵ رەسول مامەند و هاورێکانی رۆشتن.

ئەم جیابونەوەیە، سەرەتای دروستبونی ناتەبایی بو لە نێوان یەکێتی و حسکدا، دروستبونی هێزێکی تازەی چەکدار لە هەمان ئەو ناوچەیەی یەکێتی تێدا بو، نیشانەی ئارامی و تەبایی نەبو، بەڵکو پێچەوانەکەی بو.

چەند هەفتەیەک دوای جیابونەوەیان، حسک و رژێم دەستیان بە گفتوگۆ کرد و شاندێکیان کە لە د. مەحمود عوسمان و عەدنان موفتی پێکهاتبو، لە

۱۹۷۹/۹/۳۰ سەردانی بەغدایان کرد و لێپرسراوانی بەعسیان بینی لەسەرو هەموویانەوە سەدام حسێن، بەڵام سەردانەکەیان بێ سود بو.

سەرەتای کاری پێشمەرگایەتی حسک، بە ناکۆکی چەکداری لەگەڵ یەکێتی دەستیپێکرد "حسک لەو شوێنانەی جۆرێ لە باڵادەستی هەبو، هێزەکانی یەکێتی دەرئەکرد، سەید کاکە لەم روەوە لە هەمویان زیاتر توندوتیژتر بو، لە چەند جێگای وەکو بیدەلان، لە ناوچەی سەرکردایەتی، خۆشناوەتی، دەشتی هەولێر، بناری کۆسرەت، هێزەکانی یەکێتی دەرکرد و لە چەند جێگایەک چەکی ئەکردن و، لێی ئەکوشتن، هێزە راونراوەکان هەندێکیان بە چەک کراوی، ئەهاتنەوە ناوزەنگ"[۲٤۰].

چەند جارێک کۆبونەوەی هاوبەش لە نێوان یەکێتی و حسک ئەنجامدرا، بۆ ماوەیەک ئاشت دەبونەوە، بەڵام دوای ئەوە ناکۆکی و شەڕ لەگەڵ یەکتر دەستپێدەکردەوە.

بۆ نمونە لە ۱۹۷۹/۹/٤ رێکەوتنێک لە گوندی بنوخەڵەف لە نێوان یەکێتی، حسک و حشع کرا و بەڵێنیاندا ئاشتی لە نێونیاندا بەرقەرا بکەن، هەر تەنها دوای یەک رۆژ "سەید کاکە هەمو هێزەکانی خۆیانی لەسەر (یەکێتی) کۆکردنەوە و شەوی ۱۹۷۹/۹/٥ لە ناکاو لە نازەنین چوە سەریان، هێزەکەی یەکێتیان پەرتەوازە کرد، هەندێکیان گیران و هەندێکیان دەربازبون.

دو رۆژ دوای ئەوە، مەفرەزەیەکی یەکێتی لە ئاوەگرد خۆی قایم کردبو، چوە سەر ئەوانیش، هەندێکی لێکوشتن و هەندێکی لێ بریندارکردن، ئەمە جەزرەبەیەکی کاریگەر بو، حسک لە یەکێتی سرەواند و ئەیویست دەس بەسەر ناوچەکەدا بگرێ"[۲٤۱].

زۆر لە رێکەوتنەکان، لەبەردەم شەڕدا، ملیان شۆڕدەکرد و بێدەنگیان هەڵبژاردوە، هەر رێکەوتنێک ئەگەر هێزێکی گەورەی لە پشتەوە نەبوبێت، ئەنجامەکەی پوکانەوە بوە و دواجار تفەنگ و هێز لە گۆرەپانەکەدا ئەیبردەوە.

---

[۲٤۰] پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، نەوشیروان مستەفا، ل ۱۳٦.

[۲٤۱] هەمان سەرچاوە، ل ۱۳۷.

یەکێتیش بێهەڵوێست نەئەوەستا و ئەویش لە هەر کات و شوێنێک بۆی کرابێت، تۆڵەی خۆی کردۆتەوە، لەبەر ئەوە تۆڵە لە دوای تۆڵە ئاگری شەڕی ناوخۆی خۆشتر کردوە.

## دامەزرندنی جوقد و جود، وەک نیشانەی ناتەبایی کورد

ئەم باودۆخە نا ئارامە بەو شێوەیە درێژەی کێشا تا بەرەی (جوقد - بەرەی نیشتیمانی نەتەوەیی دیموکراتی) لە ١٩٨٠/١١/١٢ لە دیمەشق لە نوێنەرانی: یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، پارتی بەعسی سۆسیالیستی (ناوەندی عێراق) حیزبی شیوعی عێراقی، حسک دامەزرا. جوقد نەیتوانی ببێت بە هێزێکی کاریگەری لەسەر گۆڕەپانی کوردستان و عێراق، زیاتر بو بە دەزگایەکی راگەیاندن لە شام "جوقد زیاتر لەوەی دەزگای خەبات بێ بۆ روخاندنی رژێمی بەعس، بو بە دوکانی پارە پەیداکردن و، هەندێ لەم لایەنانە بە ناوی پێکهێنانی لەشکر و رێکخستنی خەباتی نەهێنی پارەی زۆریان لە لیبیا وەرگرت، کورد وتەنی (کێ ئەیکا و کێ ئەیخوات؟)"[٢٤٢].

لەبەرئەوەی جوقد بە ناکامڵی هاتە دنیاوە، هەر دوای دوهەفتە لە ١٩٨٠/١١/٢٨ بەرەیەکی نوێ لە راژان بە ناوی (جود – بەرەی نیشتیمانی دیموکراتی) دروست بو، ئەم بەرەیە بە دەستپێشخەری حشع دروست بو، تەنها لەبەرئەوەی پارتی ببێت بە ئەندامی بەرەیەکی عێراقی و هەست نەکات پەراوێز خراوە.

لە ماوەی دو هەفتەدا دو بەرە دروستبون، کە هەندێ لە حیزبەکان ئەندامی هەردو بەرەکە بون، وەک حسک، پاسۆک، حشع.

هەردو بەرەکە، جگە لە ئامانجی تاکتیکی حیزبیی تەسک، نەیانتوانی ریزەکانی هێزی کوردی و عەرەبی دژ بە رژێم کۆبکەنەوە و پێشرەوییان بکەن.

هەروەها بەرەی جود، بو بە بەرەیەک کە پارتی رۆڵی کاریگەری تێدا

---

[٢٤٢] پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، نەوشیروان مستەفا، ل ١٧٧.

دەبینی و لە ناوەرۆکدا بەرەیەک بو کە هەوڵی ئەدا دەسەلاتی یەکێتی تەسک و سنوردار بکات و پەرە نەسێنێت.

ئەم بەرانە، سەرکردایەتیەکی پتەوی مەیدانیان نەبو، کە هەمویان بە قسەیان بکەن، هەریەکەیان بۆ خۆی کاری دەکرد و بە قسە و ئامۆژگاری سەرکردەکانی خۆیانیان ئەکرد و هەریەکە لە ئاوازیک دەیخوێند، ڕەنگە ئەگەر بوترێت، خاڵی هاوبەشی نێوان ئەندامانی جود، جگە لە دژایەتی بەعس، ئەوەی کۆی دەکردنەوە، دژایەتی یەکێتی بو.

" تا دەهات پەیوەندی لایەنەکانی نێوان بەرەی جود بەهێزتر دەبوو، بە تایبەتی لە ڕۆژی ١٩٨١/١/٢٨ لە ڕاژان دوا نیوەڕۆکەی کۆبونەوەیەکی سێ قۆڵی لە نێوان پارتی و حشع و حسکدا دەبەسترێت و چەند مەسەلەیەک تاوتوێ دەکەن، لەوانە باری تێکچووی پەیوەندی خراپی نێوان حسک و یەکێتی لە لایەک و یەکێتی و پارتی لە لایەکیترەوە، هەروەها چۆنێتی پتەوکردنی پەیوەندی نێوان هەرسێ حزب، کە بەرەی جودیان پێکهێناوە"[٢٤٣].

ناوچەی سۆران، یاخود ناوچەکانی سلێمانی، گەرمیان، شاربازێڕ، هەولێر و پشدەر، شوێنی ناکۆکی و شەڕ بون لە نێوان ئەندامانی جود (حسک، پاسۆک، حشع، پارتی) و یەکێتی، ئەویش تەنها لەبەرئەوەی هەر حیزبێک هەوڵی ئەدا دەسەلاتی خۆی لە ناوچەکەدا بسەپێنێ و ئەو بڕیار و ڕێنماییانەی کە یەکێتی دەریدەکرد ڕەتی بکاتەوە، هەر حیزبەش هەوڵی ئەدا کە لەو شوێنەی دەسەلاتی هەیە، گومرگی تایبەت بە خۆی وەربگرێت.

بونی چەند گروپێکی دژ بەیەک لە یەک ناوچەدا، ئەبوە هۆی دوستبونی گرژی و ئاڵۆزی و پێکدادان، لەبەرئەوە دوستبونی شەڕ لە نێوان بەرەی جود و یەکێتیدا تەنها بەسترابۆوە بە کاتەوە.

---

[٢٤٣] د. سەلام عەبدولکەریم، شەڕی ناوخۆ لە شاخ لە نێوان سالانی (١٩٨٢-١٩٨٤)، چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ عەزیز محەمەد لە ٢٠٠٩/٢/٢٥.

هاوینی ١٩٨١، وەرزێکی شەڕاوی بو، لە کۆتایی حوزەیراندا دا، شەڕ لە نێوان یەکێتی و پاسۆک و لە کۆتایی ئاب لە نێوان یەکێتی و حسک و حشع رویدا، هەرلایەک ئەوی تری تاوانبار دەکرد کە هێرشی کراوەتە سەر.

"لە هەندێ لەو نامانەشدا، کە لە نێوان لایەنەکانی بەرەی جوددا ئاڵوگۆڕ دەکرا، مەسەلەی دوژمنایەتیکردنی یەکێتی و خۆئامادەکردن بۆ لێدان و شەڕکردن لەگەڵیدا باسکراوە"[٢٤٤]، زۆرجار شەڕەکان لە پێکدادان و شەڕی بچوکەوە، بەرەو شەڕی گەورە دەچو، لەبەر ئەوەی هێزێک هەوڵی ئەدا ناوچەکە لەوەی تر (پاک بکاتەوە) و خۆی دەسەڵاتی یەکەم وەرگرێت، هەمو ئەوشەڕانە لە نێوان یەکێتی و گروپەکانی تری جودا کە روی ئەدا، تەنها لەسەر دەسەڵات بو، جارێک تەرەفێکیان لەسەر هەق بون و جارێکی تر، تەرەفەکەی تر، ناکرێت و نابێت هەمو هۆی شەڕی ناوخۆ بدرێتە پاڵ هێزێکی سیاسی و ئەوانەی تری لێ بەدەر بکرێت.

لەو بارەیەوە با بزانین نەوشیروان مستەفا، چۆن باس لەو بارودۆخە دەکات؟: "پەیوەندی یەکێتی و لایەنەکانی جود، چو بوە قۆناغێکی ترسناکەوە، لە نێوان یەکێتی و پارتیدا لەسەرەتاوە حاڵەتی شەڕ بەردەوام بو، دوای ئەو دوانەش شەڕ لە نێوان یەکێتی و حسکدا هەڵگیرسابو. بەهۆی روداوەکانی دەرگەڵە و فەقێیان و کاروخەوە، پەیوەندی یەکێتی لەگەڵ حشع یش گرژ بو بو، لەگەڵ پاسۆک لە روداوەکەی مامەخەلان و گەردی تێکچو بو، بە واتایەکی تر هەر چوار براکەی جود لە سەنگەردا بون لە یەکێتی. سەرکردایەتی ئەم حیزبانە بە نەهێنی لەناو خۆیاندا رێک کەوتبون گەلەکۆمەیەکی پێشمەرگەیی بکەن، یەکێتی لە مەیدان دەرپەڕێنن.."[٢٤٥]

---

[٢٤٤] د. سەلام عەبدولکەریم، شەڕی ناوخۆ لە شاخ لە نێوان سالانی (١٩٨٢-١٩٨٤)، ل ٢، دەق لە محەمەدی حاجی مەحمود: رۆژمێری پێشمەرگەیەک، ب ٣، ل ٤٠٨ ، ٤١١.

[٢٤٥] نەوشیروان مستەفا، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، ل ٢٢٠.

## شەڕی نێوان جود و یەکێتی

ساڵی ١٩٨١، ساڵێک بو، کە پڕ بو لە پێکدادان و شەڕی هەمەجۆر لە نێوان یەکێتی و جود بە گشتی و یەکێتی و حسک بەسەرۆکایەتی سەید کاکە بە تایبەتی، لە ئەنجامی شەڕەکاندا، یەکێتی هەندێجار سەرکەوتنی ناوچەیی بەدەست دەهێنا.

لە بروسکەیەکی سەید کاکەدا، کە ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی سۆسیالیست بو، لە ١٩٨١/٨/٣١ دا بۆ مەکتەبی عەسکەری حیزبەکەی نوسیویێتی: "ئێمە زۆر بە توندی کەوتینە دوای جەلالییەکان، لە دوڵی هەروتە و بالیسانەوە دەستمان پێکرد بە راونان و چەککردنیان تا ئێستا لە دۆڵی خۆشناوەتی، ٢٠ جەلالیمان چەک کردوە...وە لە سنوری هەرێمی ١٠ و ١١ ش پێش ئەوەی ئێمە بیان گەینێ کە لە وێوە خەبەری هەردو هەرێممان دابو، زۆر پاڵەوانانە لە نازەنین و دوڵی سماقوڵی هەڤالانمان لە جەلالییەکانیان دابو، نزیکەی ٤٠ کەسیان کوژرا و بەلام توانرا ٦٢ کەسیان لێ چەک بکرێت وە ئەوانی تریش راوبنرێن و چەک کراوەکانیش بە کەفالەت بەردران".[٢٤٦]

لە هاوینی ١٩٨١دا، شەڕێکی نەخوازراو و بێ پلان لە نێوان دەستەیەک لە پێشمەرگەکانی یەکێتی و حسک لە دێی کانی رەشی سێکانیان رویدا، ئەوانەی یەکێتی میوانی حسک دەبن، لەبەر هۆی نابەجێ دەبێت بە شەڕ لە ئەنجامدا (جەمالی عەلی باپیر) لە یەکێتی و (شێرکۆی شێخ عەلی) لە حسک و

[٢٤٦] لە بلاوکراوەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، ئەو بەڵگەنامانەی کە پیلانی بەرەی جود دژ بە ریزەکانی نیشتیمانی نیشان ئەدا، ل ١١.

١٠ پێشمەرگەی تر لە هەردولا دەکوژرێن، جەمال و شێرکۆ دو سەرکردەی ناسراوی ئازا، بەخۆڕایی لەناوچون و شۆڕشی کوردستان بە لەدەستدانی ئەو دو پێشمەرگە جەسورە، هەژارتر بو، وە هیچ لایەکیش دەسکەوتی مەزنی بەدەست نەهێنا، ئەم کارەساتە ئاگری شەڕی لە دۆلی جافایەتی زیاتر گەشاندەوە.

## لەشکری ئیسلامی کوردی

لەشکری ئیسلامی کوردی، یەکەم هێزی ئیسلامی کوردی بو، کە لەسەرەتای دروستبونیەوە (سەرەتای ١٩٨١) چەکداری خۆی هەبوە. دامەزراندنی هێزی سیاسی چەکداری لەو کاتانەدا، زۆر ئاسان نەبوە، ئەگەر لە شوێنێکی دیارەوە هاوکاری نەکرایە، لەبەرئەوە هاتنە کایەی لەشکری ئیسلامی بەو شێوەیە، ئەو ناسنامەیەی لەگەڵ خۆی هێنابو کە لە لایەن ئێرانەوە دروستکراوە و پشتگیری دەکرێت.

"ئەم رێکخراوە تازەیە هیچ بەرنامەیەکی سیاسی نەبو، دامەزرێنەرەکانی: مەلا حسێن ماریونسی، شێخ قادری سۆتکە، عەبباس شاهێن کە لە تاران دائەنیشتن لەناو خۆیاندا کۆک نەبون..لەشکرەکەیان نمونەی لەشکری بەکرێگیراو بو، ئێران چەک و پارە و پەناگای، وەک بەشێک لە پاسداران، بۆ دابین کردبون...(بارودخی باشی ئەم لەشکرە) وایکرد لە ماوەیەکی کورتدا پەرەپسێنن و هێزێکی زۆر پێکەوە بنێن. هیچ بیروباوەڕێکی دینی یان نەدینی نەبو کە ئەمانە پێکەوە کۆ بکاتەوە، ئەوەی کۆی کردبونەوە دەستکەوتی ماددی و مەبەستی تایبەتی بو.."[٢٤٧].

لەبەرئەوەی ئەم هێزە زادەی بیرێکی نە ئیسلامی و نە نەتەوەیی بو، بۆیە لەسەرەتادا ناکۆکی لە نێوان سەرکردەکانیدا بە ئاشکرا هەستی پێدەکرا: "بەرپرسی گشتی ئەم لەشکرە مەلا حسێن بوو، بەڵام کارەکان بە دەستی

---

[٢٤٧] پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، نەوشیروان مستەفا، ل ٢٠١.

عباس بوو، چونکە پەیوەندیەکی قوڵی بەسەرچاوەی دارایی واتە لیبیا و سوریاوە هەبوو، ئەم رێکخراوە هیچ بەرنامەیەکی سیاسی دیاری نەبوو، تەنانەت دامەزرێنەرانی: مەلا حسێن مارونسی، عەباس شەبەک و شێخ قادر سوتکە لە نێوان خۆیاندا رێک نەبون"[248].

رێکخستنی ئەم لەشکرە ئەوەندە بێ سەروبەربو، کە دەرگای خستبوە سەرپشت بۆ هاتنە ناوەوەی هەمو یەکێک بۆ ناو ئەو حیزبە، کە پێویستی بە پارە هەبوبێت یان حیزبەکەی ناردبێتی: "هەر لەسەرەتای کارکردنیانەوە زۆربەی پارتە کوردستانییەکان خەڵکی خۆیان ناردبووە ناو لەشکری ئیسلامیەوە، هەر لەو سەرو بەندەدا ئێران داوای لە یەکێتی نیشتیمانی کرد، کە کارئاسانی بۆ لەشکری ئیسلامی بکات، لە بەرامبەریشدا ئێران کار ئاسانی بۆ یەکێتی دەکات"[249].

لە ماوەیەکی کورتدا، لەشکری ئیسلامی توانی ژمارەیەکی بەرچاو خەڵک لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە و بەهێز ببن و ئەوەش غروریەکی لا دروستکردن کە گوێ بە یەکێتی نەدەن.." چەند جارێ قسەیان لەگەڵ کرا، کەڵکی نەبو، پشت ئەستور بون بە ئێران و، ئێران هانی ئەدان لاملی بکەن. ئەگەر لەوە زیاتر چاوپۆشیان لێ بکرایە، ئەبون بە هێزێکی ئەوتۆ چارەکردنیان دژوار ئەبو، بڕیارمان دا تا مەترسیەکەیان زلتر نەبوە چارەیان بکەین، پلانی چەککردنیان دانرا"[250].

کاتێ یەکێتی بڕیاری چەککردنی ئەوانیدا، کارەکە بە ئاسانی بەڕێوە چو، مەحمود سەنگاوی بەم شێوەیە دەیگێرێتەوە: "رۆژی ١٩٨٢/٧/٢ هێزێک هات و لێمان پرسین: ئێوە کێن؟ وتیان: لەشکری ئیسلامین، دەستبەجێ کاک مولازم عومەر بڕیاری چەککردنیدا، یەکسەر گەمارۆماندان و بە

[248] بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد، د. عەلی تەتەر نێروەیی، ل ٢٢٥.

[249] ڕەوتی ئیسلامی لە باشووری کوردستان ١٩٤٦-١٩٩١، توێژینەوەیەکی مێژوویی لە کار و چالاکیەکانی پارت و کۆمەڵە ئیسلامیەکان. ئیدریس سیوەیلی، چاپی یەکەم ٢٠٠٦، ل ٢.

[250] نەوشیروان مستەفا، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، ل ٢٦٢.

چاوتروکانێک چەککران و بە دیلگیران تەنیا یەکێکیان ڕایکرد کە خەڵکی چوخماخ بو..ڕۆژێ دواتر هەمو بارەگاکانی لەشکری ئیسلامی لە حاجی مامەند دەستی بەسەرداگیرا، بەداخەوە هەندێ پێشمەرگە و فەرمانده‌ی ئازامان شەهیدبو، لەوانە کاک سەلاحی موهەندیس".[251]

بە کۆتایی ئەم شەڕە، کۆتای بە لەشکری ئیسلامی لە کوردستانی عێراقیشدا هات: "سەرهەڵدانی لەشکری ئیسلامیی، مەفهومێکی وای لەناو خەڵکیدا چەسپاند، کە ئەوەی بەناوی ئیسلامەوە کار دەکات پیاوی دەرەوەیە و کرێگرتەیە، ئەمەش کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر ئەو بزوتنەوە ئیسلامییە چەکدارییانەی دواتر دروست بون".[252]

[251] مەحمود سەنگاوی، بیرەوەریەکانی سەنگاوی، ل ١٥٢.

[252] سالار مەحمود، سایتی دیپلۆماتیک مەگەزین، ٢٠١٨/١١/٢٨.

# هەوڵێک بۆ ئاشتبونەوە

هەر لەو کاتانەدا ناوبەناو هێزێک لەناو جود دا، هەوڵی ئەدا لەگەڵ یەکێتی ڕێکەوتنێکی ئاشتەوایی بکات و ئیتر کۆتایی بە شەڕی کورد – کورد بهێنێت، ئەم هەوڵانە زۆرجار سەرکەوتو نەئەبو، لەبەرئەوەی گروپەکانی تری ناو جود، پێیان باش نەبو، ئەیان ویست کە هەمو ڕێکەوتنێک ئەوانیتریشی تێدا بن، یان ناکۆکییەکانی سەرکردایەتی هێزێک لەو هێزانە ڕێگربو، بۆئەوەی ئاشتی لەگەڵ یەکێتی ببەستن.

بروسکەیەکی حشع بۆ (م.س) حسک بە ژمارە ٢٣٥ لە ١٩٨١/١١/١ دەربارەی پەیوەندیان لەگەڵ یەکێتی نوسیویانە: "وەک پێشتر ئەم نوسین، دوجار جەماعەتی مام جەلال هاتن بۆ لامان داوای بێ لایەنی لە ئێمە کرد لە باڵەک، وتمان شتی وا نیە و نابێ، داوای هدنەی وەقتیان کرد تا ئەگەینە حەلێکی وسط. وتمان ئێمە هاوکاری (جود) ئەکەین"[٢٥٣].

ئەو هەوڵانەی کە بۆ ئاشتی نێوان یەکێتی و حسک لەسەرەتای مارتی ١٩٨٢دا، سەری نەگرت، مام جەلال بە پێویستی زانی لە ١٩٨٢/٣/٩ نامایەک ئاراستەی حسک بکات و داوای ئاشتەوایی تێدا بکات، پرۆژەی ئاشتیەکە لە دو قۆناغ پێکهاتبو، حسکیش لە ١٩٨٢/٣/١٨ دا بەدەم پێشنیازەکانی یەکێتیەوە چو، هەردو هێزەکە بۆچونەکانیان نزیک بون لە یەکەوە، بەڵام باوەڕیان لە نێودا کەم بو.

هەمو هێزەکان هەوڵیان ئەدا کە سەبەخۆیی خۆیان بپارێزن و خۆیان

---

[٢٥٣] لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، ئەو بەڵگەنامانەی کە پیلانی بەرەی جود دژ بە ریزەکانی نیشتیمانی نیشان ئەدا، ل ٢٠.

لێپرسراوی خۆیان بن، زۆریان بە باشیان ئەزانی کە سەرکردایەتی هێزێکی بچوکی بێ ڕۆڵ بکەن، وەک لەوەی ڕوڵیان هەبێت لەناو بزوتنەوەیەکی جەماوەری گەورەدا، بۆ زۆر لەوانە گرنگ نەبو، چەند کاریگەرییان لەسەر ڕوداوەکان و چەند ڕۆڵیان لەسەر سەرجەم جولانەوەکە هەیە، بۆ ئەوان گرنگ بو، ئایا خاڵی گومرگییان هەیە؟، ئایا چۆن ئەتوانن زیاتر پارە کۆبکەنەوە؟، چۆن ئەتوانن هەمو ئەو دەزگایانەیان هەبێت کە هێزێکی گەورەی وەک یەکێتی یان پارتی هەیبو؟.

"هەر لەو کاتانەدا، نوێنەرانی یەکێتی و پارتی لە ١٩٨٢/٧/٢٨ لە بارەگایەکی حشع لە پشت ئاشان کۆبونەوە و کۆمەڵێک بەڵێنیاندا کە زۆربەیان بریتی بون لەوەی کە یەکێتی بتوانێت بچێتە ناوچەکانی بادینان و پارتیش بچێت بۆ ئەو ناوچانەی کە بونیان تێدا کەمە و لە ژێر دەسەڵاتی یەکێتیدایە"[٢٥٤].

لەم چەند مانگەدا، یەکێتی توانی پەیوەندی خۆی لەگەڵ هەریەک لە پارتی، حشع و حسک باشتر بکات و بەیانی هاوبەش دەربکەن و کۆمەڵێک بەڵێنیاندا بە خەڵکی کوردستان کە جارێکی تر، شەڕی ناوخۆ ڕو نەداتەوە، هەروەها لە کۆبونەوەی ١٩ قوڵی هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراقی لە لیبیا و لە شاری تەرابلوس بە هاوبەشی هەمو هێزە کوردییەکان، بەڵێنیاندا لەمەودوا هەمو توانایان بخەنە گەڕ بۆ خەبات دژ بە دیکتاتۆریەتی بەعس.

ئەم ڕێکەوتنە وەک زۆربەی ڕێکەوتنەکانی تر، تەمەن کورت بو، زۆری نەخایاند بارودۆخەکە ئاڵۆزی و گرژی زیاتری بە خۆیەوە بینی و بە شەڕی پشت ئاشان کۆتایی هات.

---

[٢٥٤] فاتح رسول، چەند لاپەرەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی کورد، ڕوداو و بەڵگەنامە ١٩٨٢-١٩٩٠، بەرگی سێیەم، سوید، ل ٥٦- ١٩٩٤.

# شەڕی یەکلاکەرەوەی پشت ئاشان

پارتی و هێزەکانی حسک و حشع ناوبەناو لە شەڕدا بون لەگەڵ هێزەکانی یەکێتی، سەرەڕای چەند هەوڵێک کە لە لایەن حشعەوە درابو،، بۆ ڕێگرتن لە هەڵگیرسانی شەڕ، لەوانە کۆبونەوەیەک لە ناوەڕاستی شوباتی ١٩٨٣ دا لە نێوان نوێنەری پارتی (حەسۆ میرخان ژاژۆکی) و یەکێتی (محەمەدی وەتمان) و نوێنەری حشع (ئەبو شوان) باس لەوە کرابو کە ئەو ئاڵۆزییەی لە ناوچەکانی دۆڵەتو و شاخی جاسوسان هەبو، هێمن بێتەوە و پەرە نەسێنێ بۆ شوێنەکانی تر، بەڵام مەسعود بارزانی دژ بەم هەنگاوە وەستایەوە و لە ١٩٨٣/٢/٢٨ نامەیەکی بۆ حەسۆ میرخان نوسیوە و دەڵێ: "هەق نەبو تۆ لەگەڵ ئەوان (یەکێتی) دانیشتیدایە)"[٢٥٥]، نامەکەی مەسعود بارزانی بۆنی ئاشتی لێ نەئەهات، هەرچەندە دوای ئەوەش، نوێنەرانی یەکێتی (عەلی حەوێز) حسک (قادر عەزیز) و حشع (ئەبو عائید) لە ١٩٨٣/٣/٧ لە (بەستی شەڕغە) لە ڕۆژئاوای کۆیە کۆبونەوە و ڕێکەوتنێکی ئاشتییان مۆر کرد، بەڵام بارودۆخەکە لە زۆربەی ناوچەکان بۆنی شەڕیان لێدەهات زیاتر لە ئاشتی.

لە ١٩٨٣/٤/١٥هێزێکی حسک و حشع لە نزیک گوندی باداوان بۆسەیەکیان بۆ هێزێکی یەکێتی دانا و لە ئەنجامدا شەش پێشمەرگە کوژران، لە ناویاندا شەماڵی باخ، فەرماندەی تیپی کۆسرەت و سەرباز ئەحمەدی جێگری.

شەڕ و پێکدادان لە نێوان جود و یەکێتیدا دەستیپێکرد، هەردولا قوربانیان هەبو، هێزەکانی جود لە ١٩٨٣/٤/٢٦ هێرشیان کردە سەر هێزەکانی یەکێتی لە بالیسان و لەو ناوچەیە دەریان کردن.

---

[٢٥٥] فاتیح رسول، بەرگی سێیەم، سوید ١٩٩٤، ل ٢٢٩.

گرتنی بالیسـان زیانێکی گەورە بو لە یەکێتی کەوت، ئەوانیش بڕیاریاندا بارودۆخەکە بەلایەکدا بخەن، سەرکردەیەکی حشع لەو بارەیەوە دەڵێ: "ئەو سـەرکەوتنە کـاتییەی بەرەی جـود لە پەلامـاردانی هێزەکـانی یەکێتیـدا لە بالیسان، سەرکردایەتی حیزبی لە پشت ئاشان توشی لە خۆ بایبون کرد".[٢٥٦]

ئەم بۆچونەی ئەم سەرکردایەتیەی حشع باسی بارودۆخی نەفسی هێزەکان دەکات، هەریەکەیان خۆی بە گەورە و بەهێز زانیوە، کەریم ئەحمەد، سکرتێری پێشوی حیزبی شیوعی کوردستان، لە بیرەوەریەکانی تایبەت بە روداوی پشت ئاشان دەنوسێت: "لە نامەی (ئەبو حیکمەت) دەڵێت پارتی و حسک دەیانەوێت چالاکیەکی سـەربازی ئەنجام بدەن بۆ دەرکردنی یەکێتی لە ناوچەکە، لەسـەر ئێمەش پێداگری دەکەن کە بەشـدار بـین، چـونکە ئـێمە لەنـاو بەرەی {جـود} هاوپەیمانین وەڕاستیش نییە دەستبەرداری هاوپەیمانەکەمان بین".

سەرکردایەتی حیزبی شیوعیش لە وەڵامدا وتویەتی: "ڕاست نیە کارێکی وا بکرێت، ئێمە لەگەڵ یەکێتی ڕێکەوتنمـان هەیە" کەریم ئەحمەد دەنوسێت، کە ئەبـو حـیکمەت بە نـامەیەکی تـر وەڵامـی داونەتەوە و نوسـیویێتی: "پـارتی و حسک سـورن لەسـەر بەشـداریمان لەم پرۆسـەیەدا، ئەگەر نـا بونمـان لەنـاو بەرەی {جـود} دا نابێت و پەیوەندیەکانیشـمان ئاسـایی نـابن". کەریـم ئەحـمەد نەیشاردۆتەوە، کە لە وەڵامی دوهەمیاندا بۆ ئەبو حیکمەت کەوتونەتە هەڵەوە، "لە وەڵامی دوەممانـدا بـۆ ئەبـو حیکمەت هەڵوێستمان هەڵە بوو، دو دڵـی تێدا بو، مەسەلەکەمان بۆ خۆیان دانا کە چۆنیان بە بـاش زانـی وا بـکەن، ئەوانیش لە پرۆسەکەدا بەشداریانکرد" شەوی ٢٨-١٩٨٣/٤/٢٩ هێزەکانی بەرەی "جود" پـارتی و حسـک و شـیوعی، پەلامـاری بارەگـای یەکێتیـان دا لە بالیسـان و دەستیان بەسەر مەڵبەندی یەکێتیدا گرت".[٢٥٧]

---

[٢٥٦] قادر رەشید، ئەبو شوان، پشتئاشان لە نێوان ئازادی و بێدەنگیدا، ل ٦٣.

[٢٥٧] سالار مەحمود، سایتی دیپلۆماتیک مەگەزین، ٢٠١٨/١١/٢٨.

فەرەیدون عەبدولقادر،ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی لەو بارەیەوە دەنوسێت: "هێزەکانی (جود) لە هەمو لایەکەوە پەلاماری بالیسان دەدەن! هێزەکانی یەکێتی توانیان تا ئێوارە بەرگری بکەن و ئیتر ناچاری و دوای حەوت قوربانی، کشانەوە و هێزەکانی (جود) بالیسان و مەڵبەندی یەکێتیان داگیرکرد و تالآنیشیان کرد، بەو جۆرە پەلاماردانی بارەگاکانی مەڵبەندی چواری هەولێر بە گەلەکۆمەکێی هێزەکانی جود، سەرکردایەتی یەکێتی خستە سەر ئەو بڕوایەی، کە دەبێت پەلاماری سەرکردایەتی (حسک و حشع) و بنکەی پارتی لە ناوچەکەدا بدرێت و تۆڵەی ئەو هەمو شەڕ و گێچەڵەیان لێ بکرێتەوە، کە چەند ساڵە بە یەکێتی و هێزی پێشمەرگەی کوردستانی دەفرۆشن"[٢٥٨].

دەربارەی هەڵوێستی جۆراوجۆری شیوعیەکان، بەهادین نوری، کە ئەوکاتە بەرپرسی هەردو مەڵبەندی سلێمانی و کەرکوکی حیزبی شیوعی بوە، لە بیرەوەوەریەکانیدا دەڵێ: "حسک بێزاربون لەسەر دەستدرێژییەکانی یەکێتی بۆ سەریان، لەبەرئەوە، ئەو گەلەکۆمەکییەی پارتییان لا پەسەند بوو، سەبارەت بە حیزبی شیوعیش، لەو کاتەدا چەند هاورێیەکی عەرەب لە پشت ئاشان بون، سەریان لە هیچ دەرنەدەکرد، وەکو نەبوو وا بون، سێ هاورێی کوردی لێبوو (کەریم ئەحمەد، جێگری سکرتێر، عومەر عەلی شێخ، ئەندامی مەکتەبی سیاسی، ئەحمەد بانیخێلانی ئەندامی کومیتەی ناوەند) بڕیاربەدەستی راستەقینە ئەم سیانە بون، لەگەڵ سکرتێری حیزب، عەزیز محەمەد کە ئەو کاتە لە مۆسکۆ بوو. ئەمانە شیوعییان راپێچی شەڕی براکوژی کرد"[٢٥٩].

هەر دەربارەی رۆڵی حشع لە شەڕی ناوخۆ، یان بە تایبەتی لە شەڕی پشت ئاشاندا سەرکردەیەکی حشع دەنوسێت: "هێرش بردنە سەر بارەگای مەڵبەندی چواری ینک و دەست بەسەراگرتنیدا، کارێکی ناڕەوا و سەر

---

[٢٥٨] فەریدون عەبدولقادر هەڵۆ سورەکان، ، سلێمانی ٢٠١٧، ل ٤٢٣.

[٢٥٩] سالار مەحمود، سایتی دیپلۆماتیک مەگەزین، ٢٠١٨/١١/٢٨ و بەهادین نوری، پرسی کورد و ئەزموونی کوردستانی عێراق، بیرەوەریەکانی، ئابی ٢٠١٨، ل ٥٦.

لێشـیواوی کـورت بینـی تەواوی تێدا بەدیـدەکرا. لە هەمانکاتـدا کـرا بە فتـیلەی خۆشکردنی ئاگری شەڕی ناوخۆ و یەکتر کوشتن، چونکە تا ئەو کاتە لە هەمو رویەکەوە، ماوەی ئەوە مابوو، بە تایبەتی نێوان سەرکردایەتی حشع و ینک کە بە رێگای گفتوگۆکردن، چارەی ئاشتیانە بۆ ناکۆکی و مشکیلەکان بدۆزرێتەوە"[٢٦٠].

بەم هێرش و شەڕانە، رێگای گفتوگۆ و ئاشتی لە نێوان هێزەکانی جود و یەکێتیـدا داخـران، تـاقە رێگـا تەنهـا شـەڕی یەکـلاکەرەوە مـایەوە. دۆڵەکـانی بالیسان، ئاکۆیان، خانەقا، شوێنی گەرمـی پێکدادان بـون، کـاتی ئەوە هـاتبو کە ئەبێت هێزێک دەسەڵات لە ناوچەکەدا بگرێتە دەست، بارودۆخی فرە گروپی و فرە هێزی بەسـەر چوبو، بە تایبەتی لە نێوان هێزەکانی جود و یەکێتیدا.

یەکێتی بڕیاری دابو، کە خۆی لەو بارودۆخە رزگار بکات و نـاوچەکەی لە هێزەکـانی جـود (پـاک بکـاتەوە). نەخشـەیەکیان ئامـادەکرد کە لە ٢٩ی نیسـانی ١٩٨٣ەوە هێرش بکەنە سەر بنکەکانی حسک، حشع و پاسۆک لە دۆڵی بالیسـان و دۆڵی مەلەکان و رەزگە، ئاشقوڵکە، تا قرناقا و پشت ئاشان و سماقوڵی.

لە ماوەیەکی کورتدا، دەستیان بەسـەر هەمو ئەو شوێنانە گرت، کە شـوێنی هێزەکـانی جـود بـون و ژمـارەیەک کوژراو و برینـدار و بەنـدیان گـرت لەوانە کەریـم ئەحـمەد، ئەحـمەدی بـانیخێڵانی ئەنـدامانی مەکتەبـی سیاسـی حشـع و قادری رشید ناسک ئەندامی سەرکردایەتی هەمان حیزب.

فەریـدون عەبـدولقادر، بەم شـێوەیە باسـی ئەو شـەڕە دەکـات: "لە رۆژی ١٩٨٣/٥/١، بە رەمـزی (تـۆڵە بە سـەبرە، ئەممـا بە زەبـرە) کە لە رادیـۆکەوە بڵاوکـرایەوە، شـەڕ و پەلامـار بـۆ سـەر بـنکە و بارەگـانی ناوچەکـانی (جـود)، دەسـتپێکرد و لە رۆژی دوەمـدا هەمـو بارەگاکـانی (حسـک، حیزبـی شـیوعی، پـارتی و پاسـۆک) گیـران و هێزەکەی مەڵبەنـدی سـێ بەسـەرپەرشتی شـەهید (ئـازاد هەوارامـی) لە قـوڵی کۆمتـانەوە یەکـی گـرتەوە لەگەڵ هێـزە گەورەکەی

[٢٦٠] فاتح رسول، چەند لاپەرەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی کورد، روداو و بەڵگەنامە ١٩٨٢-١٩٩٠، بەرگی سێیەم، سوید ١٩٩٤، ل ٢٦٨.

(یەکێتی)دا و بەڵگەنامە و نوسراوێکی زۆر کەوتە دەست هێزەکانی (یەکێتی)".[٢٦١]

هەر دەربارەی ئەم شەڕە، ئەندامێکی سەرکردایەتی حشع بەم شێوەیە باسی دەکات: "ئەم شەڕە بۆ یەکێتی یەکلاکەرەوە بو، وە بە سەرکەوتنێکی گەورەیان زانی بۆ خۆیان و وەک بڵاویان کردەوە کە (بەم سەرکەوتنە، کۆتایی بە وردە شەڕ لەم ناوچەیە هێنرا)، هەر لەو کاتانەدا کە سەرکردەکانی حشع لای یەکێتی (میوان) بون، لە ١٠ی مایس دا ڕێکەوتنێک لە نێوان یەکێتی بەسەرۆکایەتی مام جەلال و حشع بەسەرۆکایەتی کەریم ئەحمەد مۆرکرا، ئەم ڕێکەوتنە نەک هەر جێگای دەستخۆشی نەبو، بەڵکو حشع لە کۆبونەوەی سەرکردایەتیەکەیاندا لە ٢٤ مایسی ١٩٨٣ محاسەبەی کەریم ئەحمەدیان کرد لەسەر ئەو ڕێکەوتنەی لەگەڵ مام جەلالدا کردویەتی".[٢٦٢]

ئەم شەڕە، جگە لە زیانی گیانی گەورە، زیانێکی سیاسی و مەعنەوی مەزنیدا لە هێزەکانی جود و سەرەڕای کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگە، ناوچەیەکی بەرفراوانیان لەدەستدا: "لە ئەنجامی ئەم هێرشە شکستێکی گەورە بە (حشع) و (حسک) و (پاسۆک) کەوت و ٦٤ کەس لە (حشع) و ١٣ کەس لە (حسک) و چەند کەس لە (پاسۆک) و دەیان کەس لە یەکێتی بونە قوربانی و بارەگای ئەم حزبانە بە تەواوەتی کەوتە بەردەستی یەکێتی".[٢٦٣]

دوای ئەم شەڕە، لە کوردستان دو ناوچەی پێشمەرگانە دروست بو، کە هەر ناوچەیەک هێزێک دەسەڵاتی تێدابو، بادینان و بەشێک لە سۆران بۆ پارتی و زۆربەی سۆران بۆ یەکێتی.

دوای ئەو شەڕانە، هێزەکانی جود، بەتایبەتی حشع کەوتنە شەڕی ڕاگەیاندن لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات دژ بە یەکێتی نیشتیمانی، سەرکەوتنی یەکێتییان بە هاوکاری وڵاتانی دەرەوە ئەبەستەوە! حسک لە

---

[٢٦١] هەڵۆ سورەکانی قەندیل، فەرەیدون عەبدولقادر، ل ٤٢٥.

[٢٦٢] قادر رەشید، ئەبو شوان، پشتئاشان لە نێوان...، ل ٩٠.

[٢٦٣] بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە کوردستانی عێراق، د. عەلی تەتەر نێروەی، ل ٢٨٥.

بڵاوکراوەیەکدا لە ١٩٨٣/٥/١ نوسیویتی: "یەکێتی بە گوێرەی نەخشەیەکی گڵاوی تاوانکارانە، کە ماوەیەکی زۆرە ئیشی بۆ دەکەن، بە هاوکاری رژێمی فاشی بەغدا و ئاغاکانیان لە ئیمپریالیزم و هەندێ سەرکردایەتی سوشیال دیموکراتەکانی رۆژئاوا، وەک ئەڵقەیەک لە زنجیرەی نەخشە و پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و هێزی کۆنەپەرست بۆ تاوتوێکردن و گەمارۆدانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی لە ناوچەکەدا، هێرشێکی کتوپری نامەردانەیان کردە سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی حیزبمان و لایەنەکانی تری جود"[٢٦٤].

"قەدەغەکردنی ناوچەکانی کوردستان لە یەکتری ئاماژە بوە بۆئەوەی هەر لایەنێک میرنشینێکی تایبەت بە خۆی هەبێت و ئیتر بۆ هیچ لایەنێکی تر نەبێت بەبێ رەزامەندی ئەو، چالاکی دژی دوژمنی سەرەکی لە ناوچەی میرنشینەکەی جیا لەوەی خۆی بنوێنێت. بۆیە بونی گیانی پاوەنخوازی و شەڕکردن لەسەر دەسەڵات و ناوچەی فەرمانڕەوایەتی، بە تایبەتی لە ناوچەکانی بادینان، سۆران، دۆڵی جافایەتی، شارەزور، قەرەداغ و دەشتی هەولێر، هۆکاری سەرەکی بوو، لەوەدا شەڕی خوێناوی براکان لە نێوان خۆیاندا بکاتە واقیع و بەکرداریش لەسەر دەسەڵات و ناوچەی فەرمانڕەوایی چەند ساڵێک شەڕی خوێناوی درێژە بکێشێت قوربانی زۆری لە هەمو لایەکان لێبکەوێتەوە"[٢٦٥].

زۆر کەس وای دەزانی کە شەڕی پشت ئاشان، رەنگە کۆتایی بە شەڕی نێوان یەکێتی و هێزەکانی جود لەو ناوچەیە بهێنێت، بەڵام وا دەرنەچو، جود هەوڵی ئەدا تۆڵەی ئەو زیانە سەربازیە لە یەکێتی بکاتەوە و هەرچۆنێک بێت، وا نیشان نەدات کە ئەو بەرەیە شکستی هێناوە: "بۆ رۆژی ١٩٨٣/٦/٢ هاورێیان یوسف حەنا و مولازم خدر گەیشتنەوە (سێلوە) ئاگاداریان کردین کە کۆمیتەکەی عەسکەری بڕیاری وەرگرتیە، لە ماوەیەکی کەم هێزەکان ئامادەبکەن و هێرش بەرنەوە سەر هێزەکانی (ینک)

[٢٦٤] نەوشیراون مستەفا، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، ل ٢٩٧.

[٢٦٥] د. سەلام عەبدولکەریم، شەڕی ناوخۆ... (١٩٨٢-١٩٨٤)، ل ٨.

لە ناوزەنگەوە تا گوندی وەرتێ و سەری زینوێ ئەستێرۆکان تەنانەت نوێنەرانی پدک ئاگاداری کۆمیتەکەیان کردبو، لە دانیشتنەکەدا (دانیشتنی نوێنەرانی سەرکردایەتی جود) کەوتینە ئەو بڕوایە، کە گەڕانەوەی هێزەکانی بەرەی نیشتیمانی دیموکراتی (جود) بۆ بناری شاخی قەندیل و شوێنەکانی پێشوی خۆمان، بە ستراتیژیەتی بزاڤ و هێرشی ئەرتەش و پاسدارانی کۆماری ئیسلامی بۆ سەر خاکی عێراق بەرپەرچ کراوە. (پدک)یش بەبێ ڕەزا بون و بڕیاردان و یارمەتی ئێرانییەکان بە هیچ هەنگاوێک هەڵنەدەستا، تێکڕا سەرجەمی کادر و پێشمەرگەکانی حشع و حسک، باش دەرکی ئەوەیان کردبوو کە دوا بەداوی ئەو هەمو زەرەرو زیان و تێکشکانەکانی سەرەتای مانگی ئایار، گەڕانەوە بۆ ڕۆژئاوای شاخی قەندیل لە توانای هەردولادا نیە![٢٦٦].

ساڵی ١٩٨٣، ساڵی شەڕی گەرم بو لە نێوان عێراق و ئێراندا، باشترین هەل بو بۆ هێزە کوردستانی و عێراقییەکان بۆئەوەی سودی هەمەجۆر لەو جەنگە وەربگرن و خۆیان بەهێز بکەن و تا ئەتوانن دەسکەوت بۆ گەلی کورد بەدەست بهێنن، بەڵام لەجیاتی ئەوەی ئەو فرسەتە بقۆزنەوە، چەند شەڕی ئەو دو دەوڵەتە گەرم بو، بەقەد ئەوە شەڕی ناوخۆی کوردیی بەهێز بو.

هەمو هێزەکانی یەکێتی، پارتی، حسک و حشع نەک هەر نەیانتوانی دەسکەوتی گەورە بەدەست بهێنن، بەڵکو خوێناویترین شەڕی یەکتریانکرد و ناکۆکییەکانی نێوانیان زۆر قوڵتر کردەوە و هیوای ئاشتەواییان لە نێوانیاندا زۆر دورخستەوە.

کاتێک هێزێکی سیاسی و سەربازی ناوچەیەک لەدەست ئەدا و هێزێکی تری نەیاری دەسەلاتی ناوچەکە ئەگرێتە دەست، ئەوە تەنها سەرکەوتنی سەربازی و سیاسی نەیە بۆ ئەو هێزە، بەڵکو لەدەستدان یان

---

[٢٦٦] فاتح رسول، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی کورد... بەرگی سێیەم، ل ٣٠٦ و ٣١٠.

دەستبەسەراگرتنی سەرچاوەیەکی دارایی باشبوە بۆ ئەو هێزانە، چونکە باج وەرگرتن لە ناوچەکان یان دەستبەسەرگرتنی خاڵە سنورییەکان، بایەخێکی بازرگانی و ئابوری گەورەی هەبو، بەتایبەتی بۆ ئەو هێزانەی کە یارمەتی دەرەوەیان نەبو یان زۆر کەم بو، باج وەرگرتن سەرچاوەی ژیان و بەردەوامیان بو، لەبەرئەوە شەڕی ناوخۆ، جگە لە هۆکارە سیاسی و سەربازییەکانی ناوەرۆکێکی ئابوری دیارو و ئاشکرشی هەبو.

ئەوەی جێی سەرسورمانەم کە زۆربەی هێزەکان باری ئابوریان خراپ بوە و زۆر جار نەیانتوانیوە بە چەند مانگێک هاوکاری و یارمەتی پێشمەرگەکانی خۆیان بدەن، بەڵام لە کاتەکانی شەڕی براکوژیدا، زۆر سەغی و دەستکرواە بون لە کرینی چەک و تەقەمەنیدا!.

# گفتوگۆی یەکێتی و ڕژێمی بەعس

مێژوی گفتوگۆی نێوان هێزە کوردستانییەکان و حکومەتی بەغدا، روداوێکی نوێ نەبو، ناوبەناو حکومەت راستەوخۆ و ناراستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ پارتی و حسک و حشع کردوە، دوجار رژێم هەوڵیداوە لە ١٩٧٩ و ١٩٨٢ لەگەڵ پارتی بۆ گفتوگۆ، هەروەها لەگەڵ حسک، "رژێم توانی وەفدێک لە برادەرانی حسک بۆ بەغدا ڕابکێشێت، دوای دو سێ مانگ هاتوچۆکردن و بەڵێن پێدانی پڕ درۆ و ناڕاست، سەرکردایەتی حسک بە هیچ ئەنجامێک نەگەیشت"[٢٦٧].

گفتوگۆی پارتی و رژێم نەهێنی نەبو، زۆر کەس و لایەن باسیانکردوە، یەکێ لە هاوپەیمانەکانی پارتی لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا، حسک بو، ئەوان لەم بارەیەوە دەڵێن: "لەو لاشەوە پارتی لەگەڵ عێراق لە گفتوگۆدا بون، کە بگەڕێنەوە ناوچەی بارزان و بۆخۆیان دانیشن و شۆڕش نەکەن و ١٠ هەزار تا ١٢ هەزار کەس لە عەشیرەتی بارزان چەکدار بکەن و گوندەکانیان بۆ ئاوەدان بکەنەوە و بگەڕێنەوە جێگاو و شوێنی خۆیان لە بارزان، عێراق ١٢ هەزار چەکیان بداتێ.. لە هەمان کاتدا ئێرانیش داوای لە پارتی کردبو کە ئەوان ئامادەن شتی زیاتریان بۆ بکەن بە مەرجێ ئەوان لە کاتی ئەم مفاوازاتە کە عێراق سیقەی بە پارتی هەیە ئەوان هاوکاری عێراق بکەن وە ناوچەی حاجی ئۆمەران بگرن بۆ ئێران"[٢٦٨].

---

[٢٦٧] فاتح رسول، چەند لاپەرەیەک لە مێژووی خەباتی گەلی کورد، روداو و بەڵگەنامە ١٩٨٢-١٩٩٠، بەرگی سێیەم، سوید، ل ٣٧٩ - ١٩٩٤

[٢٦٨] رۆژژمێری پێشمەرگەیەک، بەرگی ٢، ل ١٢٣.

بەعس بە چەند شێوەیەک و لەگەڵ چەند لایەک هەوڵی ئەدا کە درز بخاتە ناوماڵی کورد و گفتوگۆ لەگەڵ هەر هێزە بەتەنها بکات: "سەدام ویستبوی کە بە ڕێگای جۆراوجۆرەوە لەوانەش گفتوگۆ کە هەر بڕوای پێ نەبوو، کێشەکانی سیاسی ناوخۆی عێراق لەوانەش کێشەی کورد چارەسەربکات، بۆیە پێش دەستپێکردنی جەنگ جگە لە گفتوگۆ لەگەڵ (حسک) دا، بارزان تکریتی سەرۆکی موخابەراتی عێراق نامەیەکی بۆ مەسعود بارزانی نوسیبوو و داوای گفتوگۆی کردبو، بەڵام بەهۆی بێ متمانەیی بە حکومەتی سەدام سەری نەگرتبو.. هەروەها بارزانی لە وەڵامی نامەیەکدا کە لە ١٩٨٢ دا نوسیبوی دەڵێ "ئەوان ئامادە نین لەگەڵ ولاتێکی بیانی دژ بە ولاتەکەیان شەڕ بکەن. ئەگەر حکومەت هەڵسوکەوتێکی دروست لەگەڵ کێشەی کورد بکات، و ئەو خەڵکەی دەرکراون بگەڕێنەوە سەر گوندەکانیان و مافی کورد بدرێت ئەو ئامادەیە بچێتە بەغدا.."[٢٦٩].

ڕژێمی بەعس، گفتوگۆی وەک ئامراز دژ بە بزوتنەوەی کوردایەتی بەکاردەهێنا و نیەتی راستەقینەی نەبو کە خاڵەکانی گفتوگۆ وەک خۆی جێبەجێ بکات، خاڵێک لە خاڵەکانی ڕێکەوتن لەگەڵ ڕژێم، هەڵوەشانەوەی (جاش) بوو، هەر لەسەرەتای گفتوگۆدا، ڕژێم مەبەستی نەبو ئەم خاڵە وەک خۆی جێبەجێ بکات، لە نوسراوێکی سکرتاریەتی سەرۆکایەتی کۆمار کە بە (زۆر نهێنی، تایبەتی و زۆر خێرا) ئاراستەی (سەعدی مەهدی) (ئەمینی نهێنی ڕێکخستنی سەرو) بە ژمارە ١٤٧٢/١/٢ ک لە ١٩٨٣/١٢/٢٠ نوسراوە دەڵێ: سەرۆک پێشەوا فەرمانی دا: بەردەوامبون لەگەڵ ئەو کوردانەی کە هاوکار و یارمەتی حکومەتیان کردوە و لەم قۆناغەدا زیادکردنی هاوکاری و یارمەتی مادی و مەعنەوییان، لە پێناوی پاراستنیاندا، بۆئەوەی هیچ هەستێکیان لا دروست نەبێت کە گفتوگۆ لەگەڵ جەلال کاریگەری سلبی لەسەریان دروستدەکات. بۆئەوەی ئەو کێشانەی رابوردو دوبارە نەبێتەوە و

---

[٢٦٩] د. عەلی تەتەر نێروەی، بزاڤی ڕزگاریخوازی، ل ٣٢٠.

ئەو کـارەی دوای بەیـانی ئـازار بەسـەریاندا هـات. تکـایە بە دەمـی هەمـو پارێزگاکـانی دهـۆک، ئەربیـل و سـلێمانی و دەزگـا پەیوەندیـدارەکان ئاگاداربکرێنەوە" (نوسراوی سەرۆکایەتی کۆمارەکە پارێزراوە).

هاتنی سوپای ئێران بۆ ناوچەی حاجی ئۆمەران و هاوکاری پارتی بۆ ئەو هێرشـە، سـەدامی خسـتە بارودۆخێکەوە، کە هانیدا گفتوگۆ لەگەڵ یەکێتـی بکات، چـونکە ئەگەر هێـرش بەردەوام بـوایە، ڕەوانـدز و شـەقڵاوە دەکەوتە مەترسـی و ئینجا نۆرەی هەولێر و کەرکوک دەهات. (بزاڤی ڕزگاریخوازی، ل ٣١٩).

لەنـاو جەرگەی ئەم جەنجـاڵە سیاسـی و سـەربازییە و ئەو بـارودۆخە نالەبـاری یەکێتـی تێـدابو، ئەمـانە هانـدەربون کە زەمینـەی گفتوگـۆی نێـوان یەکێتی و ڕژێمی بەعس بێتە کایەوە.

"یەکێتی کەوتبوە ژێر فشارێکی زۆرەوە، لە لایەک لەگەڵ حکوومەتی عێراق و لە لایەکی ترەوە لەگەڵ حکومەتی ئێران لە شەڕدا بوو. هەمو حیزبە سەرەکیەکانی کوردسـتانی و (حشـع)یش لەگەڵدا بەشـەڕ بون، سیاسـەتی نالۆجیکـانەی یەکێتـی وایلێکردبـوو کە دۆسـتێکی وای لە نـاوچەکەدا نەبێـت بە تەنیـا بمێنێـتەوە".[٢٧٠]

عـومەر شـێخ مـوس، ئەنـدامی مەکتەبـی سیاسـی ئەو کـاتەی یەکێتـی بەم شێوەیە باسی بارودۆخی ئەو کاتە و ئەو هۆیانەی کە پاڵی بە یەکێتییەوە نـا لەگەڵ ڕژێـم گفتوگۆ بکـات: "لە کۆتاییەکـانی سـاڵی ١٩٨٣ دا، ئێمە گەشـتینە ئەو قەنـاعەتەی کە هێزەکانمـان زۆر مانـدون. دەمێـک بـوو بیرمـان لەوە دەکـردەوە ئەگەر بـۆ مـاوەی سـاڵێکیش بێت ئاگربەسـتێک لەگەڵ حکـومەتی عێراقی بکەین بە بەرژەوەندی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان تەواو دەبێت، تا بتـوانین پـارە و چەک و هەنـدێک کەرەسـتە پەیـدابکەین، کە پێداویسـتی پێویسـتن، تـا بـۆ جەولەیەکـی تـری شـەڕ خۆمـان ئامـادەبکەین، ئێمە وەک پرنسیپ دژی گفتوگۆ نەبوین".[٢٧١]

---

[٢٧٠] هەمان سەرچاوە.

[٢٧١] پشکۆ لە خۆڵەمێشدا، عومەر شێخمووس، ٢٠١٠، ل ١٩٩.

یەکەم دانیشتن لە نێوان یەکێتی و نوێنەرانی بەغدا لە ١٩٨٣/١٠/٢٣ لە گوندی گۆرە شێر بە ئامادەبونی نوێنەرانی حکومەت (ئەبو ئەحمەد، ئەبو محەمەد و ئەبو عودەی و لە یەکێتی مام جەلال و نەوشیروان مستەفا و عەبدولرەحمان قاسملۆش) وەک سکرتێری حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران وەک رێکخەری ئەم بینینە و میوانی دانیشتنەکە ئەنجام درا.

رژێم نەیئەویست داخوازییەکانی یەکێتی و کورد قبوڵ بکات، ئەو زیاتر مەبەستی بو، یەکێتی شەڕی ئێرانی بۆ بکات و شەڕی ناوخۆی کوردیش بەردەوام بێت، لەسەرەتادا، رژێم هاتە پێشەوە، لە بەشێ لە نامەیەکی مام جەلال بۆ (عومەر دەبابە، هۆمەر شێخ موس و د. کەمال فواد) لە ١٩٨٤/٩/٢٧ دا زۆر بە گەشبینی دەنوسێت: "..من لەوەتی هاتوم، سەرۆک و جێگرەکەیم دیوە، و گوفتار و گفتوگۆیان باشبوو، وا پێ دەچێت لە هەفتەی داهاتودا رێکەوتنەکان مۆر بکەین و بەیان دەرچێت." هەر دوای دو هەفتە، لە ١٩٨٤/١٠/١٤ مام جەلال نامەیەکی تر بۆ ئەو بەرێزانە دەنوسێت و رەشبینیەکی باشی پێوە دیارە: "وا دیارە جارێ وەختی رێکەوتن نەهاتوە لەگەڵمان، مەگەر بە هەمو شەرتەکانی ئەوان نەبێت، کە ئەمەش وادیارە سەرکردایەتی کۆمەڵە و شۆڕشگێران قبوڵیان نیە، هەوڵی تەحجیم کردنی (ی.ن.ک) زۆر دیار و ئاشکرایە".[٢٧٢]

هەر دەربارەی تاکتیکی سەدام لەگەڵ کوردا، نوسەرێکی ئینگلیز دەنوسێت: "سەدام درێژەی بە گفتوگۆکاندا، چونکە نەی دەویست مساوەمە لەسەر کۆمەڵێک شت بکا، یەکێک لەو بابەتانەی مشتومڕی زۆری لەسەر دەکرا، چارەنوسی کەرکوک بو. ئەگەر سەدام کەرکوکی بدایا مانای ئەوە بو مام جەلال لە مەلا مستەفای دەبردەوە، بەڵام سەدام نەیدەتوانی واز لە گرنگترین سەرچاوەی داهاتی عێراق بهێنێ..." هەروەها کاتێ سەدام زانی، کە کورد شەڕی ئێرانی بۆ ناکات و بارودۆخی شەڕەکەش گۆڕا: "بەڵام

[٢٧٢] پشکۆ لە خۆڵەمێشدا، هۆمەر شێخمووس، ل ٤٣١.

كاتێک دڵنیابو لەوەی دنیا ناهێڵێ ئەو شەڕە بدۆڕێنێ پێویستی بەوە نەما تەنازول بۆ کورد بکات.[٢٧٣]

پێش ئەوەی کە یەکێتی گفتوگۆی لەگەڵ رژێم دەستپێبکات، پەیوەندی زۆر خراپی لەگەڵ پارتی، حسک. حشع و پاسۆک هەبو، لە کاتی گفتوگۆدا، نەیاری تری زۆری بۆ پەیدا بو لەوانە، هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی عەرەبی عێراقی، ئەوانەی کە لە سوریا بون، حکومەتەکانی ئێران و سوریا و هەمو ئەو هێزانەی لە فەلەکی ئەو گروپ و کۆمەڵانەدا ئەجوڵانەوە.

ئەمە لە لایەک لە لایەکی ترەوە، هێزی پێشمەرگەی یەکێتی، جەماوەری ناوچەکانی سلێمانی، هەولێر و کەرکوک ئەم گفتوگیانەیان زۆر پێ باشبو.

"یەکێتی پێش ئەوەی دەستبکات بە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عێراق پەیوەندی لەگەڵ زۆربەی هێز و حیزبە کوردستانییەکانی عێراق خراپ بو، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران لەوپەڕی خاڕپیدا بو، لەبەرئەوە ئاشتبونەوەی یەکێتی لەگەڵ هێز و حیزبە کوردستانییەکان کارێکی پێویست و زەحمەت بو، بە هەمان شێوە چاککردنی پەیوەندیش لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران دیسان کارێکی زۆر قورس بو، یەکێتی پێویستی بە چەک و تەقەمەنی بو، هەروەها دەبو ڕێگایەکیشی هەبێ بۆ هاتوچۆ و پەیوەندیکردن بە دەرەوە، بۆ گەیشتن بە هەریەک لەو ئامانجانە، ئێران تاکە دەروازە و ئومێدی یەکێتی بو".[٢٧٤]

لەو قۆناغەدا، بۆ یەکێتی ئاسان نەبو، دەرگای شەڕ لە هەمو بەرەکان لەسەرخۆی بە کراوەیی بخاتە سەرپشت و بەرگەی شەڕی ناوخۆ و دەرەوە

---

[٢٧٣]. Modern History of the Kurds, I.B. Tauris, McDowall David, A London, ٢٠٠٤

شۆڕش حاجی- لە کتێبی ناسیۆنالیزمی کوردیی پەرچەکردار..رووداوەکانی (١٩٦٣-٢٠٠٣)، ٢٠١٨، ل ٢٥٠.

[٢٧٤] هەمان سەرچاوە، ل ٢٥٥.

بگرێت: "ئێران هۆکارێکی سەرەکی بوو لە پاڵپێوەنانی یەکێتی بۆ دانوستاندن لەگەڵ حکـــومەتی عێراقـــدا، چـــونکە لەو قۆنـــاغەدا یەکێتـــی بە تەواوی پەیوەنـدیەکانی لەگەڵ ئێرانـدا تێکچـوو بـوو، بە تـایبەتی دوای نـاردنی هێـزی پشتیوان لە لایەن یەکێتیەوە بۆ هاوکاری (حدکا) و شەڕی لە دژی ئێران بـون بە دوژمنـــی یەکتـــر، یەکێتـــیش هەر پێشـــڕەوییەکی ئێرانـــی بە مەترســـی لەســـەرخۆی دادەنـا، هاوکـات پێشـڕەوی هێزەکـانی ئێـران بە واتـای هـاتنی هێزەکانی (جود) بوو بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی"[٢٧٥].

پرۆسەی گفتوگۆ زۆری خایاند و چەندجارێک نوێنەرانی یەکێتی چون بۆ بەغدا و نوێنەرانی حکومەتیش هـاتن بۆ کوردستـان، ئەم هـاتن و چونە هیچ ئەنجامێکی ئیجابی لێنەکەوتەوە و لە کۆتاییدا و لە ١٩٨٥/١/١٥ یەکێتی کۆتـایی بە گفتوگۆ هێنا لەگەڵ رژێم.

پـێش گفتوگـۆی حکـومەت لەگەڵ یەکێتیـدا، حکـومەت لەگەڵ حســک و پارتیش لە ١٩٧٩دا هەوڵی خۆی دابوو، بەڵام ئەوانەش بێ ئەنجام بون "پێش هێرشی ئێران بۆسەر حاجی ئۆمەران بە هەمـان شـێوەی یەکێتی، حکومەتی عێراق لەگەڵ پارتیشدا دەستی بە گفتوگۆ کردبوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوان لە ئێران نیشتەجێ بـون، لەسـەرەتادا ئەو کارەیـان بە نهێنـی هێشـتەوە لەبەر ئێران، لە کۆبونەوەی ناوزەنگی نێوان یەکێتی و نـوێنەری حکومەتی عێراق. ئەبو ئەحمەد (عقید رکن خەلیل محەمەد شاکر) جێگری سەرۆکی ئەو کاتەی دەزگای هەواڵگری (بـارزان تکریتـی)، بە ڕاشـکاوی دانـی بەو گفتوگـۆیەدا نـا لەگەڵ پارتیـدا. بەشـداریکردنی پـارتی لە شـەڕی حـاجی ئۆمەرانـدا لەسـەر داوای ئێران بوو، ئەوە لە کاتێکدا بوو بە وتەی عەلی سنجاری دانوستاندنی نێـوان حکـومەتی عێـراق و پـارتی گەیشـتبوە قۆنـاغێکی پێشـکەوتوو. بـۆیە

[٢٧٥] فاروق محەمەد محەمەدئەمین، سیاسەتی ئێران.. ل٢٥١.

سەدام حسێن ڕقی شۆڤێنی خۆی بەسەر کورد و بارزانیەکاندا ڕشت.[276]
(Fritz Sitte, ich war bei den Kurden. S. ١٢٦)
لەسەرەتای گفتوگووە تا کۆتایی، شەڕێکی دیاری گەورە لە نێوان یەکێتی و هێزەکانی نێو بەرەی جوددا روینەدا

## کۆتایی گفتوگۆ و بەردەوامی بارودۆخی جاران

لەسەرەتای ١٩٨٣ دا، چەند هەوڵێک درا، بۆ ئاشتبونەوەی هێزە کوردییەکان، یەکێکیان لە ٥ شوبات لە ناوزەنگ لە نێوان یەکێتی و حشع و لە ٦ شوبات لە تەرابلوسی پایەتەختی لیبیا لە نێوان ١٩ هێزی عێراقی موعاریزدا، لەوانە ئەندامانی جود و جوقد.

ئەو ڕێکەوتنانە، ئەنجامێکی باشیان لێنەکەوتەوە، لەبەرئەوەی متمانە و ئاو و هەوای دۆستایەتی لە نێوان یەکێتی و ئەندامانی جودا نەمابو، هەر لەبەرئەوە، هەمو ڕێکەوتنامەکان بێ ئەنجامبون.

هەفتەیەک بەسەر ڕێکەوتنی تەرابلوسدا تێنەپەڕیبو، لە ١١ شوبات لە دەشتی هەولێر، ناکۆکی و گرژی و پێکدادان لە نێوان جود و یەکێتیدا دەستیپێکردەوە.

ئەم گرژیانە، لە پڕ دروست نەبو، بەڵکو سیاسەتی هەمو هێزەکان بو، کە بەرامبەرەکەیان بشکێنن و بەسەریدا زاڵ بن، هەر لەبارەی نزیکبونەوە و گفتوگۆی بەشێ لە هێزەکانی یەکێتی و پارتی لە ناوچەی ناوزەنگ، مەسعود بارزانی ( وەک لەوەوپێش باسمان کرد) لە نامەیەکدا لە ٢٨ شوباتی ١٩٨٣ دا بۆ سەرکردەی هێزەکەی پارتی (حەسۆ میرخان ژاژۆکی) دەنوسێ "بە هیچ شێوەیەک هەق نەبو ئێوە لەگەڵ ئەوان (مەبەست یەکێتیە) دانیشن..ئێمە رازی

[276] فاروق محەمەد محەمەدئەمین، سیاسەتی، ل ٢٣٧.

نەبوین و بروسکەشمان بۆ کردی کە نابێ لەگەڵ ئەوان دانیشن".[٢٧٧]

ئەمە نیشـانی ئەدا، کە ناکۆکییەکـانی نێـوان جـود بە گشـتی و پـارتی بە تایبەتی لەگەڵ یەکێتیدا چەند قوڵ بوە و هەمو هەوڵیک بۆ ئاشـتی نێوانیـان، تەنها تاکتیک بوە و هێڵە سیاسییە سـەرەکییەکە بێهێزکـردن و دەرپەڕانـدنی ئەوەی تر بوە لە ناوچەکەدا و باڵادەستی خۆی ئامانجی سەرەکی بوە.

نـاوچەی سلێمانی و هەولێر، جێگای شـەڕ و نـاکۆکی بو، جود ئەیویست یەکێتی لە نـاوچەکە زۆر بێهێز بکات و یەکێتیش ئەیویست خۆی باڵادەست بێـت، لەبەرئەوە مەحـاڵ بـو ئەم دو هێـزە دژبەیەکە بتـوانن بە ئاشـتی لە ناوچەیەکدا پێکەوە هەڵبکەن، رۆژانە وردە شـەڕ روی ئەدا و پێشـمەرگە لە هەمولاکـان دەبـونە قوربـانی، زۆرجـار بـێ ئەوەی لایەک ئاگـاداری هـیچ روداوێـک بێت، هێرش دەکرایە سـەری و لـێ دەکـوژرا، وای لێهـاتبو، جـود یەکێتی بە دوژمن ئەدایە قەڵەم و بە پێچەوانەشـەوە هەروەهـا، ئیتر مەبەست نەبو، چی روئەدا، بەڵکو مەبەست ئەوە بو زیاترین زیان لە بەرەی بەرامبەرت بگەیەنیت و بیشکێنیت.

لە کاتێکدا کە یەکێتی لە گفتوگۆدا بو لەگەڵ رژێم، ئێران بە ئاشکرا کەوتە هاوکـاری و یامەتیـدانی بەرەی جـود، "ئێـران بە هەمـو شـێوەیەک کەوتە پاڵپشتیکردنی بەرەی جود و لە شەڕەکانی ناوچەی حاجی ئۆمەران، قەڵادزێ، پێنجـوین، چۆمـان، رەزگە و قەڵاتوکـان، هاوکـاری و یـارمەتی بەرەی جـودی دەکـرد و پێشـمەرگەکانی پـارتی و حسـکیش چاوسـاغی هێزەکـانی ئێرانیـان دەکرد. لە هەندێ بروسکە و نامەکانی لایەنەکانی بەرەی جودیش بۆ یەکتری بە ئاشکرا هاوکاری ئێران بۆ بەرەی جود لە دژی یەکێتی دەردەکەوێت".[٢٧٨]

بەرەی (جـود)یش لە دژایەتـی ئەو رێکەوتنـامەیە درێغـی نەکـرد و لە ٤

---

[٢٧٧] نەوشیراون مستەفا، پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، ل ٢٨٠.

[٢٧٨] صـلاح خرسـان، ل ٤١١ و پشـکۆ نەجمەدین: ل٤٠، د. سـەلام عەبدولکەریم، شـەڕی نـاوخۆ، ل ١١.

کانونی دوهەمی ١٩٨٤ دا بەیانێکیان لە ژێر ناوی (لە پێناوی لە گۆڕنانی ڕێکەوتننامەی سەدام- تاڵەبانی) دەرکرد.

هەروەها هەردو دەوڵەت (عێراق و ئێران) تا بۆیان کرابێت، ئاگری ناکۆکی و شەڕی ناوخۆی کوردیان خۆش کردوە و هێزە کوردەکانیش گوێڕایەڵی باشی ئەو دەوڵەتانە بون و چالاکانە شەڕی دژ بە براکانی خۆیانیان کردوە و دەوڵەتەکانیش سەیریانکردوە چۆن ئەوانە لەناو خۆیاندا شەڕی خۆکوژی دەکەن.

"هێزەکانی حکومەتی بەعس هەندێجار و لە هەندێ ناوچە بە ئەنقەست دەکشانەوە، بۆ ئەوەی شەڕی ناوخۆ لەسەر دەسەڵات و ناوچەی فەرمانڕەوایی لە نێوان یەکێتی و جوددا زیاتر پەرە پسێنێت و خۆیانی پێ لاواز بکەن"[٢٧٩].

شەڕی سەخت لە ١ ئەیلولی ١٩٨٣ دەستیپێکرد، کاتێ هێزەکانی جود لە ناوچەکانی چیای بیبە، جادەی خانەقا، گوندەکانی ئیندزی، لێوژێ، سلێ، بۆڵی، کونەکۆتر شکان، لە ماوەیەکی کەمدا یەکێتی لە ٨ لاوە هێرشی کردە سەریان و لە هەمو ناوچەکە دەریکردن و بەرەو قولایی خاکی ئێران کشانەوە، لەو شەڕانەدا، ٢ فەرماندەی ناسراوی پارتی بە ناوەکانی حەسۆ میرخان ژاژۆکی و عەبدولڕەحیم جەسیم کە هاوڕێی خەباتی بارزانی بون لە مهاباد و یەکێتی سۆڤێت، دو فەرماندەی یەکێتیش کوژران، ئەوانەش ئەحمەد مەولود، فەرماندەی تیپی کارۆخ و نازمی حەمەی سلێمان، فەرماندەی تیپی سورداش.

ئەمە نیشانی ئەدا، کە باشترین فەرماندەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە شەڕەکانی ناوخۆدا گیانیان لەدەست داوە، بە مەرجێک هیچ هێزێکی کوردستانی سودی لەو شەڕە نەگریسانە وەرنەگرتوە، ئەوەی سودی لێوەرگرتوە، تەنها و تەنها دوژمنانی گەلی کورد بون.

نەوشیروان مستەفا، کە خۆی سەرکردایەتی شەڕە گەورەکانی دژ بە جودی کردوە، باسی لە تێڕوانینی خۆی بۆ شەڕی کوردی بەم شێوەیە

[٢٧٩] د. سەلام عەبدولکەریم، ل ١٢.

کردوە: "یەکێ لەو دیمەنانەی هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە، لە کاتی سەرکەوتندا، پێشمەرگەیەکی تیپی سەفین ناوی فاروق بو، بە سەختی بریندار بو، لە بن دارەکەدا دانیشت بو، خوێن لە برینەکەی سنگی ئەچۆڕا، دوای مردنی کە گیرفانی گەڕابون، ٢٥ فلس لە گیرفانیدا بو، کە سەرکەوتم بۆ شەڕگە و لاشەی کوژراوێکی پارتیان نیشان دام، ٢٠٠ تمەن لە گیرفانیدا بو، لە دڵی خۆمدا بە زەییم بە خۆم و بە گیانبازەکانی گەلەکەمدا هاتەوە، لەم شاخە بەرزە لەسەر چی شەڕ دەکەن؟"[٢٨٠].

سەرکردەیەکی حشع، قادر رەشید، ئەویش بەم جۆرە باسی شەڕەکان دەکات: "ئەبوایە ئەو راستیە رەچاوبکرایە کە شەڕی نێوان یەکێتی و بەرەی جود (حشع، پارتی، سوشیالیست و پاسۆک)، شەڕێکی براکوژی ناوخۆیە و ئەنجامەکەشی ماڵوێرانییە بۆ جولانەوەی نیشتیمانی و ئازادیخوازی گەلی کورد لە بەرژەوەندی رژێمی بەعسی داگیرکەر بو"[٢٨١].

شەڕی قرناقا و پشت ئاشان، کۆتایی بە شەڕی جود و یەکێتی نەهێنا، هێزەکانی جود بە گشتی و پارتی بە تایبەتی ئەیانویست تۆڵە بکەنەوە و دەسکەوتێکی سەربازی و سیاسی بۆ خۆیان تۆمار بکەن و بە ئاسانی ناوچەکە بۆ یەکێتی بەجێ نەهێڵن.

هەمویان هێزێکی گەورەیان کۆکردوە بۆ لێدانی یەکێتی و یەکەم شەڕ لە ١٣ی ئابدا رویدا لە کەڵەکی باڵەییان، بەڵام ئەنجامێکی یەکلاکراوەی نەبو.

---

[٢٨٠] پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن، ل ٣١٩.

[٢٨١] قادر رەشید، ئەبو شوان، پشتئاشان.. ل ٧٨.

# هەنگاو بەرەو کۆتایی شەڕی ناوخۆ

بە کۆتـایی گفتوگـۆی نێـوان یەکێتـی و ڕژێـم و دەرکردنـی بەیانێـک لە ١٩٨٥/١/١٥ دا، زەمینە ئاشـتەوایی لە نێوان یەکێتی و بەرەی جودا لە جاران باشـتربو. یەکێتی نەیئەتوانی دژایەتی بەعس، ئێران، سـوریا، بەرەی جود و هێـزە ئۆپۆزسـیۆنەکانی عێراقـی لە سـوریا و زۆر لایەنـی تـر بکـات، کە لەو فەلەکەدا ئەجولانەوە، ناچاربو هەوڵی ئاشتەوایی ناوخۆیی بدات لەگەڵ بەرەی جـود و لەگەڵ ولاتـانی دەرودراوسـێی وەک ئێـران و سـوریا و هێـزە ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراقی لە سوریا.

یەکەم هەنگـاو کە دەسـتپێکرد، ئەوەبـو، کە نـوێنەرانی یەکێتـی لە ئـابی ١٩٨٤دا چـون بـۆ بارەگـای حشـع لە بـارزان و دوای ئەوەش چەنـد کۆبونەوەیەکی تری بەداودا هات.

هەروەها هەوڵی ئاشتبونەوەش لەگەڵ حسکدا دەستپێکرد، بەو پێیەی کە حەمەی حاجی مەحمود، لێپرسراوی حسک بو لە ناوچەی سلێمانی و دۆستایەتی دێرینی لەگەڵ شەوکەتی حاجی موشیر هەبو کە لێپرسـراوێکی سیاسـی و سـەربازی یەکێتی بو. شـەوکەت لە ١٩٨٥/٢/٧ دا نـامەیەک بۆ حەمەی حـاجی مەحمـود دەنوسـێت و ئەویش بەم شـێوەیە باسـی دەکـات: "لە نامەکەیـدا بـۆ مـن، داوایکردبـو کە دو ڕێگـا هەیە یەکێتـی هەردو پێشـنیازەکە دەکات بۆ مـن، یەکەمیـان ئەوەیە کە مـن لەگەڵ یەکێتی ئـیش بـکەم و بـڕۆمەوە نـاو یەکێتـی، دوەمیشـیان ئەوەیە ڕێکەوتـن و ڕاگرتنـی

شەڕ لەگەڵ حزبی سۆسیالیست لە لقی سلێمانی بکەن"[282]، لە کۆتایدا، هەردو لا (حسک و یەکێتی) لە یەکەم رۆژی نەورۆزی ١٩٨٥ دا، لە گوندی ناوگردانی نزیک سەید سادق گەیشتنە رێکەوتنامەیەکی ١٠ خاڵی کە بریتی بو لە:

١. ئاگربر لە نێوان هەردولا لە رۆژی ١٩٨٥/٣/٢١ وە.

٢. ئازادی سەربازی و سیاسی لە ناوچەی شارەزور بۆ هەردولا بێت. بەڵام لە ناوچەکانی شارباژێر و دۆڵی جافایەتی، بە ئاگاداری هەردولا و بە مۆڵەتی فەرمی بێت بۆ گەرمیان و قەرەداغ.

٣. چەک رفاندن لە رۆژی ١٩٨٥/٣/٢١ بۆ هەردولا قەدەغە بکرێت.

٤. ئیجرائاتی چەکەکانی پێشوو، کە لەنێو یەکێتی نیشتمانییەوە چوونەتە ناو حکومەت، دەکرێت.

٥. دانانی لیژنەیەک بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی هەردولا لەگەڵ رەچاوکردنی هەندێ هەڵاوێردن.

٦. ئیجرائات لەگەڵ دۆستان و رێکخستن و کەس و کاری شەهیدی هەردولا نەکرێت، بە مەرجێک بەڵگەی یەکێک لەو لایەنەی پێبێت.

٧. بکوژی پێشمەرگە و جەماوەر، بە پێشمەرگە وەرنەگیرێت و حسابی بکوژی بۆبکرێت.

٨. گەڕان لەگەڵ لایەنەکانی جود لەو شوێنانەی کە بونی یەکێتی لێیە.

٩. هەرکەسێک لەهەرلایەک لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرا، لەلاکەی دیکە وەرنەگیرێت.

١٠. کێشەکانی هەردولا بەلیژنەیەک چارەسەر بکرێت.

١١. ئەنجومەنی ئاواییەکانی شارەزوور لەلایەن لیژنەیەکەوە پێکبهێنرێت و دەسەڵاتی تەواوەتی بدرێتێ[283].

---

[282] محەمەدی حاجی مەحمود، رۆژژمێر ، بەرگی ٢، ل ٢٣٧.

[283] د. سەلام عەبدولکەریم ئاشتبوونەوەی گشتیی، ل ٣.

ئەم ڕێکەوتـنە، بە دەستپێشـخەری مـحەمەدی حـاجی مەحمـود و شـێخ محەمەدی شاکەلی بو، هەرچەندە سەرکردایەتی حسک زۆر ڕازی نەبون، بە تـایبەتی سـەرکردایەتی جـود زەختیـان لە حسـک کـرد، کە هەڵویستیان ببێت لەسەر ئەو ڕێکەوتنامەیە و سزای حەمەی حاجی مەحمود و شێخ محەمەدی شاکەلی بدەن، چونکە تاکڕەوانە هەڵساون بەم کارە.

شێخ محەمەد شاکەلی لەمبارەیەوە نوسیویەتی: "دوای ئەوەی ڕێکەوتننامە و ئاگربڕە نـاوچەییەکەی ئێمە و یەکێتی بەباشـی شـکایەوە، سـەرکردایەتیی یەکێتی داوای وتویژی ڕاستەوخۆیان کرد و ئێمەش لە مەکتەبی سیاسی کۆبونەوەمان کرد و زۆر پێشنیاز هەبوو، دوایی لەسەر پێشنیازی من لەگەڵ عەبدولخالق هەورامی و دوو پێشمەرگە سەردانی سەرکردایەتی یەکێتیمان کرد و لەلایەن جەلال تاڵەبانی و ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتییەوە پێشوازی گەرم کراین" هاوکات ناوەڕۆکی بەشێکی زۆری ئەو نامانەش، کە لەوماوەیەدا لەنێوان یەکتردا ئاڵوگۆڕ دەکران، دەربڕی پەرۆشی بوو بۆ ئاشـتبونەوە لەگەڵ یەکتر و کۆتایی هێنان بەشەڕ و ناکۆکی ڕابردو، ئاکامی ئەم سـەردان و چاوپێکەوتنـانە ئەوەی لێکەوتەوە، کە وەفدێکی سـەرکردایەتی حسـک، کە پێکهـاتبون لە: (قـادر جەباری، شێخ محەمەد شـاکەلی، خـاڵە حـاجی لە ڕۆژانـی ١٨-١٩٨٦/٤/٢٤ چـون بۆ یاخسـەمەر و لەگەڵ سـەرکردایەتی یەکێتیدا کۆبـونەوە بەدیـاریکراویش لە ڕۆژی ١٩٨٦/٤/٢١ ڕێکەوتنێکی گرنگیان پێکەوە ئیمزا کرد"[284].

ئەو خاڵانەی کە لەسەری ڕێکەوتبون بریتی بون لە:

١. ئاڵوگۆڕی بیروڕا لەنێوان هەردولا لەسـەر هەمـو ئەو مەسـەلانەی لە کوردستان و عێراق و ناوچەکە دێنە پێشەوە.

٢. لە ڕۆژی ئیمزاکردنـی ئەم ڕێکەوتننـامە بەدواوە هەردولا بەڵێن بەیەکتری دەدەن، لە هیـچ میحـوەرێکی سیاسـی دژی ئەویتر بەشـدارنەبن و لەگەڵ هیچ لایەنێکی سیاسی دژ بەیەکتر پێکنەیەن.

---

[284] هەمان سەرچاوە. ل ٤.

٣. هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی خاڵی هاوبەش و قوڵکردنەوەیان و کارکردن لەسەریان.

٤. هاوکاریکردنی یەکتری بۆئەوەی لایەنەکانی تر مافی چارەی خۆنوسین بۆ گەلی کورد لە عێراقدا بسەلمێنن.

٥. هەوڵدان بۆ یەکخستنی ڕێکخراوە دیموکراتی و پیشەییەکانی کوردستان لەناوەوە و دەرەوەی وڵات.

٦. گۆڕینەوەی زانیاریی هەمەلایەنە لەنێوان هەردولادا.

٧. ئەم هاوکارییە هەنگاوێکی کرداری بێت بۆ ئاشتبونەوەیەکی گشتی لایەنە کوردستانی و عێراقییەکان، بۆبنبڕکردن و نەهێشتنی شەڕی ناوخۆ بەرەو پێکهێنانی بەرەی کوردستانی و بەرەی فراوانی عێراقی کە مافی چارەی خۆنوسین بۆ گەلی کورد بسەلمێنن.

بێ -لایەنی ڕاگەیاندن:

١. یارمەتیدانی یەکتری بۆ گەشەپێدانی کاری ڕاگەیاندن لەسەر مەسەلە هاوبەشەکان.

٢. تەرکیزکردن لەسەر پێویستی هاوکاری و یەکخستنی خەباتی شۆڕشگێڕانە دژی حکومەت و هێنانەدی مافەکانی گەلەکەمان لەسەر بناغەی مافی چارەی خۆنوسینی گەلی کورد

٣. بڵاوکردنەوەی هەواڵی ڕۆژ و چالاکی یەکتر.

٤. هاوکاری هونەری بۆ گەشەپێدانی ڕۆژنامە و ڕادیۆی هەردولا.

جیم -لایەنی سەربازی:

١. هاتوچۆکردن بۆ ناوچەکان بە ئاگاداری یەکتر بێت، بە گوێرەی (ثوابت وأسس) و پێویستییەکانی، کە لە کۆبونەوە خولییەکاندا بڕیاری لەسەر دەدرێت.

٢. نابێت هەردولا پێشمەرگەی محاسەبە کراوی ڕاکردوی یەکتری وەربگرن یاخود یارمەتی بدەن.

٣. پێشمەرگە بۆی هەبێت لەئەنجامی قەناعەتی خۆی لە یەکێک لەم دو لایەنەوە بۆلای یەکتری بگوازێتەوە، بەبێ چەک، مەگەر چەکەکە بە بەڵگە هی خۆی بێت.

٤. هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی چالاکیی سەربازیی هاوبەش دژی هێزەکانی حکومەت بەرێکەوتن لەنێوان مەڵبەندی (ی.ن.ک) و لقی حسکدا.

٥. هەوڵدان بۆخۆشکردنی زەمینەی یەکخستنی هێزی پێشمەرگە.

"دوای ئەم رێکەوتنە جارێکی تر شاندێکی باڵای حسک، کە پێکهاتبون لە (رەسوڵ مامەند، عەدنان موفتی، سەیدکاکە، خاڵەحاجی، محەمەدی حاجی مەحمود)، لە رۆژی ١١-١٢/٧/١٩٨٦ سەردانی مەکتەبی سیاسی یەکێتی دەکەن و لەلایەن (جەلال تاڵەبانی، نەوشیروان مستەفا، د. فوئاد مەعسوم، فەرەیدون عەبدولقادر)ەوە پێشوازی دەکرێن و پاش چەند رۆژێک وتووێژ، راگەیەنراوێک بە زمانی عەرەبی دەردەکەن و تێیدا، باس لە پێویستی بەدەنگەوە هاتنی لایەنە سیاسییە کوردییەکان دەکەن بۆ ئاشتبونەوە و کۆتایی هێنان بە کوشتاری ناوخۆ لەپێناوی دانانی بەردی بناغەی پێکهێنانی بەرەی کوردستانی دژی حکومەتی فاشی بەغدا، بە ئامانجی وەدەستهێنانی مافە رەواکانی کورد و مافی چارەی خۆنوسین.

هەردولا لەسەر چەند خاڵ و تەوەرێک رێککەوتن لەوانە:

ئەلف- ئاشتبونەوەی هەمەلایەنەی هەردولا و پێکهێنانی بەرەیەکی بەرهەڵستکار بۆ هێزە کوردییەکان.

بێ- رێکخستنی کاروباری دارایی و گومرگ و برینەوەی رێژەیەک لە پارەی گومرگی مانگانە بۆ حسک.

جیم- دابینکردنی بڕی ٣١ هەزار دینار مانگانە بۆحسک لەلایەن یەکێتییەوە هەر لەم سەردانەی حسکدا داوای ئاشتبونەوەی یەکێتی لەگەڵ سەرجەم لایەنەکانی تری بەرەی جود بەگشتی و پارتی بەتایبەت دەکرێت و هەردولا (یەکێتی و حسک) رێکدەکەون، لەسەرئەوەی حسک هەوڵی ناوبژیوانی بۆ ئاشتبونەوەی نێوان یەکێتی و پارتی بدات"[٢٨٥].

دەربارەی ئەم رێکەوتنە، حەمەی حاجی مەحمود باسی دەکات: "من رەئم

---

[٢٨٥] د. سەلام عەبدولکەریم، ئاشتبونەوەی گشتی، ل ٦.

وابو، ئەگەر یەکێتی بگەڕێتەوە و لەگەڵ هێزەکانی جود ڕێکبکەون، خزمەت بە کورد و میلەتەکەمان ئەکات، وە منیش باش تێگەیشتبوم ئەگەر یەکێتی نەبێت، پارتی لە هەمو حیزبەکان ئەدات و نەفسیەتی پارتی لەگەڵ ئێمەدا یان لەگەڵ روداوەکانی سەردەمدا نە دەگونجا..".[286]

ئاشتبونەوەی یەکێتی و حسک، دەرگای ئاشتەوایی لەگەڵ پارتی و حشع و پاسۆکیش کردەوە، لە ١٠/٤/ ١٩٨٦ ڕێکەوتنێک لەگەڵ پاسۆک لە بارەگای یەکێتی لە یاخسەمەر مۆر کرا و دوای ئەوەش لە ئێران لەگەڵ پارتیدا.

لە کاتێکدا، یەکێتی خەریکبو، لەگەڵ هێزەکانی تر ئاشتبێتەوە و ماڵی کوردی ڕێکبخات، کۆمەڵێک لە کادێرانی ریزی پێشەوەی یەکێتی بە سەرۆکایەتی مەلا بەختیار، لە نیسانی ١٩٨٥ ، لە یەکێتی جیابونەوە و ڕێکخستنێکی نهێنی نوێیان بەناوی ( ئاڵای شۆرش- ئاش) دروستر کرد. یەکێتی لە ١٩٨٥/١٠/٢٩ مەلابەختیاری دەستگیرکرد و لە ناوەراستی کانونی یەکەمی ١٩٨٥، پاکانەیەکی (ئیعتراف) چەند لاپەرەیی نوسی. ( برایم جەلال، چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، ل. ٤٤٦. گۆڤاری ململانی، ژ٦- ٢٠١٠/٩/٢٦)

## ئاشبونەوەی یەکێتی لەگەڵ ئێران

هەروەها حسک، رۆڵی بینی لە نزیککردنەوەی بۆچونەکانی ئێران و یەکێتیدا، ئەوەش بوە هەوێنی خێراکردنی پەیوەندی نێوان یەکێتی و پارتی.

" لە ناو لایەنەکانی جودا، تەنها حسک هەڵوێستی لە یەکێتی جیاواز بو، هانی ئێرانی ئەدا لەگەڵ یەکێتی پێک بێ و هانی یەکێتی ئەدا لەگەڵ ئێران دۆستایەتی بکا و یەکێتیان وەک هێزێکی شەرکەری سەرەکی ناو مەیدانی کوردستانی عێراق بە ئێرانییەکان ناساندبو..".[287]

---

[286] رۆژژمێری پێشمەرگەیەک، بەرگی ٢، ل ٢٥٩.

[287] نەوشیروان مستەفا، خولانەوە لە بازنەدا، ل ١٠٥.

لە هاوینی ١٩٨٦ ەوە، هانگاو بە هەنگاو پەیوەندی نێوان ئێران و یەکێتی بەرەو باشبون ئەچو، جۆرێک لە پەیوەندی نارەسمی لەگەڵ ئێرانی دروست بوبو، هەروەها ئێرانیەکانیش ئەهاتنە کوردستان و ئەیانویست لە نزیکەوە ئاگاداری بارودۆخی کوردستان بن و بزانن توانای یەکێتی لە چ ئاستێکدایە.

حەمەی حاجی مەحمود بەم شێوەیە باس مەرجی ئێران دەکات: "من بە مام جەلالم وت، هەمو داواکانی ئێران لێدانی کەرکوکە، ئەگەر ئێوە ئەوە بکەن هەمو کێشەکانتان لەگەڵ ئێران چارەسەر دەبێت و هیچ نامێنێت و پارتیش بانگ دەکەن پێیان خۆش بێت یان نا لەگەڵتان ئاشدەکەنەوە"[٢٨٨].

بەرژەوەندی ئێران و یەکێتی، هۆ بون کە وایکرد پەیوەندیەکانیان بە ماوەیەکی کورت بچێتەوە شوێنی ئاسایی جاران، ئێران مەبەستی بوو، کە هەمو ئەو هێزە کوردی و عەرەبیانەی کە دژایەتی سەدام دەکەن لەژێر چەتری خۆیدا کۆیان بکاتەوە: "سیاسەتی ئێران بریتی بوو لە کۆنترۆڵکردنی بەرهەڵستکارانی عێراق تاکو نەتوانن ببنە هەڕەشە بۆ سەر ئاییندەی ئەو پرۆژە ستراتیجیانەی کە بۆ عێراقی پاش سەدام حسێن دایان نابوو..پاش تێپەربونی دو ساڵ بەسەر شۆڕشی ئیسلامی، ئێران نەیتوانیبوو وەک پێویست کار بکاتە سەر شۆڕشگێرانی کوردستانی عێراق کە لە ئێران و نزیک لە سنوورەکانی دەژیان، و نەیتوانیبوو تەنانەت یەک خاڵیش لە پرۆگرامی حیزبە کوردستانیەکان بگۆڕێت، کە باس لە ئیسلامی سیاسی بکەن، بۆیە ئێران ئەم حیزبانەی بە هەڤاڵی ئیسترتیجی و گوێرایەڵی خۆی نەدەزانی و ناچار بوو پاش دەستپێکردنی جەنگ رێکخراوێکی تازە دابمەزرێنێ بە ناوی (لەشکری ئیسلامی کورد)"[٢٨٩].

ئێران هەمیشە هەوڵی ئەدا، کە جێپێی خۆی لە کوردستاندا قایم بکات و هێزێکی سەربەخۆی دروست بکات، دوای ئەوەی لەشکری ئیسلامی

---

[٢٨٨] رۆژژمێری پێشمەرگەیەک، بەرگی ٢، ل ٣٢٤.

[٢٨٩] بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد، د. عەلی تەتەر نێروەی، ل٢٢٤.

نوشستی هێنا، کەوتە ئەوەی هێزێکی تری ئیسلامی دروست بکات: "پاش لاوازبونی لەشکری ئیسلامی بێ کاریگەری ئەوان لەسەر گەلی کورد، ئێران بۆئەوەی کاریگەرتر سیاسەتی خۆی لەناو کورددا چالاک بکات، بە تایبەتی دژی هەردو پارتی سەرەکی کورد پارتی و یەکێتی، چونکە لە رووی ئامانج و ئایدۆلۆجیەوە لەگەڵ ئێراندا نەدەگونجان، ئەم جارە هەوڵیاندا بە ڕێگای دامەزراندنی حزبوڵڵای کوردی لە ٣ی تشرینی دوهەمی ١٩٨٣ بەسەرۆکایەتی شێخ محەمەد خالید بارزانی، پارتی لاواز بکات"[٢٩٠].

سەرەتای باشبونی پەیوەندی هەردولا، وەک کاکە حەمە باسی دەکات بە کارێکی سەربازیانەی هاوبەش دەستپێکرد، ئەویش لێدانی بیرەنەوتییەکان و هەندێ شوێنی سەربازی حکومی بو لە کەرکوک لە ١٠/١٠/ ١٩٨٦دا، هەردولا هێرشێکی گەورەیان کردە سەر بیرە نەوتییەکانی کەرکوک و زیانێکی گەورەیان لێدان، ئێران ناوی ئەم کارە سەربازیە هاوبەشەی نا (فەتحی ١)، وەک ئەوەی بەتەنها خۆی ئەنجامی دابێت!.

" یەکێتی لە یەکەمین چالاکی لەشکری هاوبەش لەگەڵ ئێران، بڕیاریاندا کە هێرش بکەنە سەر دامەزراوە نەوتیەکانی کەرکوک.. پاش گواستنەوەی هاوەنی ١٢٠ملم و کاتیوشا و هەندێک چەکی قورس کە بە ٣٢ تراکتۆر و ٤ لۆری گوێزرایەوە، بڕیاریاندا لە زەمبور، جەبەل بۆر و بابە گوڕگوڕ بدەن... "[٢٩١].

دوای ئەم چالاکیە هاوبەشە، ئیران لە یەکێتی و هێزەکەی دڵنیا بوەوە، بۆیە لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٦ دا، مام جەلال بە رەسمی بانگهێشت کرا بۆ تاران و لە بالاترین پلەی حکومی و سەربازی پێشەوازی لێکرا.

لەم سەردانەدا کومەڵێک ڕێکەوتنامە لە بواری عەسکەری و سیاسی و ڕاگەیاندندا مۆرکرا و پەیوەندیەکە چوە قۆناغێکی بەرزترەوە.

---

[٢٩٠] بزاڤی ڕزگاریخوازی د. عەلی تەتەر نێروەی، ل ٢٢٤.

[٢٩١] هەمان سەرچاوە، ل ٤٠٥.

## ئێران وەک ناوبژیکەر لە نێوان یەکێتی و پارتیدا

ئێران مەبەستی بو، کە پەیوەندی نێوان هێزە کوردستانییەکانی عێراق باش بێت، بۆ ئەم ئامانجەش هەوڵیدا کە پەیوەندی نێوان یەکێتی و پارتی ئاسایی بکاتەوە و بە کاریگەری و ئامادەبونی نوێنەرانی حکومەتی ئێران توانرا لە ٧ تشرینی دوەمی ١٩٨٦ دا، کۆبونەوەیەک لە نێوان مام جەلال و ئیدریس بارزانی دا ئەنجام بدرێت و لە ١٩٨٦/١١/٨ پرۆژەیەکی هاوبەشیان ئیمزا کرد.

بۆ پتەوکردنی پەیوەندی نێوان پارتی و یەکێتی، وەفدێکی پارتی سەردانی یەکێتی کرد و ماوەیەکی باش لای ئەوان مانەوە، ئەمە وەک هەنگاوێک وابو، بۆ دروستکردنی متمانە لەنێوانیاندا: "شاندێکی پارتی کە پێکهاتبو لە: فازیل میرانی، ئازاد قەرەداغی، فایق توفیق عزیز (فایەقە ڕەش)، عەبدولا محەمەد ئەمین، فرنسۆ حریری لەسەرەتای کانونی یەکەمی ١٩٨٦ بۆ ماوەی ١٢ ڕۆژ سەردانی ناوچەی سەرگەلۆیان کرد. ئەم سەردانە بۆ دوپاتکردنەوەی نیازپاکی لەسەر راوەستاندنی شەڕ و پێگیری بە بنەماکانی ڕێکەوتنی نێوان هەردولا و دانانی بارەگاکانی هەردو لقی ٣ و ٤ لە ناوچەی ئازادکراوەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی بوو"[٢٩٢].

" ئێران بەرژەوەندی و مەرجی خۆی هەبوو لە دروستکردنی پەیوەندی و هاوکاری لایەنە کوردییەکاندا، بەبێ جیاوازی بیروبۆچون و ئایدۆلۆژیا، یارمەتی هەمو لایەکی دەدا، بۆ سود وەرگرتن لە ئەزمون و توانای جەنگی و شارەزاییان لە ناوچەکانی کوردستاندا و بە پێی ئاستی جێبەجێکردنی مەرجەکان و باوەڕی

---

[٢٩٢] بزاڤی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد، د. عەلی تەتەر، ل ٤١٨.

ئەو هێـزانە بە دۆسـتـایەتی لەگەڵ ئێـران و ئەنجامـدانی کـار و چـالاکی هاوبەش دژی عێراق.[٢٩٣]

فەرەیدون عەبدولقادر، کە یەکێک بو لە ئەندامانی وەفدی یەکێتی لە ئێران، بەم شـێوەیە باسـی ئەو ڕێکەوتـنە دەکـات: " لە ڕۆژی ١٩٨٧/١١/١٧ دا، لە بارەگایەکی سوپای پاسداران کۆبونەوەیەکی تر، بە ئامادەبونی کاربەدەستانی بـالای پاسـداران لە نێـوان ئـێمە و (پـارتی – مەرحـوم ئیـدریس بـارزانی)دا ڕێکخرا و هەردو لایـان ئاشتکردینەوە و بە ڕێکەوتن گەیشتین، تەنها مـایەوە نوسـینی ڕێکەوتـنەکە! ئیتـر لە ڕۆژی دوایـیدا لە ١٩٨٧/١١/١٨ لە دۆخێکـی دۆستانەی خۆشدا بە هاوکاری کاک (فازیل میرانی)، من دەقی ڕێکەوتننامەکەم ئامادەکرد و پاش خوێندنەوەی، هەر دو زاتەکە ئیمزایان کرد".[٢٩٤]

---

[٢٩٣] سیاسەتی ئێران، فاروق محەمەد محەمەدئەمین، ل ٣٢٤.

[٢٩٤] هەڵۆ سورەکانی قەندیل، فەریدون عەبدولقادر، ل ٥٢٧.

# ڕێکەتننامەی نێوان پارتی و یەکێتی

لە ڕۆژی ۱۹۸٦/۱۱/۷ دا وەفدی پارتی دیموکراتی کوردستان – عێراق بەسەرۆکایەتی هەڤاڵ ئیدریس بارزانی و وەفدی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە سەرۆکایەتی هەڤاڵ مام جەلال کۆبونەوەی هاوبەشیان کرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نێوانیان و دارشتنی بنچینە و ڕێ و شوێنی پەیوەندی دۆستانە و هاوکاری نێوانیان رو لە کۆکردنە و یەکخستنی هەمو هێز و توانای گەل و وڵاتەکەمان بۆ روخاندنی رژێمی بەعسی عەفلەقی لە عێراقدا و مسۆگەرکردنی مافەڕەواکانی گەلەکەمان.

میوانداریکردنی کۆماری ئیسلامی ئێران لە هەردو وەفدەکە و پشتیوانیکردنی لە یەکێتی هێزە شورشگێرەکانی گەلەکەمان و خۆشحاڵی و دەوری ئیجابیان لە پێکهاتنی پارتی دیموکراتی کوردستان – عێراق و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان شایەتی سوپاس و ڕێزلێنانە.

لەم کۆبونەوە گرنگەدا وەفدی هەردولا بە گیانی بەرزی هەستکردن بە مەسئولیەت و بە راشکاوی لە مەسەلە گرنگەکانی کوردستان و عێراق و ناوچەکە دوان، بەر لە هەمویان پێویستی یەکخستنی هیزە شورشگێرەکانی کوردستانی – عێراق و پێکهینانی بەرەی نیشتیمانی فراوانی عێراق و کۆتاییهێنان بە جەنگی ناڕەوای عێراق دژی کۆماری ئیسلامی ئێرانی و روخاندنی رژێمی فاشی عێراق و ئەرکەکانی ئیمرۆی خەبات و مافی رەوای گەلی کورد.

لە ئەنجامی گفتوگۆی برایانە و دڵسۆزانەدا، پارتی دیموکراتی کوردستان – عێراق و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان پێکهاتن لەسەر:

١. هەوڵی تەواو و بەردەوام بۆ بەگەڕخستنی هەمو توانای هەردولا بەرەو روخاندنی رژێمی بەعسی عەفلەقی عێراق.

٢. دابینکردنی ئازادی چالاکی سیاسی و عەسکەری و رێکخراوەیی هەردولا لە هەمو ناوچەکانی کوردستانی عێراق بۆ گەشەپێدانی خەبات.

٣. وەستانی چالاکی راگەیاندنی هەردولا لە دژی یەکتر و بە چالاکی راستەخۆ بێت یان ناراستەوخۆ.

٤. رێگە گرتن لە شەڕی براکوژی و حەرامکردنی.

هەروەها رێکەوتنێکی هەمەلایەنەی سیاسی و عەسکەری و ئیعلامی دو قۆڵی مۆرکرا و کۆمیتەیەکی بەرز لەسەرکردایەتی هەردولا دیاریکرا بۆ دانانی رێ و شوێنی جێبەجێکردنی رێکەوتنەکە و گەشە پێدانی پەیوەندی نێوانیان.

جەماوەری خەڵکی کوردستان

تێکۆشەڕ و پێشمەرگە قارەمانەکان

کێشە و ناکۆکی ناو جولانەوەی رزگاریخوازانەی گەلەکەمان بە گشتی و کێشە و ناکۆکی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان - عێراق و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە تایبەتی هۆیەکی کاریگەر و کۆسپێکی گەورە بو لە رێگای گەشەکردن و بۆ پێشەوە چونی جولانەوەی گەلەکەمان لە رێگەی کۆکردنەوە و بەگەر خستنی بەشی هەرە فراوانی کۆمەلانی خەڵکی کوردستان پێکهاتن و هاوکاریتان بایەخێکی گرنگ و شوێنەواری کاریگەری لەو بوارەدا ئەخاتەوە و دۆست و دوژمنەکانی گەلەکەمان ئەجولێنێ، بۆیە بە یەک دەنگ داوا لە کۆمەلانی خەڵک و لایەنە سیاسییەکان و تێکۆشەڕ و پێشمەرگە قارەمانەکان ئەکەین کە دڵسۆزانە و هوشیارانە پشتیوانی لەسەرکەوتنی ئەم رێکەوتنە بکەن و وریای پیلان و دەسی تێوەردانی دوژمنان بن.

پارتی دیموکراتی کوردستان - عێراق    یەکێتی نیشتیمانی کوردستان

ئیدریس بارزانی    مام جەلال

رۆژێ دوای ئەم بڵاوکراوەیە، بەلاغێکی هاوبەشیان دەرکرد:

"لە رۆژی ١٩٨٦/١١/٧ دا وەفدی پارتی دیموکراتی کوردستان – عێراق بە سەرۆکایەتی هەڤاڵ ئیدریس بارزانی و وەفدی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە سەرۆکایەتی هەڤاڵ مام جەلال کۆبونەوە لە پێویستی دارشتنی شێوەی کارو رێ و شوێنی قوڵکردنەوە و پتەوکردنی پەیوەندی دۆستانەی نێوانیان کۆڵینەوە و روو لە مبدەئی یەکخستنی هێزی پێشمەرگە و دام و دەزگاکانی شۆڕش پێکهاتن لەسەر:

لایەنی سیاسی :

١. هیچ لایەک لەم دو لایەنە دژی یەکتری لەگەڵ لایەنێکی سێهەم داخلی هیچ جۆرە محوەرێکی سیاسی یا ئیتفاقێکی سیاسی نابن.

٢. هەردولا هەوڵ بدەن، گەشە بە خەباتی هەمەلایەنەی خەڵکی کوردستان بدەن، بۆ روخاندنی رژێمی بەعسی عەفلەقی عێراق و مسۆگەرکردنی مافی رەوای گەلی کورد.

٣. لە هەمو کاروبارێکی شۆڕشی گەلەکەماندا، تەنسیقی هاوبەش بکەن بە تایبەت لە هاوکاری و دۆستایەتی لەگەڵ هێزە عێراقی و دۆستەکاندا.

٤. کۆبونەوەی دەوری کۆمیتەی بەرزی هاوبەش بەلایەنی کەمەوە ساڵی دوجار بۆ قوڵکردنەوە و پتەوکردنی پەیوەندی دو قۆڵی و چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەی یان ئەو مەسەلە گرنگانەی لە رەوتی خەباتدا دێنە پێشەوە بگیرێ.

٥. شۆڕکردنەوەی گیانی ئەم رێکەوتنە بۆ هەمو ئاستەکان و حورمەت گرتن لە رێکخستن و ئەندام و لایەنگیرانی یەکتر.

٦. هەوڵدان بۆ یەکخستنی رێکخراوی خوێندکارانی کورد لە دەرەوەی وڵات.

٧. هەڵدان بۆ یەکخستنی هێزەکانی کوردستانی عێراق و پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتیمانی فراوانی عێراقی.

لایەنی عەسکەری:

١. ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی هەردولا بۆ چالاکی سیاسی و عەسکەری و ڕێکخراوەیی و ڕاگەیاندن ئازادە. ئەبێ هەردولا یارمەتی یەکتر بدەن تا ڕێکخراو و هێزەکانیان لەو ناوچانەدا بتونن بە چاکی دەوری خۆیان بنوێنن بێ ئەوەی کۆسپ بۆ یەکتر ساز بکەن.

٢. هێز و ڕێکخراوەکانی هەردولا ئەچنە ناوچەی یەکتر، ئەبێ ئاگاداری یەکتر بکەن و تەنسیق پێکەوە بکەن.

٣. هەوڵ بدەن چالاکی هاوبەشی پێشمەرگانە بکەن، تا زەمینەی هاوکاری هەمەلایەنە و برایەتی بۆ پێشەوە بچێ و کاری ئیجابی لە کۆمەلانی خەڵک و هێزی پێشمەرگە بکا، بۆ زەمینە خۆشکردنی یەکخستنی هێزی پێشمەرگە لە ئایندەدا.

٤. بۆ پێشمەرگەی هەردولا هەیە، خۆیان نەقڵ بکەن بۆ لای ئەوەی تر بەبێ چەک، مەگەر بە بەڵگە چەکەکە هی خۆی بێ، بە مەرجی ئەوە ڕەچاو بکرێ کە تاوانی دەرهەق لایەک لەو دولایەنە نەکردبێ.

٥. لە مەسەلەی حوکمرانی ناوچەکان و گومرکدا، تا هەلومەورجێکی لەبارتر ئەبێ لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکتردا، واقیعی ئێستە حورمەت بگرن.

٦. پێکهێنانی دادگای هاوبەش بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەلانی خەڵک.

لایەنی ڕاگەیاندن:

١. ڕاگرتنی هەمو جورە کارێکی ڕاگەیاندن و پروپاگەندە بەراستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لە دژی یەکتر.

٢. حەملەیەکی ڕاگەیاندنی هاوبەش بە هەمو جۆرێ و لە هەمو ئاستەکاندا بکرێ هەم بۆ چەسپاندنی گیانی ئەم ڕێکەوتنە و گەشەپێدانی هەم بۆ ناساندنی مەسەلەی کورد و جولانەوەکەی و مافە ڕەواکانی لە ناوە و دەرەوەی ولات.

٣. ڕەخنەگرتن لە یەکتر لە کۆبونەوە هاوبەشەکاندا نەک لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا.

٤. هاوکاری ڕاگەیاندن لە روی فەنیەوە.

پارتی دیموکراتی کوردستان یەکێتی نیشتیمانی کوردستان[٢٩٥]

ئەم ڕێکەوتنە، سەرەرای گرنگی خۆی، بەلام دەست و خەت و کاریگەری ئێرانی پێوە دیارە و هەروەهاش، جێپەنجەی پارتی دیموکراتی کوردستان بە هەردو پرۆتۆکۆلەکەوە دیارە. چونکە لە هەردوکیاندا ناوی پارتی و ئیدریس بارازانی لە پێش یەکێتی و مام جەلالەوە هاتوە، چونکە لە ئسولی ڕێکەوتنامەدا، ناوەکان جێگۆڕکێ دەکەن و جارێک یەکێکیان لە پێشەوە دەنوسرێت و جارێکی تر، ئەوەی تریان، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە فەرەیدون عەبدولقادر وەک ئاماژەی پێداوە خۆی دایڕشتوە!

جیاوازی گرنگ لە نێوان ئەو دو پرۆتۆکۆلەدا نیە، ئەتوانرا هەردوکیان بکرێن بە یەک پرۆتۆکۆل، لەبەر دوبارەی هەندێ خاڵ.

ئەم تێبینیانە، هیچ لە گرنگی ئەم ڕێکەوتنامەیە کەم ناکاتەوە، وەک نەوشیروان مستەفا باسی دەکات:

"لە ماوەی چەند سەعاتێکدا ڕێکەوتنێکیان پێ ئیمزا کردن، کە کۆتایی بە یەکێ لە خوێناویترین قۆناغەکانی شەڕی ناوخۆی کوردی – کوردی عێراق هێنا و، بناغەی تەبایی و هاوکاری چەند ساڵەی لە نێوان ئەم دو هێزە دوژمنەدا دامەزراند"[٢٩٦].

ئەم ڕێکەوتنە، بە هەنگاوێکی گەورە دادەنرێت و هەر هیچ نەبێت، هەشت ساڵ گەلی کوردی لە شەڕی ناوخۆ دور خستەوە، ئەو بۆچونانەی کە ئایا ئێران پێی خۆشبوە یان پێیان ناخۆشبوە، ئەوە زۆر لە ناوەرۆکی ڕێکەوتنامەکە

---

[٢٩٥] نەوشیروان مستەفا، خولانەوە لە ناو بازنەدا، ل ٢٠١.

[٢٩٦] هەمان سەرچاوە، ل ١١٧.

ناگۆڕێت: مەسعود بارزانی لەو بارەیەوە دەڵێ: "ئێران زۆر پێی ناخۆش بوو کە هەردو لای بەهێزی کورد ڕێک بکەون و بە ڕواڵەت وای پیشان دەدا کە پێیان خۆشە، بەڵام لە دەروونیاندا پێیان ناخۆشبوو، چونکە ئەم پەیمانە لە ئایندەدا دەبوو بە گرفتێک بۆ ئامانجە ستراتیجیەکانی ئێران لە عێراقدا"[297].

[297] د. عەلی تەتەر نێروەی،بزاڤی ڕزگاریخوازی، ل ٤١٨-٤٢٣.

## دامەزراندنی بەرەی کوردستانی

نزیکبونەوەی یەکێتی و پارتی، وەک دو هێزی سەرەکی کوردستان، مانای هێنانەکایەی ئاشتەوایی گشتی بو، ئەو رێکەوتنەش، هەنگاوێک بو بۆ دروستکردنی بەرەیەکی کوردستانی فراوان لە نێوان هێزە کوردستانییەکاندا.

بۆ ئەو مەبەستە مام جەلال بروسکەیەکی ئاراستەی مەسعود بارزانی، رەسول مامەند، ئازاد مستەفا و سامی عەبدولرەحمان کرد:

برای هێژا کاک مەسعود بارزانی

برای هێژا کاک رەسوڵ مامەند

برای هێژا کاک ئازاد مستەفا

برای هێژا کاک سامی

سڵاوێکی شۆڕشگێرانەی گەرم، پێشنیاز دەکەم ئاشبونەوەی نیشتیمانیمان گەشە پێبدەین و بیگەیەنینە ئاستی دامەزراندنی (بەرەی کوردستانی) بۆئەوەی ئەم بەرەیە رێبەرایەتی خەبات و شۆڕشی کوردمان بکات، ببێتە نمونەیەکی بەرچاویش بۆ دامەزراندنی بەرەی عێراقی فراوان.

پێشنیاز دەکەم نوێنەرانمان دەستبەجێ بە ئامادەبونی نوێنەرێکی حیزبی شیوعی عێراقی تێکۆشەر بۆ دارشتنی پرۆگرام و پەیرەوی ناوخۆی بەرەی کوردستانی دەست بە کۆبونەوە و وتووێژ بکەن.

پێم باشە کۆبونەوەکان لە ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستان ببەسترێت. ئێمە لە لایەن خۆمانەوە بەوپەری شانازی ئامادەین پێشوازی و میوانداری کۆبونەوەکان بکەین، هەروەها ئامادەین بۆ هەر شوێنێکی لەباری دیکە کە ئێوە پێشنیاری دەکەن.

قۆناغی گرنگی ئیمرۆی شۆڕشی رزگاریمان، پێویستی بە هەرچی زوتر

دامەزراندنی بەرەی کوردستانیە، ئەو بەرەیەی کە دەبێتە ڕێگە خۆشکەری خەباتی هاوبەشمان لە پێناو هێنانە دی بەرەی نیشتیمانی فراوان

چاوەڕێی وەڵامی ئیجابیتانم

ڕێز و سڵاو                    دڵسۆزتان مام جەلال

مەسعود بارزانیش بەم بروسکەیە وەڵامی مام جەلالی داوەتەوە:

لە مەسعود بارزانیەوە

برای بەڕێز مام جەلال

سڵاوێکی شۆڕشگێرانەی گەرم

پێشنیارەکەتان بۆ پێکهێنانی بەرەی کوردستانی پێویستیەکی گرنگ و پەسەندە، چونکە گەلەکەمان بە قۆناغێکی مێژویی ترسناکدا تێدەپەڕێ، خەباتمان لە بەرەی کوردستانیدا زامنێکی گرنگە بۆ هەڵوەشاندنەوەی پیلانەکانی دوژمن، سەرکردایەتی حزب لە پێشنیارەکەتان دەکۆڵێتەوە لە پێناوی ڕێ خۆشکردنی پێکهێنانی ئەو بەرەیە.

١٩٨٧/٤/٣٠

هەروەها ئازاد مستەفا بەناوی پاسۆک و ڕەسوڵ مامەند بەناوی حسکەوە، پشتگیری خۆیان بۆ دەستپێشخەریەکەی دەربڕی.

پرۆسەی ئاشتی نێوان یەکێتی و بەرەی جود، بە کۆبونەوەی هەمە جۆر و نامە و بروسکە ناردن، سەردان، بەیان دەرکردن و ڕێکەوتنی دوقوڵی بە تایبەتی ڕێکەوتنی نێوان پارتی و یەکێتی بەسەرۆکایەتی مام جەلال و ئیدریس بارزانی لە ١٩٨٦/١١/٧ ڕێگاخۆشکەر بو بۆ دروستکردنی بەرەی کوردستانی.

دامەزراندنی بەرەی کوردستانی، نزیکی ٢ ساڵی خایاند، تا لە ١٩٨٨/٥/٣ لە نێوان "پارتی دیموکراتی کوردستان، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان، حیزبی شیوعی کوردستان، پارتی سۆسیالیستی کورد (پاسۆک)، پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان، حیزبی

زەحمەتکێشانی کوردستان، بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشوری* دروست بو.

بەرەی کوردستانی، دەسکەوتێکی سیاسی گەورە بو بۆ گەلی کورد و هێزە سیاسیەکان و تا ١٩٩٤ کوردستان ئارامی بەخۆیەوە بینی و ئەو بەرەیەش هەوێنی راپەرینی ئازاری ١٩٩١ و هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لە ١٩٩٢/٥/١٩ و دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ١٩٩٢/٧/٤ بو..

دامەزراندنی بەرەی کوردستانی، هەڵوەشانەوەی هەردو بەرەی عێراقی (جود و جوقد) ی لەگەڵ خۆی هێناو، ئەم بەرەیە بوە بەرەی سەرەکی و کاریگەر لەناو هێزە کوردیەکان و لەسەر خاکی کوردستاندا.

ساڵی ١٩٨٨، دو دیوی هەبو، ساڵی هێمنی و کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆ و دروستکردنی بەرەی کوردستانی بو، لە هەمان کاتیشدا، دیوێکی تراتیجیای کوردی لێکەوتەوە کە خۆی لە ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە بینیەوە.

سەرەڕای گرنگی دروستکردنی بەرەی کوردستانی، بەڵام ئەو بەرەیە نەیتوانی بە تەواوی خواست و ویستەکانی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بێنێتەدی، ئەوەیش یەکخستنی هێزی پێشمەرگەی هەمولایەنەکانی کوردستان و یەک دەنگی لە بواری پەیوەندی دەرەوە و مالی و زۆر بواری تردا.

دوای راپەڕین، هەنگاو بە هەنگاو، ڕۆڵی بەرەی کوردستانی بەرەو کزی و لاوازی دەڕۆشت و هێزەکان هەریەکە ئەیویست خۆی بە تەنها شۆڕەسواری مەیدان بێت، ئەمەش وایلێکرد کە ناکۆکی نێوانیان زیاد بکات..

حکومەتی عێراق لەسەرەتای ١٩٨٨ دا، هەستیکردبو، کە ئێران ئەو هێزە هێرشکەرەی جارانی نەماوە، لەبەرئەوە بڕیاری دابو نەخشە کۆنەکەی کە بریتی بو لە خاپورکردنی دیهاتەکانی کوردستان و گوێزانەوەی دانیشتوانەکەی بۆ ئۆردوگا زۆرەملێیەکان و بۆ نوگرەسەلمانی شوێنی مەرگەساتی کوردی جێبەجێبکات.

پرۆسەی لەناوبردنی کورد بە هێرشکردنە سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی دەست پێکرد و ئەم پرۆسەیە لە لایەن بەعسەوە بە (ئەنفال) ناو برا.

## ئەنفال، هەڵەبجە و کۆتایی شەڕی ئێران و عێراق

حکومەتی عێراق لە ٢٢ی شوباتی ١٩٨٧ەوە هێرشی دەستپێکرد، جگە لە پیادە، بە مەبەستی دەستبەسەراگرتنی بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی لە سەرگەڵو، بەرگەڵو، ناوچەکانی دوڵی جافایەتی، پیرەمەگرون، شەدەڵە و شارستێن، فرۆکە و چەکی کیمیاوی و چەکی زۆر کوشندەشی بەرکار هێنا.

پێش ئەم هێرشە، حکومەت لە ١٩٨٧/٢/٢٠ دا، کۆمەڵێک نامەی بۆ هەمو هێزە سیاسیەکان نوسیبو، داوای گفتوگۆی لێکردبون و نامەکانیشی بە موکەرەم تاڵەبانیدا ناردبو، هەروەها ماوەی چەند رۆژێکی کەمی دانابو، کە وەڵامی بدرێتەوە، لەبەر کومەڵێک هۆ، نامەکان لە ١٩٨٧/٣/١٠ دا گەیشتبوە دەست هێزەکان و وەڵامەکەشی زۆر دواکەوت، ئەمە بوە هۆی ئەوەی کە سەدام حسێن هێرشەکەی پێش بخات، بێگومان ئەمە تەنها حوجەیەک بو، بۆ هێرشەکەی کە بڵێت ئەم هەوڵی ئاشتی خۆی داوە..

شەڕێکی بێ بەرامبەر لە زستانێکی سەختدا دەستیپێکرد، لە ١٩٨٨/٣/١٩دەستگیرا بەسەر ناوچەکانی سەرکردایەتی یەکێتی و بەعس ئەوەی بەسەرکەوتنێکی گەورە بۆ خۆی نیشاندا.

نەوشیراون مستەفا بەم جۆرە باس لەو شکستە دەکات: "خۆم بە راشکاوانە دانی پێدا ئەنێم، کە بەشێکی زۆری ساڵانی ژیانی من، نائاسایی بوە، روداوی جۆراوجۆری زۆرم بینیوە، چەند رۆژی خۆش و ناخۆشم گوزەراندوە، بەڵام درۆی تێدا نیە ئەگەر بڵێم هیچ رۆژێکی ژیانم لەو رۆژە ناخۆشتر نەبوە کە بڕیاری کشانەوماندا و، ماڵەکەم و بارەگاکەمم لە

بەرگەلو بە ناچاری بۆ دوژمن بە جێ هێشت.[298]

هەردوا بەدوای ئەم هێرشە، ئەنفالی یەک دەستپێکرد لە دۆڵی جافایەتی لە ٢/٢٢-١٩٨٨/٣/١٩، ئەنفالی دو لە ناوچەی قەرەداغ لە ٢٢ مارت تا ٢ نیسان و پاشانیش ئەنفالی سێ لە ناوچەی گەرمیان ٧-٤/٢٠ و ئەنفالی چوار لە ٣-١٩٨٨/٥/٨ لە دۆڵی زێی بچوک و کۆیە و کەرکوک و ئەنفالی پێنج و شەش و حەوت لە ٥/٢٤-١٩٨٨/٨/٢٦ لە ناوچەکانی هەولێر، شەقلاو و رەواندز و ئەنفالی هەشت کە بە (خاتمة الانفال) ناو دەبرێت لە ناوچەی بادینان بو لە ٢٥ی ئاب تا ٦ی ئەیلولی خایاند.

ئەم پرۆسەی جینۆسایدەی دژ بە کورد بە هەڵاتنی زیاتر لە سەد هەزار هاوڵاتی بۆ ئێران و سەر سنور و شەهید و دەربەدەر و برینداربونی ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیانی سیڤیل، کۆتاییهات.

لە کاتی ئەنجامدانی قۆناغی یەکی ئەنفال لە ٢/٢٢، بەعس لە ١٩٨٨/٣/١٦دا بە ژمارەیەکی زۆر لە فڕۆکە کە گازی کیمیاویان هەڵگرتبو هێرشیان کردە سەر هەڵەبجە, باس لە فڕێدانی ٢٠٠ تەن گاز دەکرێت بەسەر هەڵەبجەدا و لە ئەنجامدا نزیکی پێنج هەزار هاوڵاتی سیڤیل شەهید بون و ژمارەیەکی زۆریش بریندار و ئاوارە بون بۆ ئێران.

بەعسییەکان، پێش دەستپێکردنی گفتوگۆی ١٩٨٣، هەڕەشەیان لە نوێنەرانی یەکێتی کرد، کە باشترە لەگەڵیان رێکبکەون، ئەگەر وا نەکەن، ئەوا ئەنجامی زۆر خراپی دەبێت.

طاریق عەزیز لە دانیشتنی یەکەمدا بە زمانێکی هەڕەشەئامێز بە نوێنەری یەکێتی (فەریدون عەبدولقادر) دەڵێ: "ئێمە ناڕوخێین، چونکە دنیا لە بەرامبەر ئێران دا پشتیوانیمان لێ ئەکا، رۆژێکیش دێ، ئەم شەڕە تەواو بێ، ئەگەر ئێستا بێن و لەگەڵمان پێک بێن، چاکەیەکی گەورەمان لەگەڵ ئەکەن، هەرگیز لەبیرمان ناچێتەوە، خۆ ئەگەر شەڕ درێژە پێ بدەن، دوای تەواوبونی شەڕی ئێران، ئەو جەیشە زەبەلاحەی بۆ شەڕی ئەوانمان دروست

[298] نەوشیروان مستەفا. خولانەوە لەناو بازنەدا، ل ١٥١.

کردوە، ئەیهێنینە سەر ئێوە، ساڵێک وەخت و سەد هەزار کوژراوتان بۆ تەرخان ئەکەین. بەڵام خاکتان بە تورەکە ئەبێژین و تەفروتوناتان ئەکەین.[٢٩٩]

ئەم قسانەی تاریق عەزیز زۆر رون بون و قابیلی لێکۆلینەوەی تر نەبون جگە لە هەڕەشەی لەناوبردن نەبێت، نەوشیروان مستەفا لەو بارەیەشەوە دەڵێ: ئەبو ئێمە هەڕەشەکانی طاریق عەزیز کە بە زمانی حکومەت و حیزبی بەعسەوە کردبوی بە جدی وەربگرین.[٣٠٠]

لە ئەنجامدا سەرکردایەتی یەکێتی، ئەو هەرەشە ئاشکرایانەیان بە جدی وەرنەگرت و زیاتر کەوتنە شەڕی دژوار لە دژی بەعس، یەکێتی لە جیاتی وەرگرتنی هەڵوێستی نەرم و بەکارهێنانی تاکتیکی گونجاوتر بۆ ئەوەی پێکدادانی قورس لەگەڵ رژێمدا رونەدارت، هەڵسان بە شەڕێکی هاوبەش لەگەڵ ئێراندا، ئەویش لێدانی بیرەنەوتیەکانی کرکوک بو لە ١٠ تشرینی یەکەمی ١٩٨٦ و هەروەها شەڕی (داستانی ڕزگاری) لە ١٩٨٧/٤/١٣ دا کە زیانێکی گەورەیان لە سوپای عێراقدا.

بەعسیش پێش هێرشەکان، بڕیاری کۆتایی خۆی دابو کە تۆڵەی جەرگبڕ لە کورد بکاتەوە، لە سەرەتادا و لە ١٩٨٧/٤/١٥ دا کەوتە کیمیابارانی ناوچەکانی سەرکردایەتی یەکێتی لە بەگەڵو، هەڵەدن، ئاوەژێ، کانی تو و رۆژانی دوتریش دەستی لە ناوچەکانی تر نەپاراست و کیمیابارانی کردن.

کاتێ زەنگی تۆڵە لە یەکێتی بە تایبەتی و هەمو گەلی کورد بە گشتی لە لایەن بەعسەوە لێدرا، یەکێتی پەیوەندیان لەگەڵ ئێرانی دوژمنی سەرسەختی بەعس، دروستکردبو وە چالاکی سەربازی هاوبەشیان ئەنجام ئەدا. بەعس بیری نەچوبۆوە کە هێزە کوردیەکان پشتگیریان لە شەڕی هەشت ساڵەی دژ بە ئێراندا نەکردبو، ئەمە بەزاندنی هێڵی سور بو.

---

[٢٩٩] نەوشیروان مستەفا ئەمین- خولانەوە لە ناو بازنەدا، چاپی دووەم ١٩٩٩، ل ٧ - مەڵبەندی ئاوەدانی، بەرلین.

[٣٠٠] هەمان سەرچاوە.

یەکێتی و پارتی گوێیان نەدایە هەڕەشەکانی بەغدا و بارودۆخەکەیان بە وردی هەڵنەسەنگاند و ئەنجامی ئەو هاوکارییەی پارتی لە ١٩٨٣ لەگەڵ ئێراندا لە حاجی ئۆمەران و یەکێتیش دوای گفتوگۆیان لەبەرچاو نەگرتبو.

بەعس قسەکانی تاریق عەزیزی کە لە کۆتایی ١٩٨٣ دا کردبوی وەکو خۆی جێبەجێکرد، ئەو شەڕانەی دژ بە سوپای عێراق و هاوپەیمانێتیە لەگەڵ ئێراندا هەموی هۆ بون کە بەعس دژایەتی کورد توند و زۆر دژواتر بکات و پرۆسەی ئەنفال خێراتر بکات.

ئایە یەکێتی و پارتی لەو کاتانەدا هیچ ئالتەرناتیڤێکی تریان لەبەردەرمدا بو کە بتوانن بێ پەیوەندی لەگەڵ ئێران کەمێ لە داخوازیە نەتەوەییەکان بهێننە دی؟ ئایە دەوڵەتێکی بەهێزی وەک عێراق کە لە شەڕی هەشت ساڵەی لەگەڵ ئێران رزگاری بوبو، چەند ئامادە بو، خواستی هێزە کوردیەکان بهێنێتە دی؟ ئەمە پێویستی بە لێکۆلینەوەی ورد تر هەیە.

(مەبەستی ئەم نوسینەمان باسکردنی وردەکاری کارەساتی ئەنفال و هەڵەبجە نیە، لەبەرئەوە تەنها بەسەردێر باسمان کردوە)

لە کاتی پرۆسەی ئەنفال و کیمیابارانی کوردستاندا، شەڕی هەشت ساڵەی ئێران و عێراق بەرەو کۆتایی دەچو، ئێران ناچاربو لە ١٩٨٨/٨/٢٠دا ئاگربەست لەگەڵ عێراق قبوڵ بکات، ئەویش لە ئەنجامی بڕیاری ٥٩٨ ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەککگرتوەکان کە لە ١٩٨٧/٦/٢٠ دەرچوبو.

بە کۆتایهێنانی شەڕی ئەو دو وڵاتە، ئێران کۆمەڵێک لە هێزەکانی لە کوردستان کشانەوە بۆ ناو خاکی خۆی.

مام جەلال دەربارەی وەستانی شەڕی هەردو وڵات و دۆخی شۆڕشی کورد لە ١٩٨٨/٧/٢١ لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رادیۆی بیبیسی لەندەن گوتی: "ئەگەر چارەسەری ئاشتیانەی جەنگ هەمەلایەنە بێت و لایەنی کوردیش بە خۆیەوە بگرێت، ئەوە لە بەرژەوەندی هەردو گەلی عەرەب و کورد دایە، بەڵام ئەگەر کورد لە ناو ئەم کێشەیەدا نەبێت، ئەو کات عێراق هەمو هێزەکانی دژ بە کورد بەکاردێنێت، واتە سیاسەتی چەوساندنی کورد توندتردەبێت. هەروەها

گوتی: ڕاوەستاندنی جەنگ، ناتوانێت شۆڕشی کورد لەناو ببات و بێ هاوکاری دەرەکیش کورد بەردەوامی بە خەباتیان دەدەن"[٣٠١].

ساڵی ١٩٩٠ بە ساڵی کەمێ هێمنی لەبواری شەڕ و پێکداداندا لەگەڵ ڕژێم دەژمێرێت، ئەمە وایکردبو، کە هەر هێزە خەریکی کاروباری خۆی بێت.

• بەرەی کوردستانی سەرقاڵی دامەزراندنی هەیکەلی خۆیبو، هەوڵی ئەدا کە ئەو ڕۆڵەی بۆی دەستنیشان کرابو، بە باشترین شێوە بیبات بەرێوە، بە تایبەتیش هەوڵیئەدا، کە داهاتە گومرگیەکان بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیی و بەشی هەمو هێزەکانی لێبدات بەپێی قەبارەی خۆیان.

• یەکێتی خەریکی ناردنی پێشمەرگەرکانی بو بۆ مەشق کردن لە ئێران.

• گرژی نێوان عێراق و ولاتانی کەنداو سەریهەڵدا.

• عێراق لە ٢ی ئابدا کوێتی داگیرکرد و لە ئەنجامدا هاوپەیمانیەکی نێودەوڵەتی لە دژی ئەو داگیرکردنە بەسەرۆکایەتی ئەمەریکا دروست بو، وە عێراق ناچار کرا بکشێتەوە.

• ژمارەیەکی زۆر لە هاولاتیانی کورد، لە دژی زوڵم و زۆری ڕژێم رویان کردە شاخەکانی کوردستان و لەو جێگایانەی پێشمەرگەی لێبو، هێزەکوردیەکان زەحمەت بو بیانگرنە خۆیان و داڵەیان بدەن، چونکە خۆیان بە زەحمەت بژێوی ژیانیان دابین دەکرد، لەبەرئەوەی زۆربەی هەرە زۆری دێهاتەکان روخابون و باری ئابوری ناو شارەکانیش خراپ بو، پەیوەندی پێشمەرگە لەگەڵ شارەکاندا ئاسان نەبو وە هاوکاری ڕێکخستنەکانی ناوەوەیان بە ئاسانی نە ئەگەیشتەدەست، لەو بوارەدا چەندەها بروسکە هەیە، کە باس لەوە دەکات کە ناتوانن نەک هاوکاری هەڵهاتوەکان بکەن، بەڵکۆ ناتوانن پێشمەرگەی نوێ لە ریزەکانی خۆیان وەربگرن.

• ئەو ساڵە بە ساڵێکی زۆر دژوار دەژمێرا بۆ یەکێتی لە بواری

---

[٣٠١] د. عەلی تەتەر نێروەی. بزافی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد، ، ل ٥٣٨.

ئابوریەوە، بارودۆخی ئابوری زۆر خراپبو، لە هەمو بوارەکاندا کەموکوریان هەبو، سەرەرای ئەوەی موچەی پێشمەرگە زۆر رەمزی بو، لەگەڵ ئەوەشدا، بە چەند مانگێ ئەو پارمەتییەیان وەرنەدەگرت، لە بروسکەیەکی فەرماندەی گشتی یەکێتی بۆ (م.س) لە ١٩٩٠/٨/٢٤ دا دەنوسن: "هەمو پێشمەرگە بێپارەن، گەر پارمەتیش نیە، بەڵکو هەریەکە شتێکیان بۆ سەرف بکەن بۆ جگەرە و پێڵاو"، هەروەها بروسکەیەک لە نەوزادی نوری بەگەوە بۆ (م.س) یەکێتی نیشانیئەدا، کە یەکێتی کێشەی هەبوە کە پارەی خواردنی رێگای ئەو پێشمەرگانە دابین بکات کە لە مەشق گەراونەتەوە: "رۆژی پێنج شەمە (١٠١) پێشمەرگەی دەورەکەی ئەهواز ئەگەرێنەوە، بۆ کاتی گەرانەوەیان هیچ پارەی نانخوردنی رێگایان پێ نیە، ئەگەر پێتان باشە بۆ هەر پێشمەرگەیەک لە سنوری ٢٥٠-٣٠٠ تمەنیان بۆ سەرف بکرێت".

ئەمە باری ئاڵۆزی ئابوری یەکێ لەگەورەترین هێزی کوردستانی نیشان ئەدات، ئەمە لەکاتێکدایە کە دوای کەمتر لە ساڵێک گەورەترین راپەرین لە مێژوی گەلی کوردا رویداوە.

• لە هەمان ساڵدا و دوای داگیرکردنی کوێت، یەکێتی و پارتی بەتایبەتی و هێزەکانی تریش بەگشتی خەریکی خۆ ئامادەکردن بون بۆ ناردنەوەی هێزەکانیان بۆ قوڵایی کوردستان و خۆ رێکخستنەوە و ئامادەبون بۆ هەر روداوێک کە روبدات، بە تایبەتی شەڕ دژ بە رژێم.

لە ١٩٩٠/١٠/١١ دا، (م.س) یەکێتی بروسکەیەک بۆ فەرماندەیی گشتی دەنێرێت و دەنوسێت: "هەر ئەمرۆ ئاگاداری هەمو بەتالیونەکان بکەنەوە، کە هەرچی هێزیان هەیە پەیوەندی بکەن بە بنکەکانیانەوە و ئامادەی تێک شکاندنی هێرشەکەی دوژمن بن"

## ۱۹۹۱

# پێش ڕاپەڕین

سەرەتای ۱۹۹۱، ساڵی خۆ ئامادەکردن بو بۆ ڕاپەڕین و چونە ناو شار و شـــرۆچکەکان، لە بروســـکەیەکی کۆســـرەت ڕەســـوڵ لە ۱۹۹۱/۱/۱ دا کە ئاراستەی فەرماندەی گشتی، گشت لێپرسراوانی محوەرەکان، پارتیزانەکان، بەتالیۆنەکـانی کـردوە دەنوســێت: "پێویســتە لەســەر گشــت فەرمانـدە و لێپرسراوەکان و پێشمەرگەکان و هێزی جێگر، پشودراوەکان لە ۱۹۹۱/۱/۷ ەوە لە بارەگای میحوەرەکانیاندا کۆ و ئامادەبن بۆ وەرگرتنی هەمـو بڕیاڕ و تەعلیماتێک و جێبەجێکردنی، هیچ جۆرە ئەرکێکی تـایبەت نابێت ببێتە ڕێگـر یـا بیـانو بـۆ ئامـادەنەبون، هەرکەســە لە پێشــمەرگە و کـادیر و لێپرسراوەکان و فەرماندەکان"

ئەم بروسکەیە، مانای ئەوەیە، کە کاتی ڕاپەڕین نزیک بۆتەوە و پێویستە هەمو ئامادەبن. باردۆخی ئەوکاتە زۆر دژواربو، سەرەڕای ئەوەی کە شـەڕ لە نێوان عێراق و هاوپەیمانان لە ئارادا بو، بارودۆخی کوردستان لە روی سـەربازی و ئـابوریەوە زۆر خـراپ بـو، بە تـایبەتی بـارودۆخی پێشـمەرگە باش نەبو، هەر لەم بروسکەیەدا هەستی پێدەکرێت، کە لێپرسراوی مەکتەبی عەسـکەری یەکێتـی مـولازم عـومەر عەبـدوڵا لە ۱۹۹۱/۱/۲۷ دا ئاراسـتەی ڕابەری سـەید ئیبراهیمـی کـردوە: "کـاکە گەر راخەر نیە، ٦ بەتـانی لەوانەی کـاک ڕۆستەم بەجێی مـاوە بۆمـان بنێرە "ئەوە دەریدەخات کە بارودۆخیـان چۆن بوە لەو کات و شوێنەدا پێویستیان بە تەنها ٦ بەتانی بوبێت.

ئەو سـاڵە، کـاتی خـۆ ئامـادەکردن بـو بـۆ راپەڕیـن لەسـەرجەم شـارەکانی

کوردستاندا، هەروەها بارودۆخی رژێم زۆرلەبار نەبو، لەوبارەیەوە، عوسمانی حاجی مەحمود وەک لێپرسراوی پارتیزانەکان لە گەرمیانەوە لە نیوە شەوی ١/٢٧ دا بروسکەیەک بۆ نەوشیروان مستەفا ئەنێرێت و ئەنوسێت: "ئەگەر بە باشی رێنوێنی خەڵکی شارەکان نەکرێ، زۆر مەترسی دروستبونی شەڕی ئەهلی هەیە لە کاتی شێوانی شیرازەی حکومەتدا، چونکە خەڵک زۆر بە رقەوە خۆیان ئامادەکردوە بۆ تۆڵە لە هەمو خائینێک.." نەوشیروان مستەفا لە وەڵامدا نوسیویەتی: "ئێمە هیچ جۆرە ئینتیقام و شەڕێکی ئەهلیمان پێ باش نیە و ئەوە مەسەلەی سیاسی گەلەکەمان لە کیس ئەدا.."

یەکێک لە هەنگاوە باشەکانی بەرەی کوردستانی، ئەوە بو لە ١٩٩١/١/٢٩ دا لێبوردنێکی گشتی بۆ هەمو جاش و کارمەندەکانی بەعس دەرکرد و داوای لێکردن کە رووی چەکەکانیان بکەنە بەعس و ئیتر کاتی ئەوەیە هاوکاری هێزی پێشمەرگە بکەن..

ئەو بارودۆخە نیشان ئەدا، کە رژێم خەریک بو دەسەڵات لە کوردستاندا لە دەست بەدا و پێشمەرگەش خۆیان ئامادەدەکرد کە نزیکی شارەکان ببنەوە. لە ٢/٢١ فەرەیدون عەبدولقادر بروسکەیەکی بۆ نەوشیروان مستەفا نوسیوە: "ئێستا ٤٠ پێشمەرگەمان ئامادەیە بۆ چوونە خوارەوە، لە ماوەی یەک هەفتەدا، پێویستمان بە ٢٠ هەزار دینار هەیە"

هەر لە بارەی خۆ ئامادەکردن بۆ راپەرین و رۆڵی رێکخستنەکانی یەکێتی لە شارەکان، ئەم بروسکەیە دەریدەخات کە چۆن ئامادەکاری کراوە: لە بێستون رەتڵی سورداش بۆ نەوشیروان مستەفا لە ٢/٢٥ دا دەنوسێ: "برادەرانی شار داوای ئەو جیهازە دەکەن کە باستان کرد، ئەمرتان بە چیە؟" ئەویش لە وەڵامدا دەنوسێ "تەسلیمیان بکەن".

دەربارەی سەرەتای راپەرین و رۆڵی سەرکردایەتی پارتی، فەریدون عەبدولقادر، وەک ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی دەنوسێت: "لە دابەزینی هێزەکانیشماندا لەگەڵ کاک (کۆسرەت و مولازم عومەر) بە دوجاری جیا لە

کاک (مەسعود) و مەکتەبی سیاسی (پارتی) مان دوبارەکردەوە، کە ئەوانیش لەگەڵماندا چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی بنێرن تا پێکەوە بۆ ئازادکردنی شار و شارۆچکەکان کاری هاوبەش بکەین! کاک (مەسعود)، وتی: ئێوە نوێنەری ئێمەشن و هێزیش دەخەینە بەر دەستتان"[٣٠٢].

رادوێی یەکێتی، رۆڵیکی هێجگار دیار و کاریگەری هەبوە لە جۆشدانی جەماوەر و گەیاندنی بروسکە نهێنیەکانی سەرکردایەتی یەکێتی بۆ هێزی پێشمەرگە و رێکخستنەکانی ناو شارەکان، محەمەدی حاجی مەحمود، وەک سەرکردەیەکی هێزێکی سیاسی بەم شێوەیە باسی دەکات: "ئەوەی دەوری گرنگی هەبوو، رادیوی گەلی کوردستان بوو، رادیوی یەکێتی، لەوانەیە بپرسین بۆ رادیوی سۆسیالیست و پارتی دەوری نەبو؟ ئەوەی راستی بێت، رادیوی پارتی کەس لێی تێ نەدەگەیشت و کەسیش نەی دەکردەوە، رادیوی سۆسیالیستیش ئەو کاتە بە ئامانەت لای پارتی کرێکارانی کوردستان بوو، تەنها رادیوی یەکێتی خەڵکی هاندەدا و جۆشی دەدا"[٣٠٣].

لەگەڵ راپەرینی کوردستاندا، هاولاتیانی خوارووی عێراقیش، بە تایبەتی شار و شارۆچکە شیعیەکان، راپەرینیان دەستپێکردبو و دام و دەزگای بەعسیان لە چەند شارێک راماڵی، هاندەرێکی بەهێزی ئەم راپەرینە، داواکەی سەرۆک کۆماری ئەمەریکا، جۆرج دەبلیو بوش بو، لە ١٩٩١/٢/١٥ کە ئاراستەی خەڵکی عێراقیکرد کە دژی سەدام راپەڕن.

لەو کاتە ناسکانەدا، هەندێ جار سەرەتای ناکۆکی لە نێوان یەکێتی و پارتی روی ئەدا، لە بروسکەیەکی ژمارە ١٧٣ ی ١٩٩١/٢/٢٦ مەسعود بارزانی ئەم بروسکەیە دەنێرێت بۆ نەوشیروان مستەفا: "بیستومانە کە ٥٠ پەنجا پێشمەرگەی (ی.ن.ک) بە قیادەی مەلا جەمال، دابەزیون بۆ لای سلێمانی. تکایە بە پەلە ئاگادارمان بکەن، ئایە راستە یان نا، وەلام بە پەلە.

---

[٣٠٢] فەریدون عەبدولقادر، هەڵۆ سوورەکانی قەندیل، ل ٥٨٩.

[٣٠٣] محەمەدی حاجی مەحمود، رۆژژمێری ... بەرگی ٣، ل ٢٦٨.

هەر دوای رۆژێک مەسعود بارازانی بە بروسکەی ژمارە ١٧٥ ی ٢/٢٧ بۆ نەوشیروان مستەفا دەنوسیوێت: "ئیتیفاقمان وابو کە هەمو تحرکات بە هاوبەش و بە ئاگاداری یەکتر بێ، بە پێی ئەو بەرنامەیەی دانرابو، لێرە وەک بیستومانە بۆ هەولێریش هێزتان ناردوە، ئێمە لەم تەحرکاتە ئاگادار نەکراوین و ناگونجێ لەگەڵ ئیتیفاقمان لەم کاتەدا، هەر تحرکێکی یەکلایەنە لە بەرژەوەندیدا نیە".

لەم کاتانەدا، حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، سەرەرای پەیوەندیەکانی لەگەڵ بەغدا، هەوڵیداوە کە یارمەتی هێزە کوردییەکان بدات و لە بروسکەیەکی مەکتەبی سیاسیاندا لە ١٩٩١/٢/٢٧ کە ئاراستەی مەکتەبی سیاسی یەکێتیان کردوە. نوسیویانە: "ئەمرۆ لە سلێمانی حکومەت نیزامی بووە و خەڵکێکی زۆریان گرتوە و بە توندی کۆنترۆڵی هاتوچۆ دەکەن"

# دەستپێكردنی ڕاپەڕین

یەكەم شار كە لە كوردستان رزگاركرا، قەزای رانیە بو، لە ١٩٩١/٣/٥ دا، ئەم بروسكەیە لە ڕێكخستنەكانی یەكێتیەوە هاتوە بۆ (م.س) یان: "ئیمرۆ سەعات نۆ و نیوی بەیانی تظاهرات دەستپێكرد، لە ئەنجامدا شەڕ رویدا بە ئاربیجی و چەكی سوك، لە ئەنجامدا دەستگیرا بەسەر دائیرەی مونظمە و دائیرەی ئەمن و شرطە و ئیستخبارات و هەمو دەزگاكانی رژێم وە ئێستا هەمو لەژێر كۆنترۆڵی خەڵكدایە، تەنها فیرقەی چوارقورنە نەبێت، هێشتا دەستی بەسەردا نەگیراوە، ئەوانیش تەقەیان لە خەڵك نەكردوە. لە ئەنجامدا ٣٢ كەس لە ئەمن و شرطە و ئیستیخبارات ئەوانەی لەناو شاردا بون و تەسلیم نەبون و كوژران..."

هەنگاو بە هەنگاو، پێشمەرگەی لایەنەكانی بەرەی كوردستانی بەرەو ناو شارەكان دەچون و سەركردایەتیشیان هەمان هەنگاویان دەنا، لە ٣/٩ مەسعود بارزانی و نەوشیروان بەیەكەوە ئەم بروسكەیە دەنێرن بۆ مام جەلال: (كە لە دەرەوەی كوردستان بو) "زۆربەی برادەران و هێزەكان لە ناوەوەن، لەم یەك دو رۆژەدا ئەڕۆین، پێمان باشە جەنابت لە دەرەوە خەریك بیت، هەركاتێ پێویستی كرد، ئاگادارت ئەكەین"

بەرەی كوردستانی بڕیاری دا كە لێخۆشبونێكی گشتی بۆ هەمو ئەو جاشانە دەربكات كە لەگەڵ رژێم دژ بە شۆڕش كاریان كردوە و مەسعود بارزانی لە ٣/٩ دا بانگەوازێكی لە ژێر ناوی (بانگەوازێك لە تێكۆشەر مەسعود بارزانی بۆ فەوجەكانی دفاعی وەطنی و مەفرەزە خاصەكان) دەركرد و داوای لێكردن كە (لەم زروفە مێژویە دەوری خۆیان ببینن بۆ گەشە پێدان و سەركەوتنی

راپەرینی جەماوەر، پێویستە هەمو لایەک ئەوەی رۆشتوە لە بیر بکەن و بەیەک دەست و یەک دڵ قۆناغی خەباتی گەلەکەمان بگەیەنین بە ئاسۆی سەرکەوتن"

هەر لەو رۆژانەدا، ترسی برسێتی و بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە لایەن رژێمەوە لە ئارادا بو، لەبەرئەوە نەوشیروان مستەفا و مەسعود بارزانی لە ٣/١٠ دا لە بروسکەیەکدا بۆ مام جەلال دەنوسن: "تکایە هەوڵ بدە بەهۆی رئیس ئەسەد ئەم دو خاڵە کاریان بۆ بکرێت:

أ- بەهۆی مصر و سعودیە، نفوزی خۆی بەکاربێنێ تا أمریکا و حلفا مەجال نەدەن رژێم چەکی کیمیاوی و چەکی ئاسمانی لە دژی ژن و منداڵ و شارەکان بەکاربێنێ.

ب- استعداد وەربگیرێت لە سنوری سوریاوە خواردەمەنی و سوتەمەنی و هەمو هاوکاریەکی تر بۆ گەلی عێراق، چاوەڕوانی هیمەتی جەنابتانین."

بارودۆخی کوردستان، وای پێویست کردوە، کە مام جەلال بگەرێتەوە بۆ کوردستان، لەبەرئەوە دوای چەند رۆژێ لەو بروسکانە، نەوشیروان مستەفا بروسکەیەک تر بۆ مام جەلال دەنێرێت و دەنوسێ: "ئێستا خەریکە هەمو کوردستانی عێراق ئازاد ئەکرێت، پێم باشە ئیتر تەشریف بهێنیتەوە".

## ڕۆژانی ڕزگاری شار و شارۆچکەکان

- ٥ /٣ /١٩٩١: خەڵکی ڕانیە و ئۆردوگاکانی دەوروبەری ڕاپەڕین و دەسەڵاتی بەعسی‌یان ڕوخاند.
- ٣/٧ /١٩٩١: خەڵکی شاری سلێمانی ڕاپەڕین و دەسەڵاتی بەعسی‌یان ڕوخاند.
- ٣/١١ /١٩٩١: خەڵکی شاری هەولێر ڕاپەڕین و دەسەڵاتی بەعسی‌یان ڕوخاند.
- ٣/١٧ /١٩٩١: خەڵکی شاری دهۆک ڕاپەڕین و دەسەڵاتی بەعسی‌یان ڕوخاند.

٢٠ /٣ /١٩٩١: ئازاد کردنی شاری کەرکوک[٣٠٤].

دوای ڕزگارکردنی زۆربەی شار و شارۆچکەکانی کوردستان، بەرەی کوردستانی لە ٣/١٢ دا ئاگاداریەکی بڵاوکردەوە و نوسیوێتی: " بە خۆشیەکی زۆرەوە ئاگاداری جەماوەری کوردستان دەکەین، کە بەشی زۆری سنوری ناوچەی ئۆتۆنۆمی لە دەسەڵاتی بەعس ئازادبوە، بەم بۆنەیەوە، هەڵوەشانەوەی مجلیسی تەنفیزی و مەجلیسی تەشریعی ڕادەگەیەنین و مژدە بە خەڵک ئەدەین کە لەم ڕۆژانەدا مەجلیسێکی موقەت بۆ ئیدارەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی دیاری ئەکرێت تا کاتی هەڵبژاردنی گشتی پەرلەمانی کوردستان.

داوا لە فەوجەکانی دیفاعی وەتەنی دەکەین، پارێزگاری تەشکیلە و چەک و کەلوپەلەکانی خۆیان بکەن و بەم نزیکانە سەرکردایەتیەکی عەسکەریان بۆ دیاری ئەکرێت و پاراستنی ناوچە کوردستانیەکانیان پێ دەسپێرێت"

سەرەرای خۆشی و مەستی سەرکەوتن، دیویێکی ناشیرینی ئەو سەرکەوتنە کاتیە، تاڵانکردنی دام و دەزگاکانی دەوڵەت بو، لە بروسکەیەکی

---

[٣٠٤] نەوشیروان مستەفا، خەون یان مۆتەکە، ل ٩.

مولازم عومەر بۆ مەسعود بارزانی لە ۱۹۹۱/۳/۹ باسی سلێمانی دەکات و دەنوسێت: "هەر دوێنێ، مەعمەلی جگەرە، بەنزینخانە و دائیرەی تربیە، بینای حسیب سالْح و مطعمی ئەبو سەنا لەگەڵ کۆمەڵێک دوائیری تر، تالان کران و سوتێنران، ئەوراقی دائیرەکان بە ئەمنیشەوە، سوتێنراوە هەروەها بەشێک لە شتی خەستەخانەکان تالان کراوە، هەر دوێنێ حدودی ۱۰۰ کەس لەناو شاردا خەڵک هێرشی بۆ بردون گرتونیانن و کوشتویانن، هەندێکیان لێهەڵواسیون..."

ئەم دیمەنە، لە لایەک تورەیی هاولاتیان نیشان ئەدات بەرامبەر بە رژێم و دەزگا و سیخورەکانی، لە لایەکی تر، تالانکردنی مولک و مالی دەولەت، کە کەس بە هی خۆی نەزانیوە و دەولەت لای زۆر کەس، مانای حیزبی بەعس و دەزگا تۆقێنەرەکانی بوە. ئەم دیمەنە لە ولاتانی تری ناوچەکە کەمتر بینراوە، وەک لە ئێران لە کاتی شۆڕشدا، کە هیچ کەس دەسکاری مولک و مالی دەولەتی نەکرد!

هەر لەو بارەیەوە مەسعود بارزانی لە ۳/۸ ئەم بروسکەیەی بۆ لێپرسراوان و پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستانی بلاوکردەوە:

"لەم کاتە ناسکەدا بەرژەوەندی گەلەکەمان لەسەر هەمو لایەک فەرز ئەکات ئەوپەڕی ئیلتیزام بکرێت بە تعلیمات و گوێ گرتن لە مسئولینی محاور کە بەپێی بەرنامەی پێشوو دەستنیشان کراون. و بۆ هەمو وەزعێک ئەبێ بەپێی تعلیمات و ئەوامری مەسئولەکان پێشمەرگەی هەمو لایەنەکان گوێ رایەلی بن و هیچ لایەک بۆی نیە بەتەنها رەفتار بکات.

ئەبێ ممتلکاتی میلەت بپارێزرێت هەروەها ممتلکاتی دەولەت و رێگە نەدرێت بە بڕیار و رەفتاری سەربەخۆ کە شتی خراپ روبدات.، بۆ مەسئولین محاور هەیە هەرکەس لە تعلیماتی دیاریکراو دەرچوو دەست بەجێ سزای بدەن."

بریارەکەی بەرەی کوردستانی دەربارەی لێخۆشبون لە هەمو جاش و مستەشارەکانی رژێم، کاریگەری باشی هەبو، هانی زۆریانی دا، کە رۆڵی باشیان هەبێت لە راپەڕیندا، لەو بارەیەوە نەوشیروان مستەفا لە ۳/۱۱ بروسکەیەک بۆ کۆسرەت رەسول دەنوسێ: "هەمو ئەو کەسانەی لەگەڵ

بەعس بون، با بروسکەی پیرۆزبایی بۆ ئیستگە بنوسن. لەسەرکەوتندا لێبوردن و سنگ فراوانی گەورەیی و بڕیار رونیە".

## گەڕانەوەی مام جەلال و رزگارکردنی کەرکوک

بەرەوپێشچونی پرۆسەی راپەرین، وا لە نەوشیروان مستەفا دەکات کە جارێکی تر داوای گەرانەو لە مام جەلال بکات، پێش شەوی نەورۆز، ئەم بروسکەیە بۆ مام جەلال دنێرێت:

- "زۆرم پێخۆشە و باشە هەرچی زوترە بگەڕێیتە.
- ئیمشەو زەماوەندی ئازادی کەرکوک دەستپێدەکا و هیوادارم زۆر نەخایەنی و تەواو بێ و بیکەین بە عاصیمەی ئیقلیمی کوردستان.
- وەزعی ژیانی خەڵک زۆر خراپە بۆ خواردن و سوتەمەنی و پارە.
- لەمەولا ئەبێ بیر لە میزانیەی ئیدارەی کوردستان و فەوجەکانی دیفاعی وەتەنی بکەینەوە کە میزانیەیەکی زۆر گەورەی دەوێت....."

هەر دوای چەند رۆژێک بەدوای ئەم بروسکەیەدا، ئێوارەی نەورۆزی ١٩٩١، بە بۆنەی رزگارکردنی کەکرکوکەوە، نەوشیروان مستەفا ئاگاداریەک بڵاودەکاتەوە:

"بەبۆنەی ڕزگارکردنی شاری داگیرکراوی کەرکوکەوە لە دەسەلاتی پیسی بەعس, پیۆزبایی لەگەلی کورد لە عێراق و هەمو نەتەوەی کورد ئەکەم کە ڕۆژێک بەر لە نەورۆز هێزی پێشمەرگەی لایەنە سیاسیەکانی کوردستان و چەکدارە شۆڕشگێرەکان و جەماوەری ڕاپەڕیوی کورد، پشت ئەستور بەیارمەتی خوای گەورە و لێبڕانی ڕۆڵەکانی میللەتەکەمان توانی شاری پیرۆزی کەرکوک لە دەسەلاتی پیسی بەعس ڕزگار بکەن بەم بۆنەیەوە کەڕۆژێکی مێژوییە تاجی سەرکەوتنی کردە سەری ڕاپەڕینی گەلی کورد لە عێراقدا، داوا لە میللەتەکەمان ئەکەین کە بە یەکگرتن و یەکێتی ریزەکانی و بە وریایی و هۆشیاری پاریزگاری ئەم سەرکەوتنە بکەن".

نەورۆزی ١٩٩١، بە کاتە خۆشەکانی مێژووی کورد دەژمێرێت، ئەو کاتانەی زۆربەی خاکی کوردستان بە کەرکوکیشەوە، رزگار کرابو.

نەوشیروان مستەفا نوسیویێتی: "بەهاری ئازادی کورد زۆری نەخایاند، ئەم سەرکەوتنە گەورەیە وەرگەڕا بە گەورەترین شکستی جەنگی و، گەورەترین کۆچی بە کۆمەڵی کورد و، گەورەترین کارەساتی نەتەوەیی و، سەرئەنجام بۆ یەکەمین جار مەینەتیی کورد توانی بەزەیی بەشێ لە رای گشتی جیهانی پێشکەوتو بە دەس بهێنێ".

چەنـد رۆژانـی نەورۆز خـۆش و گرنـگ بـون و بە رۆژە مێژوییەکـانی گەلەکەمان دەژمێرێت و کاتێ هێزی پێشمەرگە توانی بچێتە ناو کەرکوکەوە، کە بە خەوێکـی دێـرین دەژمێـرا، بەڵام لا ناشـیرین و قێـزەوەرەکەی ئەم رزگاریە، تالآنکردن و بردنی (هەمو جۆرە) کەلوپەلێکی حکومی و گشتی بو، زوربەی هێزە سیاسییەکان بەشداری ئەم تـالآنییە بـون، لە هەمـو کەلـوپەلی بەنداوی بێخمە تـا هەمـو دام و دەزگـای رادیـۆ و تەلەفزیـۆنی کەرکوک و تـا گەیشتە هەوڵدان بۆ بردنی هەلیکۆپتەر..

ئاهەنگ و خۆشـی سـەکەوتن تەمەن کـورت بـو، چەنـد رۆژێکـی کەم دوای نەورۆز، رژێـم بە هەمـو هێـزیەوە دەسـتیکرد بە هێـرش بـۆ سـەر شـار و شـارۆچکەکان، لە کەرکـوکەوە دەسـتیپێکرد و لە مـاوەیەکی کەمـدا، زۆر شـوێنیان داگیرکردوە و بە هەزارەهـا هـاوڵاتی کوردسـتان بەرەو سنورەکانی تورکیا و ئێران هەڵهاتن.

## هاتنەوەی بەعس بۆ شارەکانی کوردستان

بەرەی کوردستانی لە دوای ٢٥ مارتەوە خۆیان ئامادەکرد بۆ چۆڵکردنی شارو شارۆچکەکان، بە هێنانی پارەی بانکەکان و هێنانە دەورەوەی کەلوپەلی پێویست و خۆ ئامادەکردن بۆ کاتی ترسناک، هەروەها پلانیان دانا کە هەردو بەنداوی دوکان و دەربەندیخان بتەقێنەوە.

چۆن رژێم لە ماوەیەکی کورتدا شکاو زۆربەی کوردستانی چوڵکرد، هێزە کوردییەکان بە هەمان خێرایی ناچاربون هەمان ئەو شار و شارۆچکەکانە چوڵ بکەنەوە.

"کورد لەو شەڕانەدا لەبەر دو هۆکاری سەرەکی نەیتوانی بەرگری لە شار و ناوچە رزگارکراوەکان بکات.

یەکەم: سوپای عێراق لە روی ژمارەوە رێکخستن و چەک و کەلوپەلی سەربازیەوە لە پێشمەرگە زۆرتر و رێکخراوتر و پۆشتەتر بو.

دوەم: ورەی پێشمەرگە و خەڵکی کوردستان بەهۆی ئەو روداوانەی دوایی بە تەواوەتی روخابو. لە بەرامبەردا ورەی سوپای عێراق و بەرپرسەکانی بەعس زۆر بەرز بو، چونکە دڵنیابون لەوەی ئەمەریکا نایەوێت رژێمی بەعس لە عێراق بروخێ، ئەمە جگە لە ترسی خەڵک و هێزی پێشمەرگە لە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە لایەن عێراقەوە لە ئەگەری بەرگریکردن لە شارەکان"[٣٠٥].

---

[٣٠٥] د. شۆڕش حاجی، ناسیۆنالیزمی کوردی، تاران ٢٠١٨، ل ٣١٥.

## گفتوگۆی نێوان بەرەی کوردستانی و ڕژێم

سەدام، پێش نەورۆز لە ڕێگای بەرزانی برایەوە لە جنێف نامەیەکی بۆ مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی نارد بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆ، خۆشی نامەیەکی تایبەتی بۆ مام جەلال نوسی و هانیدا کە ئەو فرسەتە لەدەست نەدەن.

زۆربەی سەرکردەکانی بەرەی کوردستانی، وەستانی شەڕ و دەستپێکردنی گفتوگۆیان پێباشبو، هە زو هەردو هێزی سیاسی، وەفدێکی هاوبەشیان لە فەرەیدون عەبدولقادر و عومەر فەتاح لە یەکێتی و ئازاد بەرواری و فازیل میرانی لە پارتی پێکهێنا.

سەدام لە ٢٤ مارتی ١٩٩١ دا، لە ڕێگای موکەرەم تاڵەبانیەوە، نامەیەکی زارەکی بۆ هەریەک لە مام جەلال و مەسعود بارزانی ناردبو، دەربارەی شەڕ وەستان و دەستپێکردنی گفتوگۆ، بەڵام تەنها چوار ڕۆژی دانابو، بۆ وەڵام، بەڵام نەتوانرا، لەو ماوەیەدا نامەکە بە هەمو لاکان بگات و وەڵامیشی دەستکەوێت، موکەرەم تاڵەبانی نەیتوانی مام جەلال ببینێ و چوار ڕۆژەکە کۆتاییهات و بەغدا هێرشی کرد و کەکوک گیرا[٣٠٦].

هەر لەو کاتانەدا و لە ٢٦ مارت، مام جەلال گەڕایەوە کوردستان، نەوشیروان مستافا باسی ڕۆژانی کۆچەکە و بەرگری هێزی پێشمەرگە، بەم شێوەیە دەکات: "لە ڕۆژانی ڕاپەڕیندا سەدان هەزار پارچە چەک، سوک و ناوەنجی و قورس، کەوتبوە دەس خەڵک و حیزبەکانی بەرەی کوردستانی. لە هەمو گەڕەک و کۆڵان و، لە هەمو قوتابخانە و دائیرەیەکدا، بارەگایەکی

[٣٠٦] خەون یان مۆتەکە، ل ١٤.

چەكدار دانرا بو. من خۆم یەكێك بوم لەوانەی ئەم دیاردەیەم بە لاوە شتێكی باشبو لەو باوەڕەوە كە ئەو بارەگا چەكدارانە لە كاتی هێرشی پێچەوانەی جەیشی عیراقیدا ئەبنە سەنگەری سەختی بەرگری كردنی ژیان و مردن و، ئەوە ئەبێتە سەرەتای قۆناغێكی نوێی ستراتیجی جەنگیی بزوتنەوەی نەتەوەیی كورد: ستراتیجی پێكەوە گرێدانی شەڕی ناوشار و شەڕی ناوشاخ. بەلام هەلاتنی خێرای پێشمەرگە و چەكدارەكانی كورد، كە تێكەلاو بون لە هی هەمو ناوچەكانی كوردستانی عێراق، لە بەردەم سەربازی عێراقی دا ئەم باوەڕەی كرد بە دالغەیەكی پوچ. ئەگەر لەسەر ستراتیجی ترین و دەولەمەندترین شاری كوردستان ئەوەندە بەرگری بكەن، ئەبێ لە سەر شوێنێكی نەناسراو چەندە شەڕ بكەن؟[٣٠٧].

---

[٣٠٧] هەمان سەرچاوە.

# سەرهەڵدانەوەی شەڕ لە نێوان پێشمەرگە و ڕژێم

کاتێ ڕژێم هێرشی دەستپێکرد، ڕێکخراوی موجاهیدینی خەڵکی ئێرانی، وەک سەربازی ڕژێم و بگرە درندەتر، کەوتبونە شەڕی پێشمەرگە و هاوڵاتیانی کورد، بە تایبەتیش لە ناوچەی گەرمیان و قوڵی کفرییەوە، لە بروسکەیەکی میحوەری یەک بۆ مام جلال و نەوشیروان مستەفا لە ١٩٩١/٣/٢٦، نوسیویانە: "سەرلەبەیانی ڕۆژی ٣/٢٥ لە قوڵی محوەری یەک بە درێژایی نێوان کەلار، قەرەتەپە، جەلەولا و خانەقین، هێزێک لە جەماعەتی مسعود و مریم ڕەجەوی هێرشیان هێنایە سەر ناوچەکە بە مەبەستی تۆقاندن و بڵاوەپێکردنی خەڵکی ناوچەی ڕزگاکراو، چوار دەبابە و یەک مدرعە خۆیانکرد بەناو کەلار و کوێرانە تەقەیان لەخەڵکی شارەکە کرد لە منداڵ و پیرو لاو و لێیان شەهید وبریندا بون..."

دەربارەی شەڕەکان و باری نالەبار و پەرتەوازەیی هێزی پێشمەرگە، کۆسرەت ڕەسوڵ لە بروسکەی ١٩٩١/٣/٢٩ دا بۆ نەوشیروان مستەفا، دەنوسێت: "هێرشمان برد بۆ پردێ لە ٥ میحوەرەوە، بەڵام سەرکەوتو نەبوین، بەڵام بەڕاستی بەم هێزە بێ سەروبەرە، ناتوانین هیچ بکەین چونکە هیچ پێشمەرگە لەگەڵدا نیە، بۆیە ئەبێ حساب بۆ تنظیمکردنەوەی خۆمان و ئەم ضروفە بکەین".

هەروەها، لەم بروسکەیەی حەسەن کوێستانیدا لە ١٩٩١/٣/٢٨ بۆ کۆسرەت ڕەسوڵ و ئاگاداری نەوشیروان مستەفا، دەردەکەوێت کە بارودۆخی بەرەکانی شەڕ چەند ئاڵۆزە و پێشمەرگە ناتوانێت ئەو بەرگرییە بکات کە چاوەڕوانی لێ دەکرا: "هێزەکەمان شەڕناکات، لە ٢٠٠ پێشمەرگە لە

زنجیرە چیاکانی دومەڵان دانراوە، شار بەدەست دوژمنەوەیە، قوڵەکان بە گشتی شکاوە، زۆربەی هێزەکە دەرچوە و هێزەکە توانای بەرگری نەبو لە زنجیرەی کانی دومەڵان. ڕێگای سلێمانی گیراوە، خەڵک شاریان چۆڵکرد، ژمارەیەکی کەمی هێزی خۆمان شەڕ دەکات، پەلامارەکە زۆر گرانە لە هەمو لایەکەوە، خۆشت ئاگاداری تەقەمەنی و ئازوقەیت، کە نیە. دوا کەس لەگەڵ کاک سەفین لە گەلی سێکانیان لە ژێر لولەی دەبابەوە، بە شەڕ دەرباز بوین. شەڕکەر بە دەیان و هەڵهاتوەکان بە سەدان".

هەر لەهەمان ڕۆژدا، مولازم عومەر بروسکەیەک بۆ نەوشیروان مستەفا و مەسعود بارزانی دەربارەی بارودۆخی ناوچەی کەرکوک دەنوسێت: "هێزەکەی دوژمن لە تقدمدایە بەرەو جادەی سلێمانی. قەرەهەنجیریان گرت. روحیەی مقاوەمە زۆر کزە. تەنها هێزی پێشمەرگەی یەکێتی و پارتی لێیە ئەویش هێزێکی شەقوشڕە. تەقەمەنی هیچ نەماوە، پێم چاکە هێزێکی گەورە بنێرن، وا پێشنیار دەکەم یەکێتکان لای هەولێر بن و یەکێتکان بچنە پشتی جەبهە لە سلیمانی هیچ نەبێ بۆ ناردنی هێز و تقویە و روحیەی پێشمەرگە و جەماوەر".

لە کۆتایی مارتی ١٩٩١دا، ڕژێم خەریکی گرتنی زۆربەی شار و شارۆچکەکان بو، وە هەوڵیدا دەستبەسەر شارەکانی هەولێر، سلێمانی و دهۆکدا بگرێت و لە ماوەیەکی کەمیشدا توانیان داگیریان بکات، نەوشیروان مستەفا لە بروسکەیەکدا بۆ کۆسرەت ڕەسوڵ و لیژنەی بەرەی کوردستانی لە هەولێر، لە ٣١ مارتدا نوسیویتی: "بە هەمو تواناتانەوە دیفاع لە شاری هەولێر بکەن، وە شەڕی ناوشاریش بکەن"

لە بروسکەیەکی کۆسرەت ڕەسوڵدا بۆ مام جەلال لە ٤/٣ نیشانی ئەدات کە کوردستان بە چ قۆناغێکدا تێدەپەڕێت: "

١. تکایە وابکەن چەند سەیارەیەک ئازوقە و تەقەمەنیمان بۆ بنێرن لەسلێمانیەوە، چونکە بەڕاستی هیچمان نیە و هەمو هێزەکە بێ ئازوقەیە.

٢. هیمەت بکەن چارەیەکی ئەم خەڵکە بکەیت چونکە بەڕاستی لەبرسان

و بێ جێگایی هەرهەمویان دەمرن خەڵکی دهۆک و هەولێر و کەرکوک ئەگەر شتێکی فەوریان بۆ نەکرێ کارەساتێکی گەورەیە".

لەسەرەتای مایس زۆربەی کوردستان و بە تایبەتی شار و شارۆچکەکان کەوتنەوە ژێر دەسەڵاتی بەعسەوە، ورەی زۆربەی سەرکردەکان روخابو، یەکێکی کەم لەوانەی کە ورەیان زۆر بەرز بو، مام جەلال بو، لە کاتی ئەو هەرەسە و راکردنەدا، ئەم ورە بەرزیە سیمای سەرکردەی سیاسی و عەسکەری نیشان ئەدات، کە چەند گرنگە بتوانیت سەرکردایەتی بکەیت و تۆوی بەرگری بچێنێت و نەڕوخێیت، ئەم بروسکەیەی لە ١٩٩١/٤/٤ دا بۆ دانای ئەحمەد مەجید نوسیوە لە کاتێکدا کە زۆربەی کوردستان جارێکی تر داگیرکراوەتەوە:

١. هێشتا زۆری کوردستان بەدەست خۆمانەوەیە. لەبادینان عمادیە، هەموی لەگەڵ هەمو ناحیەکانی قەزاکانی زاخۆ، شێخان، دهوک و بەشێکی چاکی عەقرەش.

٢. لە لیوای هەولێر لە مصیفەوە بەدەست خۆمانەوەیە هەتا سنووری ئێران و تورکیا، هەر ناو شاری هەولێر و مەخمور لەدەست میرییە.

٣. هەمو سلێمانی لەدەست خۆماندایە.

٤. کفری وکەلار و قادر کەرەم و لیلان و چەمچەماڵ لە کەرکوک بەدەست خۆمانەوەیە

٥. لاجئەکان لەترسی تۆپباران و کوشتن هەڵدێن بەرەو شاخەکان و ئێران.

٦. لە خراپترین حاڵدا وەزع وەک زەمانی بارزانی لێدێتەوە، واتە زۆر باشتر لە جاران بەلام گەر خۆمان رێکخەین ئەوا زووتر باشتر دەبین".

ئەو شەڕ و ئاوارەبونە لە کاتێکدا بو، باری ئابوری کوردستان بە خراپترین قۆناغدا ئەرۆشت و خواردن بەرەو نەمان دەچو، هاولاتیان بێ دەرامەت مابونەوە، بە تایبەتیش، هاولاتیانی شوێنە دورەکان، شەوکەتی حاجی موشیر، لە بروسکەیەکدا لە ١٩٩١/٤/٤ بەم شێوەیە باسی دەکات: "خەڵکێکی زۆر لە دەربەندیخان و عەربەت بارانێکی زۆر لێیان ئەدا ئاوارە

بون و خەڵکێکی زۆریان لێمردوە، هەوڵ بدەن فریای ئەو خەڵکە بکەون زیاتر لە هەزار کەس گەر فریای نەکەون زۆریان لێ ئاوارە ئەبێ و مردن چاوەڕێیانە، هەوڵبدەن لەگەڵ خزمان بەڵکو ئازوقەیان بۆ بنێرن چونکە هەمویان ژن و منالْن"

هەر لە هەمان رۆژدا، مامۆستا نازم کە سەرپەرشتی ناوچەی دهۆکی یەکێتی دەکرد، ئەم بروسکەیە بۆ مام جەلال دەنێرێت و نیشانی ئەدات کە بارودۆخی ناوچەی بادینان چۆنە: "ئەمشەو گەلی دهۆکیش لەلایەن پ.م چەکدارەکان چۆڵ کرا. ئاوەدانی تیا نەماوە ناوچەکە تەنها چەند مقراتێکی پ.م نەبێ . ئامێدی و شیلادزێ ماوە، لەچەند پێشمەرگەیەک زیاتری لێ نیە. هەمو خەڵکەکە رویان لە حدودی تورکیا کردوە بەشێکیش بەرەو بارزان و دیانا رۆیشتوون. تەنها ملازم علی لەگەڵ ۲۰-۳۰ پ.م و نقیب خلیل لەگەڵ دو پ.م. لەگەڵ نوێنەری پارتی و حسک و گەل، کۆبونەوەم کرد کەس هێزی پێ کۆنەبوەوە، ئیمرۆ ۳ پ. م لای شەهید حسن سلیم کەوتنە گەڵمان ئەگەرنا کەسمان لانەبوو.."

هێزە کوردستانیەکان، بە چ خێراییەکی زۆر توانیان زۆربەی کوردستان رزگار بکەن، حکومەتیش توانی بەهەمان خێرایی ئەو شوێنانەی لەدەستی دابو بیگرێتەوە، ئەوەش لە ئەنجامی ئەوەی کە سوپای عێراق، پڕ چەک و تەقەمەنی و ئازوقەی زۆر و مەعنەویاتیان نزم نەبو، لە بەرامبەردا، سەرەڕای ئەوەی هێزی پێشمەرگە، هێزێکی نایەکگرتو و نانیزامی بو، بە ژمارەش کەم بون و چەکی باش و نە تەقەمەنی زۆر لەبەردەستا نەبو، ئینجا برسێتی و سەرما و سوڵە، هۆ بون بۆ دابەزینی مەعنەویاتیان.

# کۆڕەوێکی تری کورد

ڕۆژانە دەبیسترا کە فلان شار و فیسار قەزا گیراوە، هەروەها زۆربەی ماڵ و منداڵیان ڕایانکردبو بەرەو سنورەکانی تورکیا و ئێران و پێشمەرگەکانیش زۆربەیان شوێنیان کەوتن، لەبەرئەوە هێزی پێشمەرگە ژمارەکەی زۆر کەم بو، کەرەسەی بەرگری نەبو، تەنها دەرگای هەڵهاتنی لەبەردمدا کرابۆوە.

حسێن عارف، وەک نوسەرێکی دیار بەم شێوەیە باس ڕۆژی ٢/٤ ی سلێمانی دەکات: "خەڵکی شار لە بەیانییەوە دەستیان بەجێهێشتنی کرد، سەعات لە دوای سەعات ژمارە تا دەهات زیاتری دەکرد. هەندێ لە کوڕوکاڵانی خوێنگەرمی شار حەماسەت گرتنی و لە گەڕەکەکان و سەرشەقامەکان، بەنیازی ورە بەرزکردنەوەی خەڵکەکە کەوتنە خۆنیشاندان، بەبێ هودە بەدەم هێتاف کێشانەوە دەخولانەوە. هەندێکی تر بەتایبەتی لە چەکداران، لەسەر ڕێگاکانی دەرەوەی شار کەوتنە سەیتەرە دانان و بەرگرتن لە هەڵاتنی خەڵکەکە، لەسەرەتادا توانیان هەندێک بگەڕێننەوە، بەڵام کە ڕێچکە بووە لێشاو، جڵەویان لە دەستدا نەما و وازیان هێنا. لە دەمە دەمی نیوەڕۆدا مام جەلال لە رادیۆوە (دەنگی گەلی کوردستان، کە لە دوای ڕاپەرینەوە هاتبووە ناو شارەوە)، وتەیەکی داو داوای لە خەڵکەکە کرد شار چۆڵ نەکەن و بە حەماسەتەوە ڕایگەیاند، کە هێزەکان (پ.م) بەرگری لێدەکەن و نایەڵن سوپای بەعس پێی تێ بنێتەوە. بەڵام ئەوەش بێ سوودبوو، لێشاوی هەڵاتن بەرەو دەرەوەی شار، تا دەهات لە زیادبون بو"[٣٠٨].

---

[٣٠٨] حسێن عارف، بیرەوەری، بەرگی ٢، ل ٥٢.

## بڕیاری ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایش

ئەو رۆژەی مام جەلال وەڵامی داخوازیەکانی سەدام و بارزانی دایەوە، بە سەرەتای گفتوگۆی نێوان بەرەی کوردستانی و رژێم دانرا، لە هەمان رۆژدا، واتا ١٩٩١/٤/٥ ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتوەکان بڕیارێکی لە سودی گەلی کورد دەرکرد، ئەوە یەکەمجار بو بڕیارێکی لەو بابەتە لە مێژوی ئەو رێکخراوەدا لە بەرژەوەندی کورد دەربکرێت. بڕیارەکە بە دەستپێشخەری ئەمەریکا و بەریتانیا و فەرەنسا ئامادە کرابو بە ناوی بڕیاری ژمارە ٦٨٨ (١٩٩١)ەوە دەرچو، بە بڕیاری ٦٨٨ ناوی دەرکرد.

هەر لەو رۆژەدا، مام جەلال بروسکەیەک بۆ مەسعود بارزانی دەنێرێت و تێدا دەنوسێ: "ئیمرۆ لە شامەوە ئاگادار کرام، کە بارزان (بارزان تکریتی) پێی گوتون، سەعاتی شەڕ راگرتن بۆ ئێمەیان بەجێ هێشتوە، منیش وا خەبەرم نارد، کە ئیمە رازین بۆ شەڕ راگرتن"

لە ١٩٩١/٤/٧ مام جەلال لە بروسکەیەکی تردا بۆ مەسعود بارزانی نوسیویتی: "مقدەم دارام ناردەوە بەغدا لەسەر داوای خۆیان، بە بێ سیم قسەی لەگەڵ کردم، کە میری ئەمری داوە بە راگرتنی شەڕ و ئامادەشە بە رادیوێش بڵاوی بکاتەوە.

هەروەها مام جەلال لە بروسکەکەیدا بۆ مەسعود بارزانی نوسیویتی.. نزیکی دوسەد بارزانی لە ماوەتن، بەڵام بەقسەم ناکەن، داوای پەنجا پێشمەرگەم لێکردن بۆ جەبهەی ئەزمر، نەیان ناردو نەچون، خەریکە ئازوقەشمان تەواو دەکەن. تکایە بیانبەرەوە لای خۆتان، چونکە حەتمەن بە قسەی جەنابت دەکەن و لەوێ کوڕەکیان پێ بگرە لەگەڵ گەلی عەلی بەگ".

## چونی وەفدی کورد بۆ بەغدا و خولێک لە گفتوگۆ

وەفـدی کـوردی هەردوهێـزەکە لە ١٩٩١/٤/١١ لەگەڵ دارای تۆفیـق ئاغـا بەرێکەوتـن بـۆ بەغدا و زۆربەی سـەرکردایەتی بەعـس و حکومەتیـان بینـی و بەعسییەکان داوایان کردبو کە مەسعود بارزانی یان مام جەلال بێت بۆ بەغدا، چونکە ئەوان دەسەڵاتدارن و ئەتوانن خێراتر بڕیار بدەن. دوای مشـتومڕێکی زۆری بەرەی کوردسـتانی تکایـان لە مـام جەلال کـرد، یەکەمجـار ئەو نوێنەرایەتی بکات و بچێت بۆ بەغدا و هەمو دەسەڵاتێکی گفتوگۆی هەبێت.

وەفدی' بەرەی کوردستانی بەسەرۆکایەتی مـام جەلال و هەریەک عومـەر فەتاح، عومەر عەبدوڵا (ملازم عومەر) نێچیروان بـارزانی، ئازاد بـەرواری لە پارتی و رەسوڵ مامەند لە سۆسیالیست و سـامی عەبدولرەحمان لە پارتی گەل و دارای تۆفیـق ئاغـا وەک ئەفسـەری پەیوەنـدی لە ٢٠ نیسـاندا بەرەو بەغدا بەرێکەوتن.

لەبەرئەوەی وەفـدەکە، لەسـەرەتادا پرۆژەیەکـی خۆیـان ئامـادە نەکردبـو، گفتوگۆکـــان زیـــاتر لە چوارچێـــوەی بەیـــانی ١١ ئـــازاری ١٩٧٠ و ئاسـاییکردنەوەی بـارودۆخی کوردسـتان بەرێـوە دەچـو، وەفـدەکە دوای هەفتەیەک لە گفتوگۆ گەڕانەوە کوردستان.

دوای گەڕانەوەی مام جەلال، مەسعود بارزانی چو بۆ بەغدا و لەوێوە لە بروسـکەیەکدا بـۆ مـام جەلال لە ١١ مایسـدا ئەنوسـێ: "ئەم نیـوەڕۆیە لەگەڵ سـەرۆک دانیشـتم، یەکجـار زۆر ئیجـابی بـو، لـوطفی زۆر زۆر بـو، وا ئەزانـم هەمو کارەکانم تەواو بوە، بە خێر و خۆشـی هەمـو لایەک و ئەم دیتنە ئیشـە ریشـییەکانی تری ئاسـانتر کرد، ئێسـتا ئیشـە ئەساسـیەکان ئەوەیە کە خزمەتـی

عێراق و برایەتی کورد و عەرەب ئەکات، تێبینی ئەکەین من خۆم شەخسی زۆر متفائیلم پاش دیتنی سەرۆک، تکایە بفەرمون بۆ ئاگادارکردنی لایەنەکانی بەرە".

جارێکی تر لە ٥/٧ تا ١٧ حوزەیران وەفدێکی تری بەرەی کوردستانی بەسەرۆکایەتی مەسعود بارزانی لە بەغدا مانەوە، لە ١٩٩١/٥/٢٠، مەسعود بارزانی بروسکەیەکی بۆ هێزی پێشمەرگەی کوردستان ناردوە، تێدا هێڵە سەرەکییەکانی گفتوگۆی لەگەڵ بەعس دارشتبو، کە سەردێرەکانی بریتی بون لە (ئاسایکردنەوەی بارودۆخی کوردستان، دیموکراتیەت، قانونی حوکمی زاتی).

وەفدی کوردی لە بەغدا زۆر نەچونە پێشەوە، ئەنجامی گفتوگۆکان زۆر بەرهەمدار نەبون، لە بروسکەیەکدا مام جەلال لە ١٩٩١/٥/٢٧ بۆ د.کەمال فواد لە دەرەوەی کوردستان دەنوسێ: "وا دیارە گفتوگۆ چەقیوە، میری بەتەما نیە، مەندەلی، خانەقین، کەرکوک و سنجار بدات، وا سێیەمین نامەم ناردوە بۆ وەفدەکە تاکو بۆ پشودان بگەڕێنەوە" دوای مانەوەیەکی زۆر وەفدەکە بەسەرۆکایەتی مەسعود بارزانی لە ٦/٢٧ گەڕانەوە کوردستان.

مەسعود بارزانی کە لە بەغدا گەڕایەوە، لە ١٩٩١/٦/٢٧ لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ رادیوێی یەکێتی و پارتی بە پێچەوانەی بۆچونەکانی مام جەلال، بە ئیجابی باسی گفتوگۆی نێوان رژێم و بەرەی کوردستانی کردوە، لە قسەکانیدا هاتوە:

"١. لەسەر قانونی حوکمی زاتی رێکەوتوین.

٢. دەسەڵاتی سەرۆکی ئەنجومەنی تەنفیزی لە جاران زیاترە و خۆشی دەبێتەوە وەزیرێک لە ئەنجومەنی وەزیران، ئەندامانی ئەنجومەنی تەنفیزی بە دەرەجەی وەزیر دەبن.

٣. ساڵەکانی شۆڕش بە خزمەت حساب دەکرێت بۆ ئەو کەسانەی فەرمانبەربون و هاتونەتە ریزی شۆڕشەوە، ئەمەش بۆ تەقاعدی.

٤. خێزانی شەهیدان و پەککەوتە، موچەیان بۆ دەبڕێتەوە.

٥. دەربارەی ناوچەکانی حوکمی زاتی هەنگاوی باش نراوە و دوایی ئیعلان دەکرێت.

٦. بە نیسبەت دیموکراسیەوە، بڕیار لەسەر ئەمانە دراوە: تعددی حیزبی،

جیاکردنەوەی حیزب لە دەوڵەت، جیاکردنەوەی هەر سێ دەسەڵاتەکە: جێبەجێکار، تشریعی، قەزائی.

دەربارەی دەستوری هەمیشەیی، بەرەی کوردستانی و حکومەت، دەستور ئامادە دەکەن و دەخرێتە بەردەم هاولاتیان بۆ دەنگدان لەسەری."

بۆچونی مەسعود بارزانی و مام جەلال دەربارەی گفتوگۆ و ئەنجامەکانی جیاواز بون، هەرچی مەسعود بارزانی هەبو، پێیوابو کە پێویستە بەردەوام بن لە گفتوگۆ و لە ئەمەریکا و دۆستەکانی زۆر بێ هیوا بو. تاڵی و ناخۆشی رۆژانی رەوەکەی لەبەرچاو بو، لەبەرئەوە مەبەستی بو لەگەڵ سەدام بگەنە ئەنجامێک. هەرچی مام جەلال بو، زۆر ڕەش بین بو لە گفتوگۆیان لەگەڵ سەدام و متمانەی بەو نەمابو و بۆچونی وابو کە بەعس ئەم گفتوگۆیە تەنها بۆ کات کوشتن ئەبات بەڕێوە و هیچ بڕوایەکی بە چارەسەری کێشەی کورد نیە.. ئەم دو بۆچونە جیاوازە، سەرەتای ناکۆکی نێوان پارتی و یەکێتی بو، وە رەنگیشی دابۆوە لە گفتوگۆیاندا لەگەڵ بەغدا.

## پرۆڤاید کۆمفۆرت

هاوپەیمانان، بە تایبەتی ئەمەریکا، ئینگلیز، فەرەنسا، کەوتبونە جێبەجێ کردنی بڕیاری ٦٨٨ ی ئەنجومەنی ئاسایش، هێزیان نارد بۆ کوردستان و "پەناگای ئارام" یان دروستکرد بۆ پاراستنی کورد لە دەستدرێژی سوپای عێراقی و ناوچەی نەفڕینیان راگەیاند و لە ٢٠ نیسان تا ٧ ی مایسدا دەستیانکرد بە دابەشکردنی خۆراک بەسەر ئاوارەکاندا.

لە ١٦ی مایسدا جۆرج بوش بڕیاریدا، سنوری چالاکی "پرۆڤاید کۆمفۆرت" فراوان بکات و جەنەراڵ شالیکاشفیلی بو بە سەرۆکی "هێزی ئەرکی هاوبەش"ی ئەمریکی، بەشێکی ئەم هێزە بە سەرکردایەتی جەنەرال جای گارنەر هاتنە ناو زاخۆوە.

لەسەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩١، لە چەند شوێنێکی کوردستان،

ئـاڵۆزی کەوتە نێـوان هەنـدێ هێـزی یەکێتـی و پـارتی، بەڵام بە هەردولا هەوڵیانـدا ئـارامی بکەنەوە و مەسـعود بـارزانی خـۆی بروسـکەی بـۆ هەمـو فەرماندەکان کرد و (م.س) یەکێتیش پشتگیری هێمنکردنەوەیان کرد.

مەسـعود بـارزانی لە ١٩٩١/١٠/٩ بە بروسـکەی ژمـارە ٤٣٣٧ بـۆ هەمـو لایەنەکـانی بەرەی کوردسـتانی دەنوسـێ: "پـاش دانیشـتن لەگەڵ برایـانی (ی.ن.ک) ئیتیفاقکرا، توندی لە هیچ شوێنێک نەمێنێت، وە هەر مەسئولێک پلەی هەرچـی بێـت، ئەگەر سـەرپێچی بکـات و لە تەعلیمـاتی سیاسـی بەرەی کوردستانی لا بدات، توشی سزا دەبێت."

لە هەمان رۆژدا، فەریق روکن حسین کامیلی زاوای صەدام، بروسکەیەک بۆ مەسعود بارزانی دەنێرێت لەسەر ئەو تەجاوزاتانەی کە هێزی پێشمەرگە لە ٩/٢٥ تا ١٩٩١/١٠/٥ کردویانەتە سەر هێزەکانی عێراقی بە وردی رۆژانی هێرشەکە و زەرەر و زیانەکانی خستۆتە رو.

رۆژی ١٩٩١/١٠/٥ حکومەتی عێراق بە هێزێکی زۆر و چەکی قورسەوە، هێرشـیان هێنـایە سـەر شـاری کفـری و توانیـان بیگـرن، هەر دوای رۆژێـک هێزەکانی ٢ قەرەداغی یەکێتی، بە هاوبەشی هێزێکی حشع و چەند هێزێکی تـر بەرگرییـان کرد، کە زیـاتر نەیەنە پێشـەوە، بە تـایبەتی رژێم مەبەسـتی بـو کە سەرقەڵاش بگرێت، بەڵام لەوێدا شکستیان هێنا و زیانێکی زۆریان لێکەوت[٣٠٩]. ئەمە نیشـانی ئەدات، کە پەیوەنـدی نێـوان رژێـم و بەرەی کوردسـتانی بەرەو ئاڵۆزی و گرژی و شەڕ دەڕۆشت.

لەو رۆژانەدا و ورد تـر، لە ١٩٩١/١٠/٨، تۆپەکـانی رژێـم لەسـەربازگای تـانجەرۆی نزیـک سلێمانی، تۆپبـارانی نـاو شـاری سلێمانیان کرد و بوەهـۆی شەهیدکردن و بریندارکردنی ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیان.

لەو کاتانەی کە هێزەکانی رژێم شارەکانی کوردستانیان تۆپباران دەکرد، گرژی لە نێوان هێزەکـانی یەکێتـی و پارتیدا پەرەی سـەندبو، لە بروسکەی

---

[٣٠٩] زانیاری لە عوسمانی حاجی مەحمود، سەرپەرشتیاری هێزەکەی یەکێتی ٢٠١٩/٤/٢٣.

ژمارە ٤٣٣٨ ی ١٩٩١/١١/٨ مەسعود بارزانیدا بۆ د. رۆژ و لقی ٤ پارتی دەنوسێت: "لەبەرئەوەی جەبار فەرمان و تاقمەکەی چونەتە لای دوکان، وە زۆر زیادڕەویان کردوە، گوتویانە خۆمان خاوەنی کوردستانین و هەرچی حەزبکەین ئەیکەین، و کەس ناناسین. کە شت گەیشتە ئەم حدودە، ئیتر ئیعتیبارات نامێنێت، قواتی خۆتان بە زۆری ئامادەبکەن، منیش بە قوەتێکی زۆر لێرەوە حەرەکەت دەکەم بۆ تەنبیەکردنی ئەم کەسانە ئەگەر لەوێ نەڕۆشتن، کەی ئامادە ئەبن، وەڵام فەورەن"

لەوکاتە ئاڵۆزەی کوردستاندا، کە پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستان و سوپای عێراق بەرەو ڕوی یەکتر وەستاون، خەریکە لەبەر کێشەیەکی سنورداری بچوک، شەڕێکی گەورە لە نێوان هێزە کوردیەکاندا روئەدا، گرژی نێوانیان زۆرجار رویداوە، بەڵام کەمجار، مەسعود بارزانی هەرەشەی ئەوەی کردوە، کە خۆی شەخسی سەرکردایەتی هێرشێک بکات بۆسەر ئەندامێک و دۆستێکی پارتی لە بەرەی کوردستانیدا. مەسعود بارزانی هەر لەو رۆژانەدا چەندەها بروسکەی لەوجۆرەی ناردوە بۆ لق و هێزەکانیان لە زۆر شوێنی تر لە کوردستان.

## کشانەوەی فەرمانگاکانی رژێم لە کوردستان

لە ١٩٩١/١٠/٢٤، رژێم هەمو دائیرەکانی جگە لە کارەبا، دەزگاکانی تەندروستی و بازرگانی و نەوتی لە هەرسی پارێزگای کوردستان راکێشایەوە بۆ ناوچەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی کوردی، رۆژێ دوای ئەوە مەسعود بارزانی نامەیەکی ئاراستەی عێزەت ئیبراهیم جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کرد و داوای لێکرد، کە ئەو بڕیارە بکشێنەوە.

دەربارەی هەمان کێشە سەدام دەڵێ: "ئەیانویست (هێزە کوردیەکان) لە خوێن رشتن لە شەڕ بەرەوام بین..بەڵام ئێمە وتمان: با سوپا و دەزگا حکومییەکان بکشێنەوە، چونکە کارمەندانی دەوڵەت نەیان ئەتوانی ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێبکەن"..هەر لەوبارەیەوە لە شوێنێکی تردا دەڵێ: "داوامان لە سوپا

کرد کە بە شێوەیەکی کاتی شوێنەکانی خۆیان چۆڵ بکەن..دوای ئەوە میللەت هاواری لێهەڵدسێت و داوا لە سوپا دەکات کە رزگاری بکات"[210].

گرژی و ئاڵۆزی لە مانگەکانی ئەیلول تا کۆتایی ساڵی ١٩٩١ لە نێوان یەکێتی و پارتیدا بەردوام بو، لە ١٠/٩ دا، (م.س) یەکێتی بروسکەیەک بۆ هێزەکانی خۆی دەنێرێت و داوای ئەوە دەکات کێشەکانی نێوان یەکێتی و پارتی بە شێوەیەکی هێمنانە چارەسەربکەن و نەهێڵن حکومەتی بەعس پیلانی سەرکەوێت بۆ دروستکردنی شەڕی ناوخۆ و لەدەستدانی عەتفی نێودەوڵەتی. لە هەمان رۆژدا بە بروسکەی ٤٣٧ ی مەسعود بارزانی بۆ بەرەی کوردستانی، هەواڵی کۆتاییهێنانی گرژی نێوان پارتی و یەکێتی راگەیاندوە.

بڕیاری کشانەوەی فەرمانگا حکومیەکان، دڵەراوکێیەکی زۆری خستە ناو هاوڵاتیانەوە، جگە لە بڕینی موچە لە فەرمانبەرانی هەرێم، هاتنی هەمو هاوکاریەک و شتومەکێکی لە بەغداوە بۆ ناو هەرێم قەدەغە کرد. لەو بارەیەوە مەسعود بارزانی لە ١٩٩١/١٠/٢٤ دا نامەیەکی بۆ عیزەت ئیبراهیم وەک جێگری سەرۆکی ئەنجومەتی سەرکردایەتی شۆڕش نوسیوە: "داوا دەکەم کە ئەمر بفەرمون بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارەی کە دراوە، بە کشانەوەی فەرمانگەکان لە پارێزگاکانی، دهۆک و هەولێر و سلێمانی، جێبەجیکردنی ئەم بڕیارە، کەشوهەوایەکی دودڵی بڵاودەکاتەوە و هاوکاری ئەوانە دەکات، کە دژی ئاشتی و برایەتی کورد و عەرەبن، کە بە بڕوا و قەناعەتەوە هەوڵی بۆ ئەدەین، پێویستە هەوڵ بدەین بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە سەرەکیەی کە هەمو گەلی عێراق چاوەڕێیەتی. رۆژی شەمە، ریکەوتی ١٩٩١/١٠/٢٦ نوێنەرانمان دێن بۆ بەغدا و ئەم کێشەیە لەگەڵ لێپرسراوان باس دەکەن، هیوادارین بتوانن ئێوە ببینن بۆ ئەوەی باسی کاری پێویست بکەن بۆ گەڕانەوەی فەرمانگەکان و کارکردنیان بە زۆر سەربەستانە و بێ

[210] آوفر بينغيو، كرد العراق، بناء دولة داخل دولة، دار ئاراس-الساقي ٢٠١٤، ل ٢٦٧، لە رۆژنامەی الثورة ١٩٩٢/٣/١٢-١٩٩٢/١١/٢٤.

ئەوەی هیچ لایەک دەست بخاتە ناو کاروباریانەوە. ئەگەر پێویستیشی کرد، تکایە ئەم داخوازیەمان بگەیەنە سەرۆک کۆمار. لەگەڵ سوپاس و رێز..."

بێگومان ئەم داخوازیە، هیچ کاریگەرییەکی نەبو، میری لەسەر بڕیاری خۆی بەردەوام بو. داوای لە کارمەندانی حکومەت کرد، ئەوەی داوای موچە دەکات، پێویستە لەسەری لە فەرمانگەکانی حکومەت لە "دەرەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی" دەوام بکات.

لە کۆتایی ساڵدا، پەیوەندی نێوان یەکێتی و پارتی، بۆ ماویەک بەرەوباشی دەرۆشت، لە بروسکەیی ژ. ١٠٣ ی ١٩٩١/١١/١٩ دەردەکەوێت کە مام جەلال بەم شێوەیە بۆ مەسعود بارززانی نوسیوە: "ئەمرم داوە بە هێزی پێشمەرگەی کوردستانی (ی.ن.ک) کە ئەمری جەنابتان جێبەجێ بکەن، هەرچەندە پێموایە هەق نیە ئەوەندە لە میری قبوڵ بکرێت، بە تایبەتی ئەو هاتنە پێشەوەی لای کفری و کەلار، مانای سقوطی عەسکەری کفری و کەلارە، بەلام لەبەر خاتری جەنابتان ئەمرمدا، کە لە ئەمری جەنابت دەرنەچن".

## ١٩٩٢

## سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوان پارتی و یەکێتی

ساڵی ١٩٩٢، ساڵی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و ساڵی سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوان یەکێتی و پارتی بو، لە ٨ نیسانی ئەو ساڵەدا، بەرەی کوردستانی پرۆژەی یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانی پەسەندکرد و بڕیاری ڕێژەی ٧٪ درا بۆ هەر هێزێکی سیاسی کە بەشداربێت لە پەرلەماندا.

لە ٢٢ ی نیسانیش بەرەی کوردستانی بڕیاری پرۆژەی ڕابەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردی پەسەند کرد.

لەو کاتانەدا، لە هەندێ شوێن وەک ئاگرێ گرژی کەوتبوە نێوان یەکێتی و پارتیەوە، لە بروسکەیەکدا لە ١٩٩٢/٤/٢٦ مەڵبەندی بادینان و لەشکری ٣ یەکێتی بۆ د. فواد مەعسوم ئەندامی (م.س) یەکێتییان ناردوە نوسیویانە؛ "بارەگای کۆمیتەی ١ی یەکێتی بە دەست پارتیەوەیە و ئەندامەکانی لای ئەوان گیراون، تاکو ئێستا ٥ جار ئاگاداری کۆمیتەی ٢ و بارەگاکانی یەکێتی کراون کە ناو ئاگرێ چوڵ بکەن..."

لە وەڵامی ئەم بروسکەیە، مام جەلال ڕۆژێ دوای ئەوە لە ٢٧ی نیساندا بروسکەیەک ئاراستەی (م.س). یەکێتی دەکات و دەڵی ئەتوانن خۆتان بروسکەکە بۆ مەسعود بارزانی بنێرن و تێیدا نوسیویتی: "وا چەند جارە تەعەدای هێزی ئێوە دوبارە دەبێتەوە، داواکارم دەستبەجێ ئەمر بکەن، پەلاماردانەکان بوەستێنن، ئەگینا دەست ئەکەینەوە و ئۆباڵەکەی لە ئەستۆی شەڕفرۆشە..."

لە هەمان ڕۆژدا (م.س) پارتی وەڵامی بروسکەکەی یەکێتیداوەتەوە و نوسیویانە: "..هێزەکانی ئێوە بە ناهەق ڕۆژی ٢٠ نیسان کادیرێکی ئێمەیان

شەهیدکردوە، بێئەوەی پێشەکی هیچ شتێک رویدابێت، پاشان تەقەیان کردوە لە مقراتی ئێمە و تەعەدایەکی گەورەیان کردوە، ئەمە ئیعلانی شەڕە نەک دیفاعکردن، چونکە هێزەکانی ئێوە دەستیان پێکردوە، پێمان خۆشە کە بزانن کە تەعەدا قبوڵ ناکەین...

ئەم بروسکانە نیشانی ئەدا کە پەیوەندییەکانی یەکێتی و پارتی چەند ناسک بون و هەڕەشەیەک یان کارێکی ناڕەوا و لابەلا بۆتە هۆی ترسی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ.

نزیکی دوهەفتە پێش هەڵبژاردن، هەردو هێزی سیاسی (حیزبی زەحمەتکێشان و کۆمەڵەی سۆسیالیستی کوردستان (ئاڵای شۆڕش) لە نێوان ٤/٢٧-١٩٩٢/٥/١ کۆنگرەیەکیان بەست و یەکیان گرت و بڕیاریان دا لە هەڵبژاردنی پەرلەماندا پشتگیری یەکێتی بکەن و نوێنەریشیان لە لیستەکەی یەکێتیدا هەبێت.

## هەڵبژاردنی پەرلەمان

١٩ مایسی ١٩٩٢ هەڵبژاردن دەستپێکرد، بڕیاڕ بو دو ڕۆژ پێش ئەو کاتە، دەستپێبکات، بەڵام بەهۆی خراپی ئەو مەرەکەبەی کە پارتی لە ئەڵمانیاوە هێنابوی، کاتەکە گۆڕانی بەسەردا هات و گرژیەکی ناوخۆیی دروست بو.

هەڵبژاردنەکە بەبێ کێشە بەڕێوەنەچو، دانانی سندوقی دەنگدان لە زۆر ناوچەدا کێشەی دروستکرد، هەتا درەنگانێکی شەو هیچ لایەنێک، بە تایبەتی پارتی دانی بە ئەنجامی هەڵبژاردنەکە نەئەنا و لە کۆتاییدا ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بەم شیوەیە ڕاگەیندرا'

پارتی: ٤٣٧٨٧٩ هەزار دەنگ ٤٥،٥٪

یەکێتی: ٤٢٣٨٣٣ هەزار دەنگ ٤٣،٦١٪

هیچ کام لە هێزەکانی تر ڕێژەی ٧٪ یان بەدەست نەهێنا و نەیانتوانی کورسی پەرلەمان بەدەست بهێنن.

هەروەها هیچ کام لەو کاندیدانەی بۆ پۆستی ڕابەر خۆیان هەڵبژاردبو، ڕیژەی زیاد لە ٥٠٪ دەنگی نەهێنا، مەسعود بارزانی ٤٤٦٨١٩ هەزار دەنگ ٥١،٤٧٪ و مام جەلال ٤٤١٠٥٧ هەزار دەنگ ٤٤،٩٣٪، مەلا عوسمان ٣٨٩٦٥ هەزار ٣،٩٧٪ و د. مەحمود عوسمان ٢٣٣٠٩ هەزار ٢،٣٧٪ .

هەمو هێزەکان پێش هەڵبژاردن بڕیاریاندا، کە ڕێز لە ئەنجامەکەی بگرن، بەڵام کە ژمارەکان کەوتنە بەرچاوی هاوڵاتیان، زۆربەی هێزەکان ناڕازی بون و تارمایی شەڕی ناوخۆ ئاسمانی کوردستانی چنیبو.

هێزەکانی تر، وایان دەزانی دەنگی زۆر زیاتر دەهێنن و ئامادەی ئەوە نەبون کە هاوپەیمانیەک لەگەڵ یەکێتی یان پارتی دروست بکەن، بە تایبەتی

حسک، کە یەکێتی زۆری مەبەست بو لەگەڵیان هاوپەیمانی دروست بکات: "ڕەسوڵ مامەند زۆر دژی ئەوە بوو لەگەڵ یەکێتی بە یەک لیست دابەزێن زۆریش دژی یەکێتی و مام جەلال بوو، قسەی خراپیشی دەکرد و دەیوت ئەوە دەزانن دەرناچن بۆیە کەوتونەتە پەلەقاژێ و هاوار هاوار"[311].

ئەم لێکدانەوەیە وایلێکردن کە ئەنجامەکەی بەو شێوەیە دەرچو کە سۆسیالیست و پاسۆک بەیەکەوە نەیانتوای ٣٪ دەنگەکان بەدەست بهێنن.

دەربارەی هەڵبژاردنی ڕابەریش، حسک کەوتە هەمان هەڵەوە و د، مەحمود خۆی هەڵبژارد و پێشنیازەکەی یەکێتیان ڕەفزکرد کە زۆر سەغیانە بو، نەوشیروان مستەفا وتی: "با د. مەحمود خۆی هەڵنەبژێرێت بۆ سەرۆک یا ڕابەر، وتی سەرۆک پەرلەمان یا سەرۆک حکومەت هەرکامیان بەری خۆمان کەوت، یەکێتی واز لە پشکی خۆی دەهێنێ بۆ دکتۆر مەحمود و سۆسیالیست، و لە وەزارەتەکانیش وەکو ئەوەی هەردولا لەسەری ڕازیبین، دابەشی دەکەین و پەیمان دەدەین خۆتان دابەشی بکەن"[312]. حسک و سەرکردەکانیان، نەیان توانی واقیعی ئەو ڕۆژەی کوردستان بە باشی بخوێننەوە، زیاد لە پێویست خۆیان بە گەورە و هێزێکی جەماوەری فراوان دەزانی، لە ئەنجامدا زیانێکی سیاسی گەورەیان لە خۆیاندا و خۆیان لە حکومەت و پەرلەمان بێبەشکرد.

گرژی نێوان پارتی و یەکێتی، سەرچاوەی لەوەوە گرتبو، کە پرۆسەی هەڵبژاردنی دیموکراسی، کارێکی نوێبو لە کوردستان و مێژوی منافەسەی سیاسی ئاشتیانە لە کوردستان، زۆر نوێترە، هەروەها هەردو هێزی سیاسی، هێزی چەکداریان هەبو و دەزگا جیاوازەکانی حکومەتیش هیچیان بێلایەن نەبون و حیزبایەتیەکە لەناو ئەوانیشدا ڕەنگی خەستی دابۆوە.

---

[311] محەمەد حاجی مەحمود، ڕۆژ ژمێر.. بەرگی ٤، ل ٤٩.

[312] هەمان سەرچاوە، ل ٥٤.

## گرژی نێوان یەکێتی و پارتی دەربارەی هەڵبژاردن

هەڵبژاردن، نەیتوانی ئاشتیەکی پتەو و سەرانسەری بۆ کوردستان دابین بکات، لەو بارەیەوە پارتی و مەسعود بارزانی لەسەرەتاوە، ئەنجامی هەڵبژاردنەکەیان قبوڵ نەکرد و دەنگی تەپڵی شەڕ لە زۆر شوێن دەبیسترا: "شەوی ١٩-١٩٩٢/٥/٢٠ بروسکەیەکی دور و درێژی کاک مەسعود بارزانی هات بۆ هەمو لایەنە شۆڕشگێر و دۆستەکان و هەمو دام و دەزگاکانی پارتی و بەرەی کوردستانی، ..باسی ئەوە دەکات کە ئەو هەڵبژاردنە تەزویرە و شەرعی نیە و بە هیچ شێوەیەک پارتی دیموکراتی کوردستان ئیلتیزامی پێوە ناکات"[٣١٣].

لە ١٩٩٢/٥/٢٠، هەریەک لە پارتی، حسک، پاسۆک، حیزبی شیوعی، پارتی گەل، بڵاوکراوەیەکیان دەرکرد بە ناوی (رونکردنەوەیەک بۆ جەماوەری بە شەرەفی سلێمانی و دەوروبەری)، کە تێدا باسی گرنگی هەڵبژاردن و تەزویر و دەستتێوەردانیان لە هەڵبژاردنەکاندا کربو، بێ ئەوەی ناوی ئەو لایەنە بهێنێت کە تەزویری کردوە.. ئەمە نیشانی ئەدات، کە هێزە کوردستانیەکان، لە یەکەم هەڵبژاردندا لە کوردستاندا، دەستیانکردوە بە تەزویر و دزینی دەنگی هاوڵاتیان، لەبەرئەوە، هیچ هەڵبژاردنێک نیە کە بە بێگەردی چوبێتەسەر، بە زۆر شێوەی جیاواز، زۆربەی هێزەکان تا تونیبێتیان تەزویریان کردوە، ئەوەی کە نەیکردوە، توانای تەزویری نەبوە.!

بۆ هێمنکردنەوەی بارودۆخەکە، لە رۆژی ٢٢ مایسدا هەردو مەکتەبی

---

[٣١٣] هەمان سەرەچاوە، ل ٦٧.

سیاسی ینک و پدک بە ئامادەبونی مەسعود بارزانی و مام جەلال لە شەقڵاوە کۆبونـەوە و هەنـدێ بڕیاریانـدا، لەوانە: "هـەڵبژاردنی ئەنجومـەنی نیشـتمانی داهـاتو لـە ١٠/١٥ هەمـان سـاڵدا بکرێـت و دوای دومانـگ بەسـەر ئەو هەڵبژاردنەدا هەڵبژاردنی رابەریش دوبارە بکرێتەوە.. پەرلەمانی کوردستان نێوان هەردولا بە یەکسانی پێکبێ، سەرۆکی پەرلەمان پارتی بێ و جێگرەکەی یەکێتی، سـەرۆکی ئەنجومـەنی وەزیـران یـەکێتی بـێ و جێگرەکـەی پـارتی و هەندێ بڕیاری تر..ئەمەش دەقی رێکەوتنامەکەیە:

"دوای هەڵسـەنگاندنی بـارودۆخی ئیمـڕۆی کوردسـتان و ئـەنجامی هـەڵبژاردنی ئەنجومـەنی نیشـتمانی- کـە هێنـدێ کـەلێن و موخالـەفاتی تـێ کـەوتوە- و لـە پێنـاوی پاراسـتنی ڕیزەکـانی جـەماوەری کوردسـتان و بـۆ پاراسـتنی سـومعەی میللەتەکـەمان و لـە پێنـاوی بـەرەو پێشـبردنی خـەباتی گەلی کوردستان و، دوای ئەوەی لایەنـەکانی تری ناوبـەرەی کوردسـتانی و بزوتنـەوەی ئیسـلامی کـە بڕیاریـان دا التـزام بـە ئەنجامـەکانی هـەڵبژاردن بکـەن و لـە دەرەوەی پەرلـەمان هـەمو هاوکاریـەکی بکـەن، هـەردولا رێککەوتن لە سەر:

١. هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی داهاتو لە ١٩٩٢/١٠/١٥ بکرێ.

٢. هەڵبژاردنی رابەر دوای دو مانگ بکرێتەوە.

٣. ئەنجومەنی نیشتمانی پێکەوە لە نێوان هەردولا بە یەکسانی پێکبێ.

٤. سەرۆکی ئەنجومەنی پەرلەمان پارتی بێ و جێگرەکەی یەکێتی.

٥. سەرۆکی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن یەکێتی بێ و جێگرەکەی پارتی.

٦. ئەنجومەنی بەڕێوەبردن بە یەکسانی دابەشبکرێ.

٧. دژی یەکتر هیچ جۆرە تەحالوفێک نەکەن.

٨. هـەڤالان مـام جـەلال و کـاک مەسـعود پێکـەوە بـەیانێک دەرئەکـەن دەربارەی هەڵبژاردنی رابەر.

٩. لە ئێستاوە هەردولا هەوڵی یەکخستنی دامو دەزگاکانی شۆڕش ئەدەن.

١٠. ئیعلانی نتائجی هەڵبژاردن لە لایەن لیژنەی باڵا ئەکرێ وەک هەیە و لە لە گەڵیا بەیانێکی موشتەرەک لە نێوان پارتی و یەکێتی دەرئەچێ.

١١. هەر بڕیارێک لە ئەنجومەنی پەرلەمان دەرچو بە رەزامەندی هەردولا ئەبێ.

مام جەلال مەسعود بارزانی

هەر لەسەرەتای هەڵبژاردنەوە، ناکۆکییەکانی نێوان یەکێتی و پارتی ئاشکرابو، یەکێتی لە بەرنامەی هەڵبژاردنیدا، دروشمی فیدرالی و نیمچە سەربەخۆیی هەڵگرتبو، "رێکخستنی پەیوەندی کوردستان لەگەڵ حکومەتی بەغدا لەسەر بنچینەی مافی چارەی خۆنوسین" (سلێمان مستەفا حەسەن، کورد و یەکەم ئەزمون.ل٢٠٠)، پارتیش دروشمە دێرینەکەی کە دیموکراتیەت بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان بەرزکردبۆوە،" (پارتی دیموکراتی کوردستان، چارەسەری کێشەی کورد لە چوارچێوەی {دیموکراتیەت بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە بۆ کوردستان} د بەدیدەکا" (هەمان سەرچاوە، ل ٢١٠) بەلام دروشم و بەرنامەی سیاسی یەکێتی و پارتی رۆلی کاریگەریان نەبو لەسەر دەنگدانی هاولاتیان، ئەوەی کاریگەری هەبو، مێژوی هەردو پارتەکە و رۆل و ناو و ناوبانگی مەسعود بارزانی و مام جەلال بوە، نەک بەرنامەی سیاسیان بۆ هەڵبژاردن.

هەردو هێزەکە، بە شێوە و بە رێگای جیاواز هێرشیان دەکردە سەریەکتر، بۆ ئەوەی دەنگی زیاتر بەدەست بهێنن: "هەر لەگەڵ دامەزراندنی بەرەی کوردستانی مەسەلەی مافی چارەی خۆنوسین وەکو تاکە رێگای چارەسەری بنەرەتی مەسەلەی کورد لە لایەن هەمو حیزبەکانی بەرەی کوردستانی بڕیاری لەسەر دراو پەسەندکرا. کەچی بەداخەوە ئەمرۆ هەندێ لایەن لەم بارودۆخە ناوخۆ و دەرەکی لە بارەی جیهان لە مافی چارەنوس پەشیمان دبنەوە و داوای حوکمی زاتی دەکەن"[٣١٤].

[٣١٤] رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژ. ٨٩ ی ١٩٩٢/٥/١١.

"دروشمی فیدرالی کە پەرلەمانی کوردستان هەڵیگرت، لە ئەنجامی تێگەیشتنێک بو لە نێوا جەلال تاڵەبانی کە ساڵی ١٩٨٨ دروشمی سەربەخۆیی هەڵگرتبو، لەگەڵ مەسعود بارزانی کە مامناوەند تر بو، دروشمی ئۆتۆنۆمی وەک ئامانج دیاریکردبو. لە ڕاستیدا هەڵگرتنی دروشمی فیدرالی لە ئەنجامی تورەیی کورد هاتبوە کایەوە، لەبەرئەوەی ڕژێمەکانی عێراق ئۆتۆنۆمیان وەک ئامرازێک دژ بە گەلی کورد بەکاردەهێنا"[٣١٥].

---

[٣١٥] آوفر بينغيو، كرد العراق، بناء دولة داخل دولة، ل ٢٧١.

## گفتوگۆی نێوان مەسعود بارزانی و نەوشیروان مستەفا

نەوشیروان مستەفا لە (خەون یان مۆتەکە) دەربارەی پەیوەندی لەگەڵ مەسعود بارزانی دەنوسێت: "لە ٤/٢٦ دا بروسکەیەکم لە مەسعود بارزانیەوە پێگەیشت و داوای ئەوەی کردبو کە یەک ببینین، منیش چوم بۆلای و دوای ماوەیەک بە دوقۆڵی دانیشتین و وتی: "ئەو ماوەیەی کە ئیشم لەگەڵ کردوی تێگەیشتوم کە تۆ پیاوێکی صەریحی ئەمەوێ هەندێ پرسیارێت لێ بکەم و ئەگەر ئیحراج نەبی ئەمەوێ بە صراحەت وەڵام بدەیتەوە بۆئەوەی بەرچاوم رون بێ لە کاری داهاتومدا شتی لەسەر بینا بکەم" منیش وتم: "فەرمو هەر پرسیارێکت هەیە ئامادەم بۆ وەڵامدانەوەی!"

وتی: "یەکێتی کە ئەڵێن ئەیانەوێ تەحالوفی ستراتیجیان لەگەڵ پارتی هەبێ و ئەیانەوێ لەگەڵ پارتی پێکەوە کاربکەن، ئەم قسانەیان بە ڕاستی یان بۆ تەکتیکە؟" منیش وتم: " ئەوەندەی من لەسەرکردایەتی یەکێتی تێگەیشتوم، یەکێتی چەند ساڵ بە تەنیا و بە یارمەتی حیزبە کوردی و عەرەبییەکانی ناو جوقد، شەڕی لەگەڵ پارتی کرد، نەیتوانی پارتی لەناوببات، پارتیش چەند ساڵ بە تەنیا و بە یارمەتی حیزبە کوردییەکانی ناو جود و بە یارمەتی ئێران شەڕی لەگەڵ یەکێتی کرد، نەیتوانی یەکێتی لەناوببات، سەرکردایەتی یەکێتی لای وایە کە هیچ لایەک ئەوەی تری پێ لەناونابرێ، هیچ لایەکیشیان بیەوێ دەستکەوتێک بۆ کورد بە دەس بهێنێ بە تەنیا و بەبێ هاوکاری لایەکی تر ناتوانێ بەدەستی بهێنێت، چونکە لایەکەی تر ئەتوانێ لێی تێکبدا. لەبەرئەوە بیانەوێ و نەیانەوێ ئەبێ پێکەوە بژین و پێکەوە هاوکاری بکەن، لەبەرئەوە کە باسی هاوپەیمانێتی ستراتیجی ئەکەن، بەڵێ بەڕاستیانە"

وتی: "ئەی بۆچی هەمیشە کاری وا ئەکەن و شتی وا ئەڵێن ئەیانەوێ من

لەبەر دەمی عەشیرەتەکەم و حیزبەکەم و گەلەکەمدا ئیحراج بکەن؟" وتم: "ئەوە منافەسەی حیزبیە، جەنابت ئەتەوێ خۆت ببی بە کەسی یەکەمی ناو جولانەوەی کورد و حیزبەکەشت ببێ بە حیزبی یەکەمی کوردستان، مام جەلالیش ئەیەوێ خۆی ببێ بە کەسی یەکەمی ناو جولانەوەی کورد و حیزبەکەی ببێ بە حیزبی یەکەمی کوردستان"

پرسی: "ئیختیلافی نێوان پارتی و یەکێتی چیە؟"

منیش زۆر بە سادەیی وتم: " لە نێوان یەکێتی و پارتیدا هیچ ئیختلافێکی گرنگ نیە، نازانم ئاگاداری یان نە؟ لە پێش راپەرین و لە دوای راپەرین، ئەندامانی هەردو مەکتەبی سیاسی پارتی و یەکێتی، چەند جارێ پێکەوە دانیشتون بۆ ئەوەی باسی ئەوە بکەن چۆن ئەم دو حیزبە بکەن بە یەک، ئیختیلاف لە نێوان جەنابت و مام جەلال هەیە، تۆ ئەڵێی جەلال جاشی ٦٦ بوە، من چۆن سەری بۆ دائەنەوێنم، ئەویش ئەڵێ، من سەرم بۆ باوکی دانەنەواندوە، مەسعود چیە سەری بۆ دابنەوێنم"

زەردەخەنەیەک گرتی و پرسی: "چارەسەرەکەی چیە؟"

وتم: "عەرەب مەسەلەیەکیان هەیە ئەڵێن: "الله لا يحير عبده" منیش وەکو خەڵکی تر داماوم، ئەوەندەی من بیرم لێکردۆتەوە تەنیا دو رێگەی هەیە:

یەکێکیان ئەوەیە: ئەو پەیوەندیە ڕوکەشی و ڕواڵەتیەی ئێستا لە نێوان جەنابت و (مام جەلال) دایە کە لەسەر بنچینەی موجامەلە دامەزراوە، بگۆڕین بە پەیوەندیەکی قانونی، واتا یەکێکتان ببێتە سەرۆکی پەرلەمان و یەکێکتان ببێتە سەرۆکی حکومەت، ئەوسا هەرلایەک ماف و ئەرکەکانی خۆی بە دیاریکراوی ئەزانێ"

ئەگەر ئەوە ناکەن، دوەمیان ئەوەیە ماوەی شەش مانگ هەردوکتان خەریکی کاروباری حیزبەکانی خۆتان بن و، واز لەم پەرلەمان و حکومەتە بهێنن بێ دەستێوەردانی ئێوە بە ئازادی کاروبارەکانیان ئەنجام بدەن، پاش شەش مانگەکە دائەنیشینەوە سەیر ئەکەین ئەگەر ئیشوکارەکانیان بە چاکی

بەرێـوە بـرد بـو داوایـان لـێ ئەکەیـن دریـژە بە کارەکانیـان بـدەن، ئەگەر خراپیشیان کردبو ئەیانگۆرین".

بەوردی گوێی بۆ قسەکانم شلکردبو، کە لێبومەوە وتی: " دیراسەی ئەکەم" گفتوگۆکەمان بەم جۆرە تەواو بو[٣١٦].

ئەم بۆچونە، ئاوێنەی راستەقینەی ناکۆکیەکانی نێوان پارتی و یەکێتی بوە، دوای ئەم قسانە شەش ساڵی تر ئەم دوهێزە شەڕی یەکتریان کردوە و هەزارەها هاوڵاتی کورد بونە قوربانی، ئەو هۆیانەی کە نەوشیراوان مستەفا باسیکردوە، دوای رێکەوتنی واشنتۆنی ١٩٩٨ وەک خۆی ماوەتەوە.

---

[٣١٦] خەون یان مۆتەکە، ئەو کۆپییەی لەبەردەستایە، ل ٥٥.

# پەرەسەندنی گرژی نێوان یەکێتی و پارتی

سەرەتای ناکۆکییەکان، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای راپەڕین، زمانی گفتوگۆ رۆژبەرۆژ زبرتردەبو، مەسعود بارزانی لە ١٩٩١/٦/٨ بە بروسکەی ژمارە ٧٥٧ بۆ (م.س) یەکێتی دەنوسێ: "پێشمەرگەکانتان لە ناوچەی چەمچەماڵ تەعدایەکی زۆریانکردوە لە پێشمەرگەی ئێمە و شەڕ دەفرۆشن، تکایە سنورێکی بۆ دابنێن، ئێوە تەحمولی تەعویض دەکەن".

لە هەمان شەودا، مەسعود بارزانی بە ژمارە ٧٦٢ بروسکەیەکی تر بۆ (م.س). یەکێتی لێئەدا و ئەنوسێ: "بەپێی ئەو مەعلوماتەی بۆ ئێمە دێت، لەشکری ١ تان، خەریکن تەحەشودادی قواتی خۆیان بۆ تەعەداکردن لە پارتی، بە صراحەت پێتان رادەگەیەنم بچوکترین تەعەدابکرێت لە هێزەکانی ئێمە، لە هەمو شوێنێک ئەتەقێتەوە، وە ئێوە تەحەمولی مەسئولیەت دەکەن، چونکە ئەمە شەڕ فرۆشتنە و قبوڵ ناکرێت لە هیچ کەسێک تەعەدا لە ئێمە بکات، پێمان خۆش نیە، بەڵام ناچارین رەد بدەینەوە".

بۆ رۆژی دوایی لە ٦/٩ دا مەسعود بارزانی بروسکەی سێهەم بە ژمارە ٧٧٢ بۆ (م.س) ی یەکێتی دەنێرێت و دەنوسێ: "بۆئەوەی دوێنێ شەو بروسکەمان کرد، کە حەدێک بۆ لەشکری ١ دابنێن، شتەکان گەورە نەبێت بەداخەوە وا بڕیارە هیچ نەکراوە، چونکە ئەو بەیانیە کاتژمێر ٧ زۆر بە درندانە هێرشیان کردۆتە سەر بارەگاکانی ئێمە لە مەدینەی شۆڕش. ئیتر هەرچی ئەقەومێ ئێمە مەسئول نین وە لەشکری ١ ناتوانێت تحدیدی بکات شەڕ لە کوێ ئەبێت".

مام جەلال بۆ وەڵامی ئەو بروسکانە، بۆ مەسعود بارزانی دەنوسێ: "زۆر

بە داخەوە، بروسکەکانی جەنابتم خوێندەوە کە بۆنی خوێنیان لێدێت وا چەند جارێکە جەنابت ئەو جۆرە بروسکەیە لێئەدەی لە چەند موناسەبەیەکدا، لە کاتێکدا ئێوە دەزانن ئەم جۆرە لەهجەیە چەند زیانبەخشە و هەرگیز و هەرگیز (ی.ن.ک)ی پێ نەتۆقێنراوە. هەموومان ئەنجامی شەڕی براکوژیمان لەیادە، بۆیە هەق نیە بە قسەی جاسوس و تاوانبارێکی وەک تەحسین شاوەیس وا بە توند و تیژی قسە بکەن ...".

هەر دەربارەی ئەو گرژییەی دروست ببو، کۆسرەت رەسوڵ لە ٦/٩ دا، بروسکەی ژ ١٠٤ بۆ جەبار فەرمان و عومەر فەتاح دەنوسێت: "دیارە جەماعەتی پارتی لەسەر شەڕی چەمچەماڵ دەوری قواتی خۆمانیان گرتووە لە ئاکرێ و ئامێدی و ٢ پێشمەرگەیان شەهید کردوین، مەسئولی کۆمیتەی ئاکرێیان گرتوە، بۆیە هێزەکانتان ساز و ئامادەبن لە بادینان غەدر لە جەماعەتمان بکەن، هەقە لە هەمو شوێنێک دیفاعی مەشروع بکەین".

ئەم بروسکانە، نیشانی ئەدا پردی دۆستانەی نێوان پارتی و یەکێتی چەند باریک و لەق بوە، خەریک بوە بە قسەی یەکێک یان بەهۆی هەڵوێستی لایەک، شەڕێکی سەرانسەری روبدات، لە کاتێکدا هێشتا مەرکەبی پەنجەی هاوڵاتیان کە دەنگیان بۆ پەرلەمان داوە وشک نەبۆتەوە.

هەر دەربارەی ناوچەی چەمچەماڵ، لەشکری ١ ی یەکێتی بە بروسکەی ژمارە ٩٥٢ لە ١٩٩٢/٦/١٣ دەنوسن: "وەک لە بروسکەی پێشودا ئاگادارمان کردن، بەناوی لەشکری ١ پارتی، شەڕمان پێدەفرۆشن، کەمینیان داناوە لە چەمچەماڵ، پێشمەرگەیان لێگرتوین، ئەگەر بەو شێوەیە بڕوات، مەجبورین لە هەمو سنوری لەشکرەکەمان، دەستدەکەین بە ڕەددانەویان، یان تەعەدا قبوڵ ناکەین.."

ئەم گرژیە، بەردەوام بو، زمانی دانوستاندن تا دەهات زبرتر دەبو، بروسکەی لەشکری ٢ یەکێتی نیشانی ئەدات کە بارودۆخەکە چەند ناسک بوە: "بۆ هەمو هێزەکانی سەر بە لەشکری ٢، هێزەکانتان با لە بارەگاکانی خۆیاندا وریابن، بڵاوە مەکەن، ئیحتیاتی خۆتان هەمیشە بکەن."

لەم کاتانەدا و لە ١٩٩٢/٨/٢٠ کۆنگرەیەکی هاوبەشی یەکگرتو لە نێوان حسک، پاسۆک و گەل لە سلێمانی گیرا .

لەم کاتە ناسک و دژوارەدا، کە شەڕ و ئاوارەیی ئێخەی کوردستانی گرتبو، چەندەها کەس و گروپ و هێزی جیاواز، خەریکی ئاودیوکردنی کەلوپەلی کوردستان بون، بۆ دیوی ئێران، لە بروسکەیەکی گومرگی سەر بە یەکێتی لە ١٩٩٢/٨/٢٩ دا بۆ (م.س) دەنوسن: "شەوی ٨/٦ لە ناو کارگەکانی بلۆکی سەر ریگای مەخمور، ٤ مەفرەزەی پارتی لەگەڵ مەفرەزەیەکی زەحمەتکێشان، لەو کاتەی دەیانویست سێ لۆری شیش ئاودیو بکەن، سێ مەفرەزەی هاوبەش لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش، ریگایان لێگرتن، بەڵام نەیان توانی بە تەواوی بەرگریان لێبکەن..." ئەمە سیمایەک بوە، کە هەمو هێزە دەستڕۆشتوکان بە راستەوخۆ یان نارستەوخۆ بەشداربون لە تاڵانکردنی سەروەت و سامانی کوردستاندا، ئاودیوکردنی کەلوپەلی پیشەسازی، بردنی هەمو کەرەسە گرنگەکانی سەدی بێخمە و جۆرەها کەرەسەی گران بەهای تر، کە بۆ بینای ژێرخانی ئابوری کوردستان زۆر پێویست بو، بە تاڵان ئاودیوی ئێران کران و بە نرخێکی هەرزان دەفرۆشران و پارەکەی ئەچوە گیرفانی لێپرسروانی هەمو حیزبەکانەوە.

## سەرەتای شەڕ لە نێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی

لە هاوینی ١٩٩٢ شەڕ لە نێوان هێزەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە کەلار دەستیپێکردبو.

گرژی، ئاڵۆزی، دەوری بارەگا گرتن و سەیتەرە دانان لە ناوچەکانی دژ بەیەک سەری هەڵدابو، بەڵام نەگەیشتبوە ئاستی شەڕ و تەقە لەیەککردن. شەڕی کەلاری نێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی دو رۆژی خایاند، کوژراو و بریداری لە هەردولا لێکەوتەوە.

"لە پێناوی ئاشتی و تەبایی نێوان یەکێتی و پارتی و شێوەی حوکمڕانیەکی تەندروست، مام جەلال و مەسعود بارزانی لە ١٩٩٢/٩/٢ ڕێکەوتنێکیان ئیمزاکرد کە ناوەڕۆکەکەی بریتی بو لە "بەگەڕخستنی پەرلەمان و حکومەت و بە تەواوی دەسەڵاتدار کردنیان بۆ حوکمڕانی کوردستانی عێراق و یەکخستنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە یەک تاکە هێزی ڕێکوپێکو یەکخستنی دەزگاکانی پەیوەندیی دەرەوە و ئیعلام و مالیە و هەمو دەزگاکانی تر و ڕێگە نەدان بە هیچ حیزب و تاقمێک لە سەرپێچیکردن لە بەرامبەر پەرلەمان و حکومەتدا و لە یەکخستنی هێزی پێشمەرگە، گومرگ، ئیدارە و دەزگا جیاجیاکانی تر و دابینکردنی هەمو ماف و ئازادیە دیموکراتیەکانی بیروڕا و ڕێکخستن و مانگرتن و خۆپیشاندان، هەڵبژاردن و چالاکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و هونەری و فەرهەنگی (ثقافی) بۆ هەمو هێز و حیزب و هاوڵاتیەکی کوردستان بە کورد و تورکمان و ئاشوریشەوە". ئەو ڕێکەوتنە تێروتەسەلە، کە هیچ بوارێک نەمابۆوە کە نەیانەوێت یەکی بخات، تەنها باسی یەکگرتنی هەردو هێزەکەی تێدا نەکرابو.

ئەم هەمو بەڵێنانە قورس و زۆر زەحمەت بون لەو قۆناغەدا جێبەجێ بکرێت، هەر لەبەرئەوە تەمەنی ئەم رێکەوتنەش زۆر کورت بو.

لەو مانگەی کە رێکەوتنامەکەی تێدا مۆر کرابو، چەندەها گرژی و وردە شەڕ رویداو و نەتوانرا، رۆحیەتی رێکەوتنامەکە شۆڕببێتەوە بۆ خوارەوە.

لە ١٩٩٢/١٠/٤ پەرلەمانی کوردستان بە دەنگی گشتی هەمو فراکسیۆنەکان، بڕیاری سیستەمی فیدراڵیان بۆ کوردستان پەسەند کرد.

## شەڕ لە نێوان پارتی و یەکێتی لە لایەک و پارتی کرێکاران لە لایەکی تر

مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩٢، مانگی گرژی و ئاژە و شەڕ بو لە نێوان هێزەکانی یەکێتی و پارتی لە لایەک و هێزەکانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە لایەکی تر، لە بروسکەی ١٩٩٢/١٠/٧ دا کە مستەفا چاورەش ئاراستەی مام جەلال و مەسعود بارزانی کردبو، نوسیبوی: "شەوی ٧-٦ /١٠ هێزی هاوبەشەکان هێرشیان کردە سەر چیای پشتی کەوەر، تا نیوەی شاخەکە گیراوە و ٤ لە PKK کوژراوە و جێ ماوە، لەگەڵ ٢ شەهید خۆمان و ٢ بریندار.."

پارتی کرێکاران، دانی نەئەنا بە پارلەمانی کوردستان و داوای دامەزراندنی دەسەڵاتێکی تری دەکرد بەناوی (حکومەتی بۆتان و بادینان).

هەر بۆ چاوڕونی بارودۆخی ئەو شەڕە، حەسەن کوێستانی بروسکەیەک بە ژ ٧٥٤ لە ١٠/١٤ بۆ مام جەلال دەنوسێ: "لەگەڵ بونی بۆردومانی فرۆکە و هاتنە ناوەوەی سوپای تورکیا کە راستەوخۆ سەرپەرشتیان دەکات، هێزەکانی ئێرە شەڕ ناکەن و زۆربەی بەرنامەکان جێبەجێ ناکرێت، PKK شەڕی جدی دەکات بۆیە پێشنیاز دەکەم هێزێکی هاوبەش لە ناوچەکانی سلێمانی بێتە ئێرە، چونکە دواکەوتنی زیانێکی گەورەمان پێ ئەگات.."

زۆر لە بروسکەکان، باسی قێزەونی شەڕەکە و بڕوانەبون پێی و باسی بەرگری هێزەکانی پارتی کرێکاران و بێ دسپلینی هێزەکانی یەکێتی و پارتی دەکەن و هەر هەمویان وا نیشانی ئەدەن کە هیچ لایەکیان بڕوایان بەو شەڕە نەبوە.

چەندەها و چەندەها بروسکەی هەمەجۆر هەن کە باسی (شەهید) بونی پێشمەرگە و (کوشتنی) گەریلا دەکات و باسی ئازایەتی ئەوان و نوشستی خۆیان دەکات، ئەنجامەکەشی بە رێکەوتن لە نێوانیاندا کۆتاییهات.

لە بروسـکەی ژمـارە ٩٦٦ ی ١٠/٢٦/ ١٩٩٢ کە کۆسـرەت رەسـوڵ ئاراسـتەی مـام جەلال و مەسـعود بـارزانی کـردوە نوسـیویتی: "عوسـمان ئـوجەلان ئامـادەیە قسـەیان لەگەڵـدا بکەیـن، شـروتی پەرلەمانیـان قبـوڵە، ئەمرتان بەچیە؟ مقەری (م.س)یان گیراوە"

مـام جەلال بە بروسکەی ژمارە ٧٥٥ لە هەمان رۆژدا وەڵامی ئەداتەوە و دەنوسێ: "رێکەوتن بە نوسین بێت، هەمو ناوچەکانی سنور چۆڵ بکەن لە ٢٤ سـەعاتدا، بـۆ چـالاکی سیاسـیان، خۆمـان شـوێنیان بـۆ دیـاری دەکەیـن. لە کوردستانی ئێمەوە چالاکی عەسکەری ناکەن وەک پەرلەمان داوایکردبو..."

دەربـارەی ئەنجـامی گفتوگۆکـان، شـێردڵ حەوێـزی لە ١٠/٣٠ دا بروسکەیەک بۆ مستەفا چاورەش دەنێرێت و نوسیویتی: "ئێمشـەو سـەعات ٨,٢٥ رێکەوتـنەکە لە لایەن هەڤـالانی PKK مـۆر کـرا، عەبـدولموهەیمن هەڵدەسـێ بە گواسـتنەوەیان لە خواکورکەوە بـۆ زەڵـێ، پارێزگـای دهـۆک ئەیـانگوێزێتەوە لە زاخـۆوە بـۆ زەڵـێ، بە هەمـو کەلـوپەلەوە نەقل دەکـرێن، بریندارەکانیان دەبرێن بۆ نەخوشخانەکانی هەولێر.."

## ١٩٩٣

# بەردەوامی گرژی

ساڵی ١٩٩٣، لە لایەک بە ساڵی هەوڵدان بو ئاشتەوایی و تەبایی نێوان یەکێتی و پارتی دائەنرێت، لە لایەکی تریش بە ساڵی گرژی و شەڕی نێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی، هەروەها پارتی و حسک دائەنرێت.

لە ئەنجامی گرژی نێوان پارتی و یەکێتی لە کەرکوک، مەسعود بارزانی لە ١٩٩٣/٣/١٧ بروسکەیەک بۆ (م.س) یەکیتی و پارتی دەنوسێ: "...بەداخەوە چەند جارێک داوامان لە پارێزگای کەرکوک کردوە کە تاونبارێک (ک.ن) تەسلیمی ئاسایش بکات..بەداخەوە هیچ نەکرا، تا بوە هۆی زیاتر حەماسەتی تاوانباران و جارێکی تر بچنەوە سەر ئاسایش و هەڤاڵ فاتیح حەمەرەش تهدید بکەن و دەربکرێت لە چەمچەماڵ. بەڕاستی ئەمە گەیشتە ئاخر سنور، بۆیە پێویستە هەرچی کارمەندی پارتی لە پارێزگای کەرکوکە، هەر هەمویان دەست لەکار بکشێنەوە، یان تا ٢٤ سەعاتی تر، یان تاوانبار بگیرێت، یان ئێمە وەک پارتی خۆمان بەسەربەست ئەزانین بۆ هەرچی هەنگاوێک کە بە موناسیب بزانین بۆ دیفاعکردن لە هەڤاڵانی خۆمان"..

# ڕێکەوتنی یەکێتی و پارتی و چەسپاندنی سیستەمی فیفتی بە فیفتی

لە پێناوی هێمنکردنەوەی بارودۆخەکە، لە ١٩٩٣/٤/٥ دا هەردو مەکتەبی سیاسی یەکێتی و پارتی کۆبونەوە و بە ئیمزای شەش ئەندامیان، ڕێکەوتنێکیان مۆرکرد کە بریتی بو، لە دابەشکردنی دەسەڵاتەکان لە نێوان پارتی و یەکێتیدا لە ناو حکومەت و پەرلەماندا: "کە هەر یەک لە مەسعود بارزانی و مام جەلال هەمان دەسەڵاتی ڕابەری هەرێمیان هەبێت تا هەڵبژاردن بۆ ئەو پوستە دەکرێت، هەمان دەسەڵاتی پەنجا بە پەنجا درا بەسەرۆکی پەرلەمان و جێگرەکەی و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکەی.

ئەم ڕێکەوتنە زۆر حزبییە، بناغەی سیاسەتێکی زۆر چەوتی لە ناو پەرلەمان و حکومەتدا دارشت و وایکرد کە پۆستی حکومی، بە تەواوی ببەسترێتەوە بە حیزبەوە و ئەم سیاسەتەی (نیوە بە نیوە) یە کە بە (ففتی بە ففتی) ناسرا، شۆڕ بۆوە بۆ هەمو پلە و پایەکی حکومی و پەرلەمانی و وایکرد کە شارەزایی و توانا و لێهاتویی، ڕۆڵ نەبینێ، بەڵکو پلە و پایەی حیزبی سەنگی مەحەک بن بۆ پۆستە حکومییەکان، ئەمە وایکرد هیچ لێپرسراوێک بە قسەی لێپرسراوی سەروی خۆی نەکات ئەگەر لە حیزبەکەی تر بێت، ئەم سیاسەتە چەوتە بەردەوامە تاکو ئیمڕو، بەڵام تەنها شێوەکەی گۆڕاوە، ئەم نمونەی کارکردنە بەم شێوەیە لە هیچ شوێنێک روی نەدابو.

## شەڕی نێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی

پاش ڕاپەڕین بزوتنەوەی ئیسلامی لە زۆربەی شار و قەزا و ناحیەکان بارەگایان دانابو، لەبەرئەوەی هێزی چەکداریان هەبو، هەمو بارەگاکانیان سەربازی بو. ساڵ بە ساڵ ژمارەی هێز و چەک و پێداویستی تریان زیاددەبو، لەبەرئەوەی لە دەرەوە هاوکاری دەکران، باری ئابوریيان باشبو.

بارەگای ڕابەر و سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسییان لەسەر ئەشکەوتانی بێتواتە بو، قورسایی هێزیان لە سنوری قەڵادزێ، ڕاپەڕین، هەڵەبجە، شارەزور، کەلار، کفری، چەمچەماڵ و کۆیە بو، لەسەر ڕێگای هیزۆپ-کۆیە لەسەر بەرزترین لوتکەی چیای هەیبەت سوڵتان بارەگایان دانابو، لە سنورەکانی پارێزگای هەولێر و دهۆکیش بارەگایان هەبو، بەڵام نەک وەک ناوچەکانی تر.

لە دوای هەڵبژاردنی پەرلەمان و پێکهێنانی سوپای یەکگرتوی کوردستان، بزوتنەوە لە دەرەوەی ئەو سوپایە مایەوە، لە کار و کردەوەی ڕۆژانەدا جۆرێک لە گوێنەدان بە حکومەتی هەرێم و بڕیارەکانی و نەوەستان لە بازگەکانی پۆلیس و ئاسایش ببوە کاری ڕۆژانەیان و وەک هێزێکی سەربەخۆ لە دەرەوەی حکومەت و پارتی و یەکێتی دەجوڵانەوە. ئەم هەڵوێستەی بزوتنەوە، تۆوی ناکۆکی و ئاڵۆزی و شەڕی بەرهەم دەهێنا.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٣، گرژی و ناکۆکی لە نێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامیدا دروست بو، تا گەیشتە شەڕی چەکداری نێوانیان. ئێران بە ئاشکرا پشتگیری بزوتنەوەی دەکرد و پارتیش شەڕەکەی زۆر پێناخۆش نەبو، چونکە هەمو گرژییەک و کێشەیەک بۆ یەکێتی، بە سودی خۆیانیان دەزانی.

بزوتنەوە هێرشەکانی لە ناوچەی بیارە و خورماڵ دەستپێکرد، لە ٢/١٩ قیادەی سلێمانی یەکێتی بروسکەی ژمارە ٢٣ ئاراستەی قیادەی منتیقەی کەرکوک، محافیز، مەلا عوسمان، وەزارەتی پێشمەرگە دەکات و دەنوسێ: "ئیسلامیەکان لە خورماڵ گوێ نادەنە فەرمانی قیادەی خۆشیان، لە جیاتی قاتلەکان تەسلیم بە دادگا بکەن، قوەتیان لێ کۆدەکەنەوە و بە نیازی خراپەکارین، تکایە تۆپە ١٠٦ کانمان لەگەڵ هێزێکی باش بەرەو خورماڵ بۆ بنێرن، لە هەرکوێ مقەری ئیسلامی لێبێت ئەبێت لەژێر چاودێری باشدابن، لەوە زیاتر تەعەدا و ملهوری قبوڵ ناکرێت".

ئێران لە سنورەکانەوە، چەند جارێ هێرشی کردۆتە سەر هێزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی، لەو بارەیەوە، مەسعود بارزانی بە بروسکەی ژمارە ٣١٦ی ١٩٩٣/٧/٢٢ کە ئاراستەی مام جەلال و لقی ٤ پارتی و کۆسرەت رەسوڵ و جەلال جەوهەر کردوە دەنوسێ: "پێمان باشە هەمو ئیحطیات وەرگرین بۆ بەرگری لە وڵاتەکەمان و تەمێکردنی نۆکەرانی بێگانە کە دەیانەوێت ئاژاوە بنێنەوە..ئەگەر ئێران بە زمانی تهدید قسە لەگەڵ حکومەت و گەلەکەمان بکات، ئەبێت زۆر بە توندی وەڵامیان بدرێتەوە..." مام جەلالیش هەمان رۆژ وەڵامی داوتەوە و پشتگیری بۆچونەکانی مەسعود بارزانی کردوە.

## یەکگرتنی کاتی پارتی و حسک

لەم کاتانەدا، پارتی لە ٨/١٦ کۆنگرەی یانزەهەمی بە هاوبەشی حسک گرت و دە رۆژی خایاند، ئەم کۆنگرەیە هەڵایەکی گەورەی لە لایەن پارتییەوە بۆ سازکرا، کە گوایە زۆربەی هێزە کوردیەکان یەکیان گرتوە (پارتی، حسک، پاسۆک) و ناوی پارتیش گۆڕرا بۆ (پارتی دیموکراتی یەکگرتوی کوردستان) و دروشمی یەکگرتنیان لە شەقامەکاندا بەرزکردبۆوە (زەرد و شینی ئاسمانی، کاکە حەمە و بارزانی).

ئەم یەکگـرتنە زۆری نەخایانـد و حەمەی حـاجی مەحمـود، وەک کەسـی یەکەمـــی حســـک، دژ بەم یەکگـــرتنە وەســـتایەوە، ئەو لەســـەرەتای پێشمەرگایەتیەوە وا راهاتبو، کە هێزی تایبەتی خۆی هەبێت و کەسی دەست رۆشتو بێت لە حیزبدا، ئەم یەکگرتنە، ئەو خواستانەی ئەوی نەئەهێنایەدی و پارتی هەروەک پارتەکەی جاری جاران مابۆوە کە پارتی بنەماڵەی بارزانی بو، ئەوان خاوەن ماڵ و ئەوانەی تریش میوان.

مانگێـک بەســـەر ئەم یەکگـــرتنەدا تێـنەپەری، حســـک لە ١٩٩٣/٩/٦ دا، بەیانێکیان دەرکرد و رێکخستنەوەی سەرلەنوێی خۆیان راگەیاند، ئەمەش دەرگایەکی تری ئاڵۆزی و شەڕی ناوخۆی نێوان هێزە کوردییەکانی کردوە.

هەر لەو کاتەدا، وەفدێکی کۆماری ئیسلامی هاتن بۆ کوردستان و مام جەلال و مەســعود بارزانیـــان بینـــی و بڕیاریـــان دا کە کۆتـــایی بهێـــنن بە گرژیەکانی سەر سنور، هەروەها وەفدێکی کوردییش سەردانی تاران بکات.

لێپرســـراوی ســـەربازیی گشـــتی بـزوتنەوە لە بروسکەی ژمـارە ٧٢٨ ی ١٩٩٣/١٠/٨دا بـۆ گشـت بارەگاکـانی عەسـکەری و رێکخسـتنەکانی ســەر بە بزوتنەوەی ئیسلامی دەنوسێ: "وەک ئاگادارن یەکێتی نیشتیمانی کوردستان کەوتۆتە خۆ، دەوری ئیعلامی و عەسکەری و تەنزیمی خۆی بەهێز دەکات لەسەرانسەری کوردستاندا و توانیوێتی خەڵکانی ئێمە و پارتی دیموکراتی کوردستان بەلای خۆیدا رابکێشێت و سیاسەتی حیزبی واحید پەیرەو بکات، تەنـانەت لە بادینـانیش زۆر بەهێـزن، بـۆیە دەبێـت پەیـرەوی ئەم خـاڵانەی خوارەوە بکەین:

• زیـاتر تەنسـیق لەگەڵ پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان بکەیـن و لە زۆر شوێن دیفاع لەیەک بکەین.

• لە بارەگاکاندا ئەبێت بەلای کەمەوە ١٠ پێشمەرگە هەبێت بۆ واجب.

• تـا بۆتـان دەکرێـت، ئیسـتعرازی عەسـکەری بـکەن و جۆرەکـانی چەک پیشانی خەڵک بدەن.

- تا ئەتوانن (خط مائیل) دروست بکەن لە ناویاندا بۆ وەرگرتنی دەنگ و باس.
- یارمەتی و هاوکاری پارتی بکەن و یارمەتی بدەن بە غیر مباشر..'

بزوتنەوەی ئیسلامی، بەنیازبو ئیدارەیەکی ئیسلامی سەبەخۆ لە هەڵەبجە و هەورامان دامەزرێنێت و سەبەخۆ بێت لە ئیدارەی یەکێتی و پارتی و دانیان نەئەنا بە هەندێ بڕیاری پەرلەمان و حکومەت و بە نائیسلامییان ئەدایە قەڵەم. هێزیان لە ناوچەی ڕانیە و قەڵادزێش هەبو، ئێرانیش ڕاستەوخۆ و ناڕاستەخۆش هاوکاری دەکردن، مەبەستیان بو ناوچەکە ئارام و هێمن نەبێت.

لەو قۆناغەدا، باری ئابوری بزوتنەوە، باشبو، ئەیانتوانی ژمارەیەکی بەرچاو لە هاولاتیان لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە: 'جگە لەوەی ئێران هاوکاری بزوتنەوەی دەکرد، هەر یەک لە ولاتانی پاکستان، ئەفغانستان، سعودیە، جەزائیر، تونس و لوبنان هاوکاری باشی بزوتنەوەیان دەکرد، کە بە کۆی گشتی مانگانە دەگەیشتە ١،٥٧ ملیۆن دۆلار'[٢١٧].

مانگی ٦ ی ١٩٩٣، مانگی نائارامی و شەڕ بو لە نێوان یەکێتی و بزوتنەوە و حسک و پارتی دیموکراتی کوردستان لە ناوچەی پێنجوین. لە ڕۆژانی٦/١١ شەڕ لە زۆر ناوچەی شارەزور و پێنجوین لە نێوان پارتی و حسک ڕویدا، بۆ نمونە لە ٦/١١ بارەگای حسک لە ئۆردوگای پیرەمەگرون گیرا، لە ٦/١٢ شەڕ لە ناوچەی سەراوی سوبحان ئاغا و هەڵەبجەی تازە دەستیپێکرد، لە ٦/١٣ زۆربەی بارەگا و شوێنەکانی حسک لە ناو شاری سلێمانیدا گیرا، لە زۆر شەڕی نێوان پارتی و حسک، یەکێتی ڕۆڵی ناوبژیوانی دەبینی و هاوکاری و داڵدەی هێزەکانی حسکی ئەدا.

لە ١٩٩٣/٦/٢٣ هەردو مەکتەبی سیاسی پارتی و یەکێتی بە ئامادەبونی مەسعود بارزانی کۆبونەوە و لەسەر ئەم خاڵانە ڕێکەوتن.:

- 'مقراتی بزوتنەوەی ئیسلامی لە قەڵادزێ، ڕانیە، چوراقورنە دابخرێن و دەرچن لەو ناوچانە.

---

[٢١٧] آوفر بینغو، کرد العراق، ل ٢٨٠.

- هەمو دیلەکان، واتا هی هەردولا ئازادبکرێن.
- دادگا بەپێی یاسا، داوای کێی کرد، ئەبێ تەسلیم بکرێت.
- ئەگەر ئیسلامیەکان ئەمانەیان قبوڵ نەکرد، ئەوا ئەبێت هەڵوێستی یەکێتی و پارتی یەک بێت، بۆ چارەسەرکردنی وەزعەکە".

## جەولەیەکی تری شەڕی نێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی

دوای ئەم کۆبونەوەیە، بارودۆخەکە، هەر بە نا ئارامی مایەوە و گرژییەکان لە نێوان یەکێتی و بزوتنەوەدا وەک خۆی مایەوە و لە ٢٥ و ٦/٢٦ هەندێ بارەگای بزوتنەوە لە سلێمانی، کۆیە، کەلار، عەربەت و قەڵادزێ و زۆر شوێنی تر گیران و مەلا عوسمان پەیوەندی بە پارتییەوە کرد و ئامادەیی خۆی نیشان دا بە تەسلیم بون، ئیتر بزوتنەوە وەک هێزێکی چەکداری کاریگەر لە کوردستان زۆر بێهێز بو.

پەیوەندی نێوان یەکێتی و بزوتنەوە لە ١٩٩٣/١٠/٢١ جارێکی تر گرژی تێکەوتەوە، ئەویش لەو کاتەدا کە " ئوتۆمبێلێکی بزوتنەوە لە بازگەی ئاسایشی تونێلەکەی دەربەندیخان ئامادە نابن پێناسەکانیان بدەن و وتبوویان خۆیان ئەچنە ئاسایش و خۆیان ئەناسێنن، ئەمە وەکو تەحەدا و گاڵتە پێکردنێک کە ئەچنە دەربەندیخان ئەچنە بارەگای مەڵبەندەکەیان و گوێ نادەنە ئاسایش. ئاسایش داوا لە مەڵبەندی بزوتنەوە ئەکات، کە نوێنەریان بچێتە لایان بۆ لێکۆڵینەوە لەو مەسەلەیە، نوێنەرەکەیان بە هەندێ حیمایەوە دەچێتە ئاسایش، لە دەرچونیدا حیمایەکانی کە دیارە هەمان چەکدارانی ناو ئوتۆمبێلەکە دەبن، تەقە لە ئاسایش دەکەن و یەکسەر ٢ ئاسایش خەڵکی چەمچەماڵ شەهید ئەبن و ٣ ی تریش بریندارئەبن، کە هەمویان سەر بە یەکێتین"[٣١٨]، دوای دو رۆژی تر، شەڕ لە نێوان یەکێتی و بزوتنەوە لە

---

[٣١٨] مەحمود سەنگاوی، بیرەوەریەکانی سەنگاوی، سلێمانی ٢٠٠٤، چاپخانەی تیشک، ل ٦١٧.

چەمچەماڵ و کەلار و چەند ناوچەیەکی تر تەشەنەی کرد.

هەر لە کۆتایی ئەو مانگەدا، گرژییەکان سەری هەڵدایەوە و لە بروسکەیەکدا لە ۱۰/۲۲ مـام جەلال داوا لە مەڵبەنـدەکان دەکـات، کە خۆیـان ئامـادەبکەن بـۆ شـەڕێکی یەکـلاکەرەوە دژ بە بـزوتنەوە، لە هەمـان ڕۆژدا، بروسـکەیکی تـر بە ژمارە ٥٢١ بۆ مەلا عوسمانی رابەری بزوتنەوەی ئیسلامی دەنێرێت و دەنوسێ:

- "بەداخەوە هەندێ لە کاربەدەستانی ئێوە شـەڕ بە حکومەت و پەرلەمـان و یەکێتـی دەفرۆشـن، جەنابـت گـوێ لە خـوطبەی جـومعەی مەلا کرێکـار بگـرە، ئامۆژگارەییە تایبەتیە نەهێنیەکەی ۱۰/۸ بخوێنەوە، ڕاستیەکانت بۆ دەردەکەوێت.
- ئێمە هەمیشە دۆستایەتی بزوتنەوەمان ویستوە، بە داخەوە ئامۆژگاری ۱۰/۸ تان دڵۆپی خوێن دژە هێزی دوژمنایەتی لێئەتکێن.
- خۆتان باش لە ئەنجامی دەزانـن، ئێمە بـاش ئەتـوانین دیفـاع لە خۆمـان بکەین. بەڵام ئێمە هەمیشە برایەتی بەسەر دوژمنایەتیدا فەزل دەکەین.
- حەز دەکەم ئێمە دڵ و زارمان لەگەڵ یەک بێت.
- حەزدەکەم لێتان ڕونبێت، ئێمە مەحـاڵە ڕێ بە گێرەشـێوێنی و دژایەتـی حکومەت و پەرلەمان بدەین، پەرلەمان و حکومەتیش ماوەی نادات..".

ئەم بروسکانە، نیشانی ئەدات کە سەعاتی سفر بۆ شەڕ نزیک بۆتەوە و ڕێکەوتنەکان هیچ مانایەکی سیاسی خۆیان نەهێشتبۆوە.

گرژی و ئاڵۆزی لە نێوان بزوتنەوە و یەکێتیدا لە ۱۲/۱٦ لە کفری ڕویـدا و هێزەکانی بزوتنەوە لە ۱۲/۱۷ دا چەند کەسێکی سەر بە یەکێتـی دەگـرن و لە ئەنجامـدا یەکێکیان لەوانە (ئـازاد کەریـم سـەمین) دەکـوژن و ئەوانەی تـر ئازاد دەکەن.

ڕۆژێ دوای ئەوە، بـزوتنەوە لە ڕانـیەوە هێـز دەنێـرن بـۆ کفـری بـۆ هاوکاری هێزەکانیان لەوێ، کاتێ هێزەکانی یەکێتی لەسەر سنوری شـارەکە نـاهێڵن بچـنە نـاو کفـری، دەبێـت بە شــەڕ لە نێوانیانـدا و ٤ پێشـمەرگەی بزوتنەوە دەکوژرێن.

دوای ئەم شەڕە، لیژنەیەکی هاوبەش پێکهات و بارودۆخەکە کەمێ ئارام بۆوە و ٤ تەرمەکەی بزوتنەوە دەنێرنەوە بۆ رانیە.

بۆ رۆژی دوایی لە ١٢/١٩ دا، بە ڕێپێوانێکی سەربازی تەرمەکان دەنێژن و لە هەمان رۆژدا پەلاماری کۆمیتەی رێکخستنی یەکێتی لە رانیە ئەدەن و دەیگرن و چوار کادێری یەکێتی دەکوژن، لە ناویاندا محەمەد سوڵتان، لە ئەنجامی ئەو شەڕەی رانیە شەڕ و ئاڵۆزی بۆ قەڵادزێ، حاجی ئاو و چوارقورنە تەشەنە ئەکات.

پریشکی ئەم شەڕە بڵاودەبێتەوە بۆ سنورەکانی پارێزگای سلێمانی، کەرکوک و بەشێک لە هەولێر، دوای چەند رۆژێک شەڕی سەخت، یەکێتی توانی زۆربەی بارەگاکانی بزوتنەوە لە گەرمیان و ڕاپەرین داگیربکات.

لە دوای ئەم شەڕانە، هێزەکانی بزوتنەوە پارچە پارچە بون و قورسایی خۆیان خستە سەر ناوچەکانی سنوری ئێران، کە ئەوانیش درێخیان نەئەکرد لە هاوکاریکردنیاندا. (زانیاری لە عوسمانی حاجی مەحمود)ەوە.

لە ناو ئەم گرژیەدا، هەندێجار تیشکی هیوا و دۆستایەتی ئاسمانی کوردستانی روناک ئەکردەوە، بەڵام ئەو تیشکە نە زۆر بە هێزبوو، نەزۆری دەخایاند کە ئاسمان روناک بکاتەوە.

لە ١٩٩٣/١٠/٦ دا، تەرمی مستەفا بارزانی و ئیدریسی کوری لە ئێرانەوە هێنرانەوە کوردستان و لە باشماخەوە بە رێورەسمێکی گەورە لە رێی سلێمانی و کۆیە و هەولێر گەیەنرانە زێدی خۆیان و لە بارزان بە خاک سپێران، هەمو هێزە سیاسییەکان لەم رێورەسمەدا بەشداربون، لەوانە مام جەلال کە لە سنورەوە لەگەڵ تەرمەکەدابو، ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەیەکی ئیجابی بو بۆ پەیوەندی ئەو لەگەڵ بنەماڵەی بارزانیدا.

## شەڕی نێوان پارتی و حسک

کاتێ لە ئابی ١٩٩٣، حسک، پارتی گەل و پاسۆک لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان یەکیانگرت و کۆنگرەیەکی هاوبەشیان ئەنجامدا، حەمەی حاجی مەحمود بو بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانی یەکگرتو و دوای کەمتر لە مانگێ وازی لە پارتی هێنا و ئەمە بوە هۆی ئەوەی ناکۆکی لە نێوان پارتی و حسکدا سەرهەڵبدات.

شەڕی نێوان پارتی و حسک لە مانگی ١٢ ەوە بە خەستی دەستپێکرد، ئەویش لە ئەنجامی ئەوەی کە حەمەی حاجی مەحمود بە هێزێکەوە چوە سەر لیوای ٢٤ی سەر بە قیادەی ناوچەی سلێمانی سەر بە سوپای یەکگرتوی کوردستان، کە ژمارەیەک لە فەرماندە سۆسیالیستە کۆنەکانی لێبون و پەیوەندیان بە کاکە حەمەوە کردبو، کاتێ ئەو لیوایەیان گرت، هەرچی چەک و کەرەسەی شەڕی تێدابو، بردیان بۆ خۆیان.

ئەم روداوە، ئاڵۆزییەکانی نێوان پارتی و حسکی قوڵترکرد، بە تایبەتی کە ئەو لیوایە، بەشێکی دیاری پارتی و یەکێتی بون.

مامۆستا شاهۆ بە بروسکەی ژمارە ٥٣٩ ی ١٩٩٣/١٢/١١ بۆ مام جەلال، باسی بارودۆخەکە لە نێوان پارتی و حسکدا دەکات لە هەڵەبجەی تازە و عەربەت و شاری سلێمانی.

هەر لەو رۆژەدا هێزەکانی پارتی دەستیان گرت بەسەر بارەگاکانی حسک لە رانیە، قەڵادزی، ناڵپارێز، نەسر، عەربەت، دەربەندیخان و سلێمانی.

گرژی و شەڕ لە نیوان پارتی و حسک دەستپێکرد، مەسعود بارزانی لە ١٢/١٢ بە نیوە شەو ئەم بروسکەیەک دەنێرێت: "پاکیان بکەنەوە، ئەوانە خائینن و

بەکرێ گیراون و جاسوسن"[319].

بۆ هاوکاری حسک هێزەکانی یەکێتی بە سەرپەرشتی عوسمانی حاجی مەحمود چونە ناو بارەگای لقی کەرکوکی حسک لە دەربەندیخان و ئاڵای یەکێتیان لەسەر هەڵکرد، ئەویش لەبەرئەوەی کە هێزێکی پارتی ئابڵوقە دابون و ئەیانویست بارەگاکەیان کۆنترۆڵ بکەن.

بارەگای لق و (م.س)ی حسک لە سلێمانی کەوتە دەست پارتیەوە، لەوکاتانەدا، مەڵبەندی ٢ کەرکوکی یەکێتی بە ژمارە ١٦٤٨ لە ١٢/١١ دا بروسکەیەک بۆ (م.س)ی یەکێتی دەنێرێت و دەنوسێت:

- "سەر لە ئێوارەی دوێنێ جەماعەتی حسک، فەوجێکی یەکگرتویان چەککرد، کە لە عەربەتەوە سەر بە لیوای ٤ی (ق.م) سلێمانیە، ئێستا وەزعەکە ئاڵۆزە، لە زۆر جێگاکان، سەنگەریان لەیەک گرتوە.
- لقی حسک، نوسراوێکیان ئاراستەی خۆمان و حشعک و بزوتنەوە کردوە، ئەڵێن شەڕی ئێمە دژی حکومەت و لایەنەکان نیە، دژی پارتیە.
- لە چەند جێگایەک دەوری مقری حسک گیراوە و کاتیان تحدید کردوە، تا خۆیان تەسلیم بکەن، ئەوانیش ئامادە نین خۆیان تەسلیم ببن.
- مقەری کەلاری حسک چەککراون"

لەو بارەیەوە و لە کاتی ئەو ئاڵۆزییەدا، قیادەی منطقەی کەرکوک بروسکەی ژمارە ١٩٢٥ ی ١٢/١١ بۆ قیادەی منطقەی سلێمانی و هەولێر و وەزارەتی پێشمەرگە دەنوسن: "لەسەر رۆشنایی بروسکەی وەزارەتی پێشمەرگە لە ١٢/١١، بە هەمو هێز و توانایەکەوە، بەرپەرچی ئەو کارە نا هەموارەی حەمە و جەماعەتەکەی بدەنەوە، چونکە بێحورمەتیان بەرامبەر بە سوپای کوردستان نواندوە، هەرچی دەکەن بیکەن لە تۆڵەی لیوای ٢٤ و سریەکانی، پلانی سەرکەوتوانەی بۆ دارێژن".

هەر لەو رۆژەدا، پارتی هێرشی کردە سەر بارەگاکانی حسک لە رانیە،

[319] رۆژ ژمێری پێشمەرگەیەک، بەرگی ٤، ل ٣٠١.

قەلادزی، نالپاریز و نەسر، تەکیە و بازیان و هەمویان گیران، واتا، شەڕی سەرانسەری لە نێوان ئەو دو هێزەدا لە کوردستان زیاتر گڕی گرت و کوشتار و بریندارى زۆرى لێکەوتەوە.

ئەم بروسکانە، نیشانی ئەدا، کە کێشەی نێوان هێزە سیاسیەکان کراوە بە کێشەی حکومەت و هێزێکی سیاسی، لێرەدا، کێشەی نێوان پارتی و حسک کراوە بە کێشەی نێوان حسک و حکومەتی هەرێم، ئەمە لە کاتێکدایە، کە پەیوەندی نێوان یەکێتی و حسک باشبوە، بەلام وەزیری پێشمەرگە لە یەکێتی بوە!.

لە ١٤/ ١١وە وردە شەڕ لە نێوان یەکێتی و پارتی لە سلێمانی رویداو لە ئەنجامدا پێنج پێشمەرگەی یەکێتی کوژران، گرژیەکە بەردەوام بو بەلام شەڕەکە وەستا، پارتی هێرشکەرێکی خۆی دالدەدابو بەناوی عومەر چاوشینەوە و تەقەی لە کادیرێکی یەکێتی کردبو، بە مەبەستی کوشتنی، نوێنەری پارتی مولازم یونس رۆژبەیانی و یەکێتی جەبار فەرمان هاتن بۆ سلێمانی و بە هاوکاری پارێزگای سلێمانی جەمال عەبدول کێشەکانیان چارەسەرکرد.

شەڕی نێوان پارتی و حسک و بارودۆخی سەربازی حسک، بۆچونێکی هێنایە پێشەوە، کە بۆچی حسک و یەکێتی یەک نەگرن، حەمەی حاجی مەحمود وەک سکرتێری حسک، وەکو یەککگرتنەکەی لەگەل پارتی، دژی وەستایەوە و بە مام جەلالی وتبو: "ئەگەر خۆم تەنها بم لە کوردستان، هەر درێژە بە سۆسیالیست دەدەم"[٣٢٠].

---

[٣٢٠] هەمان سەرچاوە، ل ٣١٠.

## هەوڵدانێکی نوێ بۆ هێمنکردنەوەی پەیوەندی نێوان پارتی و یەکێتی

بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە، هەردو مەکتەبی سیاسی یەکێتی و پارتی بەسەرۆکایەتی مام جەلال و مەسعود بارزانی لە ١٩٩٣/١٢/١٨ کۆبونەوە و کۆمەڵێک بڕیاریاندا کە بارودۆخەکە هێمن بکەنەوە و هەوڵبدرێت کە ئارامی و ئاسایش بگەڕێتەوە بۆ هەمو ئەو ناوچانەی کە دەسەلاتی حکومەتی هەرێمی لێیە و ڕەچاوی بارودۆخەکە بکەن و ڕێز لە یاسا بگرن.

لە ١٢/١١، وەزیری رۆشنبیری حکومەتی هەرێم، شێرکۆ بێکەسی شاعیر، وەک نارەزاییەک لەسەرئەوەی کە پەیوەندییەکی وەرزشی و کلتوری خەریک بو دروست ببێت لە نێوان حکومەتی هەرێم و بەغدا و وەفدێکی لاوان بێ رەزامەندی حکومەت و پەرلەمان سەردانی بەغدایان کردبو وە بەشداری چالاکی لاوانی رژێمیان کردبو، دەستی لەکارکێشایەوە.

جارێکی تر، لە ١٢/٢٣ دا، کۆبونەوەیەک لە نێوان پارتی، بە ئامادەبونی مەسعود بارزانی و یەکێتی بە ئامادەبونی، کۆسرەت ڕەسوڵ، د. کمال فواد و ڕەسوڵ مامەند ئەنجامدرا و لەسەر ئەم خاڵانە ڕێکەوتن:

١. حکومەت، بزوتنەوە، پارتی و یەکێتی، ئیدانەی جەریمەی رانیە بکەن.

٢. مقراتی بزوتنەوە لە قەلادزێ، رانیە و چوراقوڕنە دابخرێن.

٣. دیلی هەردولا ئازادبکرێن.

٤. دادگا بە گوێرەی یاسا، داوای هەر یەکێکی کرد، پێویستە تەسلیم بکرێت.

٥. ئەگەر بزوتنەوە ئەم خاڵانەیان قبوڵ نەکرد و جێبەجێیان نەکرد، ئەوا پێویستە پارتی و یەکێتی یەک هەڵوێستیان هەبێت بۆ چارەسەری کێشەکە.

لە ۱۹۹۳/۱۲/۲۷ دا، مەسعود بارزانی نامەیەکی ئاراستەی جەماوەری کوردستان کرد و تێدا باسی ئاڵۆزی ئەو شەڕە دەکات کە لە ناوچەی رانیە رویداو، هەردو هێزەکە هەوڵیاندا، ئارامی بکەنەوە، بەڵام بێ ئەنجام بو، لە شەڕەکاندا چەکی قورس بەکاردەهات. هەروەها رەخنە لە وەزیری پێشمەرگەی هەرێم دەگیرا، لەبەرئەوەی لە شەڕی دژ بە بزوتنەوەی ئیسلامی رەچاوی بڕیارەکانی حکومەت و سەرکردایەتی نەکردوە.

لە کۆتاییدا، هەرەشە دەکات، یان ئەبێت یاسا سەروەربێت، یان ئەوان تەحەمولی بارودۆخەکە ناکەن.

کۆتایی سال، بە رێکەوتنێکی گرنگی نێوان یەکێتی و پارتی کۆتاییهات، کە بە هەنگاوێکی گرنگ ئەژمێردرا، ئەویش (رێکەوتنی ئیستراتیجی) بو لە نێوان یەکێتی و پارتی لە ۱۹۹۳/۱۲/۲۰ دا.

رێکەوتنەکە باس لە چارەنوسی ستراتیجی هەردو حیزب و دابەشکردنی کار و پۆستەکان لە نێوان هەردولادا بە یەکسانی دەکات و بڕیار ئەدەن کە ئەنجومەنێکی سەرۆکایەتی باڵا بۆ بەرێوەبردنی کاروباری هەرێم دابنێن.

ئەگەر بهاتبایە، نەک هەمو رێکەوتنەکە، بەڵکو بەشێکی کەمی یان چەند خاڵێکی ئەو رێکەوتنە جێبەجێ بکرایە، ئەوە بە دڵنیایەوە گەلی کورد توشی ئەو کارەساتە دڵتەزێنانە نەئەبو کە دوایی بەسەریهات.

کۆتایی سال، بە شەڕی نێوان بزوتنەوە و یەکێتیدا کۆتایهات کە ئەم ناوچانەی گرتبۆوە: (سلێمانی، کۆیە، قەڵادزێ، رانیە، بێتواتە، جوارقورنە، سەنگەسەر، کەلار، دەربەندیخان، خورماڵ، هەڵەبجە، عەربەت، رەواندز، حەریر، شەقڵاوە، رەواندز) هەر چەند رۆژێ پێش کۆتایی ساڵ و لە (سەعات ٤ پاش نیوەرۆی ۱۹۹۳/۱۲/۲٦ بێتواتە و سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی بزوتنەوە گیرا و هەمو سەرکردایەتیان تەسلیم بون بە مامۆستا مەلا عوسمانی رابەری گشتی بزوتنەوەی ئیسلامیشەوە..[۳۲۱].

---

[۳۲۱] هەمان سەرچاوە، ل ۳۲۱.

## ١٩٩٤

# ساڵی نوێ، وەک کۆتایی پار

ساڵی نوێ، بە شەڕ و ئاژاوە و گرژی نێوان هێزە کوردستانییەکان دەستیپێکرد، گرژی نێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی درێژکەرەوەی ساڵی رابوردوبو، بەڵام هەوڵێکی هەمەلایەن لە ١٩٩٤/٢/١٧ دەستیپێکرد بۆ هێمنکردنەوەی ئاڵۆزیەکانی نێوان ئەو دو هێزە.

بە ئیمزای ئەم کەسایەتیانە کۆتایی بە شەڕی نێوانیان هات: مەسعود بارزانی، مام جەلال، ئەحمەد چەلەبی (سەرۆکی INC)، نابع سامرائی (سەرۆکی لیژنەی ئاشتەوایی) عوسمان عەبدولعەزیز (مورشیدی گشتی بزوتنەوەی ئیسلامی).

بارودۆخی سیاسی و سەربازی و رێکخراوەیی بزوتنەوەی ئیسلامی، بەرەو خراپی دەڕۆشت و لە زۆر بواردا سەرکەوتو نەبو، ئەمانە کاریگەری گەورەیان هەبو لەسەر بارودۆخی ناو بزوتنەوە، تا گەیشتە ئەوەی لە ١٩٩٤/٢/٦ دا (یەکگرتوی ئیسلامی کوردستان) وەک هێزێک سەربەخۆیی خۆی راگەیاند و لە بزوتنەوەی ئیسلامی جیابۆوە، دروستکردنی یەکگرتوی ئیسلامی هەنگاوێک بو کە لە سودی بزوتنەوە نەبو، چونکە زۆر لە ئەندامانی بزوتنەوە، چونە ناو ریزەکانی یەکگرتوەوە.

ساڵی ١٩٩٤ ساڵێک بو پڕ بو لە نەهامەتی بۆ کوردستانی عێراق، لەو ساڵەدا، ئەو شەڕەی کە دەمێک بو، چاوەڕێی تەقینەوەی دەکرا لە نێوان پارتی و یەکێتیدا رویدا.

مـام جەلال، نەوشـیروان مسـتەفا، شـازاد سـایب و نوسـەری ئەم کتێبە لەسـەرەتای مـانگی مایسـەوە لە شـاری رۆمـای ئیتاڵیـا بـون، مـام جەلال و نەوشـیروان مسـتەفا، سـەرۆک کۆمـاری ئیتاڵییـان بینـی و چەنـد دیـدارێکی سیاسی گرنگیش ئەنجامدرا.

## چۆن شەڕی ناوخۆ گەرم بو؟

شەو ١٩٩٤/٥/٢ لەو ئوتێلەی لێی دابەزیبوین، فاکسێک (نامە)یەکی (م.س) یەکێتی هات بۆ مام جەلال کە نوسیبویان:

"بۆ هەڤاڵی بەڕێز مام جەلال، مەڵبەندی دەرەوە

لە م س وە

سەلاوێکی گەرم

رۆژی ١٩٩٤/٥/١ عەلی حەسۆ میرخانی ژاژۆکی (لەو کەسانەیە لە گەڵ مەلا مستەفا چۆتە یەکێتی سۆڤێت و چەند پۆستێکی جیاوازی لەناو پارتیدا هەبوە) لەگەڵ بابەکر پشدەری جێگری لقی ١١، بە هێزێکەوە دەچنە سەر قەلادزە بۆ تێکدانی ژمارەیەک دوکان، کە ئیدیعایان کردوە هی باوکێتی. لەوێ جەماوەر نارەحەت ئەبن و دۆخەکە ئالۆز ئەبێ. هەڤاڵ مام جوتیار و ژمارەیەک لە تێکۆشەرەکانی یەکێتی لەگەڵ جەماوەر ئەبن. پاشان مامۆستا دەڵگەیی و پیاوچاکان ئەکەونە بەینەوە و لە یەکتر جیایان ئەکەنەوە. لەو دەمەدا پاش بڵاوەلێکردن کاک جوتیار و دەستەیەک پێشمەرگە کە بە لای چەکدارەکانی عەلی و ئەوانەی لقدا رەت ئەبن لەناکاو دەستڕێژ لە مام جوتیار ئەکەن، خۆی و دو پێشمەرگە شەهید ئەبن. ئەو ئێوارەیە هەڤالانی ئێمە کۆنابن بۆ کۆنترۆڵکردنی وەزعەکە و وەرامدانەوەی دەستدرێژی، شەو هێزێکی یەکێتی لەگەڵ هەڤاڵ عەلی نەبی ئەچنە هانای برادەرەکانمانەوە ئەچنە سەر لیژنەی ناوچەی قەلادزە، کە خۆیان بۆ شەڕ حازرکردبو. ئەبێ بە شەڕ

و لەو شەڕەدا هەڤاڵ عەلی نەبی شەهید ئەکرێ و هەڤاڵ ئیسماعیل وەرتێ بە خەستی بریندار ئەبێ گولە لە سەریداوە، پاش ئەوە هەلومەرج ئاڵۆزتر ئەبێ و هەڤاڵانی یەکێتی و جەماوەر ناچارئەبن دەست بکەنەوە و قەڵادزە پاک بکەنەوە.

کەسوکاری شەهیدەکان و عەشیرەت و هەڤاڵانیان زۆر تورە ئەبن و ناوچەی رانیە و لق و چوارقوڕنە ئەگرن. ئێمە بە پەلە دەستەیەکمان نارد، هەڤاڵ دارۆ شێخ نوری وەزیری دارایی و هەڤاڵ یونس رۆژبەیانی، بەیانی زوی ١٩٩٤/٥/٢ بۆ چارەسەرکردنی وەزعەکە. بە داخەوە ئەمڕۆ عەسر هەردوکیان بروسکەیاندا کە لە بەرتوڕەیی خزم و عەشیرەتی هەڤاڵ عەلی نەبی و شەهیدەکان بۆیان ناکرێ کۆنترۆڵی وەزعەکە بکەن، بۆیە بە پەلە پێشنیارمان کرد هەڤاڵ کۆسرەت، سەرۆک وەزیر و د. رۆژ شاوەیس جێگری سەرۆک وەزیران و هەڤاڵ ئازاد بەرواری بچن خۆیان لە نزیکەوە دەست بە سەر وەزعەکەدا بگرن و بەر بە تەشەنەکردن بگرن. ئێستە ئەو برایانە بەرەو ئەوێ ئەجوڵێن.

ئەم ساتە هەواڵی د. رۆژ وا ئەگەیەنێ کە پەشیمان بونەتەوە نایانەوێ لەگەڵ کاک کۆسرەت بچن"[٣٢٢].

لەو بارەیەوە، مەسعود بارزانی بە بروسکەی ژمارە ٨٤٢ ی ١٩٩٤/٥/١ بۆ لیژنەی ناوچەی قەڵادزێی پارتی دەنوسێت: "عەلی حەسۆ میرخان بەبێ ئیجازەی من بۆ قەڵادزێ هاتووە، دەبێ یەکسەر بگەڕێتەوە، نابێ بەهۆی کێشەیەکی لەو بابەتە شتێک روبدات"[٣٢٣].

لە هەمان رۆژدا مەسعود بارزانی بە بروسکەی ژمارە ٨٤٦ کە ئاراستەی ئازاد قەرەداغی، بەرپرسی لقی رانیەی پارتی و مستەفا چاوڕەش

---

[٣٢٢] نەشیروان مسەفا، خەون یان مۆتەکە،ل ٨٩.

[٣٢٣] پارتی دیموکراتی کوردستان، مەکتەبی سیاسی، مەکتەبی ناوەندی دیراسات و تۆیژینەوە، شەڕی ناوخۆی کوردستانی عێراق، چۆن دەستی پێکرد و کێ لێی بەرپرسیارە، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم ١٩٩٧، ل ٥٠.

بەرپرسی مەڵبەندی ٨ ی ڕانیەی یەکێتی و هەردو (م.س) پارتی و یەکێتی کردوە و نوسیویێتی: "دەبێ دەستبەجێ هەدوکتان بۆ هێورکردنەوەی ڕەوشەکە و کۆنترۆڵکردنی کەسانی نامەسئول، دەخالەت بکەن، وەک یەک حیزب ڕەفتار بکەن، مل نەدەن بۆ کەسانی بەڕەڵڵا، ئێوە بەرپرسیاریتی لە ئەستۆ دەگرن."[٣٢٤]

بۆ هێمنکردنەوەی بارودۆخەکە، نوێنەری هەردوهێز، چونە ناوچەکە و لە ئەنجامدا مەکتەبی سیاسی یەکێتی و پارتی ئەم بڵاوکراوەیان دەرکرد:

"ئەی جەماوەری بە شەرەفی کوردستان!

بە داخەوە ڕۆژانی ٥/١ و ٥/٢ ی ١٩٩٤ چەند کارەساتێکی دڵتەزێن لە شاری قەڵادزە ڕویاندا و لە ئەنجامدا چەند کادر و پێشمەرگەی هەردولا شەهیدبون. ئەم ڕوداوە دڵتەزێنە ئەنجامی ناکۆکی و خیلافێکە کە دورە لە هەردو حیزب و بە بێ ئاگاداری لێپرسراوانی هەردو حیزبی هاوپەیمان ڕویداوە.

لێرەدا داوا لە هێزی هەردولا لە ناوچەکانی قەڵادزێ دەکەین، کە دەستبەجێ بڵاوەی لێ بکەن و بە هێمنی بگەڕێنەوە جێگای بنکە ئاساییەکانی خۆیان. هەر کێشەیەک ڕویدا و هەر ئیجرائاتێک پێویست بێ بکرێ بەرەوڕوی حکومەتی هەرێم بکرێتەوە.

بۆ ئاگاداریی جەماوەری بە شەرەفی کوردستان لیژنەیەکی باڵای مەکتەبی سیاسی هەردولا و حکومەتی هەرێم ڕویکردۆتە ناوچەکە بۆ خامۆشکردنەوەی باری نائاسایی و چارەسەرکردنی ئەو ئاڵۆزی و گیروگرفتە.

پێویستە لەسەر هەمو لێپرسراوەکان و لیژنەکانی هەردولامان دەستبەجێ باری نائاسایی ناوچەکانیان هێمن بکەنەوە و بە گیانی برایەتی و هاوپەیمانێتی ڕەفتار بکەن و ئاسایش و تەبایی بپارێزن"[٣٢٥].

---

[٣٢٤] پارتی دیموکراتی کوردستان، شەڕی ناوخۆی...، ل٥٠.

[٣٢٥] پارتی دیموکراتی کوردستان. شەڕی ناوخۆی کوردستان چۆن، ل٥٠.

## ئاڵوگۆری نامە لە نێوان مەسعود بارزانی و مام جەلال

هەر دەربارەی کێشەی قەڵادزی، مام جەلال لە رۆماوە لە ١٩٩٤/٥/٣ ئەم نامەیەی لە رێگای فاکسەوە نارد بۆ مەسعود بارزانی:

" لە مام جەلالەوە بۆ برای خۆشەویستمان کاک مەسعود بارزانی بەرێز..

سلاوێکی گەرم

زۆر بە داخەوە خەبەرە ناخۆش و دڵتەزێنەکانی شەڕی نێوان نەفامان و نامەسئولانی پارتی و یەکێتیمان بیست. من و کاکە نەوە دەسبەجێ بروسکەمان کردوە بۆ م س- ی ن ک کە پەیڕەوی ئامۆژگاری جەنابت بکەن. هەقە ئەمڕۆ جەنابتان دەوری مێژویی خۆتان ببینن بۆ گێڕاندنەوەی ئارامی و ئاسایش و برایەتی و یەکێتی نێوان (پ د ک) و (ی ن ک).

پێم باشە جەنابت سەرۆکایەتی هەردو (م س) بکەیت بۆ راگرتنی دەستبەجێی شەڕ و دانانی لیژنەی لێکۆڵینەوە و سزادانی تاوانباران.

لە غیابی مندا هەقە جەنابت دەوری خۆتان لە جیاتی هەردوکمان لە ناو هەردو حیزبدا ببینن بە دوربینیی خۆتان چارەی پەلەی وەزعەکە بکەن. لە سەر هەردو (م س) پێویستە پەیڕەوی ئامۆژگاریەکانی کاک مەسعود بکەن". (بروسکەکە پارێزراوە)

هەر لەو بارەیەوە و مەسعود بارزانی لە ١٩٩٤/٥/٣ دا بانگەوازێکی بۆ ئاشتەویی گشتی دەرکرد، کە ئەمە ناوەڕۆکەکەیەتی: "

"بانگەوازی مەسعود بارزانی بۆ راگرتنی شەڕ

بسم الله الرحمن الرحیم

هەرچەندە زوڵمێکی زۆر لە پارتی کراوە لەم روداوانەی دوسێ رۆژی

رابوردو لە ناوچەی قەڵادزێ و رانیە و سلێمانی و لەبەرئەوەی چارەنوسی گەلی کورد لە مەترسیەکی یەکجار زۆر گەورەدایە و بۆئەوەی چیتر کارەساتی دڵتەزێن رونەدات، داوا دەکەم لە هەمو لایەک هێمنی بپارێزن و شەڕ بوەستێنن دەستبەجێ. داواکارم رۆژی ١٩٩٤/٥/٤ کۆبونەوەی سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی ببێ لەگەڵ مەکتەبی سیاسی پارتی و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بۆ دیراسەتی ئەم وەزعە و چارەسەرکردنی.

ئێمە هەمیشە بۆ بەرژەوەندی بەرزی گەلی کورد و کوردستان بەرژەوەندی ترمان بەلاوە ناوە، وا ئەم جارەش بۆ خاتری گەلی کورد دیسان واز لە مافی خۆمان دێنین تا مافی کورد بپارێزین. بە پێویستی دەزانم سوپاسی هەڵوێست و موبادەرەی لایەنە سیاسیەکان و شەخسیاتی خێرخواز بکەم کە زۆر ماندوبون و هەوڵێکی زۆریاندا"[٣٢٦].

گرژیەکانی نێوان یەکێتی و پارتی ئارام نەدەکرایەوە، دوای ئەوەی پارتی بارەگای رێکخراوە دیموکراتیەکانی یەکێتی لە دهۆک داگیرکرد، وەفدێکی یەکێتی لە د. فواد مەعسوم و فەریدون عەبدولقادر چون بۆلای مەسعود بارزانی بۆ ئارام کردنەوەی گرژیەکان و بۆ ئەوەی بارەگای یەکێتی لە دهۆک داگیر نەکرێت، ئەگەر ئەوە بکرێت، ئەوە ئەوانیش بارەگاکانی پارتی لە شوێنەکانی تر دەگرن، بەڵام ئەو سەردانە بێ ئەنجام بو، پارتی مەڵبەندی یەکێتی لە دهۆک داگیرکرد و یەکێتیش دوای چەند سەعاتێک لقی چواری پارتی لە سلێمانی و لقی ٣ یان لە دەربەندیخان داگیرکرد.

لە پێناوی ئارامکردنەوەی بارودۆخەکە، هەردو مەکتەبی سیاسی بە سەرۆکایەتی مەسعود بارزانی لە ١٩٩٤/٥/٤ لە سەلاحەدین کۆبونەوەیەکیان ئەنجامدا و ئەم بڕیارانەیان دەرکرد:

١. کۆمیتەیەکی هاوبەش لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان بنێرێت بۆ ناوچەکانی سلێمانی و کەرکوک و قەڵادزە و

---

[٣٢٦] پارتی دیموکراتی کوردستان. شەڕی ناوخۆی.. چۆن، ل٥١.

رانیە بۆ راگرتنی شەڕ و نەهێشتنی شوێنەواری شەڕ و حاڵەتی شەڕ.

٢. کۆمیتەیەکی هاوبەش بە هەمان شێوە و بە هەمان دەسەڵات و بۆ ئەو کارانەی فەقەرەی (١) بچێ بۆ ناوچەکانی دهۆک، زاخۆ، ئامێدی و ئاکرێ و هەمو ناوچەی بادینان.

٣. هەمو گیراوەکان بدرێنەوە بە یەکتری.

٤. ئەبێ بە پەلە بارەگاکان بدەنەوە بە یەکتر.

٥. ئەبێ بێ هیچ مەحتەلکردن، مومتەلەکاتی یەکتر هەمو شت و هەمو ئامێر و دەزگای یەکتری بدەنەوە بە یەکتری.

٦. تەحەشودات هەمو هەڵگیرێ و هیچ هێزی تازەش لە روی یەکتر و دژی یەکتر کۆ نەکرێتەوە.

٧. راگەیاندن شوێنەواری شەڕ نەهێڵن و هەردولا بەرپرسیارن لە راگەیاندن بە گیانی برایەتی و ئاشتی و تەبایی.

٨. هیچ جۆرە تەصریح و قسەیەک رێگە پێ نەدرێ بە بێ تەوجیهاتی مەرکەزی.[٣٢٧]

رۆژێ دوای ئەم رێکەوتنە، واتا لە ٥/٥ دا کۆبونەویەکی تر لە ماڵی مام جەلال بە ئامادەبونی نێچیرڤان بارزانی و چەند ئەندامێکی (م.س)ی هەردولا و ئەحمەد چەلەبی وەک سەرۆکی دەستەی راپەرینی کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی کراو، لەسەر ئەم خالانە رێککەوتن، کە هەریەک لە د. فواد مەعسوم، نێچیرڤان بارزانی و ئەحمەد چەلەبی ئیمزایان کردوە:

١. هیچ لایەنێکیان هێز بۆ پارێزگای هەولێر نەنێرن، نە هێزی پارتی لە ئاوی قەندیل بپەڕێتەوە نە هێزی یەکێتی لە پارێزگای سلێمانی و کەرکوکەوە بچن بۆ هەولێر.

٢. هیچ لایەک لە دەرەوەی هەولێر هێز نەهێنێتە ناو هەولێر.

٣. هەردولا هەر هێزێکی لە ماوەی ئەم هەفتەیەدا هێناوەتە دەوربەر یان

[٣٢٧] پارتی دیموکراتی کوردستان. شەڕی ناوخۆی کوردستان، ل ٥٣.

ناو هەولێر، بگەڕێتەوە شوێنی خۆی.

٤. هەردولا پشتگیری لە هەنگاوەکانی لیژە ئەمنیەکە دەکەن کە لە لایەن هەردولاوە دانراوە بۆ پاراستنی هێمنی و ئاسایشی هەولێر."[٣٢٨]

هەر لە هەمان رۆژدا، واتا لە ١٩٩٤/٥/٥دا، مەسعود بارزانی نامەیەکی ئاراستەی مام جەلال کردوە، کە تێدا هاتبو:

"زۆر بە داخەوە روداوی ناخۆش و دڵتەزێن رویاندا، لەم چوار رۆژەی رابوردودا بە خەیاڵمدا نەئەهات، شتی وا لە نێوان پارتی و یەکێتی روبدات. خەڵکی نەفام و نەزان و هەندێک خائینیش بە داخەوە مەیدانیان بۆ خۆشبوە یاری بە چارەنوسمان بکەن. من هەمو هەوڵێکم داو و ئەیدەم کۆنترۆڵی وەزعەکە بکەم، لجانمان دانا بۆ محافظەکان، بەڵام دیسان سەرپێچی هەر هەیە، نابێ کۆڵ بدەین و ئەبێ ئینشائەڵا ئیرادەی خێر سەرکەوێت، ئیستا ئەم کارانەمان کردوە.

١. نێچیر و ئەحمەد چون بۆ ماڵی جەنابت بۆ سەردانی هێرۆخان بۆ ئەوەی هەمو خەڵک بزانن کە ماڵی جەنابت ماڵی منە وە رەفتاری منداڵانەی خەڵکانێک تەئسیر لە برایەتیمان ناکات.

٢. لیژنەیەکمان دانا بۆ ناهێشتنی مظاهری توتر لە هەولێر، وە هەمو هەوڵێک درا بۆ ئەوەی لە هەولێر وەزعەکە بپارێزین وە لە شوێنەکانی تریش معالەجەی بکەین.

٣. کاک کۆسرەت و کاک د. رۆژ چون بۆ سلێمانی.

٤. کاک فەرەیدون و کاک ئازاد بۆ دهۆک.

٥. کاک عارف و کاک مەلا بەختیار بۆ هەولێر، بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکان. کە کارێکی ئاسان نیە و بەداخەوە شتی وا رویداوە کە کەس حەزناکات باسیان بکات لەبەر سومعەی گەلەکەمان.

برای خۆشەویستم مام جەلال:

---

[٣٢٨] نەشیروان مسەفا، خەون یان مۆتەکە، ل ٩٢.

پێشمەرگە و کادیری پارتی بە ساغی گیراون و ئیعدام کراون، بریندار لە خەستەخانە دەریان هێناوە و شەهیدیان کردوە، شتی وا زۆرە نامەوێت نارەحەتت بکەم، چونکە ئەزانم لە من نارەحەتتری بۆ ئەم وەزعە ناخۆشە، شتی نا مەعقول و ناڕاست زۆرکراوە، بەڵام هەردبێ خەبات بکەین بۆ تەبایی و برایەتی و فێرکردنی خەڵک بۆ ئاشتی و برایەتی و تەبایی نەک شەڕ.

ئینشائەڵا کە تەشریفت هاتەوە ئەبێ لە بنەڕەتەوە ئەم وەزعە عیلاج بکەین یان وا بڕوات زۆر باشترە بۆ هەردکمان بۆ خۆمان بڕۆین با ڕوزەرد نەبین.

زۆر بە پێویستی دەزانم هەرچی زوتر تەشریف بهێنەوە لامان بۆئەوەی پێکەوە بەڵکو هەم برینەکان سارێژ بکەین وە هەم عیلاجێک بۆ ئەم وەزعە بکەین وە سود لەم تەجروبانە وەرگرین.

زۆر زۆر سڵاوم بۆ کاک نەوشیروان و بە ئومێدی دیدارتان.

براتان مەسعود بارزانی[٣٢٩].

لە شاری ڕۆماوە، مام جەلال لە ١٩٩٤/٥/٧ دا نامەیەکی تری ئاراستەی مەسعود بارزانی کرد و تێدا، هانی ئەدا کە ڕۆڵی براگەورە ببینێ و هەوڵی ئارامکردنەوەی بارودۆخەکە بدات و تێیدا هاتوە کە خۆشی (مام جەلال) و نەوشیروان مستەفا دورۆژی تر دەگەنەوە شام.

کۆبونەوانەی نێوان یەکێتی و پارتی، ئەنجامێکی دیاری بەدەست نەهێنا و هەست نەئەکرا کە تەمی شەڕی ناوخۆ ڕەواوەتەوە، بەڵکو گرژی و ئاڵۆزی و شەڕ لە هەندێ ناوچە بەردەوام بو، بۆ نمونە پارتی مەڵبەندی ٧ ی یەکێتیان لە ئاکرێ داگیرکرد و دو فەرماندەی دێرینی یەکێتی ئەوانیش ( ڕەفعەت عەبدوڵا) ناسراو بە ڕێباز و مەلا سلێمان دەگرن و دەیانکوژن.

لە سەلاحەدینیش پارتی هەڵیکوتایە سەر کۆمیتەی ڕێکخستنی یەکێتی و

---

[٣٢٩] هەمان سەرچاوە، ئەو کۆپیەی لای ئێمەیە، ل ٩٤.

١٤ کەسی تێدا بو، کوشتیانن، ئەم کوشتنانە نا ئارامیەکی زیاتری هێنایە کایەوە، لەم بارەیەوە نەوشیروان مستەفا دەنوسێت:

"سەرەڕای ئەو هەمو بەیان و بانگەوازەی هەردولا دەستدرێژی و هێرش و پەلامار بۆسەر یەکتری بەردەوامە ئەمە چی لێ ئەخوێنرێتەوە؟

- یان سەرکردە و سەرکردایەتی (پ د ک) و (ی ن ک) دەسەلاتیان بەسەر هێزە چەکدارەکانیان و حیزبەکانیاندا نەماوە.

- یان ئەو بڵاوکراوانە بۆ چاوبەست و تەفرەدانی رای گشتیە، ئەوان خۆیان لە پشت ئەم روداوانەوەن.

ئەگینا رێی تێ ئەچێ ئەگەر خۆیان ژێربەژێر فەرمانیان بۆ دەرنەکەن کەسیان بوێرن کاری لەو بابەتە بکەن!

سەرەڕای ئەو هەمو بەیان و بانگەوازەی هەردولا دەستدرێژی و هێرش و پەلامار بۆسەر یەکتری بەردەوامە ئەمە چی لێ ئەخوێنرێتەوە؟"[٣٣٠].

مام جەلال لە ٥/٧ ئەم پەیامەی بۆ کاک مەسعود ناردوە:

"بۆ برای خۆشەویستمان کاک مەسعودی بەڕێز

سڵاوێکی گەرم

وەک پێکەوە باسمانکرد، بە زوترین کات بە رێ دەکەوین بەرەو شام. دوبەیانی ئێوارەکەی هەمومان دەگەینە شام. کاکە نەوەش زۆر سڵاوی هەیە. هەمومان هیوامان زۆرە کە جەنابت کۆنترۆڵی تەواوی وەزعەکە بکەن تاکو دەگەینەوە و پێکەوە چارەی دەکەین. لە شامیشەوە هەوڵ دەدەین قسەتان لەگەڵ بکەین. پێم باشە بەردەوام هەردو (م س) ئامۆژگاری بکەن و ماوەی هیچ جۆرە کارێکی ناخۆشی دڵتەزێنی تر نەدرێت.

هەر شاد و سەرکەوتو بن، ئیتالیا، ١٩٩٤/٥/٧"[٣٣١]

---

[٣٣٠] هەمان سەرچاوە.

[٣٣١] هەمان سەرچاوە، ل ٩٣.

مام جەلال لە ١٩٩٤/٥/١٠ بانگەوازێکی بۆ وەستانی شەڕ لە کوردستان بڵاوکردەوە:

"هەڤاڵانی بەڕێز
پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان
بە سڵاوێکی گەرمەوە
داواتان لێدەکەم کە دەسبەجێ بچنەوە شوێنەکانی خۆتان و دەست لە هەمو پێکدادان و بەگژیەکاچونێک هەڵگرن. پێویستە هەموتان ئەم ڕاستیە بخەنەوە یادی خۆتان کە شەڕی براکوژی کارەساتێکی نیشتمانی و نەتەوایەتیە دەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی بەری ڕەنج و خەباتی خۆتان و برا شەهیدەکانتان و دەبێتە هۆی شادی دوژمنان و لە دەستدانی دۆستان و پشتیوانی گەلان و هاوپەیمانان.
ئەی جەماوەری خەڵکی کوردستانی تێکۆشەر
پاراستنی خوێنی شەهیدەکانتان و تاقیکردنەوە دیمۆکراتیەکەمان و ژیان و مان و گەشەکردنی حکومەتە ساواکەمان بەند و بەستراوەتەوە بە یەکێتی ریزەکانی گەل بە گشتی و یەکێتی و هاوپەیمانێتی (ی.ن.ک) و (پ.د.ک) بە تایبەتی، بۆیە پێویستە هەمومان وەک بیلبیلەی چاوەکانمان بیانپارێزین و بە هیچ شێوە و جۆرێک ماوەی شەڕی براکوژی نەدەین پێویستە هەمو چەکەکانمان، هەمو هەوڵ و تەقەلایەکمان، بۆ پاراستنی کوردستانی رزگار و رزگاری وڵات بێت لە دیکتاتۆریەت و هێنانەکایەی عێراقێکی دیمۆکرات و فیدرال بێت.
ئەی کەسوکاری شەهیدانی کوردستان! ماوە مەدەن خوێنی شەهیدەکان بە فیڕۆ بچێت، هەموتان لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بەری شەڕی براکوژی بگرن و پشێوی و ئاڵۆزی مەهێڵن.
ئەی هەمو حیزبەکانی تێکۆشەر!
خەباتی خۆتان، هەوڵی خۆتان پەرە و گەشە پێ بدەن بۆ نەهێشتنی

هۆیەکانی شەڕی براکوژی و چەسپاندنی ئاشتی و برایەتی و دیموکراتی لە کوردستانی خۆشەویستماندا. دەبا هەمومان پێکەوە خەباتەکەمان درێژە پێ بدەین بۆ لە رەگورِیشە هەڵکەندنی هۆیەکانی توندوتیژی و پێکادانی ناوخۆ.

بژی یەکێتی ریزەکانی گەلی کوردستان

نەفرەت لە شەڕی براکوژەی کارەسات هێنەر

سەرکەوێ خەباتی هەمو لایەکمان لە پێناوی چەسپاندنی ئاشتی و دیمۆکراسی و برایەتی و هاوپەیمانی

هەر شاد و سەرکەوتو بن

برای دڵسۆزتان

مام جەلال[٣٣٢]

[٣٣٢] هەمان سەرچاوە، ل ٩٥ و کودستانی نوێ، ژ ٦٨٣، ١٩٩٤/٥/١٠.

## ڕەنگدانەوەی شەڕەکە لە ناوخۆ و دەرەوەدا

دەنگی شەڕی ناوخۆ، لەوە دەرچوبو تەنها لە سنوری کوردستان بمێنێتەوە، ڕۆژنامە عەرەبیەکان زۆربەیان باسی ئەو شەڕە و هەواڵی ئاشتەوایان باسدەکرد، بە تایبەتی ڕۆژنامەکانی بیروتی، لەوانە ڕۆژنامەی (الحیاة) لە ٥/٥ و (النهار) لە ٥/١٠ باسی شەڕی یەکێتی و پارتی و ئەو هەوڵە بێ بەرهەمانەیان دەکرد کە دراون بۆ کۆتایهێنانی ئاڵۆزییەکان.

بۆ هەمان مەبەست، کۆمەڵێک کەسایەتی شاری سلێمانی لە ١٩٩٤/٥/٩ دا، بە ناوی (لیژنەی کۆششی نەتەوەیی) نامەیەکیان ئاراستەی مەسعود بارزانی و هەردو مەکتەبی سیاسی کردو داوای ئاشتی و دورکەوتنەوە لە شەڕی ناوخۆیان لێدەکردن[٣٢٣].

لەو ڕۆژانەدا، چەندەها بروسکە و نامە لە دەزگای جیاواز و حیزب و ڕێکخراوی هەمەجۆرەوە ئاراستەی هەردو سەرکردە و هەردو هێزی سیاسی کراون بۆ وەستانی شەڕی ناوخۆ. هەر لەو چوارچێوەیەدا و لە ٥/١٢ نوێنەرانی ٢٦ ڕێکخراو و کۆمەڵەی جەماوەری و پیشەیی کوردستان سەردانی هەردو مەکتەبی سیاسیان کردوە و پشتگیری خۆیان بۆ ئاشتی و تەبایی نێوانیان دەربڕی.

هەر دەربارەی شەڕ و ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی، ڕۆژنامەی (الحیاة)ی لوبنانی لە ڕۆژی ١٩٩٤/٥/١٣ دا وتارێکی لە نوسینی کامەران قەرەداغی لە ژێر ناونیشانی "بارزانی و تاڵەبانی لەیەک دوردەکەونەوە، نزیک دەبنەوە،

---

[٣٢٣] تیشکێک لەسەر کارەساتی شەڕی ناوخۆ، مەڵبەندی دەرەوەی یەکێتی، ئابی ١٩٩٤.

ناکۆکیان دەبێت و رێک دەکەون" بڵاوکردەوە و باس لە مێژوی ناکۆکی نێوان تاڵەبانی و بارزانی باوک دوای ١٩٦٤ و باس لەو هەوڵانە دەکات کە بۆ ئاشتی نراوە، هەروەها باس لە کێشە و ململانێکان و شەڕی نێوانیان دەکات، باس لەو هەوڵانە دەکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان، دەنوسێت کە ئەنجامی ئەم جەولەیەش وەکو ئەوانەی ترە.

بۆ زانینی زیاتری باری ئاڵۆزی رۆژانی شەڕی ناوخۆ، تەنها لە یەک رۆژدا، لە ١٩٩٤/٥/١٧ دا ئەم روداوانە تۆمار کراوە:

١. شەهید کردنی حەسەن کوێستانی (ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی) و ١٦ پێشمەرگەی هاورێی.

٢. وەفدی هەردو (م. س) لەگەڵ مەسعود بارزانی کۆبونەوە بۆ باسکردنی ئاشتی نێوانیان.

٣. پێشمەرگەکانی پارتی پەلاماری مەڵبەندێکی یەکێتی لە دەرەوەی کۆیە ئەدەن و لە ئانجامدا، ٨ پێشمەرگەی یەکێتی دەکوژرێن.

٤. یەکێتی دەستیگرت بەسەر کۆیەدا و هێزەکانی پارتی لەو قەزایە کرانە دەرەوە. ئەم پانۆرامای تەنها یەک رۆژە و لە ناوچەیەکی دیایکراو.

بۆ کۆتایی ئەم شەڕە بێ مانایە، مەسعود بارزانی دورۆژ دوای کوشتنی ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی حەسەن کوێستانی، لە ٥/١٩ دا بانگەوازێکی بۆ هێزی پێشمەرگە دەرکرد بۆ وەستانی شەڕی کورد –کورد و نوسیویێتی: "داوا لە هەمو لایەنەکانی ئەم شەڕە دەکەم، شەڕ رابگرن و چیتر خوێنی رۆڵەی کورد بەدەستی کورد نەڕژێنن، راگرتنی شەڕ دەبێت سەرانسەر بێت..."[٣٢٤].

هەر لە پێناوی کۆتایی شەڕدا، لە ١٩٩٤/٥/٢٠ کۆبونەوەیەکی هەردو مەکتەبی سیاسی بە ئامادەبونی نوێنەری کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی و کەسایەتی عیراقی دیار، حەسەن نەقیب ئەنجامدراو و لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە رێککەوتن:

---

[٣٢٤] پارتی دیموکراتی کوردستان – یەکگرتو، لقی ٧، ئەمریکا و کەنەدا.

"١. جیاکردنەوەی هێزەکانی هەردولا لەیەک لە پارێزگای هەولێر.
٢. کشانەوەی ئەو هێزانە کە هاتون بۆ ئەو پارێزگایە، بۆ شوێنەکانی خۆیان.
٣. جێبەجێکردنی ڕێکەوتنەکانی ڕابوردو.
٤. دروستکردنی ژورێکی (عملیات) کە پێکبێت لە مەسعود بارزانی، لیوا روکن حەسەن نەقیب، کۆسرەت ڕەسول، د. ئەحمەد چەلەبی، ئەندامێکی بەرەی کوردستانی و لە کاتی پێویستدا ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەشداردەبن و شوێنی ئەم ژورە، لە بارەگای کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی دەبێت، لە ڕۆژی ١٩٩٤/٥/٢١ دەستدەکات بە کارەکانی خۆی".

ئەم ڕێکەوتنە بە زمانی عەرەبی نوسراوە و واژوی ئەم بەڕێزانەی لەسەرکراوە: مەسعود بارزانی، لیوا روکن حەسەن نەقیب، فواد مەعسوم، کۆسرەت ڕەسول، عەبدولخالق زەنگەنە، کەریم ئەحمەد، ئەحمەد چەلەبی و یعقوب یوسف.

## گەرمبونی شەڕی هەمولاکان

ئەم ڕێکەوتنە، وەک ڕێکەوتنەکانی تر، چەند ڕۆژێکی نەخایاند و شەڕ دەستیپێکردەوە، ڕۆژی ١٩٩٤/٥/٢٤ هێزێکی، پاسداران، پارتی، بزوتنەوەی ئیسلامی هێرشیان کردە سەر بارەگاکانی یەکێتی لە لای هەڵشۆ – کێلێ لە قەلادزێ، هەر لە هەمان ڕۆژدا پارتی هێرشیان کردۆتە سەر هێزەکانی یەکێتی لە بەنی حەریر، دۆڵی بالیسان، کڵاو قاسم... (بروسکەی حەمە تۆفیق، ئەندامی (م.س)ی یەکێتی بۆ نوسەری ئەم کتێبە لە ١٩٩٤/٥/٢٥)

شەڕی نێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی پێش ئەم مێژوەی سەرەوە، لەو ناوچەیە دەستیپێکردبو "شەوی ١٠-١٩٩٤/٥/١١ ڕاجیمە و تۆپ هێزی ئێرانیش لەگەڵ بزوتنەوە هێرشیان کرد و یەکێتی شکا و لەوناوە بزوتنەوە هەندێک هاتنە پێشەوە بۆ لای گوڵپ و باخەکۆن و نارنجەڵە...زۆر هەوڵمدا بۆ وەستانی شەڕەکە بەڵام نەکرا، هەردولا بەردەوام بزوتنەوە و پارتی لە لایەک

و یەکێتیش لە لایەک و ئێمەش لایەن بوین لەو شەڕە، بەڵام پێمان خۆش نەبو یەکێتی بەرامبەر پارتی بشکێ، چونکە پارتی لە ئێمەشی دەدا"[٣٣٥].

هەر دەربارەی وەستانی شەڕی ناوخۆ، لێپرسراوی ڕێکخراوی خێرخوازی (شیڵتەر ناو) تێری ئاسیسلابی لە دەزگای هەواڵی فەرەنسی (AFP) لە ٥/٢٥ بانگەوازێکی بڵاوکردەوە دەڵێ: "تکایە شەڕەکانتان لەو جێگایە بکەن، کە هەمو شەڕێکی دیموکراتی تێدا ئەنجام ئەدرێت، ئەویش پەرلەمانە"

هەر لەوکاتەدا و لە ٥/٢٢، مام جەلال لە چاوپێکەوتنێکدا لە ژمارە ٥٦٥٤ ی ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط) دەڵێ: "هێزی دەرەوە، شەڕی ناوخۆی گەرم کردوە، ئەو بە گەشبینیەوە دەڕوانێتە ئەو ڕێکەوتنەی لەگەڵ پارتی کراوە، کێشەکان بە شەڕ بەهیچ شێوەیەک چارەسەر ناکرێت، یەکێتی بە شەڕ لەناو ناچێت، وە هێزی دەرەوە لەم شەڕانەی دواییدا لە ناوچەی هەڵەبجە بە خەستی بەشداربو..."[٣٣٦].

دوای تێپەربونی چەند ڕۆژێک بەسەر ڕێکەوتنی ٥/٢٠ دا، مام جەلال لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (الحیاة) ژمارە ١١٤٢٢ ی ١٩٩٤/٥/٢٧ پاسدارانی ئێران و بزوتنەوی ئسلامی و چەکدارانی حیزبولای سەر بە ئەدهەم بارزانی تاوانبار دەکات کە پشتگیری پارتی دەکەن دژ بە یەکێتی و هێرش دەکاتە سەر پارتی کە هێرشیان کردوتە سەر یەکێتی و ڕێکەوتنەکەیان شکاندوە. هەر لەو چاوپێکەوتنەدا، نوێنەری پارتی لە لەندەن هۆی هەڵگیرسانی ئەو گرژیە دەخاتە ئەستۆی یەکێتی.

پارتی لە مانگی مایسی ١٩٩٤ لیستێکی ناوی بڵاوکردەوە کە لەو مانگەدا یەکێتی ٥٨ دیلی پارتی لە زینداندا کوشتوە، کە زۆربەیان لە قەڵادزێ، ڕانیە و هەڵەبجە بون، هەروەها خشتەیەکی تریان بڵاوکردۆتەوە لە هەمان مانگدا ناوی ٥٥ کەسی لایەنگری پارتی تێدایە لە چەمچەماڵ کە ماڵەکانیان

---

[٣٣٥] محەمەد حاجی مەحمود، ڕۆژ ژمێری... بەرگی ٤، ل ٣٦٠.

[٣٣٦] ڕۆژنامەی الشرق الاوسط. ١٩٩٤/٥/٢٢، العدد ٥٦٥٤.

تەقاندۆتەوە، هەروەها لیستێکی تریان لە ١٩٩٤/٥/٣٠ بڵاوکردۆتەوە، ناوی ٢٩ ئەندامی پارتی تێدایە کە لە لایەن یەکێتیەوە دەستگیر و دەستبەسەر کراون[٣٣٧].

هەندێجار، شەڕ لە نێوان پارتی و یەکێتیدا رویئەدا، بەڵام سەرکردایەتی هەردولا بێ ئاگایی خۆیانیان نیشان ئەدا لە شەڕەکە، ئەمە رەنگە وابێت و ئەوان ئاگایان لێی نەبوێت و شەڕەکە زۆر ناوچەیی بوبێت، یاخود هەریەکە ویستویەتی سەرکەوتن بۆخۆی تۆماربکات و وای نیشانداوە کە بێ ئاگایە، یان دەسەڵاتیان نەبوبێت شەڕەکە بوەستێنن، یاخود لێپرسراوە سەربازییەکان بەقسی سەرەوەی خۆیانیان نەکردوە، هەرچیەکیان بێت، ئەوە هەڵوێستێکی خراپە، بۆ نمونە لە ١٩٩٤/٥/٢٩ مەسعود بارزانی و کۆسرەت رەسوڵ بەیانێکی هاوبەش دەردەکەن و داوای وەستانی شەڕ دەکەن لە گەڕەکی ئیسکانی هەولێر[٣٣٨].

مەسعود بارزانی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رۆژنامەی (الشرق الاوسط) دەڵێ: "کاتێ تاڵەبانی پشتگیری جەماوەری کەمکرد، پەنای بردە بەر چەک، هیچ چارەیەکیش نیە، تەنها گەڕانەوە بۆ شەرعیەت نەبێت" هەروەها دەڵێ: "چارەسەر ئەوەیە کە بگەڕێینەوە بۆ بڕیارەکانی کۆنمان و پەرلەمان رۆڵی سەرەکی خۆی ببینێ و کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی چاودێری رێکەوتن و بارودۆخەکە بکات"[٣٣٩]، هەروەها وەک زۆربەی چاوپێکەوتنەکانی سەرکردەکانی کورد، هەریەکە ئۆباڵی هەڵگیرسانی شەڕ و باسی رابوردوی خوێناوی ئەخاتە ئەستۆی لاکەی تر و خۆی وەک کۆتری ئاشتی ئەداتە قەڵەم.. هەر لەو رۆژانەدا، پارتی و بزوتنەوە هەوڵیان ئەدا گورزی کوشندە

---

[٣٣٧] پارتی دیموکراتی کوردستان، (م.س). چۆن دەستی پێکرد..خشتەی ژمارە ١، ل ٩،٤، ٤١٨.

[٣٣٨] کوردستانی نوێ، ژ ٦٩٤، ١٩٩٤/٥/٢٠.

[٣٣٩] الشرق الاوسط، ژ. ٥٦٦٤ی ١٩٩٤/٦/١

لە یەکێتی بدەن: "لە ڕۆژانی ١و٦/٢ هێزەکانی پارتی و هەندێک بزوتنەوە لە مەریوانەوە واتە لە دزلی و مەریوانەوە بۆ لای پێنجوین بە نیازی گرتنی پێنجوین و گومرگی ئەو ناوە لە یەکێتی هێرشیان دەستپێکرد، پێنجوینیان گرت و ناڵپارێز و بەتەمای لەیەکدانەوەی لەگەڵ سەید سادق دابون، ڕادیۆی پارتی هاواری دەکرد، بەتەمای گومرگی ئیبراهیم خەلیل بون، وا گومرگی باشماخ یشیان لەدەست چو"[٢٤٠]. لە ١٩٩٤/٦/٣ دا، مام جەلال بانگەوازێکی بڵاوکردەوە لە ژێر ناوی: "مژدەی موبادەرەیەکی یەکلایەنی (ی.ن.ک) دەربارەی دەربازبون لە گێژاوی شەڕی خۆ کوژە و کورد کوژە و ڕامالینی نەویستراوی نە شەڕ و نە ئاشتی":بانگەوازەکە کە بریتی بو لە ٥ خاڵ دەربارەی وەستانی شەڕ و گەڕانەوە بۆ جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەکان لەگەڵ پارتیدا و کەمکردنەوەی هێزەکانی هەردولا لەو ناوچانەی کە نزیکن لە یەکتر[٢٤١].

مستەفا چاوڕەش، ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی و لێپرسراوی مەڵبەندی ڕاپەرینی یەکێتی، کە ڕاستەخۆ لێپرسراوێتی سیاسی و سەربازی یەکێتی ئەو دەڤەرەی لە ئەستۆدا بو، بە کورتی باسی سەرهەڵدانی شەڕی قەلادزێ دەکات: "دەبێت بە هەمومان ئەم ئەزمونە بپارێزین، بەداخەوە ئەوەی چاوەڕێمان نەدەکرد، ڕویدا، زەمینەی شەڕ لە ئارادا بوو، ئەگەر لە ڕانیە نەبوایە، لە گەرمیان یان لە هەولێر یاخود لە دهۆک هەڵدەگیرسا، دۆخەکە و عەقڵیەتی حیکمەت وایکردبو، ئەم شەڕە لە ملی ئێمەوە ئالا، لە شەڕیشدا لەسەر حەق بیت یان ناحەق، کەس خۆی بە کوشت نادات، منیش نامەوێت بارەگاکەم بگیرێت، لە دڵیشدا لە هەمو پارتیەکان زیاتر پێم ناخۆش بوو، بەڵام ئیتر شەڕ شەڕە. جارێکی تر بەداخەوە بۆ هەمو شەهیدەکانی هەردولا،

---

[٢٤٠] محەمەد حاجی مەحمود، ڕۆژ ژمێر.. بەرگی ٤، ل ٣٧٢.

[٢٤١] کوردستانی نوێ. ژ. ٦٩٩ ی ١٩٩٤/٥/٢٠

شەڕەکە بەهۆی هەڵەی چەند کەسێکەوە روویدا[٣٤٢]، یاسای شەڕ ئەوەیە، کە هیچ لایەک خۆی بە تاوانبار و دەستپێشخەر نازانێت، ئەوەی بەرامبەری بە هەڵگیرسێنەر دادەنێ.

شەڕی ناوخۆی دوای راپەرین نیشانی دا، کە یەکێتی و پارتی بەرپرسن، ئەوەی کە مستەفا چاوڕەش باسی دەکات زۆر راستە، ئەویش کە زەمینەی شەڕی ناوخۆ لە ئاردابو، ئامادەبو، چاوەڕێی تەقەیەک بو، تەقەکە کراو و شەڕەکە چوار ساڵی خایاند!.

---

[٣٤٢] مستەفا چاورەش، یادەوەریەکان، چاپی دووەم ٢٠١٥، ل ٣٤٥.

# هەوڵی تورکیا بۆ ئاشتکردنەوەی یەکێتی و پارتی

شەڕی ناوخۆی نێوان یەکێتی و پارتی بە ئاسانی و بە هەوڵی ناوخۆیی کۆتایی نە ئەهات و هێمن نە ئەبۆوە، حکومەتی تورکیا ویستی دەست بخاتە ناو کاروباری هەرێمی کوردستان و خۆشی وەک پیاوچاک بناسێنێت، لەبەرئەوە هەردولای بۆ ١٩٩٤/٦/١٣ بانگهێشتکرد بو قەزای سلۆپی، لە یەکێتی: مام جەلال، محەمەد تۆفیق، سەرچڵ قەزاز، شازاد سائیب، شێردڵ حەوێزی و لە پارتی: مەسعود بارزانی، سامی عەبدولڕەحمان، موحسین دزەیی، فازیل میرانی، بابەکر زێباری، سەفین دزەیی.

لە لایەنی تورکی: جەنەراڵ ئایدن ئالتەر (سەرکردەی گشتی جەندرمە)، جەنەراڵ حەسەن قۆنداغچی، جەنەراڵ یوسف، جەنەراڵ یاڵچین، نوێنەری وەزارەتی دەرەوە، بەرپرسی رۆژهەلاتی ناوەڕاست لە ئۆفیسی سەرۆک وەزیران.

مەسعود بارزانی ئامادە نەبوە کە راستەوخۆ لەگەڵ مام جەلال گفتوگۆ بکا. تورکەکان بە جیا مەسعود بارزانی و مام جەلالیان بینی و گفتەگۆیان لەگەڵ کردن و سوربون لەسەر راگرتنی شەڕ و چەسپاندنی ئاشتی، ئامادەییان پیشاندا بۆ ئەو مەبەستە یارمەتی هەردولا بدەن. پێش ئەم کۆبونەوەیە، واتا لە ١٩٩٤/٦/١٢ دا، مام جەلال بە ئامادەبونی نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان لە کوردستان و نوێنەرانی رێکخراوی مافی مرۆڤ لە سلێمانی، بڕیاریدا کە تەواو گیراوەکانی پارتی و بزوتنەوەی ئیسلامی کە لای یەکێتیی بون، ئازادبکرێن، کە ژمارەیان ٥٢ بەندبون[٣٤٣].

---

[٣٤٣] کوردستانی نوێ، ژمارە، ٧٠٨ ی ١٩٩٤/٦/١٥.

هەر لەو رۆژەدا، واتـا ١٩٩٤/٦/١٣ دا، تەرمـی (عوسـمانی قـاله مـنەوەر) کە لێپرسـراوێکی سـەربازی دیـاری پـارتی و پێشمەرگەیەکی سـەرەتاکانی شـۆڕش بو، لە سلێمانی بەخاک سپێرا، لەو کاتەدا کە یەکێتی ئاسایشی سلێمانی لە دەستدا بـو، وە بـاڵا دەسـت بـو لە شـاردا، تەقە لە کەژاوەی تەرمەکەی کـراو و کـوژرا و بریندارێ زۆری لێکەوتەوە، ئەم روداوەش ئاگری شەڕەکەی زیاتر خۆشکرد.

## گومرگی ئیبراهیم خەلیل

هۆیەکی گرنگ و سـەرەکی و رونی شـەڕی نـاوخۆ، کێشـەی داهـاتی نـاوخۆ بـو، داهـاتی ئەو کـاتەش زۆربەی هەرە زۆری گـومرگی ئیبـراهیم خەلیـل بـو، لەبەرئەوەی ئەو دەروازەیە کوردسـتانی بە تورکیـاوە دەبەسـتەوە و لە ژێـر دەسەڵاتی پارتیدا بو، پارتی هەمو داهاتەکەی بۆ خۆی دەبرد.

لە هەمـو دانوسـتانەکان و رێکەوتـنە نـاوخۆیی و دەرەکیەکانـدا، ئیبـراهیم خەلیـل خـاڵێکی گرنـگ و سـەرەکی رێکەوتنەکـان بـو، یەکێتـی داوای دەکـرد داهاتەکەی بگەڕێتەوە بۆ خەزێنەی حکومەتی هەرێم.

هـیچ کـاتێکیش پـارتی بە ئاشـکرا نەی ئەوت کە ئەو بە تەنهـا دەسـت دەگرێـت بەسـەر داهـاتەکەدا و نایـدا بە حکـومەتی هەرێـم. تەلەفزیـۆنی (گـولان)ی پـارتی لە ١٩٩٤/٦/١٩ دا وتـارێکی دەربـارەی گـومرگی ئیبـراهیم خەلیل بڵاوکردەوە و لە بەشێکیدا دەڵێ: "پێمانوایە، پارتی مەسئولێتی ئەوە دەگـرێتە ئەسـتۆ، دینارێـک لە مـوچەی ئەو فەرمـانبەرانە کەم نەبێـتەوە لەو شوێنانەی کە پارتی بە ئاشکرا تیایاندا کاردەکات. لە کۆتاییدا ئەوە دەڵێین، ئەم داد و فیگـانەی (ی.ن.ک) دەیکـات بـۆ حکـومەتی کوردسـتان و مـوچەی فەرمانبـاران نییە، بگـرە بـۆ ئەوەیەتـی خـۆی پـارەی لەبەربـڕاوە، بەڵام ئێمە پێمانوایە ئەوەچو جارێکی تر لاف بە پارەی ئیبراهیم خەلیلەوە لێبدەن. کورد گـوتەنی ئەو باوکەیـان مـرد جـارێکی تـر خۆیـان چەکدار بکەن و ئینقیلاب

بەسەر هاوپەیمانەکانیاندا بکەن و لە بێ ئاگاییدا خەنجەر لە پشت بدەن"[٣٤٤]، کورتەی ئەم وتارە ئەوەیە: ئیبراهیم خەلیل هی پارتیە و داهاتەکەی تەنها بۆ فەرمانبەرانی ژێر دەسەلاتی پارتیە، هەروەها مانای ئەوەیە کە یەکێتی نابێت هیچ هیوای بە داهاتی ئیبراهیم خەلیل هەبێت.

"مەسعود بارزانی وتی کە داهاتی گومرگ، تاقە سەرچاوەی داهاتی کوردستانە، رۆژانە نزیکی ٧٠٠ بارهەڵگری تورکی دێنە کوردستانەوە، ئەمەش سەرچاوەیەکی گەورەی ئابوری و سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانە، ئەم بارودۆخە هۆیەکە لە هۆکانی شەڕی ناوخۆ، چونکە ئەمە وایکردوە کە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بێبەش بێت لەو داهاتە.."[٣٤٥].

هەر دەربارەی گومرگی ئیبراهیم خەلیل، پارتی دەیویست داهاتەکەی بە کەم نیشان بدات و نیشانی بدات کە داهاتی یەکێتیش لە گومرگەکانی ژێر دەسەلاتی خۆی، لە ئیبراهیم خەلیل کەمتر نیە، لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا لەگەڵ رۆژنامەی (برایەتی)، بریکاری وەزیری دارایی حکومەتی هەرێمی ئەو کاتە (صلاح دەلۆ) کە پارتی بو دەڵێ: "ئەگەر ئاماژە بەوە کرابێت کە گوایە کە رۆژانە داهاتی گومرگی ئیبراهیم خەلیل دو ملیۆن دینار بێت، ئەوە داهاتی گومرگەکانی سلێمانی لەوە کەمتر نیە، بۆ نمونە لە سێ مانگی رابوردو، گومرگی سلێمانی (٣٨) ملیۆن دینار و ٨٠٦ هەزار ٣٦٧ دیناری داهات بوە، هەردو گومرگیش بێجگە لە دینار، داهاتی دۆلاریشیان هەبووە"[٣٤٦].

جگە لە تورکیا، وڵاتانی دەرەوە لەوانە ئەمەریکا و چەند وڵاتێکی ئەوروپی هەوڵی زۆریاندا بۆ وەستانی شەڕی نێوان یەکێتی و پارتی، لە بروسکەیەکی

---

[٣٤٤] کوردستانی نوێ، ژمارە، ٧٠٨ ی ١٩٩٤/٦/١٥.

[٣٤٥] تیشک لەسەر کارەساتی شەڕی ناوخۆ، مەڵبەندی دەرەوەی یەکێتی ئابی ١٩٩٤.

[٣٤٦] آفرا بینفیو، کرد العراق، بناء دولة داخل دولة، دەزگای ئارس و الساقی ٢٠١٤، رۆژنامەی سەفیری لوبنانی ٢-١٩٨٤/٨/٣.

(مـــام جەلال)دا بە ژمـــارە ٢٥٧ ی ١٩٩٤/٦/٢٧ بــۆ (م.س) و کــۆمیتەی سـەرکردایەتی و مەکتەبەکـان، دەنوسێت: "ئیمـڕۆ کۆبـونەوەیەکی زۆر بـاش کرا لە ماڵی کاک کۆسرەت، بە بەشداری وەفدی سۆسیال ئینتەرناسیۆنال و د. کەندال و د. نجمەدین کەریم، لە لایەن پارتیەوە، هەڤالان، کاک مەسعود و د. رۆژ و کاک جەوهەر نامیق، کاک موحسین دزەیی و کاک زەعیم عەلـی و کـاک فەرەنسـۆ بەشـداریانکرد، لە لایەن (ی.ن.ک) وە، هەڤـالان مـام جەلال، کاک کۆسرەت، کاک د. فواد، کاک مەلا بەختیـار، کـاک ئەرسـەلان بـایز، کـاک نەژادی ئەحـمەدی عەزیـز، کـاک ئەحـمەد بـامەرنی بەشـداریان کـرد. لە کۆبونەوەیەکی دوقۆڵی (کاک مەسعود) و (مـام جەلال)دا پێک هـاتن لەسـەر ئەوەی هەر دوسبەی نوێنەری هەردو مەکتەبی سیاسی کۆببنەوە، بۆئەوەی دەســتبەجێ پەرلەمـــان و حکــومەت بــخەنەوە گەڕ، باســی دەســتبەجێ ئاساییکردنەوەی وەزع و دەستبەجێ راگرتنی حەملەیی دیعایی و راوەستانی گرتن و تالانکردن و ئازاردانی یەکتر. پێویستە هەردو (م.س) پلان دانێن بۆ چارەســەرکردنی هەمــو گیروگــرفتە گرنگەکــان لە نێــو خۆمانــدا، بەڵام ســەرکردایەتی بەرەش کــۆبکرێتەوە بــۆ بەشــدایکردنیان لە چارەســەری گیروگرفتەکـان، تکـایە هەمـو بە جـدی پەیـڕەوی ئەو بڕیـارانە بـکەن و جێبەجییان بکەن و ماوە نەدەن بە لاساران و داخ لە دڵان بۆ شێواندنی ئەو رێکەوتنە گرنگە."

بەرهەمێکی ئەو کۆبونەوەی لوتکەیە، ئەوەبو، پەرلەمـانی کوردسـتان، دوای دابرانێکـی زۆر، کۆبـونەوەیەکی گشـتیان لە ٦/٣٠ دا ئەنجامـدا بە ئامـادەبونی هەریەک لە مام جەلال و مەسـعود بـارزانی و نـوێنەرانی کۆنگرەی نیشـتیمانی عێراقی و زۆربەی زۆری ئەندامانی هەمو فراکسیۆنەکان.

# کۆبونەوەی پاریس

دەوڵەتــی فەرەنســا، لە ١٩٩٤/٧/١٦ بـۆ ئاشــتبونەوە و ڕێکەوتنــی نێـوان یەکێتی و پارتی، بانگهێشتی هەردولای کرد بۆ پاریس، نوێنەرانی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا و نوێنەرانی سەفارەتی ئەمریکی و بەریتانیا وەک چاودێر ئامــادەی کۆبــونەوەکە بــون، کۆبــونەوەکە بە درێــژی باســی بــارودۆخی کوردستان و هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ کرد و لە ئەنجامدا هەردولا لەسەر ئەم خاڵانە ڕێککەوتن:

"١. پێویستە هەمو کێشە و ناکۆکیەکان بە ڕێگای ئاشتیانە چارەسەر بکرێت.

٢. هەڵبژاردنی گشتی لە کوردستان بکرێت.

٣. بـۆ هەڵبژاردنـی ئەنجـومەنی نیشـتیمانی کوردسـتان لە مـانگی مایسـی ساڵی ١٩٩٥، لە کاتێکدا فەترەی یاسایی پەرلەمانی ئێستا تەواو دەبێت.

٤. لەسەر چەند خاڵێکی تر ڕێکەوتن کە پەیوەندییان بە بارودۆخی هێزی پێشمەرگە و ئیدارە و مالییەی حکومەتی هەرێم و حیزبەکان و هێشتنەوەی حکومەت دور لە دەستێوەردانی حیزبایەت".

نەوشیروان مستەفا، لە کتێبی "خەو یـان مۆتەکە" دەربارەی کۆبونەوەی پاریس بەم شێوەیە نوسیویێتی:

" هەوڵی کوژاندنەوە شەڕ: گفتوگۆ لە پاریس (١٦-١٩٩٤/٧/٢٢)

دەســتەیــەکی نوێنەرایــەتی سۆسیالیســت ئینتەرناســیۆنال هــاتون بــۆ کوردستان ئەیانەوێ لە نێوان یەکێتی و پارتیدا ناوبژی بکەن. چەندجارێ بۆ چەند کۆنفرەنسێکی خۆیان هەردولایان وەکو "چاودێر" بانگکردوە.

هاوزەمان لەگەڵ هاتنی ئەوان دەستەیەک کورد هـاتون کە بریتیە لە: د

کەندال نەزان، سەرۆکی ئینیستوتی کورد لە پاریس. د. فوئاد حسێن، جێگری سەرۆکی ئینیستوت. د. نەجمەدین کەریم، سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانی کورد لە ئەمەریکا. هاتون بۆ کوردستان پێشنیارێکیان پێیە فەرەنسا ناوبژی بکا و وەفدی سەرکردایەتی هەردولا بانگ بکا بۆ پاریس، مادام میتران، هاوسەری سەرۆک میتران و سەرۆکی رێکخراوی "فرانس لیبرتی" لە پشتە.

خاڵە سەرەکیەکانی پرۆژەکەیان بریتیە لە:

• سەرۆک میتران نوێنەرانی هەردولا بانگ بکا بۆ جێگایەکی نزیک پاریس بۆ گفتوگۆ.

• ئەبێ هەواڵ و دەنگوباسی ئەم بانگهێشتنە و کۆبونەوەکانی و گفتوگۆکانی نهێنی بمێنێتەوە، نابێ بگاتە دەم رۆژنامەوانەکان.

• کۆبونەوەکان لەلایەن نوێنەری تایبەتی سەرۆک میترانەوە سەرپەرشتی ئەکرێ، پسپۆڕ و شارەزای کێشەی کورد و، بەڕێوەبردنی ململانێ بانگ ئەکرێن بۆ یارمەتیدانی هەردولا بۆ نزیککردنەوەی بیروڕاکانیان لە یەکتری.

• ئەگەر گفتوگۆکان بە سەرکەوتویی گەیشتە رێککەوتن، ئەوسا سەرۆک میتران سەرکردەی هەردولا بانگ ئەکا بۆ پاریس و لە ئاهەنگێکی ئاشکرادا کە دیپلۆمات و رۆژنامەوان و سیاسی وڵاتانی جیاوازی بۆ بانگ ئەکرێ، بە ئامادەبونی سەرۆک میتران رێککەوتنەکە ئیمزا ئەکرێ.

• ئەگەر گفتوگۆکە سەرکەوتو نەبو فەرەنسا خۆی ناکا بە خاوەنی.

بۆ پرۆسەکەش زەمان بەندیەکی دیاریکراویان دانا بو.

وەفدەکە ئەیانەوێ باری سەرنجی هەردولا بزانن لە هەولێر سەرکردە و سەرکردایەتی پارتی یان دیوە. هەروەها (مام جەلال) و هەندێ لە ئەندامانی (م س) و سەرکردایەتی یەکێتیش".

لە کۆتایی کۆبونەوەکانی پاریس، لە ١٩٩٤/٧/٢٢ دا ئەم ڕاگەیاندنە بڵاوکرایەوە:

"یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان لە پاریس

لەسەر ڕێککەوتننامەی ئاشتی ڕێکدەکەون. لە ڕۆژی ١٦ ی گەلاوێژ تا ٢٢ گەلاوێژ دو وەفدی بالای یەکێتی و پارتی لە شوێنێکی نزیک پاریس لێدوان و گفتوگویان کرد، بۆ چارەکردنی ناکۆکی و کێشەکانی نێوان هەردولا لە کوردستانی عێراق. قسەکردنەکە لە جەوێکی دۆستانە و جدیدابو. ئەنجامی هێنا بە ڕێککەوتننامەیەکی بەربلاو و فراوان، کە بە ڕەسمی لە لایەن بەڕێزان مام جەلال و کاک مەسعودەوە دەبێ ئیمزا بکرێ.

کاربەدەستانی کۆشکی ئەلیزی و وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا و سەفارەتی ئەمەریکا و بەریتانیا وەک تەنها چاودێر لە هەندێک لە لێدوانەکاندا ئامادەبون، هەروەها چەند دیپلۆماسیەک و سیاسیەکی فەرەنسی و ئەکادیمی ئەوروپی وەک سەرپەرشتیکەری لێدوانەکان ئامادەبون.

لەم دانیشتنانەدا بە تێروتەسەلی باسکرا لە هۆکانی ناکۆکی و کێشەکانی نێوان هەردولا، لە ئەنجامدا ڕێککەوتن لە سەر ئەم خالانەی خوارەوە:

- پێویستە هەمو کێشە و ناکۆکیەکان بە ڕێگای ئاشتی و دیموکراتیانە چارە بکرێن.
- هەلبژاردنی گشتی لە کوردستان بکرێت بۆ هەلبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان لە مانگی مایسی ١٩٩٥ لە کاتێک دا فەترەی یاسایی پەرلەمانی ئێستا کۆتایی دێت.
- ڕێککەوتن لەسەر کۆمەلێک ئیجرائات بۆ فراوانکردن و پتەوکردنی دەسەلاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان و بۆ نەهێشتنی دەستێوەردانی پارتەکان لە کاروباری حکومەتدا.
- ڕێککەوتن لەسەر کۆمەلێک ئیجرائات بۆ سەرلەنوێ ڕێکخستن و بنیاتنانەوەی هێزی چەکدار لە ناوچەکە.
- هەردولا ڕێککەوتن بۆ کارکردن لەسەر سیاسەتێکی دەرەوەی هاوبەش.

دانیشتنەکان دو بانگەوازی بەرزکردەوە بۆ کۆمەلگای نێودەولەتی بۆ کەمکردنەوەی ئابلوقەی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆسەر ناوچەکانی کوردستانی

عێراق و هەروەهاش بۆ درێژەپێدانی (Operation Provide Comfort) تا ئەوکاتەی چارەسەرێکی دیموکراتیانە بۆ کێشەی کورد لە عێراق دەدۆزرێتەوە.

لێدوانەکان بایەخی سەرەکیدا بە تەباییکردنی پەیوەندی نێوان و باری ناوخۆی کوردستانی عێراق.

هەردولا سوپاس و رەزامەندی گەرمی خۆیان ئاراستەی دەزگاکانی فەرەنسا کرد بۆ رۆڵی گرنگیان بۆ ئاسانکردنی گرتنی کۆبونەوەکان[٣٤٧].

هەر دەربارەی کۆبونەوەکانی پاریس، سامی عەبدولرەحمان، سەرۆکی وەفدی پارتی لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا لە ١٩٩٤/٨/٦ لەو بارەیەوە دەڵێ: "بە شێوەیەکی گشتی ئەو مشاکیلەی لە کوردستان هەیە، لە تەطبیع، هەڵبژاردن، هەموی لەوێ باسکرا، دەتوانم بڵێم حلول و ئیتیفاق بۆ زۆربەی هەرە زۆری ئەو مشکیلانە دۆزرایە و ئیتیفاقی لەسەرکرا..."[٣٤٨].

دەقی رێکەوتنەکەی پاریس بە ئیمزای نەوشیروان مستەفا و سامی عەبدولرەحمان لە پرۆتۆکۆلەکانی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستانی عێراق، بەرگی ١١ی ساڵی ١٩٩٤ چاپی یەکەم، ل ٥٩١ بڵاوکراوەتەوە.

نوێنەرانی تورکیا و وڵاتانی تر هەوڵیاندا بۆ نیشاندانی نیەتیان کە لەم کێشەی ناوخۆیەی کوردیدا بێلایەن دەبن، زۆر کات بەسەر رێکەوتنەکەدا نەچوبو، کە رۆژنامەی (الحیاة)ی لەندەنی لە ژمارە ١١٥٢٥ی ١٩٩٤/٩/٧دا نوسیبوی کە مام جەلال لە ١٩٩٤/٨/١٥ نامەیەکی ئاراستەی سەرۆک وەزیرانی تورکیا سلێمان دیمیرێل کردوە و داوای بێلایەنی لە حکومەتی تورکیا کردوە و باسی هێرشی فرۆکەی تورکیای کردوە کە لە ٨/٨ دا کردویانەتە سەر بارەگاکانی یەکێتی نیشتیمانی.

هوشیار زێباری، ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی و لێپرسراوی پەیوەندیەکانی دەرەوەیان، لە نوسینێکدا، دەربارەی هەڵوێستی پارتی لە رێکەوتنامەکە و رۆڵی تورکیا و ئەو ئیدعایەی یەکێتی کە گوایە پارتی

---

[٣٤٧] خەون یان مۆتەکە، ١، ل ١٢٠.

[٣٤٨] خەون یان مۆتەکە، ١، ل ١٢٦.

ناوەرۆکی ڕێکەوتنەکەی داوە بە تورکیا، نوسیویێتی: "وەفدی یەکێتی و پارتی لە ڕێگای گەڕانەوەیاندا لە تورکیاوە بۆ کوردستان، دیسان بە هەلیکۆپتەرێکی دیکەی تورکی گوێزراونەتەوە، کەچی سەرانی یەکێتی پێیانوایە حکومەتی تورکی ئەوەندە سادە و ساکارن کە یەکێتی نیشتیمانی بتوانێت چاوبەستیان لێبکات و ڕیکەوتنەکەی پاریسیان لێبشارنەوە...وێڕای تورکیا، ئەو دەوڵەتانەی پێکدێنن کە پرۆسەی (پرڤاید کۆمفۆرت) بۆ کوردستان دابین دەکەن، هەرگیز عەقڵیش نایبڕێت کە ڕێکەوتنێک بەبێ ئاگاداری تورکیا بکرێت، یان ڕێکەوتنێک ئەنجام بدرێت بەبێ ئەوەی وڵاتانی ڕۆژئاوا، تورکیای هاوپەیمانی خۆیان لێ ئاگادار نەکەنەوە...هەروەها لە ١٩٩٤/٧/٢٣دا، ڕاگەیاندنێکی ڕۆژنامەگەری دەرچوو،کە بە ڕەزامەندی هەردولایەن درا بە ڕاگەیاندنەکانی دەرەوە و بەسەر هەمو ئاژانسە جیهانیەکانی دەنگوباسدا دابەشکرا و زۆربەی رادیو و ئاژانس و ڕۆژنامەکان بڵاویانکردەوە..."[٣٤٩].

هەر لەوکاتانەدا، ڕۆژنامەکانی عەرەبی هەواڵی شەڕی ناوخۆیان بڵاودەکردەوە، ڕۆژنامەی (السفیر) لە ١٩٩٤/٨/٢ چاوپێکەوتنێکی درێژی لەگەڵ مەسعود بارزانی ئەنجامداوە و بە درێژی باسی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ دەکات و یەکێتی بە هێرشکەر ئەداتە قەڵەم. هەرەوەها هەمان ڕۆژنامە ڕۆژی دوای ئەوە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ مام جەلال کردوە و ئەویش بەهەمان شێوە بەرگری لە هەڵوێستی یەکێتی دەکات و هێرش دەکاتە سەر پارتی و مەسعود بارزانی.

هەروەها ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط) لە ٨/٨ بە مانشێتی گەورە نوسیویێتی "پارتەکەی تاڵەبانی ئێران تاوانبار دەکات بە بۆردومانکردن و کوشتنی ٤٠ هاوڵاتی کورد"، هەروەها ڕۆژنامەی (النهار)ی لوبنانی لە ٨/١٩دا نوسیبوی: "شەڕ لەسەروی عێراق، شەڕ دوبارە دەبێتەوە لە نێوان حیزبەکانی تاڵەبانی

---

[٣٤٩] شەڕی ناوخۆی کوردستانی عێراق، چۆن.. ڕۆژنامەی برایەتی ژمارە ٢٠١٢ی ١٩٩٤/٨/٧، ل ٩٦.

و بارزانی" دوای ئەوە رۆژنامەی (الحیاة)ی لەندەنی دەربارەی هەمان کێشە نوسیبوی: "حیزبەکەی تاڵەبانی بەرپرسیارێتی شەڕی شەقڵاوە رەتدەکاتەوە"

هەر لەو کاتانەدا، لە ١٩٩٤/٨/٣، مەسعود بارزانی نامەیەکی ئاراستەی هێزە سیاسیەکان و سەرۆکی حکومەت و پەرلەمان کردوە، ئەویش لە ئەنجامی ئەوەی کە هەوڵی تەقاندنەوەی مەڵبەندی ٨ ی یەکێتی و تیرۆرکردنی مەلا بەختیار دراوە و ئەو کارە دراوەتە پاڵ پارتی، ئەویش داوای لەو هێزانە کردوە کە لیژنەیەک بۆ لێکۆڵینەوە پێکبهێنن..

هەروەها رۆژامەی (الشرق الاوسط) لە ١٩٩٤/٨/١٥ نوسیویێتی "پارتی بارزانی، یەکێتی تاوانبار دەکات بە کوشتنی هاولاتیان، حیزبەکەی بارزانی ئاشتیەکی سەرانسەری دەوێت" هەروەها (الحیاة) لە هەمان رۆژدا نوسیوێتی "پارتی رەتیدەکاتەوە کە هێزەکانی لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامیدا بەشداری شەڕیان کردبێت دژ بە یەکێتی، هەروەها نوسیوێتی کە یەکێتی کەمتەرخەمە بۆ هێنانەدی ئاشتی لە نێوانیاندا".

## هەڵوێستی ئێران

ئێران لە دێر زەمانەوە پەیوەندیەکی توندی لەگەڵ هێزە جیاوازەکانی کوردستانی عێراقدا هەبوە و هەیە، زۆرجار هەوڵی بێلایەنی داوە و زۆرجاریش بە ئاشکرا تەرەفداری لایەکی کردوە دژ بە لاکەی تر.. دوای شۆڕشی ئیسلامیش لەسەر هەمان رێڕەو رۆشتوە و زۆربەی هێزە کوردییەکان نوێنەرایەتیان لە تاران و شارەکانی تری ئێران هەبوە.

دەربارەی شەڕوەستان رۆژنامەی (الحیاة) لە ١٩٩٤/٨/٢٧ نوسیوێتی (کوردەکان شەڕی یەکتریان بە چەک وەستاندوە، بەلام لە شەڕی ئیتهامکردنی یەکدا بەردەوامن) باس لە کۆبونەوەی پەرلەمانی کوردستان دەکات کە بارزانی و تاڵەبانی ئامادەبون و نزیکەی هەزار خۆپیشاندەر لەبەردەم پەرلەماندا وەستابون دژ بە بەردەوامی شەڕی کوردی کوردی.

لە ١٩٩٤/٨/٢٧ دا مام جەلال بروسکەیەک بۆ گشت هێزی پێشمەرگەی کوردستان و گشت لایەنەکان دەنێرێت و دەنوسێت: "وا وەفدی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان دێت، بە دەسەلاتی تەواوی پەرلەمان و هەردوکمانەوە، بۆ راگرتنی شەڕ و دیاریکردنی پەلاماردەر و ئەوانەی بڕیارەکانی پەرلەمان و هەردو بروسکەکانی هەردوکمانیان پێشێلکردوە، پێویستە هەمو لایەک هەمو جۆرە هاوکاریەکیان بکەن و بە قسەیان بکەن"[٣٥٠].

ئێران لەم شەڕانەدا، رۆڵی ناوبژیکەری نەبینی، بەڵکو بە ئاشکرا پشتگیری پارتی دەکرد. لەو شەڕانەی نێوان یەکێتی و پارتی و بە تایبەتی لە شەڕەکانی ناوچەی پێنجوین، هەڵەبجە و قەلادزێ لە ١٩٩٤/٩/٥ دا، کە پارتی شکا و زەرەرمەند بو، ئێران کەوتە هاوکاری پارتی بە چەکی قورس و بۆ هەڵساندنەوەی هێزی پارتی، بە تۆپخانەی قورس کەوتە بۆردومانی خەستی هێزەکانی یەکێتی و شار و شارۆچکەکانی سەر سنوەرەکان و لەو بۆردومانانەدا ژمارەیەکی زۆر بونە قوربانی و برینداربون.

ئێران بە ئاشکرا یارمەتی و هاوکاری پارتی و بزوتنەوەی ئیسلامی دەکرد و دژ بە یەکێتی بو: "ئێرانییەکان دەیانوت یەکێتی رێگای دیموکرات (حدکا) دەدات، کێشەمان بۆ دروست دەکات، ئێمەش و پارتی و بزوتنەوە، ئەگەر ئەوانیش نەبن، حیزبێکی کە دروست دەکەین و پشتگیری دەکەین دژی یەکێتی، ئەگەر یەکێتی واز بهێنێت ئەوە ئێمەش واز دەهێنین و رێگا نادەین پارتی و بزوتنەوە لە سنوری ئێمەوە هێرشیان بۆ بکرێ"[٣٥١].

[٣٥٠] شەڕی ناوخۆ، چۆن، ل٤٢٢

[٣٥١] شەڕی ناوخۆی کوردستانی عێراق، ل ٨٩

## ڕێکەوتنێکی نوێ لە نێوان مەسعود بارزانی و مام جەلال

جارێکی تر، مام جەلال و مەسعود بارزانی لە ١٩٩٤/٩/٢٣ دا، ڕێکەوتنێکی نوێیان ئیمزاکرد، ڕۆژنامەی (الحیاة) لە ژمارەی ٢١٦٠٣ ی ١٩٩٤/٩/٢٤ دا لە ژێر ناونیشانی (بارزانی و تاڵەبانی ڕێکەوتنێکیان ئیمزاکرد) باس لە گێڕانەوەی متمانە و ئاشتی لە کوردستان و جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەی پاریس دەکات.

هەردو هێزی دەسەڵاتدار، هەوڵیان ئەدا بارودۆخەکە ئارام بکەنەوە، بەڵام زۆر سەرکەوتنیان بەدەست نە ئەهێنا و مەڵبەند و لقەکان زۆرجار نیو سەربەخۆ هەڵسوکەوتیان دەکرد و ئەو بێسەروبەریە کێشەی دروستدەکرد و مەسەلەی گوێزانەوەی سەنگەر، یاخود چونی کەسێک لە لایەکی سیاسیەوە بۆ لاکەی تر، بە دەسکەوتی حیزبی دائەنرا و شانازی پێوە دەکرا. ئەو سەنگەر گۆڕینە زۆرجار کێشەی پێشمەرگایەتی و کۆمەڵایەتی لەگەڵ خۆی دەهێنا، بۆ نمونە یەکێک لەبەر هەر هۆیەک لای هێزێک سزا ئەدرا، یان لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرا، یاخوی تاوانێکی ئەنجام ئەدا و ڕاستەوخۆ ئەچوە لایەکی تر، لاکەی تر وەک پاڵەوان باسی دەکرد و هیچ لێپرسینەوەیەکی لەگەڵدا نەئەکرد، لە جیاتی لێپرسینەوە، خەلات دەکرا!.

بۆ بنبڕکردنی دیاردەی سەنگەر گواستنەوە، مام جەلال و مەسعود بارزانی لە ١٩٩٤/١١/٧ بروسکەیەکیان بۆ هەمو لق و مەڵبەندەکان، دەزگای ڕاگەیاندنی پارتی و یەکێتی و هەردو (م.س) یەکێتی و پارتی لێدا و نوسیبویان:

"لە دانیشتنی تایبەتی ئیمرۆ بڕیارماندا، ئیعتیبار لە ڕۆژی ١٩٩٤/١١/٨ وە دەرگای سەنگەر گۆڕین قەپات بکرێت و چیتر مەجال نەدرێت بە کەس

ئیفتزازمـان بکـات وه هەر لێپرسـراوێکی یەکێتـی و پـارتی به پێچەوانەی ئەم بڕیارەوە بجوڵێتەوە، تەحەمولی مەسئولیەت دەکات و توشی سزا دەبێت"

چەند ڕۆژێک پێش ئەوە، لە چەمچەماڵ، هەنگاوێکی باش نێرا بۆ هێمن و ئاسـایکردنەوەی نـاوچەکە، ئەمەش لە بروسـکەیەکی قـادری حـاجی عەلـی دەردەکەوێت، کە بۆ مەسعود بارزانی، عارف تەیفور، ڕۆژ نوری شاوەیس و مـام جەلال نوسـیبوی: "ئیمڕۆ کۆبـونەوەم لەگەڵ نـاوچەی پـارتی و کۆمیتەی یەکێتـی و نـوێنەری حیزبـی شـیوعی و بـزوتنەوە کـرد، هێزێکـی موشـتەرەک دروسـت بـو. لە چەمچەمـال خەریکی سـەحب پێکردنی هەمـو پێشـمەرگەکانی هەردولان. دەمێنێـتەوە هاوکـاری برایـانی لقــی سـلێمانی و کەرکـوک بــۆ تەسلیمکردنی تاوانباران بە ئاسایشی کەرکوک..."

لە ڕاسـتیدا ئەم بەیان و کۆبـونەوە هاوبەشـانە، هەنگاوێکی باشبون، بەڵام زۆر بەرهەمدار و کاریگەر نەبون، لەبەرئەوەی زەمینەی ئاشتی ناوخۆ و بڕوا بەیەک لەق بوبو، زەمینەی شەڕ و گرژی لەبارتربو لە ئاشتی نێوانیان.

لە ۱۹۹٤/۱۱/۲۱ دا ڕێکەوتنێکی نوێ ئەنجامدرا کە مام جەلال و مەسعود بـارزانی ئیمزایـان کردبـو، لە ١٤ خـاڵ پێکهـاتبو، وە هەمـو ئەو بـوارانەی گرتبـۆوە کە کێشـەی لەسـەربو، هەروەهـا بـۆ بەگەڕخسـتنەوەی پارلەمـان و هـێمن کـردنەوەی بـارودۆخەکە بە تـایبەتی لە نـاوچەی بادینـان، هەر لەو بـارەیەوە مـام جەلال بە بروسـکەی ژمـارە ۱۰۷٦ ی ۱۱/۲۱ کە ئاڕاسـتەی نەوشیروان مستافا و مولازم عومەر و هەمو مەڵبەندەکانی کردوە، باسـی ئەو ڕێکەوتنە دەکات کە لەگەڵ پارتیدا ئەنجامیانداوە و کێشەی پێشـمەرگە و مـالیە و پەرلەمـان چارەسـەرکراوە. ئەم بروسـکەیە ئاراسـتەی هەمـو مەڵبەنـدەکانی یەکێتـیش کـراوە و بە مـژدە نـاوبراوە کە لەگەڵ پارتیـدا لەسـەر هەمـو خـاڵە ناکۆکەکان ڕێکەوتون و ئەمەش مانای کۆتایی شەڕ و ئاڵۆزیە لە کوردستاندا.!

مەرەکەبــی ئەو بروســکانە وشــک نەبوبــۆوە، هەر ڕۆژی دوای ئەوە، لە ۱۱/۲۲ قایمـامی پێنجـوین بروسـکەیەک ئاراسـتەی پارێزگـای سـلێمانی و مـام

جەلال و مەسعود بارزانی و هەردو (م.س) پارتی و یەکێتی دەکات و دەنوسێت: "ئیمشەو سەعات ١٠ شەو، پارتی مقەڕی ناوچەی پێنجوینیان چوڵ کردوە بەبێ هۆ، پاشان شەڕ لە نێوان یەکێتی و پارتی رویداوە لە ناوچەی گۆخڵان، وە چەند شەهید و بریندار هەیە..." بیگومان هەر لەو رۆژەدا، مام جەلال بروسکەیەک ئاراستەی مەڵبەندەکانی یەکێتی لە سلێمانی و شارەزور و مەسعود بارزانی دەکات بە مەبەستی هێمنکردنەوەی بارودۆخەکە، بەڵام شەڕەکان بە ناردنی بروسکە کۆتایی نەهات!

ئەمجارەش لە پێناوی بەردەوامی کاری حکومەت و پەرلەماندا و لە ١١/٢٤ کۆسرەت رەسوڵ وەک سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان و د. رۆژ نوری شاوەیس وەک جێگرەکەی، نامەیەکیان ئاراستەی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان (پەرلەمان) کردوە و باس لە کۆتایی گرژی و شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی دەکەن، وە لە پێناوی بەگەڕ خستنی کارەکانی حکومەت و بەشدارپێکردنی هێزەکانی تر لە حکومەتدا، بڕیاریانداوە کە دەست لەکاربکشێننەوە، بۆئەوەی زەمینە چاکسازی زیاتر بڕەخسێت"

دوای دو رۆژ، پەرلەمان کۆسرەت رەسوڵ وەک سەرۆکی حکومەت و د. رۆژ نوری شاویسی وەک جێگری دەستنیشان کردەوە، بۆ ئەوەی بەیەکەوە حکومەتێکی نوێ دروست بکەن و ناوکانیان بخەنە بەردەم پەرلەمان.

لەو رۆژەدا، ١١/٢٤، مام جەلال و مەسعود بارزانی رێکەوتننامەیەکیان لە پەرلەمان، بە نوێنەرانی بەرەی کوردستانی و هەندێ هێزی کوردی و عێراقی ئیمزا کرد و ئەنجومەنی نیشتیمانیش ئەو رێکەوتننامەیەی پەسەند کرد.

زەرەرمەند لەو شەڕ و کوشتارانە، تەنها پێشمەرگە نەبوە، بەڵکو هاوڵاتی ئاسایی راستەخۆ و ناڕاستەوخۆ زەرەرمەندی گەورە بون، لە بروسکەی قایمقامی پێنجوین لە ١٩٩٤/١٢/١٢ بۆ پارێزگای سلێمانی و مام جەلال و مەڵبەندی یەکێتی و لقی ٤ پارتی نوسیویێتی: "هێزەکانی یەکێتی و پارتی لە پێنجوین زۆر ئاڵۆزن، وەزعی ئەمنی شارەکەیان تێکداوە، بە تایبەتی دانانی

ئەو مقڕەی (ی.ن.ک) کە خەڵک ئەگرن لەناو شاردا، بەبێ ئەوەی حساب بۆ حکـومەتی هەرێـم بکرێـت، ئەگەر چارەسـەری نەکەن و کـار وابـڕوات، کوشتارێکی کە لە پێنجوین دەکرێت...".

## شەڕ لە دژی هەرکیەکان و بەردەوامی شەڕ و ئاڵۆزی لە ناوچەکانی تر

هەر لەو رۆژانەدا، پارتی لە ١٩٩٤/١٢/١٧ هێرشـی کـردە سـەر گونـدەکانی عەشیرەتی هەرکیەکان، کە خۆیان بە نزیک لە مام جەلال دەزانی و پیاوەکانیان چونە لای ئەو، بەڵام پارتی گوێنەدایە ئەو پەیوەندیە و هێرشی کرد سەریان.

مەڵبەندی ٧ ی یەکێتی لەو رۆژەدا، بروسکەیەک بۆ (مام جەلال) و (م.س) دەنوسـن: "گونـدەکانی غـازی هەرکـی بە تەواوی چـۆڵکران، هەرچـی چەکـی سـوک و گـران هەیە لە لایەن هەڤـالانی (پ.د.ک) دەسـتی بەسـەردا گیـراوە، هەروەهـا ژن و منـداڵەکانیان خـراونەتە نـاو لـۆریەوە کە ٨ لـۆری دەبـون و بەرەو شوێنێکی نادیار دەیان گوێزنەوە".

لە پێناوی هێمنکردنەوەی ئاڵۆزی نێوان یەکێتی و پارتی، حەمەی حاجی مەحمـود لە ١٩٩٤/١٢/١٨ دا سـەردانی مەسـعود بـارزانی دەکـات و دەنوسێت: "زۆر قسەم لەگەڵ کاک مەسعود کرد، لەو روەوە کاک مەسعود دەیـوت ئەم جارە خـۆم دەچمە شـەڕەوە وە وتـی: "سـەدام حسـێن و هەمـو کەس قبـوڵ دەکەم، بەڵام جەلال قبـوڵ نـاکەم..وتی کەرامەتـی پـارتی شـکاوە لە کەلار و کفـری و دەربەنـدیخان، ئـالای پارتیـان داگرتـوە و خسـتویانەتە ژێـر پێـوە، کـورد چـیە؟ مـن سـەرکەوتنی کـورد لە پـارتیەوە دەبیـنم"[٣٥٢].

شەڕ و ئاڵۆزی نێوان پارتی و یەکێتی هێور نەدەبۆوە، بارودۆخەکە زۆر زیـاتر ئـاڵۆزبو، کـاتێ کە هێزەکـانی پـارتی بارەگاکـانی یەکێتـی و مـاڵە شەخسیەکەی مام جەلالیان لە شەقڵاوە داگیرکرد.

---

[٣٥٢] محەمەد حاجی مەحمود، رۆژ ژمێری... بەرگی ٤، ل ٤١٣.

لە هەمانکاتدا، هەوڵی باشیش لە هەردولاوە هەبو، بەڵام نە درێژەخایان بو، نە سەرانسەری بو، بۆ نمونە لە کاتێکدا شەڕ و گرژی لە هەندێ شوێن بەردەوام بو، عوسمانی حاجی مەحمود و عیماد ئەحمەد بەیانی سەعات ٣ ێ ١٩٩٤/١٢/١٨ ئەم بروسکەیە دەنێرن: "بۆ مەڵبەندی٢ ی کەرکوک، کۆمیتەکانی خانەقین، کەلار، صمود، دوز، کفری و گەرمیان: بە هیچ شێوەیەک ناچنە سەر بارەگاکانی برادەرانی پارتی، وە هەرکەسێ ئەو بڕیارە بشکێنێت و سەرپێچی بکات، بە توندی سزای ئەدەین" هەردوای ئەم بروسکەیە چەند بروسکەیەکی تر هەیە بە ناوەرۆکی ئەوەی کە هەر کەلوپەلێک لە بارەگاکانی پارتی براوە، بدرێتەوە و هەنگاو بنرێت بۆ ئاشتەوایی لەو ناوچەیەدا".

لە گەرمیان خەریک بو، گرژی کەم دەبۆوە، بەڵام ئاڵۆزی زۆربەی ناوچەکانی تری گرتبۆوە، مەڵبەندی ٦ ی سۆرانی یەکێتی لە ١٢/١٨ دا بە بروسکەی ژمارە ٧٥٨ بۆ مام جەلال و (م.س) نیشانی ئەدەن کە بارودۆخی هێزەکەیان چەند خراپ و بێسەروبەرە، ئەمە نمونەیەکە بۆ زۆر ناوچەی تر.

"١. پارتی لە ناوچەی، قەزای سۆران، چۆمان، شەقڵاوە، بەرزایەکانیان گرتوە و ئامادەی شەڕیان هەیە. ٢. ئێمە هێزەکانمان پەرش و بڵاون و لەبەر فەوزای تەشکیلات و نەبونی معاش کۆ نابنەوە. ٣. یەک تاکە فلسمان لەدەست نیە.."

گرژی نێوان هەردولا ناوچەکانی تری گرتبۆوە، مەڵبەندی شارەزوری یەکێتی لە بروسکەی رۆژی ١٢/١٨ دا بۆ قادری حاجی عەلی و عومەری سەید عەلی دەربارەی هێرشی پارتی دەنوسن: "چونەتە سەر مقەڕەکەی بیارە و ئەو پێشمەرگانەی لە کۆمیتەکەدابون، چەکیان کردون و دەستیان گرتوە بەسەر مقەڕەکەدا"

ئەوەی سەیرە، ئەوەیە لە کاتێکدا، شەڕ و ئاڵۆزی لە هەندێ ناوچە لە نێوان یەکێتی و پارتیدا زۆر زەق دیاربو، بەڵام لە هەندێ ناوچەی تر، بە دەستپێشخەری لایەکی سیاسی، ئاشتییەکی کاتی و سنوردار لە نێوان

هەردو هێزدا رادەگەیەنرا، لەم بروسکەیەی قادری حاجی عەلی لە ۱۲/۱۸ بۆ عوسمانی حاجی مەحمود دەنوسێت: " ئیمرۆ سەعات ۳ لەگەڵ پارتی لە بارەگای بزوتنەوە دانیشتین و ئەو ئیتیفاقەمان ئیمزاکرد، مەفروزە ئیمشەوە سەیتەرەکان لا ببرێن، چاوەڕێی بەیانین، ئەگەر جێبەجێ بکرێت ئەوا کێشە دروست نابێت.."

هەر دەربارەی ئەوەی هەمو ئەو هەوڵە ناوچەییانە بۆ دابینکردنی ئاشتی، نەئەبوە هۆی ئەوەی کە ئاشتی بۆ ماویەکی درێژ لە ناوچەکانی تریش بەردەوام بێت.

زۆربەی کات نە زەمینەی شەڕ لەباربوە، نە هۆ هەبوە شەڕ هەڵگیرسێت، نە ئامرازەکانی شەڕیش لەبەردەستابوە، لەم بروسکەیەی پێشەوەی مەڵبەندی سۆرانی یەکێتیدا دەریدەخات.

ئەمە بارودۆخی هێزێکی گەورەی یەکێتیە پیشان ئەدات، کە ئەو هێزە ناتوانیت شەڕ بکات و ئینجا شەڕی ناوخۆش، ئەمە وێنەی یەکێتیە لە ناوچەیەک، بەدڵنیایەوە، وێنەی پارتی لە ناوچەیەکی تر، زۆر لەوان باشتر نەبوە.

لەو رۆژانەی کە تروسکەی ئاشتی و هێمنی لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا هەستی پێدەکرا، رۆژنامەی برایەتی لە ژمارە ۲۱۱۱ی ۱۲/۱۹، وتارێک دەنوسێت و هێرشی توند دەکاتە سەر یەکێتی و ئەو وتارە وا دەکات کە راگەیاندنی یەکێتیدا لە رۆژنامەی کوردستانی نوێدا وەڵام بداتەوە و بەم شێوەیە شەڕی راگەیاندن جارێکی تر دەستپێدەکاتەوەو، وتار، وەڵام، دواترا وتارێکی تر و جارێکی تر وەڵام و بەم شێوەیە..

لە هەمان رۆژدا، پارتی بارەگاکانی خۆی لە عەربەت، دەربەندیخان و صمود چوڵکرد، چوڵکردنی ئەو شوێنانە لەبەر هەرهۆیەک بوبێت، کارێکە کە شەڕی هەردولای لەو ناوچانە بۆ ماوەیەک دور خستەوە، چونکە ئەگەر لایەکی سیاسی و عەسکەری لە ناوچەیەکدا نەبێت، شەڕ و گرژی رونادات.

ئەو بروسکانەی کە لەبەردەمی بەندەدا هەیە، زۆر کەم هەواڵی ئارامی و هێمنی و ئاشتەوایی تێدایە.

بروسکەی دڵخۆشکەر زۆر کەمبون، لەوانە: لە ١٢/١٨ دا لقی ٤ ی پارتی و مەڵبەندی ١ یەکێتی لە سلێمانی کۆبونەوە و کۆمەڵێک بڕیاری باشیاندا بۆ هێمنکردنەوەی بارودۆخەکە.

دو ڕۆژ دوای ئەوە لە ١٢/٢٠، قادری حاجی عەلی ئەم بروسکەیە دەنێرێت بۆ کۆمیتەی پیرەمەگرونی یەکێتی، ناوەڕۆکێکی دڵخۆشکەرانەی تێدایە بۆ دەستپێنەکردنی شەڕ: "هەوڵبدەن بە زوترین کات تەقە رابوەستێنرێت و دوایی تەحقیقی تێدا ئەکەین، ئەگەر دەستپێشکەری لە ئێوەوە بێ، بە توندی سزاتان ئەدەین".

هەوڵی ئاشتی یان شەڕ لە ناوچەیەکی دیاریکراودا، کاریگەری زۆری نەبوە بۆ ناوچەکانی تر، لە ١٢/٢٠ سەردار عەبدوڵا لە کفریەوە ئەم بروسکەیە بۆ مەڵبەندی ٢ ی یەکێتی و عوسمانی حاجی مەحمود دەنێرێت: "بە هاوکاری کاک مەحمود (مەحمود بیکەیسی) لەگەڵ قایمقام و لێپرسراوانی کۆمیتە و برادەران لەگەڵ پارتی دانیشتین، بەرنامەی باشمان هەیە پێکەوە، ئێستا وەزعی ئێرە باشە.." بەڵام لە هەمان ڕۆژدا و ٥٠ کم لە کفریەوە دور، واتا لە کەلار ئەم بروسکەیە دەگات، لە کۆمیتەی رێکخستنی کەلاری یەکێتیەوە بۆ مەڵبەندی ٢، "کات ژمێر ٧،١٠ دەقیقە دەستگیرا بەسەر ناوچەی کەلاردا (ناوچەی پارتی)"

پەرەدۆکس، لە یەک ڕۆژدا، لە یەک ناوچە، لە لایەک رێکەوتنی ئاشتی و لە لایەکی تر شەڕ و بەدەستهێنانی (سەرکەوتن)!

بێگومان پارتیش لە کوێ بۆی کرابێت، هەوڵیداوە، کە تۆڵەی خۆی بکاتەوە، لە هەمان ڕۆژدا، ١٢/٢٠ کۆمیتەی پیرەمەگرونی یەکێتی ئەم بروسکەیەی بۆ مەڵبەندی ١ دەنوسێ: "پارتی لە ناکاو پەلاماری کۆمیتەیان داو گرتیان، بە جیهازەکەمانەوە، شەهید و بریندارمان هەیە.." یاسای ئەو ڕۆژەی شەڕی ناوخۆ: تۆ ناوچەی کەلار دەگریت، منیش کۆمیتەی پیرەمەگرون دەگرم!

پارتی لە ١٢/٢٠ کۆمیتەی پیرەمەگرونی یەکێتی دەگرێت و دو ڕۆژ دوای

ئەوە، ئەو کۆمیتەیە بروسکەیەک بۆ مەڵبەندی ١ و عومەری سەید عەلی دەنێرێت و دەنوسێت: "ناوچەی (پارتی)مان گرتوە و ٥ کەسی تێدا گیراوە، بە چەکەکانیانەوە، سیان چواریان رایان کردوە، ئێستا پێشمەرگەی خۆمان لە ناوچەیە".

ناحیەیەکی گەورە، لە دو رۆژدا لە لایەن یەکێتی و پاتیەوە دەگیرێت، لەو دوو رۆژەدا هەردولا قوربانی و برینداریان دەبێت! ئەبێ ئەمە چ سودێکی بە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد گەیاندبێت، جگە لە قین و تۆڵە و زیادکردنی ژمارەی قوربانی نەبێت، کوژراو و برینداریش هەر لە نێوان نەیاری ئیمڕۆ و هاوڕێ و دۆستانی دوێنی و هاوخەباتانی دوسبەی رویداوە.

## گرتنی شەقڵاوە، ئاگری شەڕ گەرمتر دەکات

پارتی لە ١٩٩٤/١٢/٢٢دەستیان بەسەر هەمو بارەگاکانی یەکێتیدا گرت لە شەقڵاوە، بە ماڵەکەی مام جەلالەوە، ئەم کارە بەنزینی زیاتر کرد بەسەر ئاگری شەڕی کورد – کورد دا!.

دەربارەی گرتنی شەقڵاوە و چونە سەر ماڵی مام جەلال، مام جەلال لە ١٢/٢٢ ئەم بروسکەیە بۆ مەسعود بارزانی دەنێرێت: "ئەم بروسکەیە بەو صیفەتە بۆت دەنوسم، کە خۆت لەسەر قەبری باوکی رەحمەتیتان فەرموتان، تکایە هەر بەو چاوەوە تەماشای بکەن:

١. پەلاماردانی شەقڵاوە، ئەویش بە هێزی تایبەتی خۆت، زۆر خراپ تەفسیر دەکرێت لە لایەن (ی.ن.ک) وە، ترسم هەیە شەڕ هەڵگیرسێتەوە، بۆیە وەک مەسئولیەتی مێژویی داواتان لێدەکەم دەستبەجێ شەڕەکە رابگرن، ئەگینا لە ئەنجامە خراپەکەی خۆتان بەرپرسیار دەبن.

٢. هەق نیە بارزانیەکان و هێزی بارزان بخەیتە شەڕەوە، چونکە وا باشە پیرۆزی خاکی بارزان لە نێوان خەڵک و بارزانیەکاندا رەنگ بداتەوە، نەک لە ئەنجامی خوێن رشتندا لەگەڵ چەند ناوچە و هۆز و بگرە دوژمنایەتی بۆ بارزانیەکان دروست دەبێت، رەنگە گەر ناچاربون هەقیان

بێت، بەڵام ئێستا دورە، جگە لەوەی کە شەڕەکە هەر هەموی خۆکوژیە، ئیتر بۆچی بارزانی تێوە بگلێنن.

٣. کەس باوەڕ ناکات جەنابت لە پەنای خۆتەوە، شەڕت پێڕانەگیرێت، بۆیە تکایە، تکایە، تکایە شەڕەکەی شەقڵاوە رابگرن، ئەگینا پاشان پەکی منیش دەخات، رەنگە هیچی ترم پێنەکرێت.

٤. لە مەسەلەی ئیبراهیم خەلیل زمان کورتت کردم، هەرچەندە چەندینجار بەڵێنتاندا، لەمەشدا داوام لێمەکە نەتوانم کۆنترۆڵی (ی.ن.ک) و هێزەکەی بکەم. هیودارم بە حیکمەت و وردبینانە بن"[٣٥٣].

مەسعود بارزانیش لە هەمان رۆژدا وەڵامی مام جەلالی بەم بروسکەیەی داوەتەوە:

"پێشەکی من داخ و ئەسەفی خۆم دەردەبڕم بۆ ئەو وەزعە بە تایبەتی لە شەقڵاوە، بەڵام پێموایە جەنابت زۆر دڵفراوانتربیت و تەحەمولی مێژویی خۆت بکەیت لەم کاتە حەساسەدا، من موبەریرات بۆئەوەی شەقڵاوە نادۆزمەوە، بەڵام پێم باشە حەقیقەت عەرزتان بکەم، ئیمڕۆ عەمید غازی لەسەر داوای کۆمیتەی شەقڵاوە چو بۆ لایان بۆ چارەسەری وەزعەکە، لە رێگا لێیاندا، خۆیی و دو لە حیمایەکانی بریندابون و یەکێکیش شەهید کرا. لەم حاڵەتەدا وەزعەکە لە کۆنترۆڵدا نەما، بەڵام جەنابت حەکەم بە بەبێ هیچ هۆیەک، لەگەڵ ئەوەش من ئامادەبوم و ئامادەم بۆ بەشداربون بۆ هەر کۆبونەوەیەک کە جەنابت ئامادەبیت، بگرە ئیمڕۆ لە سەیطرەی شاوەیس سێ پێشمەرگەی ئێمەیان شەهید کردوە، هەرچی پارتیان دەستکەوتبێت، ئیهانەیان کردوە و روتیان کردونەتەوە و بارەگاکەمان لە شاوەیس دیسان گیراوە و تالانکراوە. دوێنێ شەویش ناوچەی کۆیە داگیرکراوە و قایمقامی کۆیە دەستبەسەر کراوە. پاش بروسکەی مشتەرەکمان هێرش هەر بەردەوام بوە لەسەر برادەرانمان. لەسەروچاوە و تەقتەقیش تا ئەم ئێوارەیە شتی سەلبی زۆرە و هەردولا هەیانە، بەڵام ئەبێت نائومێد بین و جڵەوەکە بۆ شەڕخوازان

---

[٣٥٣] یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، پەنۆرامای ٢١ و ١٩٩٤/١٢/٢٢.

شل بکەین؟ ماڵمان وێران بکەن؟ نەهاتنی جەنابت وەزعەکە خراپتر دەکات نەک چاکی دەکات، من برایانە و کوردانە و دۆستانە مناشەدەت دەکەم کە کوردستان گەورە تربێت لامان لە شارێک و چەند شارۆچکە و چەند ناوچە و چەند کۆمیتەیەک چاوەڕوانتانین تا ئەم جارە کۆتایی بە هەمو شت بهێنن"[٣٥٤].

مام جەلال بۆ سبەینێ ١٢/٢٣ وەلامی مەسعود بارزانی بەم شێوەیە ئەداتەوە: "من هەرچی توانیم کردم بۆئەوەی پەکی شەڕخوازان بخەین، بەلام زۆر بە داخەوە جەنابت فەوجە تایبەتیەکانی خۆتت نارد شەقلاوەت پێگرت، کە زۆر تکام لێکردیت ئەوە نەکەیت، چونکە ئەبێتە تەشەنەکردنی شەڕەکە، ئێستا ئێوە بەڵێن شکێنتان کردوە، دەستی منتان گرتوە و زمانی منتان لاڵکردوە، بۆیە هەمو شت ئێستا بەدەست خۆتە، ئەتوانیت بڕیاری شەڕ وەستانی راستەقینە بدەیت و هێزەکانتان لە شەقلاوە بکشێنەوە، بدرێتە INC کە ئارام و ئاسایی دەکاتەوە، ئەشتوانن شەڕەکە پەرەو درێژەی پێبدەن، تکای برایانەم ئەمەیە ئیحترامی نىدای مشتەرەکمان بگرین، چی تر بە خوت و خۆڕایی خوێنی رۆڵەکانی کورد نەرژێت"[٣٥٥].

رۆژانی ٢٢، ٢٣ و ٢٤ /١٢/١٩٩٤، بە دژوارترین رۆژانی شەڕی ناوخۆ دەژمێریت لەو ساڵەدا، تەنها لەو دو رۆژەدا شەڕی جۆراو جۆر لەم ناوچانە رویانداوە، (قەلادزێ، تەق تەق، شاری هەولێر، شاخی سەفین، کەسنەزان، کانی قرژاڵە، کەڵەک، کۆیە، هیران، سەنگەسەر، قەسرێ، شاوەیس، هەڵەبجەی تازە، زەڕایەن، ناوچەی زەڵم، چۆمان، رەواندز، سەرای سوبحان ئاغا، سەید صادق، شانەدەری، حاجی ئۆمەران و پێنجوین)

لە ئەنجامی ئەم پێکدادانانە ژمارەیەکی دیار کوژراو و بریندار لێکەوتەوە و هەرلایەک ئۆبالی شەڕەکەی داوەتە پاڵ لاکەی تر، ئەگەر لەکاتی شەڕی پێشمەرگە دژ بە رژێم ئەم شەڕانە لە ماوەی ٤٨ کاتژمێردا

[٣٥٤] پانۆرامەی ١٩٩٤/١٢/٢٢.

[٣٥٥] هەمان سەرچاوە، رۆژانی ٢٢ و ٢٣ /١٩٩٤/١٢.

رویبدایە، ئێستا بە رۆژە قارەمانەکان و رۆژانی بەرگری و داستانەکانی پاڵەوانانی دژ بە بەعس ناو دەبرا!.

مام جەلال لە شەوی کرسمیس، واتا ۱۲/۲٤ ئەم بروسکەیەی ئاراستە پارتی کردوە: "گەلانی خواپێداوی ئەوروپا ئیمشەو بە جەژن و شادی بەسەر دەبەن، کەچی رۆڵەکانی گەلی کوردستان یەکتر ئەکوژن، منیش لەگەڵ ئێوەدا داوای وەستانی شەڕی کورد کوژە دەکەم"[٣٥٦]، وتەکانی مام جەلال، زۆر راستن، بەلام یەکێتی بێلایەن نەبوە لەم شەڕەدا، بەڵکو تەرەفێکی گەورە و کاریگەری شەڕەکە بوە وەک پارتی، هەردولایان کاریگەریان هەبوە لەسەر بەردەوامی یان کۆتایی پێهێنانی شەڕ، سەرەڕای ئەوەی کە رەنگە لە شەڕێکدا پارتی دەستپێشخەر بوبێت، بەلام شەڕی درێژخایانی وەک ئەوەی دیمان، تەنها بە لایەک ئەنجام نەدراوە و نادرێت.

دەربارەی وەستانی شەڕی ناوخۆ و رۆڵی ولاتانی دراوسێ، رۆژنامەی (الشرق الاوسط) لە ۱۱/۲۷ دا وتارێکی دەربارەی رۆڵی خراپی تورکیا نوسیوە: "باس لە ترسی نزیک بونەوەی یەکێتی و پارتی دەکات و هێرش دەکاتە سەر کۆبونەوەی مانگی تەموز لە پاریس و وەزیری دەرەوەیان مومتاز سویسال ئەو رێکەوتنە بە هەوڵێک ئەزانێت بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی".

لە کۆتایی ساڵدا، شەڕ لە ناوچەی هەولێر گەرم بو، قیادەی ناوچەی هەولێر لە ۱۲/۲۳ دا بروسکەیەک دەنێرێت بۆ هەمو محەطەکان کە تێدا هاتوە: "سەعات ۱۰ شەوی ۲۳-۱۲/۲٤/۱۹۹٤ هێزێکی ئێمە (یەکێتی) پەلاماری تەجەموعی هێزەکانی پارتی لە کەسنەزاندا کە ژمارەیان لە ۵۰۰ کەس زیاتر بو، لە ماوەی نیو سەعاتدا، تەفروتوناکران، ۱۷ سەیارە دەستی بەسەردا گیرا، ۳۲ کەسیش دیل گیرا، ژمارەیەکی زۆر کوژراو برنیدار هەیە"[٣٥٧].

پارتی گرتنی کەسنەزانی بە زەنگێکی ترسناک دایە قەڵەم بۆ نزیکبونەوەی

---

[٣٥٦] هەمان سەرچاوە، ئێوارەی ۱۹۹٤/۱۲/۲٤.

[٣٥٧] هەمان سەرەچاوە، ۱۹۹٤/۱۲/۲٤.

یەکێتی لە شەقڵاوە و سەری ڕەش، لەبەرئەوە مەسعود بارزانی داوایکرد کە یەکێتی کەسنەزان چۆڵ بکات.

دوای ئەم شەڕە خوێناوییە، مام جەلال، هەر دوای ئەو گرتنە، داوا لە کۆسرەت ڕەسوڵ دەکات، کەسنەزان تەسلیمی بەرەی کوردستانی بکات[٣٥٨]، بۆ کەسنەزان گیرا و بۆ تەسلیم دەکرێتەوە و ئەم هەمو قوربانیە لە پێناوی چیدا؟.

## ڕۆڵی پەرلەمانی کوردستان لە شەڕی ناوخۆدا

پەرلەمانی کوردستان، سەرەڕای لەتبونی لە نێوان فراکسیۆنی یەکێتی (سەوز) و پارتی (زەرد) دا، هەڵوێستی زۆر باشیان هەبو، هەوڵی ئەدا بۆ وەستانی شەڕ. لە ١٢/٢٤ دا و بە دەنگی ٥٧ ئەندام، دەستیانکرد بە مانگرتن دژ بە شەڕی ناوخۆ، لەو مانگرتنەدا نوێنەرانی هەمو فراکسیۆنەکان تێدا بەشدار بون. هەرچەندە ئەندام پەرلەمانە پەناگیرەکان چالاک بون، بەڵام ناکۆکی نێوان یەکێتی و پارتی ئەو چالاکیانەشیان پەک خست و زۆربەیان کاریگەرە حیزبییەکانیان لەسەر بو، ئەو سوێندەیان نەبردەسەر کە خواردبویان کە بێلایەن بن و بەرژەوەندی گەل و نیشتمان بخەنە سەر هەمو بەرژەوەندییەکی ترەوە.

لە کۆتایی ساڵ و درێژەی شەڕی ناوخۆدا، نەوشیروان مستەفا لە ١٢/٢٣، بروسکەی ژمارە ١٠١٧ دەنێرێت بۆ هێزەکانی شارەزور و دەنوسێت: "تکایە دەستبەجێ هەرچی هێزتان هەیە کۆی بکەنەوە بۆ گرتنەوەی سەید صادق، تکایە هیمەت بکەن.."

هەر لە هەمان ڕۆژدا و لە نزیک سەید صادق، کە پارتی گرتبوی، عوسمانی حاجی مەحمود بروسکەیەک بۆ مام جەلال دەنوسێت و دەڵێ: "لە هەڵەبجەی تازە سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، کوژراو و بریندار و دیلیان هەیە، بارەگاکانیان هەموی بەدەست خۆمانەوەیە، ئێمەش دو شەهیدمان هەیە و برینداریش."

---

[٣٥٨] هەمان سەرچاوە، ١٩٩٤/١٢/٢٤.

هەر رۆژێک دوای گرتنی سەید صادق لە لایەن پارتیەوە، کوردۆ قاسم، عیماد ئەحمەد و ماموستا جەمال شەوی ١٢/٢٤ بروسکەیەک دەنێرن بۆ مام جەلال و نەوشیروان مستەفا و دەنوسن: "سەید صادقمان پاککردەوە ..." ئەم (کەڕ و فەڕە) لە زۆربەی ناوچەکان رویئەدا و گرتنی شوێنێک ئەبو بە سەرکەوتن بۆ لایەک، دوای چەند رۆژێکی تر بە هەرەس بۆ هەمان لا.. لەبەرئەوە، سەرکەوتن و نوشستیەکان بۆ هێزە چەکدارەکان هەموی کاتی بو، بۆ گرتنی شاخێک یان تەپۆڵکەیەک یان ناحیەیەک، چەندەها پێشمەرگە ئەبونە قوربانی و برینداریکی زۆری لێدەکەوتەوە و بە سەرکەوتنی مەزن ئەدرایە قەڵەم، هەردوای چەند رۆژێکی تر، هێزەکەی تر، ئەوەندە زیاتر قوربانی ئەدا بۆ گرتنەوەی هەمان شوێن! ئەمە تراژیدیای شەڕی ناوخۆی کوردی نیشان ئەدات کە هیچ لایەک سەرکەوتنی هەمیشەیی بەدەسی نەهێناوە، زەرەرمەندی یەکەم تەنها پێشمەرگەی کوردستان بوە.

رۆژانی ٢٣ و ١٩٩٤/١٢/٢٤ شەڕ لە زۆر ناوچە گەرم بو، بروسکەکانی یەکێتی لەو رۆژانەدا نیشانیان ئەدا کە "سەرجەم چۆمان و حاجی ئۆمەران. سەرای سوبحان ئاغا، شانەدەری و سەید صادق لە هێزەکانی پارتی پاککرانەوە"[٣٥٩].

پارتی گلەیی لە یەکێتی دەکرد، کە شەڕی رانەگرتوە و یەکێتیش بە هەمان شێوە، گلەیی دەکرد، هەریەکەیان ئۆباڵی شەڕی ناوخۆی دەخستە سەر ئەوەی تر، وەک لە خاڵێکی بروسکەیەکی مام جەلال بۆ مەسعود بارزانی نوسیویتی: "پێشمەرگەی (ی.ن.ک) دەڵێن، پارتی هێرش دەکات و هی پارتی دەڵێن یەکێتی هێرش دەکات، سەرمان لێشیواوە، برای چاک بن و وەرن با لیژنەیەکی بێلایەن بە ڕێبەری INC لە هەمو قوڵێکدا دابنێین بۆ ئەوەی راستیەکەمان پێ بڵێت تکایە موافەقەت بکەن لەلایەن خۆتانەوە لیژنەکان دابنێن و بیانخەنەگەڕ"[٣٦٠].

---

[٣٥٩] پانۆرامەی ئێوارەی، ١٩٩٤/١٢/٢٤.

[٣٦٠] پانۆرامەی ئێوارەی، ١٩٩٤/١٢/٢٤.

بۆ رونکردنەوەی زیاتری بارودۆخەکە با سەیری پەنۆرامای یەکێتی بکەین بزانین لە رۆژی (کرسمیس) ١٩٩٤/١٢/٢٤ چی لە پارێزگای هەولێر رویداوە:

"ناو شاری هەولێر ئارامە، دو تەجەمعی پارتی لە دو شوێن هەیە، لە هۆڵی زەرد و بارەگای لق، هەمو شوێنەکانی تری ناو هەولێر لە ژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی ئێمەدایە. ئۆردوگای تۆپزاوا و کەلەکی یاسین ئاغا کەوتە ژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی ئێمە، لە کەڵەک هەرکیەکانی لێبو، بێ تەقە خۆیان تەسلیم کرد. ئۆردوگاکانی کەڵەک، تۆپزاوا، شاوەیس، دارەتو، بنصلاوە، کەسنەزان لە ژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی ئێمەدایە. هێزەکانی ئەوان لە ئۆردوگاکانی مەلا هۆمەر، بەحرەکە و بەستورە جێگیرن. هەمو کۆیە، رەواندز و چۆمان لەبەردەستی ئێمەدایە. شەقڵاوە، حەریر، خەلیفان و سۆران لەبەر دەستی ئەواندایە. تا بەرەبەیانی ئیمڕۆ شەڕ لە خەلیفان شاخی (زینەتیر)، نزیک شەقڵاوە و دەربەندی گۆمەسپان هەبو".

بارودۆخی پارێزگای سلێمانی و دەوروبەری تا بەرەبەیانی ١٢/٢٤ لە هەولێر باشتر نەبو، ئەویش بەم شێوەیە بو: "شەڕ لەناو پێنجوین درێژەی هەیە، هێزەکانی پارتی تا سەرای سوبحاناغا هاتون، خەتی دیفاعی ئێمە لە کانی پانکە جێگیر کراوە. خەتی دیفاعی ئێمە لە زەرایەن و هەڵەبجەی تازە جێگیر کراوە. ناو شاری سلێمانی نسبیەن ئارامە، هێزەکانی پارتی لە لقی کۆنیانن (بارەگای مقەڕی شەهید عوسمانی بەعس لە توی مەلیک) وە لە هەردو گەڕەکی ئازادی و خانوە قوڕەکان سەنگەریان گرتوە، دڵنیا کراون کە پەلامار نادرێن، بەڵام ئەوان جگە لە ئیفتیزاز و ئیهانەی خەڵک بەردەوامن و تەقە لە خەڵک دەکەن، هاوەن و قەناص بەکار دێنن، تاکو سەر لە بەیانی ئیمڕۆ، ژمارەی شەهید و بریندار ئەوەی کە گەینراوەتە خەستەخانەی طواری سلێمانی لە ناو شاری سلێمانی پێکراون بەم جۆرەیە (٥ شەهید دوانیان پێشمەرگەیە، سێیان هاوڵاتی، ٥٦ بریندار کە تەنها ١٦ کەسیان پێشمەرگەن، ٤٠ کەسەکەی تر هاوڵاتین).

...تا ئێستا پەیوەندی لە نێوان برادەرانی ئێمە و ئەواندا هەیە. سەرجەم سنوری قەزاکانی چەمچەماڵ، دوکان، رانیە و قەلادزێ، جگە لەسەرئەشکەوتانی بێتواتە، تەواجدی هێزەکانی ئەوانی لێنەماوە، بە تەوجیهاتی سەرکردایەتیان لە شوێنی دیایکراو کۆکراونەتەوە. پارێزگای کەرکوک، هەمو ئەو ناوچانەی لەژێر دەستی کوردایە، لەژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی ئێمەدایە...[٣٦١٠]

ئەم بروسکەیە باری ئاڵۆزی ئەو رۆژە دەردەخات..نیشانی ئەدات نەخشەی سەربازی لەو رۆژەدا لە روانگەی یەکێتیەوە چۆن بوە، یان یەکێتی چۆنی بینیوە، ئەم نەخشەیە هەمیشەیی نەبوە، بەڵکو بە سەعات گۆڕانی بەسەردا هاتوە و ئەو شوێنەی ئەو کاتە لەژێر کۆنترۆڵی یەکێتیدا بوە، دوای سەعاتێکی تر، کەوتۆتە ژێر دەسەلاتی پارتیەوە و بەم شێوەیە جێگۆرکێ کراوە و رۆڵەی کوردیش بوە بە قوربانی سەرکەوتنە کاتیەکانی دو هێزە گەورەیە!

## هەولێر و شەڕ، رێکەوتن و جارێکی تر شەڕ..

هەر چەند رۆژێک دوای ئەم بروسکانە، کاتێ کە بارودۆخی ناوشاری هەولێر ئاڵۆز دەبێت، مەسعود بارزانی لە شەوی ١٢/٢٦ بروسکەیەک بۆ مام جەلال، کۆسرەت رەسوڵ و ئەحمەد چەلەبی دەنوسێت: "بەڕاستی لەوە ناچێت بەرنامەی شەڕ راگرتن هەبێت، برایانی یەکێتی ئێمڕۆ لە تەلەفزیۆنی هەولێر دەڵێن: پارتی لە هەولێر موحاصەرەیە و دەبێت تەسلیم ببن، ئەندامانی م.س ی یەکێتی هەریەکەیان لە میحوەرێک قیادەی شەڕ دەکەن و تصریحات ئەدەن کە ئەم شەڕە تا حەسم نەبێت، ناوەستێت. بێگومان جەنابت لە هەموکەس باشتر دەزانیت کە پارتی قەت لە هەڕەشە نەترساوە، وە من ئەم قسەیەی تەلەفزیۆنم زۆر لا گرانە و زۆر ئازاری داوم. ئینجا برای

[٣٦١] هەمان سەرچاوە.

خۆشەویستم ئەگەر بە جدی مەبەستت راگرتنی شەڕە، جەنابت ئەبێت فەرزی بکەیت لەسەر (ی.ن. ک) و منیش حازرم بۆ هەمو هاوکاریەک ئەگەر مەبەستیش لەناوبردنی پارتیش بێت، ئەوا ئۆباڵی هەرچی دەبێت لە ئەستۆی ئێمەدا نابێت".

هەر دەربارەی ئەو کێشەیە، مام جەلال لە ١٢/٢٨ دا ئەم بروسکەیە بۆ مەسعود بارزانی دەنێرێت: "من قەت درۆ لەگەڵ تۆ ناکەم، فێڵت لێ ناکەم باوەڕ بکە، هیچ کاتێک بڕیاری وا نەدراوە، بەڵکو بە عەکسەوەیە، من تکای برایانەم شەڕ راگرتنە، باوەڕبکە ئەو رۆژەی (ی.ن.ک) بڕیاری شەڕی لەناوبردنی پارتی دەدات، یەک دەقیقە تیا نامێنمەوە، (ی.ن.ک) وەک ئێستا لەوە ئەترسێت پارتی بڕیاری وای دابێت. من ئێستا زمان و دەستم زۆر کورت بووە لە ناو (ی.ن.ک)، تکایە با پێکەوە بە جدی هەوڵ بدەین ئەو شەڕە پیس و گڵاوە کورد کورد و خۆ کوژیە راگرین. تکایە جەنابت هاوکارم بن لەو هەوڵەدا با چیتر خوێنی کورد بە خۆڕایی نەرژێت".

هەر دوای ئەم بروسکەیە (م.س) یەکێتی وەڵامی بروسکەی پارتی داوەتەوە و ئاراستەی هەریەک لە مام جەلال، مەسعود بارزانی و ئەحمەد چەلەبیان کردوە و نوسیویانە: "بروسکەی م.ب. ژمارە ١٢٢١لە ١٢/٢٧ تەئکید دەکەینەوە کە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان کەناڵی هەولێر ئەم جۆرە قسە و وتارانەی بڵاو نەکردۆتەوە، کارمەندانی تەلەفزیۆن بە قطعی ئینکاریان کردوە.."

مەسعود بارزانیش لە هەمان رۆژدا، بروسکەیەک ئاراستەی " هەمو سوپاکان، هێز و بەتالیۆنەکان، گشت لقەکان، (م.س) لیژنەی بەرزی متابەعەی بڕیارەکانی ئاساییکردنەوەی وەزع بڕیاریانداوە، لە سەعات پێنجی ئێوارەی ئیمڕۆوە تەقە لەسەرتاسەری بەرەکان بوەستێت. ئێمەش موافەقەتمان کردوە لەسەر ئەم بڕیارە، هەروەها بەرێز (مام جەلال)یش رازیە بەم بڕیارە و ئەمری داوە بە هێزەکانی ی.ن.ک. داواتان لێدەکەم

التیزام بە وەستانی تەقە بکەن و هەوڵبدەین ویستمان دیفاعی بێت و بەس"[362].

بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە و نەهێشتنی دیاردەی تالانی و تۆڵەکردنەوە، بەدیکردنی ئاسۆیەکی روناک لەناو ئەو شەڕە نەگریسەدا، نەوشیروان مستەفا لە ۱۲/۲۷ دا ئەم بروسکەیەی ئاراستەی مەڵبەندەکانی ۱، ۲، ۸، ۹ و سەرجەم کۆمیتەکانی رێکخستن و هەمو لیوا و فەجەکانی پێشمەرگە کرد و نوسیوێتی:

"۱. ئەو برادەرانەی پارتی لە شار و ئۆردوگاکاندا ماونەتەوە و شوێنەکانی خۆیان بەجێ نەهێشتوە، پێویستە سەر و سامان و سەلامەتیان پارێزراو بێت، هیچ کەسێک بە هیچ بیانویەک بۆی نیە دەست درێژی بکاتە سەریان.

۲. ماڵ داگیرکردن و ماڵ تالانکردن، خەڵک دەرکردن لە خانوی خۆی قەدەغەیە.

۳. سەیارە لێوەرگرتن قەدەغەیە.

٤. چەک لێسەندن بەبێ موافەقەتی مەڵبەند قەدەغەیە.

٥. هەمو موچەخۆرانی پارتی ئەتوانن لە دائیرەکانی خۆیاندا کار بکەن و نابێت هیچ کەسێک دەستبێنێتە رێگایان.

٦. تۆڵە سەندنەوە قەدەغەیە.

۷. پێویستە رێز لە دیل بگیرێت، ژیان و کەرامەتی پارێزراو بێت. هەرکەسێک سەرپێچی بکات سزا ئەدرێت."[363].

هەر دوای ئەم هەمو هەوڵ و بروسکە ناردنەی هەمو لاکان، مەکتەبی سیاسی پارتی لە شەوی ۱۲/۲۸ دا بروسکەیەک ئاراستەی: لایەنەکانی بەرەی کوردستانی، لیژنەی متابعەی بەرێزان ئەحمەد چەلەبی، جەوهەر نامیق، د. کمال فواد، ئەحمەد چەلەبی، سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتیمانی عێراقی INC، حیزب و رێکخراوە سیاسیە عێراقیەکان دەکات و نوسیویانە: "زۆر بەداخەوە

---

[362] هەمان سەرچاوە.

[363] هەمان سەرچاوە.

ئەوە ئیمڕۆ دە ڕۆژە شـەڕ و پێکدادان بەردەوامە لە کوردسـتان، سـەرەڕای هەمو بروسکە و نوسراو و بەڵێن بە ناوبژیکەران وەک د. ئەحمەد چەلەبی و پەرلەمانتـارە پەنـاگیران و کـۆڕ و کـۆمەڵی شەخسـیاتی ناسـراو، بە ڕاگرتنـی شـەڕ و ئاسـایکردنەوەی بـارودۆخی کوردسـتان. بەڵام هێرشـی ڕێکخـراو و ڕێکوپێکی هێزەکانی یەکێتی لە چەند قوڵەوە بۆمان دەرکەوتوە کە هێزەکانتـان وەک بڕیاری پێشو بەردەوامن لەسەر هێزەکانی پارتی بە مەبەستی ئاشکرای ئـابڵوقەدانی سـەلاحەدین، هەربۆیەشـە ئیتـر و چیتـر گـوێ نـادەینە هـیچ بروسکەیەک لەم بارەیەوە و بە ئاشـکرا دیڵێین نە پێیان فریـودراوین نە فریـو دەدرێین، بۆیە بۆ دواجـار رایدەگەیەنین، ئەگەر هێرشـەکانتان لە مـاوەی ٢٤ سـەعاتدا رانەگـرن، ئەوە ئـێمە خۆمـان بە ئـازاد ئەزانـین و پابەنـدی هـیچ ڕێکەوتننامەیەک نابین..."[٣٦٤].

بـۆ ڕۆژی دوایـی، مـام جەلال بروسـکەی ژمـارە ١٤١٨ لە ١٩٩٤/١٢/٢٩ بـۆ مەسعود بارزانی و ئەحمەد چەلەبی و هەمو لایەنە سیاسییەکان دەنێرێت و دەنوسێت:

"١. یەکێتی دەستبەجێ و هەر ئێستا ئامادەی شەڕ ڕاگرتنە.

٢. داوا دەکەین بە سەرۆکایەتی INC لە هەمو لایەنەکان لیژنەی ئیشـراف بـۆ هەمـو قوڵەکـان دەرچێـت، هەر کەسـێ لە سـەعاتی دیـاریکراو شـەڕی رانەگرت ئەو هەمو لایەک وەک تاوانبار و شەڕفرۆش ئیدانەی بکەن.

٣. ئێمە پێمان باشە شەڕ ڕاگرتن بە هەر بە قسە و بانگەواز نەبێت، بەڵکو بۆ هەمو قوڵەکان لیژنەی ئیشرافی شەڕ وەستاندن بچێت و شـەڕ ڕاگیرێت و چونکە ئەو شەڕە گلاوە کورد کوژیە و تـاوانێکی نیشـتیمانی گەورەیە، تکـای تایبەتیشـم لە بـرای خۆشەویسـتمان کـاک مەسـعودی بەرێـز کە بە هێمنـی و شـێنەیی گیروگرفتەکـان چارەسـەر بکەیـن لەم کـاتەدا، ئەبێـت پشـو درێـژی شۆڕشگێرانەمان هەبێت، ئەبێت هەردوکمان پێکەوە بچینە کایەکەوە بۆ شەڕ

[٣٦٤] خەون یان مۆتەکە، ل ١٤٣.

ڕاگرتن، با دەستبەجێ ئەو شەڕە ڕاوەستێت، پاشان باسی گیروگرفتەکانی تر بکەین.[٣٦٥]

هەر دەربارەی بارودۆخە ئاڵۆزەکە، مەکتەبی سیاسی یەکێتی وەڵامی بروسکەی ژمارە ٤٧٤٥ ی ١٩٩٤/١٢/٢٨ ی مەکتەبی سیاسی پارتی ئەداتەوە، ئۆبالی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ دەخاتە ئەستۆی پارتی و باسی داگیرکردنی ماڵی مام جەلال و بارەگای یەکێتی لە شەقلاوە دەکات و ئینجا داوا دەکات کە (لیژنەی متابعە) هەستێت بە چاودێری شەڕ وەستان.

هەر دەربارەی هەوڵی پەرلەمانتاران و هاوڵاتیانی هەمەجۆر بۆ وەستان شەڕ، مام جەلال ڕۆژی ١٩٩٤/١٢/٢٩ بە کاتی عەسر ئەم بروسکەیە دەنێرێت بۆ مەسعود بارزانی: "وەفدی پەرلەمان هاتنە لام، من داواکانیانم پەسەند کرد نامەم بە دەستوخەتی خۆم پێداون بۆ شەڕ ڕاگرتن لەناو هەولێر و دەوروبەری، بۆ شەڕ ڕاگرتنی سەرتاسەری هەمو قۆڵەکانیش پێکهاتوین لە گەڵیان کە لەگەڵ چاودێری لیژەکانی ئەوان بەرەی کوردستانی و INC حیزبەکانی تریشدا بێت. هیوادارم جەنابیشت وەک لێتان ڕەچاو دەکەم بە حیکمەتی خۆتان داواکانیان لێپەسەند بکەن وە هیمەتی پێویست بفەرمون بۆ دوایی هێنان بەو کارە"

دەربارەی ئەو دەنگەی کە گوایە هێزەکانی یەکێتی چونەتە سەر ماڵی دایکی مەسعود بارزانی، مام جەلال لە ١٢/٢٩ دا ئەم بروسکەیە بۆ مەسعود بارزانی دەنێرێت: "هێرش بۆسەر ماڵی تۆ و دایکمان (حەمایل خان) هەر مەگەر بەسەر لاشەی مام جەلالدا تێپەڕێت، ئەگینا موستەحیلە. تکایە بە پروپاگەندەی ناحەزان باوەر مەکەن، ٣ جاری تریش ماڵی برای خۆتان تالان بکەن، من هەرگیز ماوەی هێرشی سەر ماڵی جەنابتان نادەم، لەم بەڵێنە دڵنیابن".

زۆربەی هەرە زۆری بروسکەکان لەو کاتانەدا نێراون کە هەر لایە خۆی

[٣٦٥] خەون یان مۆتەکە، ل ١٤٣.

ئامادەکردوە بۆ شەڕ و باس لە کوژراو و بریندابونی هێزی بەرامبەر دەکات.
یەکێ لە بروسکەکانی ١٢/٢٨، زۆر جیاواز بوە لە هەمو بروسکەکانی تر و ئەمجارەیان بۆن و بەرامی شەڕ و ئاژاوەی تێدا نەبوە، بەڵکو باس لە هێنانەدی خەونێکی نەتەوەیی کورد دەکات و مژدەی رۆژێکی نوێ بە نەوکانی سبەینێ ئەدات، مام جەلال لە ١٢ نیوەڕۆدا ئەم بروسکەیەی کردوە:

"بۆ: کاک سالار، کاک عیماد، کوردە، شۆڕش، هەڤالانی (م.س) مەسعود بارزانی، مژدەتان لێ بێ، وا دو رۆژە بیرێکی نەوت کەوتۆتە کار و دەست کراوە بە هەڵێنجان و پالاوتنی نەوت و بەنزین..لەگەڵ بیرەکانی تریش خەریکن"[٣٦٦].

دیارە مەبەستی بیرە نەوتی (شێواشۆک) بوە، کە یەکەم جارە لە مێژوی کوردا، کورد لەسەر خاکی خۆی بیرە نەوتی خۆی بۆ خۆی دەردەهێنێت و بەکاری بهێنێت، ئەوە سەرەتایەک بو، بۆ هەمو بیرەکانی تری ناو کوردستان.

بە هەمان ناوەرۆک مام جەلال بروسکەی ژمارە ١٥١٤ ی ١٢/٣٠ دەنێرێت بۆ مەکتەبی سیاسی یەکێتی و گشت هێزی پێشمەرگەی کوردستان و دەنوسێت:

"١. بڕیارماندا لە ئێمشەوەوە سەعات ٨ شەڕ لەسەرانسەری کوردستان رابگیرێت.

٢. نابێ لە ئێوەوە هێرش بکرێت، تەنها حەقی دیفاعتان هەیە.

٣. هەمو فەرماندەکان مەسئولن لە جێبەجێکردنی ئەم بڕیارەمان بۆ دوایی هێنان بە شەڕ و خۆ کوژی و کورد کوژەی گڵاو"

هەمان رۆژ مەسعود بارزانی بروسکەیەک ئاراستەی مام جەلال و ئەحمەد چەلەبی دەکات پشتگیری بۆ وەستانی شەڕ دەردەبڕێت و داوا لە INC دەکات کە چاودێری بکات.

بۆ سبەینێ واتا رۆژی ماڵئاوایی ساڵی ١٩٩٤وەک هەمو رۆژەکانی تری ساڵ، رۆژی شەڕو پێکدادان بوە، کۆسرەت رەسوڵ لە ١٢/٣١، بروسکەیەک دەنێرێت بۆ مام جەلال و هەمو لایەک و دەنوسێت: "١. ئیمڕۆ پارتی لە

---

[٣٦٦] یەکێتی نیشتیمانی پەنۆرامای پاش نیوەرۆی ٢٨ و ١٩٩٤/١٢/٢٩.

میحوەری کانی قرژاڵە و بەحرکە هێرشیان کردە سەر سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە، لە چەندین لاوە شکان و رایان کرد. ٢. ئێستاکە لای شاوەیس قەسفی متبادەل هەیە لە نێوانماندا."

ئەم بروسکەیە دەریدەخات کە هەوڵی هێمنکردنەوە و ئاشتەوایی چەند تەمەن کورت بوە، رۆژێ بەسەر بروسکەکەی مام جەلالدا تێنەپەڕیبو، شەڕ دەستپێدەکاتەوە.

شەوی سەری ساڵ، پارتی سەعات ١٠ شەو، شاری هەولێری تۆپباران کرد، ئەم شەڕانە لە ماوەیەکی کورتدا پەلی هاویشت بۆ شارەزور و ناوچەکانی تر و هەردولا خۆیان بۆ شەڕێکی ڕوبەڕوی قورس ئامادەکرد، بۆ رۆژی دوایی، واتا لەسەرەتای ساڵی نوێدا، مام جەلال (نەفیری عام) ی لەسەرانسەری کوردستاندا راگەیاند، شەڕەکەی نێوان پارتی و یەکێتی بو بە شەڕی سەرانسەری و لە چەند بروسکەیەکدا مام جەلال داوا لە فەرماندەییەکان و مەکتەبی سیاسی دەکات کە خۆیان بۆ شەڕێکی قورس ئامادە بکەن.

ئەم شەڕانە هیچ یاسایەکی نێودەوڵەتی نەیان دەگرتەوە، لەبەرئەوە کوشتنی دیل و بەتالان بردنی موڵک و ماڵ بوە بە روخسارێکی ناشیرین لەم شەڕە ناوخۆیانەدا.

بۆ ئاگادارکردنەوەی هێزی پێشمەرگەی سەر بە یەکێتی، مام جەلال لە یەکەم رۆژی سەری ساڵدا ئەم بروسکەیە دەنێرێت بۆ (م.س) : "ئەگەر راوڕوت قەدەغە نەکەن و پەکی نەخەن، ئەوا لەروی سیاسییەوە دەیدۆڕێنین، بۆیە دیسان دوپاتی دەکەمەوە، کادیرەکان و ئەندام کۆمیتەکان و کەرتەکان دابەش بکەن بەسەر طرەفەکاندا وەک پاسەوان بۆ قەدەغەکردنی راووڕوت"[٣٦٧].

[٣٦٧] یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، مەڵبەندی دەرەوە، پەنۆرامای روداوەکانی پاش نیوەرۆی ٢٨ و ١٩٩٤/١٢/٢٩.

## ١٩٩٥

## ساڵی نوێ، شەڕی گەرمی لەگەڵ خۆی هێنا

دوای کۆتایی هاتنی کاتیی شەڕی یەکێتی و پارتی، بزوتنەوەی ئیسلامی ناوچەی هەڵەبجەی کرد بە بنکەی سەرەکی خۆی، ڕێبەری گشتی بزوتنەوە و هەندێ لە سەرکردەکانی لەوێ نیشتەجێ بون. لەسەروەختی شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی زەمینە ڕەخسا بۆ بزوتنەوە کە لە هەڵەبجە جێگیر و بەهێزبێت، سەرەڕای گرژیی لەگەڵ یەکێتیدا، بزوتنەوە مەبەستی بو یەکێتی مەشغوڵ بکات و نەتوانێت هێز ڕەوانەی ناوچەی هەولێر بکات.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٥ ەوە شەڕ لە نێوان پارتی و یەکێتی سەری هەڵدایەوە و لەو شەڕانەدا چەندین فەرماندەی یەکێتی شەهید بون لەوانە قادر کۆکۆیی و ئازادی کوڕی.

سەری ساڵی نوێ، شەڕی خەست و خوێناوی لەگەڵ خۆیدا هێنا، لە زۆربەی ناوچەکان شەڕ گەرم بو، مام جەلال بەیانی زوی ١٩٩٥/١/١ بروسکەیەک بۆ مەڵبەندەکانی سلێمانی و کەرکوک دەنێرێت و دەنوسێت: "تا چەند دەکرێت هێز کۆبکەنەوە، چونکە پێدەچێت پارتی شەڕی مان و نەمانمان لەگەڵدا بکات"

هەر هەمان ڕۆژ و کات ١١ بەیانی، مام جەلال بەهەمان ناوەڕۆکی بروسکەکەی پێشو، بروسکەیەک دەنێرێت بۆ کۆسرەت ڕەسول لە هەولێر.

لەو کاتانەدا کە تارمایی شەڕ و یەککوشتن ئاسمانی کوردستانی گرتبۆوە، دەنگی دژ بە شەڕی براکوژی لە زۆر لاوە بەرز دەبۆوە و چەندەها ڕێکخراوی کۆمەڵگەی مەدەنی و گروپی ژنان و پەرلەمانتاران مانیان

دەگرت و زۆرجار لە شار و شارۆچکەکانەوە بەپێ دەهاتن بۆ هەولێر، تەنها بۆ ناڕەزایی دەربڕین دژ بە شەڕی ناوخۆ.

ژمارەیەکی زۆر لە ئەندام پەرلەمانەکانی هەمو هێزە سیاسییەکان لە ناو بینای پەرلەماندا مانیانگرتبو، لە ١٩٩٥/١/٤ بروسکەیەکیان ئاراستەی مام جەلال و (م.س) یەکێتی کرد و وێنەیەکیان دا بە (م.س) پارتی، نوسیوبویان: "لە شاری هەولێر خروقات و تەجاوزات زۆر بەردەوامە، ڕێگای چونی سوتەمەنی بۆ دەرەوەی هەولێر گیراوە، داوا دەکرێت ئاسایشی ناو هەولێر مسۆگەر بکرێت، و ڕێگای سوتەمەنی بدرێت، هەروەها داوادەکرێت ڕێگای هاتنی ئازوقە بدرێت بۆ ناو هەولێر، کە پارتی لەو کارە بەرپرسیارە"

سەرەتای ساڵ، کێشەی شاری هەولێر، خاڵی بنەڕەتی بو لە ناکۆکیەکانی نێوان پارتی و یەکێتیدا، یەکێتی هەولێری بە بەشێک لە کێشەکان ئەدایە قەڵەم و پارتیش بە جەوهەری کێشەکانی پێناسە دەکرد.

هەڵوێستی پارتی دەربارەی هەولێر، لە وەڵامی بروسکەیەکی مەسعود بارزانیدا دەردەکەوێت کە لە ١٩٩٥/١/٤ دا ئاراستەی پەرلەمانتارە پەناگیرەکانی کردوە و نوسیوێتی: "بروسکەتان ژمارە ١٩، داگیرکردنی هەولێر، بە هێزی چەکداری تێکدانی هەمو وەزعێکە و تەجروبەکەمانە، کلیلی هەمو حەل ئاسایکردنەوەی هەولێرە، دەبێت هەولێر بۆ هەموان بێت یان بۆ کەس نابێت".

بۆ هەوڵی ناوبژی و ئاسایکردنەوەی پەیوەندی نێوان پارتی و یەکێتی، ئێران ئەیویست ڕۆڵی دیار ببینێت، لەو بارەیەوە مام جەلال لە ١٩٩٥/١/٦ دا، بروسکەیەک بۆ نەوشیروان مستەفا دەنێرێت و دەنوسێت:

"١. سبەینێ بەیانی برا ئێرانییەکان دێنە خزمەتتان.

٢. پێم باشە (م.ب) (مەسعود بارزانی) موافەقەتی لەسەر ڕاگرتنی شەڕ کردوە.

٣. پێم باشە ئێران ئامادەیە ناوبژی بکات...".

لە کاتی نوسینی ئەم بروسکەیەدا، شەڕ لە زۆر ناوچەی پارێزگای هەولێر

بەردەوام بوە، لە هەمان رۆژدا، واتا لە ١/٦ دا، پارتی دوای شەڕێکی سەخت لەگەڵ یەکێتیدا، توانی دەست بەسەر قەزای چۆماندا بگرێت.

لەم رۆژانەدا، هەندێ لە هێزە عێراقییە شیعەکان هەوڵیان ئەدا، ناوبژی بکەن و بارودۆخەکە هێمن بکەنەوە، لەسەردانێکیاندا بۆ لای (م.س) یەکێتی لە ١٩٩٥/١/٩ دا، یەکێتی تاک لایەنانە راگرتنی شەڕی راگەیاند، (م.س) پێشنیازەکەی ئەوانی قبوڵ کردو لە بروسکەیەکدا بۆ هەمو دەزگاکانی راگەیاندنی سەر بە خۆی، داوای راگرتنی هێرشی راگەیاندن کرد.

لەسەر پێشنیازی د. ئەحمەد چەلەبی و لیژنەی باڵای بەدوداچون، هەریەک لە مام جەلال و مەسعود بارزانی لە دو بروسکەی جیاوازدا لە ٩-١٩٩٥/١/١٠ دا، دەسەلات ئەدەن بە د. چەلەبی کە چی بەباش دەزانێت بۆ وەستانی شەڕ بیکات.

بۆ رۆژی دوایی مام جەلال بە بروسکەی ژمارە ١٩٩ ی ١٩٩٥/١/١٠ بۆ ئەحمەد چەلەبی دەنوسێت: "ئەو رۆژەی کە پێویست بو شەڕ رابگیرێت، پارتی بەڵێنی شکاندوە، پارتی هێرشی لە ناوچەکانی دێگەڵە، چۆمان، شاوەیس کردوە، وە ئەمە جێی قبوڵ نیە".

دەربارەی پێشێلکاری یەکێتیش د. ئەحمەد چەلەبی لە ١٩٩٥/١/١١ دو بروسکە بۆ مام جەلال دەنێرێت، کە زانیاریەکانی لە پارتی وەرگرتوە و نوسیویتی "یەکێتی لە کەپکی ئەحمەد ئاغا و شا ئۆمەر هێرشیان کردوە" داوای راگرتنی شەڕ و هێرش دەکات".

ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە هەردولا چەند بە زارەکی ئامادەی ئاشتی بون، بەڵام دە ئەوەندە بە کردار ئامادەی شەڕ بون و ئەوەی نەبوبێت لە نێوانیاندا متمانە بەیەک بون بوە.

هەر بۆ راگرتنی ماوەی شەڕی راگەیاندن، هێشتا چەند کاتژمێرێک بەسەر نامەکانی بارزانی و تاڵەبانیدا تێنەپەریبو، کوسرەت رەسوڵ لە بروسکەی ژمارە ٥٥ ی ١٠-١٩٩٥/١/١١ بۆ مام جەلال دەنوسێت: "ئێمشەو تەلەفزیۆنی

پارتی هێرشیان لەسەر مام جەلال و کاک نەوشیروان و منیش دەکرد، وە قسەی زۆر ناشیرینیان دەکرد، بۆیە ئێمەش رەدی زۆر توندماندانەوە" ئەمە دەریدەخات کە هەوڵی ئاشتی چەند دەخایەنێت و خواستی شەڕیش چەند!

ئێران هەوڵی خۆی ئەدا، کە شەڕەکە راگرێت، نوێنەرانی هەردولای بانگهێشتی تاران دەکرد و نوێنەری خۆشی دەنارد بۆ کوردستان بۆلای هەردولا، جەختیی لەسەر ئەوەش دەکرد، کە یەکێتی و پارتی نابێت هاوکاری پارتەکانی رۆژهەڵات بکەن و چالاکیەکانیان دژ بە ئێران بوەستێنن و پێویستە حزبی دیموکرات ئیستگەکەی دابخات.

## ناکۆکی نێوان ئێران و ئەمەریکا بۆ ناوبژی

ئەمەریکاش هەوڵی خۆی ئەدا کە ناوبژی لە نێوان یەکێتی و پارتیدا بکات، ئەویش لەبەر ئەوەی نەوەکا ئێران رۆڵی کاریگەر ببینێت و نەوەکا هێزە کوردییەکان بە قسەی ئێران بکەن و جەختی دەکردەوە کە ئیستگەی حیزبی دیموکرات نابێت دابخرێت. ئەمە شانۆگەری رۆژانی شەڕی ناوخۆیە، کە ولاتانی دراوسێ و دەرەوە چەند کاریگەریی و رۆڵیان هەبوە و هەیە، لێرەدا دەردەکەوێت کە هێزە کوردییەکان چەند سەربەخۆ بون و چەند کاریگەری دەرەوەیان لەسەر بوە!. (ئەمانە هەموی لە بروسکەی ژمارە ١٨٧ی شەوی ١٩٩٥/١/٩ ی مام جەلال بۆ نەوشیروان مستەفا دەردەکەوێت)

هەر لەم بارەیەوە نەوشیروان مستەفا لە بروسکەی ژمارە ٢٨ ی ١٠-١٩٩٥/١/١١ بۆ مام جەلال دەنوسێت: "لام وایە ئێران لە ئەمریکا مهم ترە لە راگرتنی ئەم شەڕەدا".

بۆ رۆژی دوایی، مام جەلال وەڵامی بروسکەکەی نەشیروان مستەفا ئەداتەوە و دەنوسێت: "من هیچ باوەڕم بە ئێران نیە، هەموی فرت و فێڵە، وا لە حاجی ئۆمەران بە ئاشکرا یارمەتی پارتی ئەدات..." ئەمانە دو هەڵوێست لە یەک سەرکردایەتیەوە بەرامبەر بە دەوڵەتێکی گرنگی وەک ئێران.

ئێران زەختی زۆری دەکردە سەر یەکێتی کە ئیستگەکەی حزبی دیموکرات دابخات، حیزبی دیموکراتیش بە قسەی یەکێتیان نەدەکرد و ئیستگەکەیان لە کار بەدەوام بو، ئێرانیش ئامادەنەبو هیچ رۆڵێک ببینێت بۆ ئاشتی نێوان یەکێتی و پارتی یاخود هاوکاری یەکێتی نەدەکرد تا ئیستگەکەی حدکا دانەخات.

مام جەلال لە بروسکەی ژمارە ٢٢٠ ی ١١-١٩٩٥/١/١٢ بۆ فەرەیدون عەبدولقادر کە ئەو کاتە لە ئێران بو بۆ دانوساندن: "ئەو شەرتانە (ئێران) بۆ تەشقەڵەیە و شەرتی تەعجیزیە و بۆ بیانو گرتنە، ئەگینا من زۆرم هەوڵ داوە، رەنگە ئەوان بە قسەی ئەمریکا و بەغدا بکەن کە هەردوکیان تەشجیعیان دەکەن کە رادیۆکە دانەخەن. دەزانن ئێستا ئێمە شەڕی هەموکەسمان پێناکرێت، بۆیە لێمان بێ منەتن، جا ئەگەر ئەوان دۆستایەتی ئێمەیان بەلاوە پەسەندە، هەقە بزانن (لا يكلف الله نفسا الأ وسعها) ".

مام جەلال لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا دەربارەی پەیوەندی لەگەڵ مەسعود بارزانی، دەڵی: "کێشەی دو سەرۆکایەتی لە کوردستان تەنها لە رێگای هەڵبژاردنەوە چارەسەر دەکرێت، وە داوا لە تورکیا دەکات کە دەست نەخاتە ناو کاروباری کوردستان و هاوکاریە سەربازی و مادیەکانی بۆ بارزانی بوەستێنێت. هەروەها دەڵێت کە یەکێتی بڕوا بە بەڵێنەکانی بارزانی نەماوە"[٣٦٨]، هەروەها ئۆباڵی ئەو شەڕە دەخاتە ئەستۆی بارزانی.

شەڕ لە زۆر ناوچە بەردەوام بو، بە تایبەتی لەناو هەولێر، لەو بارەیەوە کۆسرەت رەسوڵ لە بروسکەی ژمارە ٨٧ی ١٩٩٥/١/١٥ دا بۆ مام جەلال نوسیویتی: "لقی پارتی ئیمشەو گیرا، زۆربەیان هەڵهاتون بۆ مقری (حشع) (شیراتۆن) ٤٠ کەسی تێدا ماوەتەوە، شەڕیان لەسەرە، ئەحمەد چەلەبی داوادەکات نەقڵیان بکەن بۆ مەصیف" ئەمە وێنەی تراجیدیای سەرەتای ساڵی پایتەختی هەرێم بوە..!

---

[٣٦٨] (الحياة) ژمارە ١١٦٤٩ی ١٩٩٥/١/١١.

شــەڕ لەنــاو شــار و دەوروپشـــتی هەولێــر زۆر گەرم بــو، لیــژنەی پەیوەنـدیەکانی دەرەوەی یەکێتـی لە نامەیەکیـدا بـۆ ڕێکخسـتنەکانی دەرەوە دەنوسـێت: "لە دوێنێـوە، ڕێکەوتـی ١٩٩٥/١/١٤ سـەعات ٢١ بە کـاتی هەولێـر، پارتی شاری هەولێر لە مەصیفەوە بۆردومـان دەکات، ژمـارەی ئەو تۆپـانەی تاکو ئێستا لە هەولێر دراوە، (٥٠) تۆپە، نەوعی (١٥٢) ملم."

## بانگەوازی مام جەلال

لە ١/١٥دا مـام جەلال بـانگەوازێکی لە ژێـر نـاوی (بانگەوازێـک لە مـام جەلالەوە بـۆ جەمـاوەری کوردسـتان و ئەنـدامان و لایەنگرانـی یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان) بڵاوکـردە، کە تێـدا بـاس لە هەوڵـی سـەرنەکەوتنی یەکێتـی و هێـزە کوردیەکـان و کـۆنگرەی نیشـتیمانی عێراقـی دەکـات بـۆ ئاشـتبونەوە، هەمـو بێئەنجـامی هەوڵەکـانی خسـتۆتە سـەر (سـەرکردایەتی ئاشبەتاڵ) و داوا لە دۆست و ئەندام و لایەنگرانی یەکێتی دەکات، کە خۆیان پڕ چەک بکەن و لە بەرگریدابن دژ بە پارتی، زمانی نوسینەکە، زۆر تونـد و زبر بو، پارتی ناوی بانگەوازەکەی نـابو (نەفیری گشتی بۆ شـەڕی نـاوخۆ) ..یەکێتی وای پیشاندا، کە ئەم بانگەوازە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە بو کە لە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی لیوا تایبەتیەکانی یەکێتی دروست بوبو.

هەر لە ١/١٥ دا دو شوێنی پارتی لە هەولێر مابون (لق و هۆتێل شیراتۆن) هەردوکیان لە لایەن یەکێتیەوە گیران و ئیتر هیـچ بارەگـایەکی ڕەسـمی پـارتی لەناو شاری هەولێردا نەما.

شەڕ و پێکدادان لە زۆربەی بەرەکان بەردەوام بو، هەنـدێجار، لە هەنـدێ نـاوچە گەرم دەبـو، لە هەنـدێ نـاوچەی تـر، پشـوی تێدا بـو، لە ناوچەکـانی پێنجـوین و چەمچەمـاڵ لە هەفـتەی سـێهەمی مـانگی یەک، شـەڕ گەرم بـو، ئێوارەی ١٩٩٥/١/٢١، محوەری پێنجوینی یەکێتی بروسکەیەک بۆ نەشـیروان مسـتەفا و فەرمانـدەی گشـتی هێـزی پێشـمەرگەی یەکێتـی دەنوسـێت:

"بەردەوامین لە ڕاونانی هێزە بەزیوەکەی پارتی، چەندین کوژراویان لەبەر دەستماندایە، دو دیلیان لامانە و خۆشمان شەهیدێکمان هەیە، "

تراجیدیای شەڕی کورد لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە تەرەفی بەرامبەر لەو شەڕەدا چەند کوژرا و بریندار و دیلیان هەیە، بێ ئەوەی هیچ لایەک بتوانن بۆ خێزانی ئەو قوربانیانە ڕون بکەنەوە، کە لە پێناوی چیدا ڕۆڵەکانیان تیدا چون.

هەروەها لە هەمان ڕۆژدا، میحوەری شارەزوری یەکێتی بروسکەیەک بۆ فەرماندەی یەکێتی و نەوشیروان مستەفا دەربارەی بارودۆخی ناوچەی هەڵەبجە و سەید صادق دەنێرن و دەنوسن: "ئەم بەیانیە هێزەکانی پارتی لە سەید صادق و شانەدەریەوە، هێرشیان هێنا و لە هەردولا تێک شکێنران، تا سەعات ٣ پاش نیوەڕۆی ئیمرۆ (٢٠) کوژراو و ١٢ دیلیان هەیە، هەروەها ٤٠ پارچە چەکی هەمەجۆرە..".

ئەو هێرشانە لەو کاتانەدا بە سەرکەوتو دائەنرا، کە تۆ زۆرترین ئازاری بەرامبەرەکەت بدەیت، زۆرترین کوژرا و بریندار و زۆرترین دیل و زۆرترین زیانی مادی و مەعنەوی پێبگەیەنیت! ئەمەیە ئیستراتیجی هێڵی سەرەکی و گرنگی شەڕی کوردی کوردیی بوە!.

## رۆڵی ئێران لە شەڕەکاندا

دەربارەی ئەو شەڕانە، حەمەی حاجی مەحمود دەنوسێت: "لە ١٩٩٥/١/٢١ پارتی بە پشتیوانی تۆپ و راجیمەی ئێران و هاوکاری بزوتنەوە، هێرشیان کرد بۆ سەید سادق و گردی حاجی عەبدوڵا و شانەدەری لە لای گامێش تەپە، نزیکەی ٥٢ کەسیان کوژرا و ١٢ کەسیان بەدیل گیران".

هەر بەم شەڕە خوێناویە نەوەستانەوە لە ١٩٩٥/١/٢٢ پارتی تۆپبارانی ئۆردوگای بنصلاوەی کرد، کە زۆربەیان ئاوارەی ناوچەی کەرکوک بون و لە ئەنجامدا ١٥ هاوڵاتی بێتاوان شەهیدبون.. ئەم کوشتارانە تەنها لە ماوەی دو رۆژدا لە شەڕی ناوخۆیە[٣٦٩].

هەر دەربارەی ئەو شەڕە و پێکدادانە، لقی ئەوروپای پارتی لە لندنەوە، لە بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیی ژمارە ٩٤٥ ی ١٩٩٥/١/٢١ نوسیویانە: "سەرەڕای بەڵێنی سەرانی ٦٦ کە بە INC یان دابو، گوایە هێرش و پەلامار رائەگرن، تەنها لە هەڵوێستی دیفاعکردن لەخۆ شەڕدەکەن، بەڵام بە پێچەوانەوە، لە شەوی ٢١-١٩٩٥/١/٢٢ لە بنصلاوەوە و لە سەنگەری دیفاعەکانی پارتیمان لە کەسنەزان هێرشیان هێنا، سەرئەنجام تێکشکان و بەرەو بنصلاوە هەڵهاتن. کە ئێستا کردویانەتە مۆڵگای عەسکەری خۆیان، تۆپخانەی پێشمەرگەکانی پارتیمان، بۆ تەمێکردنیان زۆر بەدیقەت و سەرکەوتوانە ئاگربارانیان کردن و توانیان ناوجەرگەی هەردو بارەگاکەیان بارەگای کۆمیتە و بارەگای عەسکەری بپێکن و زیانێکی زۆر گەورەیان لێبدەن، کە زیاتر لە (٥٠) لە نێو

---

[٣٦٩] محەمەد حاجی مەحمود، رۆژ ژمێری... بەرگی ٤، ل٤٢٧.

کوژراو و بینداردا بپێکن و ناچار رایانکرد بەرەو هەولێر و بارەگاکانیان بەجێ هێشت. ئەوەی شایانی باسە، دوای ئەو تۆپبارانە سەرکەوتوە، دەزگای راگەیاندنی یەکێتی بە شڵەژاوی داوای خوێن و هاوکاری لە هاولاتیانیان دەکرد.

ئەمە نمونەیەکی راگەیاندنی شەڕ و نمونەی شەڕی تێکشکاندنی مۆراڵی یەکترە، سەنگی مەحەک لە شەڕەکاندا، ژمارەی زۆری کوژراو و برینداری تەرەفی بەرامبەربو، هەدولا حەزیاندەکرد، کە زۆرترین زیان بە بەرامبەریان بگەیەنن و زۆرجار ژمارەکانیان چەند قات بڵاودەکردەوە، دور لەو واقیعەی کە رویداوە.. مەگەر تەنها ژمارەی دیلەکان راست بن، کە ناویان بڵاودەکرایەوە، ئەگینا، لە شەڕێکی سەختی خوێناوی ناو شاخ و دوڵی کوردستاندا و لە ژێر زرمەی ئاگر و ئاسندا، چۆن ئەتوانرێت ژمارەی تەواوی کوژراو و بریندار بزانرێت. دەزگای راگەیاندنەکانی هەردولا، نەک بەقەدەر شەڕەکان گەرم بون، بەڵکو ئاگرخۆشکەری یەکترکوشتن و ئێسک شکاندنی یەکتر بون.

رۆژنامەیەکی عەرەبی لە ژێر ناونیشانی "هێزەکانی بارزانی ئابلوقەی هەولێریان داوە.... خاچی سوری نێودەوڵەتی دەڵی لە ١٣ی مانگی یەکەوە تاکو ئێستا ١٠٠ هاولاتی لەناو هەولێر و دەروپشتی کوژراون"[٣٧٠] رۆژنامەکانی ئەوروپاش، بە باشی و وردی باسی رەوشی کوردستانیان دەکرد و بێلایەنانە ئەیانویست هاولاتیانی ئەو ولاتانە ئاگاداربکەنەوە لەسەر دوا گۆڕانکاری کە لە کوردستان روی ئەدا، رۆژنامەیەکی ئەڵمانی لەژێر ناونیشانی (سەرەڕای ئابلوقە، بازرگانی گەشەیکردوە) باس لەوەدەکات کە سەرەڕای ئەوەی کە ئابلوقەی نەتەوەیەکگرتوەکان لەسەر عێراق بەردەوامە، بەلام بە ئاشکرا، عێراق لە رێگای کوردستانەوە نەوت دەفرۆشێت بە تورکیا،

---

[٣٧٠] (الحياة) ژمارە ١١٦٥٨ی ١٩٩٥/١/٢٠.

"سنورەی ئیبراهیم خەلیل لەژێر چاودێری پێشمەرگەی مەسعود بارزانیدایە و پارەیەکی باشیش وەردەگرن، رۆژانە ۱۰۰ هەزار دۆلار داهاتی مەسعود بارزانیە لەو سنورە. ئەمە داهاتێکی زۆر باشە بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان و وەک چەکێکیش وایە دژ بە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە سەرۆکایەتی جەلال تاڵەبانی. یەکێتی شاری هەولێر و ئیدارەکەی لە ژێر دەستدایە، بەڵام خەزێنەکەی تەقریبەن بەتاڵە، چونکە بارزانی ئەو گومرگەی لەسەر سنور دەستی دەکەوێت بەشی هەولێری لێنادات. جاران داهاتی ئەو سنورە، دولەسەرسێی داهاتی حکومەتی هەرێمی پێکدەهێنا"[۳۷۱].

## هەوڵی هەمەلایەنە بۆ وەستانی شەڕ و بەردەوامی ئاڵۆزی

هەر دەربارەی بارودۆخی کوردستان، رۆژنامەی (الحیاة) لەژێر سەردێری (دەها هەزار لە هەولێر خۆپیشاندان دەکەن و بارزانی سورە لەسەر کشانەوەی هێز تێدا) دەنوسێت، "دەها هەزار هاولاتی لە هەولێر خۆپیشاندان دەکەن بۆ پشتگیری ٤٩ رۆشنبیر، کە دەیانەوێت لە پێناوی ئاشتیدا لەبەردەم پارێزگای هەولێر خۆیان بسوتێنن، بەڵام هاولاتیان دەڵێن، با ئەو رۆشنبیرانە خۆیان نەسوتێنن، بەڵکو ئەوانەی بون بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ، خۆیان بسوتێنن"[۳۷۲].

لە ۱۹۹٥/۱/۲٦ دا، وەفدێکی ئەمریکی بەسەرۆکایەتی دیڤید لیت، لێپرسراوی بەشی باکوری کەنداو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، گەیشتە کوردستان و پرۆژەیەکی ئاشتیان پێبو بۆ هەردولا، کە بریتی بو لە:

١. راگرتنی سەرتاسەری شەڕ.

٢. واریداتی گومرگ بدرێتەوە بە حکومەت بە ئیشرافی INC.

---

[۳۷۱] Frankfurter Rundschau - ۲٤/۱/۱۹۹٥

[۳۷۲] (الحیاة) ژمارە ۱۱٦٦۳ ی ۱۹۹٥/۱/۲٥.

٣. میلیشیاکان حەل بکرێن.

٤. دۆخی دیموکراتی کوردستان بپارێزرێت.

٥. بە هیچ جۆرێک نابێت ئێران و عێراق بکەونە ناو کێشەکەوە.*

بەبۆنەی هاتنی مانگی رەمەزانەوە، لە ١٩٩٥/١/٣١ دا، مام جەلال لە دەزگای راگەیاندنەکانی یەکێتیەوە، دەستپێشخەریەکی کرد بۆ کۆتایی هێنانی شەڕی ناوخۆ، کە تێداهاتبو:

قۆناغی یەکەم:

١. راگرتنی شەڕ لەسەرانسەری کوردستانەوە و دەستنیشانکردنی چاودێر لە لایەن INC لە گشت قۆڵەکانی شەڕ. راگەیاندنی ئەمە لە دەزگاکانی هەردولا، وە لە پێشدا ئاگادارکردنەوەی لێپرسراوانی مەیدانی.

٢. کشانەوەی ئەو هێزانەی لە سلێمانی و کەرکوک و دهۆکەوە هێنراون بۆ هەولێر و ناوچەکانی دەوروپشتی لە ماوەی یەک رۆژدا بە چاودێری INC و حیزبە کوردستانیەکان.

٣. لەگەڵ کشانەوەی هێزەکانی یەکێتی لە هەولێر و ئەو هێزانەی پارتی کە لە دەوروبەی هەولێرن، دەبێت هێزەکانی پارتی لە شەقڵاوە و زاخۆ بکشێنەوە لە ماوەی یەک رۆژدا و INC کاروباری ئاسایش لەم دو شارەدا دەگرێتە خۆی.

٤. داهاتی حکومی دەچێتە خەزێنەی حکومەتی هەرێم و گومرگی ئیبراهیم خەلیل و پۆستی پەڕینەوەی سنوریش دەدرێتە INC لە ماوەی یەک رۆژدا.

قۆناغی دوەم:

١. قسەکردن لە نێوان وەفدی هەدولا دەست پێدەکات بە ئامادەبونی INC و حیزبە کوردستانییەکان.

٢. نابێت وەزیری دارایی و مودیری بانکی هەرێم لە یەک حیزب بن.

٣. گشت داهاتی حکومی و حسابی بانکەکان لە گشت ناوچەکانی کوردستان جەرد دەکرێن.

قۆناغی سێیەم:

١. دەستپێکردن بە کەمکردنەوە و تەسریح کردنی میلیشیاکان.

٢. دەستپێکردن بە ئارامکردنەوەی بارودۆخی گشت ناوچەکانی کوردستان.

٣. پەیـداکردن و دابینکردنـی پێداویسـتیەکان بـۆ سـەرژمێری گشـتی و هەڵبژاردنی گشتی.

ئەم پێشـنیازانە، دەستپێشـخەریەکی باشـبو، بەڵام باشـتربو، ئەگەر یەکێتـی لەگەڵ پـارتی یـان لەگەڵ هێزەکـانی تـر، بە هاوبەشـی ئەم پێشـنیازانەیان پێشکەش بکردایە و مـاوەی جێبەجێکردنەکەی لە یەک ڕۆژەوە بکرایە بە یەک هەفتە یـان زیـاتر، چونکە هـیچ هێزێک نیە بتوانێت لە مـاوەی یەک ڕۆژدا ئەو خاڵانە جێبەجێ بکات.

سـیمای ئەو ڕۆژانە لە کوردسـتاندا، برتیـی بـون لە شـەڕ و سـەرکەوتن و نوشستی، ناوبژی و گفتوگۆی ڕاستەخۆ و ناڕاستەوخۆ و پرۆژە بۆ ئاشتی. هەریەکە هەوڵـی ئەدا خـۆی بکـات بە کـۆتری ئاشـتی و ئەوەی تـر بکـات بە شەیتانی جەنگ. بێگومان لەم کاتانەدا دەستێوەردانی دەرەکی زۆر ئاسـان بـو بـۆئەوەی ئـاگری شـەڕی نـاوخۆ زیـاتر گـڕی خۆشـبێت، بەڵام نـاو بەنـاویش فرمێسکی تیمساحیان دەڕشت و خۆیان بە کۆتری ئاشتی ئەدایە قەڵەم، هێزە کوردیەکانیش ئەو زەمینەیان بۆ خۆش کردبون.

نەوشیروان مستەفا، بەم شێوەیە باسی بارودۆخی ئەو کاتەی کورد دەکات:

هێمنی موکریانی کە گلەیی لە دڵدارەکەی ئەکا ئەڵێ:

لەناو کوردا نەبو پەیمان شکاندن

لە کوێ فێربوی گوڵم پەیمانشکێنی؟

تەجروبـەی ئـەم چەنـد مانگـەی شـەڕی نـاوخۆ و، ئیمزاکردنـی ئـەو هـەمو ڕێککەوتن و پەیمان و بانگەواز و پرۆژەی ئاشتی و چی و چی ... سەلماندیان کە ئەو بۆچونە باوەی ئەڵێ: لەنـاو کوردا پەیمانشـکێنی نـەبوە، کورد خـاوەنی

قسەی خۆیەتی، ئەگەر گفتیدا جێبەجێی ئەکا، کە سۆزیدا ئەیباتە سەر... راست نیە. چەندینجار پەیمانی دۆستایەتییان ئیمزاکرد و، بەڵێنی راگرتنی شەڕیاندا و، گفتی جێگیرکردنی ئاشتییان دوبارەکردەوە، کەچی ئەم شەڕە نالەبارە کۆتایینەهات، لە جێیەک دائەمرکێتەوە لە جێیەکی تر هەڵئەگیرسێتەوە"[٣٧٣].

لێرەدا، رۆژژمێری هەندێ رۆژانی شەڕ و پێکدادانی چەکداری نێوان پارتی و یەکێتی تەنها لە ١٥ رۆژی کانونی دوهەم دەخەینە بەردەستان، بۆ ئەوەی بزانین، بە هاتنی ساڵی نوێ و زستانی کوردستان، ئەم ناوچەیە چەند ئارام بوە! شەڕ لە دو هەفتەی سەری ساڵی ١٩٩٥ ئەم ناوچانە گرتۆتەوە:

١/٦ چۆمان، ١/٧بەنی هەریر، ١/٨، بێتواتە، حەریر، ١/٩رەواندز، گۆرنۆک، بێ خاڵ، ١/١٠ ئەشکەوتی سەفا، چۆمان، ١/١١ کەپکی حەمەدئاغا، ١/١٢ قەسرێ، ١/١٣ کەسنەزان، هەندرێن، جندیان، رەواندز، بناری کۆرەک، ١/١٤ حەسارۆک، کەسنەزان، ١/١٥/ناو هەولێر، پێنجوین، سەید صادق، کانی قرژاڵە.

ئەم شەڕانە، تێکەڵاوبون، لە هەندێکیانەوە یەکێتی هێرشی کردوە و لە هەندێکی تردا پارتی، بەڵام یەک خاڵی هاوبەشیان هەبوە، ئەویش کوشتن و بریندارکردن و ماڵ کاولکردنی هاوڵاتیانی کوردستان بوە، پێوانەی سەرکەوتنی هەرلایەکیش بریتی بوە کە چەندی لە لاکەی تر کوشتوە و بریندارکردوە و بە دیلگرتوە!

شەڕ، واتا یەککوشتن، شەڕی باش و خراپ نیە، کاتێ مرۆڤێک دەکوژرێت یان گوندێک خاپوردەکرێت یان کۆمەڵێک لەناو دەچێت، بۆ خاوەنەکانیان گرنگ نیە کێ هەستاوە بە کارەکە، چەپە یان راست، دیموکراتە یان موحافیزکار، ئەنجامی کارەکە گرنگە.

زۆر وڵات و هێزی جیاواز، بە مەبەستی جیاواز هەوڵیان ئەدا کە کۆتاییەک بهێنن بە شەڕی کوردی- کوردی، وڵاتانی ئەمریکا، فەرەنسا، ئێران و تورکیا بە ئاشکرا و راستەوخۆ هەوڵی خۆیان ئەدا بۆ کۆتاییهێنانی ئەو شەڕە.. "لە ٢/٦ وەفدێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بەسەرۆکایەتی دیڤیت

---

[٣٧٣] خەون یان مۆتەکە -١، ل ١٤٧.

لیت، هاتن بۆ کوردستان و لەگەڵ هەریەک لە مەسعود بارزانی و مام جەلال کۆبونەوە، وەک هەوڵێک بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی کوردی"[٣٧٤].

ئەم شەڕە تەنها لە چوارچێوەی بەرەکانی شەڕدا قەتیس نەمابو، بەڵکو، خۆی خزاندبوە ناو شار و شارۆچکەکان و شۆڕببوە بۆ ناو ماڵی هەمو هاوڵاتیەکی کورد. کوشتنی هەوادارانی یەکتر لە شارەکاندا و فرێدانی نارنجۆک بۆ ناو ماڵی یەکتر و هەڕەشە لە کەسوکاری یەکتر و زیان گەیاندن بە خەتی کارەبا و ژێرخانی ئابوری شار و تەقاندنەوەی گۆڕستانی شارۆچکەکان بوبون بە سیمایەکی رۆژانە و تەواوکەری شەڕی بەرەکان.

بروسکەی هیچ لایەک نابینیت کە باسی شکستی هێزەکەی خۆی کردبێت، لە زۆر شەڕدا، بۆ نمونە لە شەڕی رەواندز لە ١٩٩٥/٢/٧ کە یەکێتی زیاتر ١٩ قوربانی داوە، بەڵام باسی داستانی سەرکەوتن دەکات، ئێمە زانیاریمان لەبەر دەستا نەبو، کە زیانی پارتی چەندبوە، دور نیە، ئەوانیش بە هەمان شێوە باسی شەڕەکەیان نەکردبێت، سەرەڕای زیانەکانیان.

هەر لە سێبەری ئەم شەڕەدا، دەستێوەردانی دەرەوە بە باشی دەردەکەوێت، بۆ نمونە رۆڵی ئێران کاتێ دۆستی پارتی بوە و نەیاری یەکێتی بە باشی هەستپێدەکرێت کاتێ کە تۆپبارانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دەکات، ئەمە لەو بروسکەیەدا کە فەرماندەی یەکێتی لە پێنجوین لە ١٩٩٥/٢/٢٤ دا بۆ مام جەلال و م. ٩ و م١، ناردویەتی و نوسیویێتی: "ئێران بە خەستی تۆپبارانی ناو شاری پێنجوینی کرد، لە سەعات ١ تا ٢،٣٠ پاش نیوەرۆ..خۆشبەختانە زیانی گیانی نەبوو" ئەم رۆڵەی ئێران، دوای ماوەیەکی تر، گۆڕاوە و ئەمجارە بەرژەوەندیەکانی خواستویەتی کە یارمەتی یەکێتی بدات دژ بە پارتی.

ئەم شەڕە، وەک هەمو شەڕێکی ناوخۆی تر، هاوڵاتیان زەرەرمەندی یەکەم بون، لە ١٩٩٥/٢/٢٧ دا و لەناو بازاڕی زاخۆدا، ئوتۆمبیلێک دەتەقێتەوە و دەبێتە هۆی کوشتن و بریندارکردنی چەندەها هاوڵاتی سیڤیل،

---

[٣٧٤] (الشرق الاوسط)، ژمارە ٩٥١٢ ی ١٩٩٥/٢/٧.

هەردوای تەقینەوەکە قسەکەرێک بەناوی پارتیەوە، یەکێتی بە بکەری تەقینەوەکە تۆمەتبارکرد، ئەمە لە کاتێکدا کە هێشتا لێکۆڵینەوە لە کارەساتەکە دەستیپێنەکردبو!.

بێگومان شەڕی نێوان یەکێتی و پارتی، کاروباری پەرلەمانیشی پەک خستبو، هەڵسوکەوتی هەردو کتلەی سەوز و زەرد، ئاوێنەی حیزبەکانیان بون و ئەوانیش هەمان ئەو کارانەیان دەرکرد، کە حیزبەکانیان پێیان باشبو، چەندەهاجار کۆبونەوەی هاوبەشکرا، بەڵام کۆبونەوەکان و هەوڵی زیندوکردنەوەی پەرلەمان، ئەنجامەکەی وەک ئەنجامی کۆبونەوەکانی هەردو هێزی سیاسی بون، کە بێ ئەنجامی پێوە دیاربو.

هەر دەربارەی شەڕی ناوخۆ، رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی (ئەمنستی ئینتەر ناشناڵ) لە بڵاوکراوەیەکدا لە رۆژی ٢/٢٨/ ١٩٩٥ دا بێزاری خۆی بۆ بەردەوامبونی شەڕی ناوخۆ دەربڕی و نوسیبوی: "زۆر لە هاوڵاتیانی کوردستانی عێراق بێزارن لەو بارودۆخەی کە لە کوردستان هەیە و ئەو بەڵێنانەی کە سەرکردایەتی کورد دایان دەربارەی پاراستنی مافی مرۆڤ. لە ماوەی سێ ساڵی رابوردودا، زۆر لە هاوڵاتیان و شەڕکەران کە بەندکراون و لە زیندانەکاندا بون، دوچاری پێشێلکردنی مافی مرۆڤ بون، کە ئەمانە لەژێر فەرمانی هێزە کوردییەکاندا هەڵسوکەوت دەکەن..".

بێ هیوایی هەمو لایەک لە ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی، لە وتارێکی رۆژنامەی ئەڵمانی (فرانکفورتەر روند شاو) لە ١٩٩٥/٣/١ دەردەکەوێت، کە باس لە شەڕی نێوان هەردو هێزە کوردیەکە دەکات و مەسەلەی دابەشبونی ناوچەی هەرێمی کوردستان بە دو بەشەوە بوە بە واقعێک و بارزانی دەستی بەسەر پارەی سنوری تورکیا گرتوە، ئەم شەڕە خەریکە ئەمریکیەکان بێ هیوا دەکات لە ئاشتی نێوانیان، باس لەوە دەکات، کە کوردەکان دوچاری ٣ جۆر لە ئابڵوقە بون، ئابڵوقەی نەتەوەیەکگرتوەکان لەسەر عێراق و عێراق لەسەر کوردستان و ئابڵوقەی کورد لەناوخۆیاندا.

بێگومـان، کەم کەس هەبو، لە هەمولاکـان، بڕوایـان بە عەدالەتـی شـەڕی ناوخۆ هەبوبێت، بەڵام پێشمەرگە ناچار بو، فەرمـانی سـەرو خۆی جێبەجی بکات، ئەگینا زۆریان خەڵکی ناوچەیەک بون یەکتریان دەناسی و ڕۆژێک لە ڕۆژان لەیەک سـەنگەردابون و دۆسـت و ناسـیاو و هـاوڕێ و کەسـوکاری یەکتربـون، لەبەرئەوە، زۆر ئاسـایی بـوە، ئەگەر مـۆراڵی شـەڕکردنیان بەرزنەبوبێت و ئامادەی کوشتنی هاوڕێکانی دوێنێیان بە ڕاست نەزانیبێت.

لە بروسـکەیەکی مـام جەلالـی ژمـارە ١٢٢٣ ی ١٩٩٥/٣/٧دا بـۆ زۆر لە فەرماندەکانی هێزی یەکێتی دەنوسێت: "ئاگادار و وریای شائعات و درۆی پـارتی بـن، ڕەنـگە هـاژەوهوژ دروسـت بـکەن، بـۆ ورژانـدن و ترسـاندن و چەواشەکردنتان..بزانن کە ئێمە نە لەشکری سوری سۆڤێتین و نە لەشکری زۆری چینیمـان هەیە، پێشـمەرگەکانیش لە خەڵـکەوەن و زۆریـش لەوانەی لەگەڵمـانن لە عەشـایەر و خەڵکەوە هـاتون، بۆیە عەیبە هەمیشـە هاوارتـان لێهەڵسێت بۆ ئەوەی هێزەکانتان تایبەت نیە و موتەفەریق و هتدد..ئەوانەش کوردن و زۆرجار لە تیپی تایبەت باشتر شەڕ دەکەن، گرنگ ئەوەیە باشیان ڕێکخەن..".

لەو ڕۆژانەدا، زۆر کەم بروسکە هەبوە، کە باسی شەڕی نێوان پێشـمەرگە و سـوپای عێـراق بکـات، یەکێـک لە بروسـکە دانسـقاکان، ژمـارە ٣٦٣ ی ٦-١٩٩٥/٣/٧ ە کە کۆسـرەت ڕەسـوڵ بـۆ مـام جەلالـی نـاردوە و نوسـیویەتی: "سـەعات ١٢.٣٠ ئەمشـەو پەلامـاری محـوەری گـوێر - هەولێرمانـدا، لە ئەنجامی پەلامارەکە، ئەم شتانەی خوارەوە گیران: ١- ١٠٠ کلاشینکۆف، ٢-٢٠٠ گولە RBG، ٣- ٨ تۆپی گەورە، ٤- ٧ دۆشکە، ٥- گولە تۆپێکی زۆر، ٦- گرتنی یەک مودەرەعە و دەیان سەیارە، ٧- کوژراوێکی هێجگار زۆریـان هەیە"، بەڵام لەم بروسکەیەدا باس لە زیانەکانی یەکێتی نەکراوە!.

# رۆڵی فراکسیۆنی زەردی پەرلەمان

فراکسیۆنی زەرد لە پەرلەمانی کوردستان لە ۱۹۹٥/۳/۹ بەیانێکی دەرکرد، کە زیاتر، مۆرکی سیاسی پێوە دیاربو، لە چەند خاڵێکدا نوسیویانە:

"۱- ...ئازادی و ئازادی هاتوچۆی ئەندامانی پەرلەمان لەگەڵ حیمایە ئاسایییەکانی خۆیان لە هەردو فراکسیۆن و لیستی مۆریشدا، ئەوەش بۆئەوەی بە عەمەلی بەرجەستەی ئەوە بکرێت کە لە یاسای ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستانی عێراق و پەیڕەوی ناوخۆدا هەتوە.

۲- لابردنی بازگەکان و دابینکردنی ئەو رێگایانەی ئەچنە پەرلەمان.

۳- هەروەها بۆ سەلامەتی و ئازادی پەرلەمەنتارەکان پێشنیازی دابینکردنی رێگای نێوان بینای پەرلەمان و هاوینەهەواری سەلاحەدین بۆ ئەندامانی کیتلەی پارتی دەکەین، ئەویش لە رێگای دانانی بازگەی INC لە (رزگاری-حصار) هەروەها سەبارەت بەو بازگانەش کە لە رێگای کتلەی سەوز و هەردولا وەک یەک.

٤- دانەوەی خانوەکانی ئەو ئەندام پەرلەمانتارانەی کە لە لایەن چەکدارانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە دەستیان بەسەرداگیراوە، بە مەرجێک ئەمە پێش کۆبونەوەی کردنەوەی پەرلەمان ئەنجام بدرێت..."

لە پەرلەمانی کوردستان، دەنگی ئەوە بڵاوبۆوە، کە فراکسیونی زەرد کاری (جاسوسی) دەکات بۆ پارتی و پەرلەمانیان بۆ ئەو مەبەستە بەکارهێناوە.. حاکم قادر، لێپرسراوی ئاسایشی هەولێر لە ۱۹۹٥/۳/۲۸ لە بروسکەیەکدا بۆ مام جەلال نوسیویێتی: "لە ئەنجامی تەواوی مەعلوماتی ئاسایشی شاری هەولێر بۆمان دەرکەوت کە جیهازەکانی ناو پەرلەمان بۆتە رەصدی تۆپباران و ناردنی مەعلومات لەسەر هێزەکانمان لە هەولێر و دەوروبەری. جیهازەکان موڵکی پەرلەمان نین، بەڵکو پاراستن (رێکخستنی

تـایبەتی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان – یەکگرتـو) لەوێ دایاننـاوە و بـۆ مەبەسـتی تـایبەتی بەکاریـدێنن، ئیمـڕۆ چـوینە لای جەوهەر نـامیق و داوامـان لێکـرد، کە دەبێـت جیهازەکـان و بەڵگەکـانم تەسـلیم بکـات بـۆ لێکـۆڵینەوە، لە ئەنجامدا جیهازەکە و دەفتەری بروسکەکانم هێنا کە بەڵگەی تەواوی تێدایە کە بۆ مەبەستی تایبەتی و کاروباری پاراستن بەکارهاتون، بۆ ئاگاداری بەڕێزتان هەر ئەمشەو بەڵگەکان لە تەلەفزیۆنی هەولێرەوە بڵاودەکەینەوە".

حسێن عـارف، وەک نوسـەرێکی ناسـراو و سـەربەخۆ، کە سـەر بە لیسـتی سـەوز بـو، لە بیرەوەریەکـانی خۆیـدا بەم شـێوەیە باسـی ئەم روداوە دەکـات: "چوین بۆ لای حاکم قـادرو، دانەیەکی کۆپیکراومـان لە دەفتەرەکە لێوەرگرت. ئەوسـا گەڕایـنەوە (م.س) و دەسـتمانکرد بە خوێنـدنەوەی یەکبەیەکـی بروسکەکانی نـاو دەفتەرەکە و سەرسامبوین!. چل و نۆ دانەیـان لە بـابەتی هەواڵگری (مخـابەراتی) بـون و لەنـاو تەلاری پەرلەمـانەوە، بـۆ خـودی بەڕێـز مەسـعود بـارزانی و سـەرکردایەتی پارتی نێردرابـون، ئەمەش بە ئاشـکرا وای دەگەیانـد کە فراکسـیۆنی زەرد پەنـاگیریەکەی، بـۆ کـاری هەواڵگـری لە بەرژەوەنـدی پـارتی بە گشـتی و، کۆششـی سـەربازی بە تـایبەتی بەکارهێناوە"[٣٧٥].

ئەم بروسـکەیە نمـونەیەکە لە چەنـد بروسـکەیەک کە لە دەفـتەری بروسکەکانی جیهازی سەرۆکی پەرلەماندا بوە و نوسیویانە:

" بۆ م.ب. (مەسعود بارزانی) ١٣٨ لە محمەد نوری

١٩-١٩٩٥/١/٢٠

ینک رۆژانە حسـاب ئەکـات لە رۆژنـامە و راگەیانـدن و پروپاگنـدەی نـاو جەمـاوەر و لایەنەکـان و دام و دەزگـای خێرخـواز کە ئەو دو رۆژە یـان سـێ رۆژە تەقە لە هەولێر نیە، ئـارامە تـاکو ئەو رادەیەی ئەمـرۆ سـتارفۆرد کلاری هەمان تەئکیدی کرد هەروەها قسەکانی (محەمەد زیجاری) لە دەنگی ئەمریکا

[٣٧٥] حسێن عارف، بیرەوەری، ب. ٢، ل ١٣٦.

کە تەئکید دەکا ئەم دو سێ رۆژە هەولێر هێمن و ئارامە، ئەم کش و ماتیە لە هەولێر، خەڵکی شاریش لەوەی لێی رابێت، ئیمرۆ حەرەکەتی بازار زۆرتر بوو، لەوەیە سبەی هێشتا زۆرتر بێت. نابێت ناو هەولێر ئارامی بەخۆیەوە ببینێت، ئەگەر هاتو ینک هەروا داگیرکەر بێت، کات گرنگە وەک ئەڵێن (الوقت کالسیف ذو حدیین)".

ئەمە دەردەخات کە کیتلەی زەرد، نەیانتوانیوە کارە میهەنیەکەی خۆیان ئەنجام بدەن و هەوڵ بدەن لە کێشە سیاسیەکانەوە نەگلێن و بەڵکو ببن بە هەوێنی ئاشتەوایی و وەک نوێنەرانی خەڵکی کوردستان هەوڵی کوژانەوەی شەڕی ناوخۆ بدەن، نەک ببن بە بەشێک لەو شەڕە قێزەونە، بەلام پەرلەمان و ئەنــدامەکانی وەک زۆربەی دەزگاکــانی تــری حکــومەت و دەرەوەی حکومەت بون بە بەشێک لەو ناکۆکیانە.

هاولاتیان چاوەڕێیان دەکرد کە هاتنی نەورۆز ببێت بە جەژنی خۆشی و کۆتای هێنانی شەڕی ناوخۆ، بەلام بە پێچەوانەوە، پارتی لە ١٩٩٥/٣/٢١ دا، هێرشیان کردە سەر شارۆچکەی پێنجوین و گرتیان و شەڕ تا ماوەیەکی زۆر لەوێ و لە دەوروپشــتی بەردەوام بــو، لە ئەنجامــدا پــارتی نەیتــوانی بەرگری لە خۆیان و مانەوەیان لە پێنجوین بکات و یەکێتی گرتیەوە.

لە ١٩٩٥/٣/٢٦ دا، هەریەک لە شــۆرش ئیســماعیل و جەبــار فەرمــان، دو بروسکە بۆ مام جەلال دەنێرن و دەنوسن، کە ئەوان لەناو شاری پێنجویندان و هێزەکەی پارتی کە زیاتر لە ٣٠٠ کەس بون، هەڵهاتون.

هەر لەو رۆژەدا، کە گەرمەی شــەڕ بــوە لە پێنجــوین، مــام جەلال لە بروســکەی ژمــارە ١٥٩٧ ی ١٩٩٥/٣/٢٦ بــۆ گشــت هێــزی پێشــمەرگەی کوردستان نوسیویێتی: "سەرکردایەتی (ی.ن.ک) بریاریدا، کە هەمو هێرش و پەلامارێکی پێشمەرگەی قارەمان بۆ سەر هێزەکانی پارتی لە سەعات ٧ ئەمــڕۆوە رابوەســتێنرێت، هەر تەنهــا دیفــاع بــکەن و بەرپەرچــی هێــرش

بدەنەوە".

ئەو بروسکەیەی مام جەلال، چەند سەعاتێکی نەخایاند و شەڕ دەستپێکردەوە و هیوای ئاشتی و هێمنی لە ئاسمانی کوردستان دورکەوتەوە و کۆسرەت رەسوڵ لە ١٩٩٥/٣/٢٧ دا لە بروسکەیەکدا بۆ مام جەلال دەنوسێت: "سەعات ٦ بەیانی، ئاشبەتاڵ لە میحوەرەکانی (کانی قرژاڵە، بەحرکە، پێرزین، شاوەیس، سێبەردان، گردجوتیار، کەرەک، کەسنەزان) هێرشیان کرد و لە هەمو قوڵەکانەوە شکان و شەڕ تاکو ئێستا بەردەوامە..".

شەڕ لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان بەردەوامبو، بەتایبەتیش لە دەوروپشتی هەولێر، پارتی چەندەهاجار هەوڵی ئەدا هەولێر بگرێت، بەڵام هیچ جارێک سەرکەوتنی بەدەست نەئەهێنا، لەم کاتانەدا، تورکیا هەنگاو بە هەنگاو ئەهاتە ناو کێشەکەوە و راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ یارمەتی پارتییان ئەدا و بە بیانوی ئەوەی کە هاتون بۆ تەفروتوناکردنی پارتی کرێکارانی کوردستان، لەم بارەیەوە رۆژنامەی (الحیاة) لە ژمارە ١١٧٢٦ ی ٣/٣٠ دا و لە ژێر ناونیشانی (سوپای تورکی خۆی ئامادە دەکات بۆ هێرشکردنە سەر ناوچەکانی تاڵەبانی) رۆژنامەکە باسی شەڕی خەستی پارتی و یەکێتی دەکات و لە زمانی وەزیری بەرگری تورکیاوە وەریگرتوە، کە چونیان بۆ ناو خاکی عێراق کاتیە و هەر کاتێ کە کارەکەیان کۆتایهات و بەسەر پارتی کرێکاراندا سەرکەوتن، ئەوا کاری ئەوانیش کۆتایدێت!.

## هاتنی سوپای تورکیا بۆ کوردستانی عێراق

له ۱۹۹٥/۳/۲۲، تورکیا به هێزێکی زۆری سەربازییەوه هاتنه ناو خاکی کوردستانەوه، ئەم هێرشه نازناوی (پۆلا) یان لێنا، "به بیانوی دابینکردنی ناوچەیەک که لەوێوه ئاسایشی تورکی بپارێزێن"، ولاتانی ئێران، سوریا و عێراق لەم هێرشه ئاگادارکران، سوپاکه له ناوچەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان مانەوه، هێرشیشیان هێنا بۆ هەندێ ناوچەی ژێر دەسەلاتی یەکێتی به بیانوی شەڕ دژی پارتی کرێکارانی کوردستان، ئیسرائیلیەکان ئەم هاتنەناوەیه، به هاتنی سوپای ئیسرائیل بۆ خواروی لوبنان دەشوبهێنن.

لەم هێرشەدا نزیکی ۲٥۰ هەزار سەرباز بەشداربون، هاتنه ناوەوەی ئەم سوپایه زۆری خایاند، ئێران و سوریا، دڵگرانی خۆیان دەربری و ئەمریکاش له ٤/۹ دا داوای کشانەوەی تورکیای کرد لەناو خاکی عێراقدا، ئەنقەره هەنگاو به هەنگاو سەربازەکانی کشانەوه و له ٤/۲٦ دا ۱۲ هەزار سەربازی کشانەوه و له ۱۹۹٥/٥/٥ دا کۆتایی به هێرشەکەی هێناو و هەمو سەربازەکانی کشانەوه"[۳٦۰].

## ناوبژییەکی نوێی ئێران

پارتی و یەکێتی بێ هاوکاری دەرەوه نەیانتوانیوه بگەنه رێکەوتنێکی کۆتایی (کورد بڕوای بەخۆی نیه که خۆی کێشەی خۆی چارەسەربکات) ئەگەر هێزێکی دەرەکی له پشتەوەو نەبێت، شەڕی یەکێتی و پارتی چەند ساڵی خایاند و نەتوانرا کۆتایی پێبێت، تا ئێران هەوڵی نەدا.

---

[۳٦۰] کوردنامه، گۆڤارێکی دەوری بو، تایبەت به به کێشەی کورد، به دو مانگ جارێک دەردەچو ژ. ۲ و ۳ تەموز و ئەیلولی ۱۹۹٥، سەرپرشتیار: نزار ئاغری- لەندەن.

دوای ئەوەی ئێران داوای لە یەکێتی و پارتی کرد کە پێکەوە دانیشن و ڕێکبکەون، نەوشیراون مستەفا بەم شێوەیە باس لەو ڕۆڵەی ئێران دەکات:

" ئەمڕۆ ١٩٩٥/٣/٢٦یەکەم دانیشتن لەگەڵ لایەنی ئێرانی دەستی پێکرد. نوێنەری ئێران لە قسەکانیدا چەند بابەتێکی دیاریکراوی باسکرد:

- ئێران ئەیەوێ بارودۆخی دراوسێکان ئارام بێ.
- هەردولا، یەکێتی و پارتی، دۆستی ئێرانن کوژرانی هێزەکانیان بە قازانجی دوژمنە.
- ئەگەر کێشەی زدی ئینقیلاب نەبێ ئێران نایەوێ پشێوی "ئیختیشاش" لە سەروی عێراقدا هەبێ.
- ئێران لە پارتیدا مەسعود بارزانی و لە یەکێتیدا جەلال تاڵەبانی ئەناسێ. ئەوانەی خوارەوە هەرچی بکەن ئێران هەر ئەوان بە لێپرسراو ئەزانێ.
- ئێران قبوڵ ناکا لایەک لایەکەی تر "حذف" بکا.
- جارێکی تریش ئەوەی دوبارەکردەوە، کە ئەگەر کێشەی داڵدەدانی زدی ئینقیلاب نەبێ، ئێران دەس وەر نادات کاروباری ناوخۆی کوردستان و خۆیان هەر شێوەیەکی حوکمڕانی حکومەتی کوردی یا فیدراڵی هەڵئەبژێرن، ئەوان دژی ناوەستن.
- ئەگەر بێتە سەر پارچە پارچە کردن، ئەوسا ئێران ڕەئی خۆی هەیە.
- دوای ڕاپەڕین یەکێتی خۆی بارەگا و بنەی لە ئێران پێچایەوە. ئێران لە هەڵبژاردندا یارمەتیدان و، داوای لێکردن پەیوەندی باشتر بکەن.

دوای سوپاسی میوانداری ئێمە پێخۆشحاڵی خۆمان دەربڕی بۆ ناوبژیوانیی ئێران. پێمان وتن هیچ مەرجێکی پێشەکی مان نیە بۆ گفتوگۆ لە گەڵ پارتی. ئامادەین بۆ باس و چارەسەرکردنی هەمو ناکۆکیەکان."

دوای ئەم گفتوگۆ و ئەم هەوڵەی ئێرانیش، ئاشتی هەر بەرقەرار نەبو، شەڕ بەردەوام بو، پارتی لە هەوڵی خۆی نەکەوتبو بۆ داگیرکردنی هەولێر.

گفتوگۆی نێوان پارتی و یەکێتی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، ئامانجی

بەدیهێنانی ئاشتی نەئەپێکا، نەوشیروان مستافا لە ١٩٩٥/٤/٦ بروسکەیەکی بۆ مام جەلال ناردوە دەربارەی گفتوگۆ لەگەڵ پارتی و بەم شێوەیە باسی دەکات: "کۆبونەوەکان سودیان نەبو، چونکە پارتی هەر سورە لە سەر چۆڵکردنی هەولێر لە یەکێتی و هەمو هێزەکان بەماڵەکەی جەنابت و مەکتەبی سیاسی و هەمو مەقەڕەکانەوە. پێشمەرگەی لایەنی سێیەم حەراسەت لە مەقەرات و مەسئولەکان بگرێت، واتە چەکداری موع و بەرە. رازی نابن هیچ چەکدارێکی یەکێتی تێدا بمێنێ تاکو ئێستا ئامادە نین باسی راگرتنی شەڕ و گومرگ و پێکهێنانەوەی حکومەت بکەن، ئەگەر وا بڕوا گفتوگۆ بە شکان تەواو ئەبێ".

بەلام لە هەمان رۆژدا ١٩٩٥/٤/٦، کارگێڕی حیزبە کوردستانیەکان، بروسکەیەکیان بۆ مام جەلال ناردوە، دەربارەی چونیان بۆ لای مەسعود بارزانی و نوسیویانە: "ئیمرۆ ٤/٦ لە کاتی سەردانماندا بۆ لای کاک مەسعود بارزانی بەڵێنی دا، کە هودنەیەک دەست پێ بکات بۆ ماوەی ١٥ رۆژ، لە سەعات ١٢ هەینی رۆژی ٤/٨ وە قابیلی تازەکردنەوەش بێت لە کاتێکدا کە هەنگاوی ئیجابی بەرەوە ئاشتی بنرێت. تەفاصیلی ئەم هەنگاوە لەگەڵ راگرتنی ئینتیهاکات و بەرەلاکردنی دیلەکانی هەرولا زیاتر هێورکردنەوەی راگەیاندنی هەردولا هاوئاهەنگ بن. لەگەڵ برادەرانی (م.س) ی ئێوە ئەم مەسەلەیەمان باسکرد، هەڵوێستیان ئیجابی بو، جا هەنگاونان بەرەو ئاشتی و بە ئاکام گەیاندنی پرۆژەکەمان چاوەڕێی بیروڕا و هەنگاوی ئیجابی جەنابتین، هەروەک لێتان رادەبینین".

لە وەلامی ئەم بروسکەیە، مام جەلال بەم شێوەیە وەلامی داونەتەوە: "١- زۆر باشە منیش رازیم بە هدنەکە. ٢- بەیانی هەینی ٤/٧ ئێمە ئامادەین بۆ راگرتنی و رازیشین کە ئێوە بە ناوی ئێمەوە رایگەیەنن".

شەڕ تەنها بەرەکانی پێکدادانی نەگرتبۆوە، هیچ بوارێک نەبوە، کە دوربێت لە شەڕەوە، پریشکی شەڕ هەمو بوارەکانی ژیانی گرتبۆوە، دەزگا جیاوازەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، ناچار دەبون راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ پشتگیری ئەو لایەنە بکەن، کە ئەوان لێی دەژیان، هەتا ئەم پشتگیریە مزگەوت و وتاری رۆژانی هەینیشی گرتبۆوە و هەر مەلایەک لە شوێنی

خۆیەوە بەرگری لە حیزبەکەی خۆی دەکرد و هێرشی توندی دەکردە سەر ئەوەی تر و بە مونافیق و کافری ئەدایە قەڵەم.

## هەوڵێکی تری ئەمەریکا

لە ١٩٩٥/٢/٨، دایڤیت لیت، لێپرسراوی بەشی کەنداو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، کە چەند جارێک سەردانی کوردستانی کردبو لە سیمینارێکدا لە (دامەزراوەی واشنتون بۆ سیاسەتی رۆژهەلاتی ناوەراست) وتارێکی دەربارەی هەوڵی ئەمریکا بۆ هێنانە کایەی ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی پێشکەش کرد و گوتی: "لە ساڵی ١٩٩٢ دا، INC دروست بو، هەردو یەکێتی و پارتی لە دامەزرێنەرانی بون، ئەو تەرتیب و رێکەوتنە سیاسیەی کوردەکان لە نێوان خۆیاندا سازیان کردبو، لە کۆتایی ١٩٩٣ بەرەو لاوازی و خراپی دەرۆشت، لە مانگی دیسیمبەری ئەو ساڵەدا شەڕ هەڵگیرسا، چەندین وەساتەت و رێکەوتن نەی توانی کە شەڕەکان لە ١٩٩٤ دا بوەستێنێت. کەم بێ باوەڕی لە نێو سەرکردەکاندا گەشەی دەکرد و هەروەهاش پەیوەندیاکانی نێوانیان بەرەو خراپی دەچوو، ئیتر ئامانجە گەورەکانیان لەبەرچاو نەما و خەریکی یەکتربون. لەو ساڵەدا وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا چەندین نامەی بۆ ناردون: شەڕ راگرن و کێشەکان بە ئاشتییانە چارەسەر بکەن، ئێمە پێمان راگەیاندبون کە ئێمە ناکەوینە بەینیانەوە و پشتگیری لایەکیشیان ناکەین. تەئسیر و تەقەلامان بۆ ماوەیەکی کورت بوو، بێ باوەڕی زیادی دەکرد و شەڕ هەڵگیرسایەوە.."[٣٧٧].

ئەمە بۆچونی نوێنەری گەورەترین هێزی دنیایە لەسەر کێشەی کورد، لەبەرئەوە نە شەڕەکە شەڕعی بوە، نە هەوڵدان بۆ ئارامی و ئاشتی زۆر کاریگەربوە، هەردو هێزەکە لە نێوان ئاشتی و شەڕدا شەڕیان هەڵبژارد!.

---

[٣٧٧] ئاسۆ و گرفتەکان، گۆرینی لە ئینگلیزیەوە، مەڵبەندی دەرەوەی یەکێتی، ١٩٩٥/٢/١٤.

ئاسانترین ڕێگا بۆ دەستێوەردانی دەرەکی لە کاروباری ناوخۆی کوردستاندا، ئەو کاتانەیە کە شەڕی ناوخۆ لە ئارادایە و هەرلایەک هەوڵ ئەدا دۆست بۆ خۆی ڕاکێشێت و شەرعیەت بدات بەو شەڕەی کە دەیکات. تورکیا باشترین هەلی بۆ ڕەخسابو کە دەستێوەردان بکات لە کاروباری ناوخۆی کوردستاندا، لەو بارەیەوە ڕۆژنامەی (حورییەت)ی تورکی لە ١٩٩٥/٤/٧ وتارێکی بە پێنوسی سلین جاغلیان نوسیوە و دەڵێت: "بارزانی دەڵێت من لەگەڵ تاڵەبانی هاوکاری ناکەم، پرۆژەی ئاسایشی سنوری توکیا بە هاوکاری بارزانی و تاڵەبانی بە ئاسانی سەرکەوتو نابێت، ئەمە بارزانی بە وەفدی وەزارەتی دەرەوەی تورکی وت لە کاتی سەردانیاند بۆلای ئەو و لێکۆڵینەوە لە بارودۆخەکە، (ئێمە دەسەلاتمان لەسەر سنور هەیە، لێرە لەگەڵ تاڵەبانی هاوکاری ناکەم) لەسەرئەوە ڕێکەوتن کە بارزانی بە تەنها، ئاسایشی سنور بپارێزێت، وە تاڵەبانیش بەرپرسە لەوەی کە نابێت ڕێگا بە بە پارتی کرێکاران بدات لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئەودا نیشتەجێ ببن. سەرۆکی وەفدی تورکی جەنگ دوعا تەبە گوتی: بارزانی بانگکراوە بۆ ئەنقەرە بۆ مەسەلەی پارێزگاری سنور، تاڵەبانیش هەرکاتێک ویستی ئەتوانێت بێت"[٣٧٨].

دەربارەی پەیوەندی پارتی و یەکێتی، مام جەلال لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا و دەربارەی (سیقە) لە نێوان خۆی و مەسعود بارزانی یاخود یەکێتی و پارتی دەڵێ: "..وا هەست دەکەم، کە سیقە لە نێوانماندا نیە، ئەمە لەسەرەوە بۆ خوارەوەیە، من خۆم سیقەم بە هێزی بەرامبەر نەماوە، ئەمە لە کاتێکدا، کە مەسعود بارزانی بە قسەو بە نوسین بەڵێنی دامێ کە هەندی کاری گرنگ بە ئەنجام بگەیەنێ، بەڵام نەیکرد، بۆ نمونە داهاتی ئیبراهیم خەلیل و دەستگرتن بەسەر شەقلاوەدا. منیش بەڵێنی ئاساییکردنەوەم لە سلێمانیدا (دوای شەڕی هاوینی ڕابوردو) بەرامبەر بەوە مەسعود بارزانی بەڵێنیدا کە چارەسەری کێشەی ئیبراهیم خەلیل بکات، بەڵێنی دامێ کە من

---

[٣٧٨] ڕۆژنامەی تورکی (حرییەت)ی ١٩٩٥/٤/٧.

توشی ئیحراجی نەبم لای هاوڕێیانم لەسەرکردایەتی یەکێتی..[379] .

هەر دەربارەی رۆڵی تورکیا و هاتنە ناوەوەی هێزی سەربازی تورکی بۆ ناو خاکی کورستان، مەسعود بارزانی لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا دەڵێ: "من بڕوام بە ئاشتی لە نێوان پارتی و یەکێتیدا هەیە، ئێمە هەوڵی ئاگربەست نادەین، بەڵکو هەوڵی ئاشتی ئەدەین. چوڵکردنی هەولێر، کلیلی ئاشتیە...ئێمە بە هیچ جۆرێک لەگەڵ هاتنە ناوەوەی هێزی سەربازی تورکی نین و ئاگادار نەکراوین، بەڵکو کتوپڕ بو بۆ ئێمە کە مودەرەعەی تورکی لە سنوری خاپورەوە هاتنە ناوەوە، ئێمە تورکیا و پارتی کرێکارانمان ئاگادارکردۆتەوە، کە کێشەکانی خۆیان نەهێننە ناو خاکی ئێمەوە، ئێستاش دەڵێین کە پێویستە هێزی هەردولا بکشێنەوە و کێشەکانیان لای ئێمە چارەسەر نەکەن."[380].

بە پێچەوانەی ئەم وتانەی مەسعود بارزانی، رۆژنامەی (حوریەت)ی تورکی لە ١٩٩٥/٣/٢٢ دا دەنوسێت: "دوێنێ لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیراندا، دودڵیەک هەمو، کە ئایە پارتی کرێکاران، ئاگاداری هێرشەکەی ئێمە (تورکیا) بوە، یان نەبوە؟ تانسو چیلەر دەربارەی ئەو دودڵیە وتی: (ئێمە بارزانیمان پێش هێرشەکە بە ماوەیەک ئاگادارکردۆتەوە، بەلام تاڵەبانیمان لە کاتی هێرشەکەدا ئاگادارکردوە)" دو بۆچون، نازانرێت کامیان راست بو؟

هەر دەربارەی رۆڵی تورکیا، کە هێزەکانی لەناو خاکی عێراق و سەر سنوری تورکیا دانابو بە مەبەستی دژایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان، رۆژنامەیەکی ئەڵمانی لەو بارەیەوە لەژێرناوی (بێ سەرکەوتنێکی سەربازی ئاشکرا- تورکیا لە ترسی فشاری دەرەوە ناکشێتەوە، بەڵکو لە ترسی شەڕی پارتیزانی) دەنوسێت: "بارزانی دەستی بەسەر سنوری عێراقی- تورکیدا گرتوە لە پردی خابور، کارمەندەکانی بارزانی رۆژانە نزیکی ١٤٠ هەزار مارک گومرگ وەردەگرن، ئەم پارەیە بۆتە هۆی کێشەیەکی هەمیشەیی لە

[379] (الحیاة)ی ١٩٩٥/٤/٩ ژمارە ١١٧٣٦.

[380] (الحیاة)ی ١٩٩٥/٤/١١ ژمارە ١١٧٣٨.

نێوان هێزە کوردیەکاندا لەسەروی عێراق. تاڵەبانی و یەکێتی نیشتیمانی داوا دەکەن، بەشێکی دیاریان هەبێت لەو داهاتە..تورکیا بە هیچ جۆرێک خوشحاڵ نیە بەسەرکەوتنی تاقیکردنەوەی کوردەکان لە بواری خۆبەڕێوەبردندا لەسەروی عێراق، زیاتر پێیان خۆشە کە دەسەلاتی عێراق بگەڕێتەوە سەر سنورەکان. کوردەکان لە نێوان دو حاڵەتدان، یەکێکیان دەزانن کە هیچ کاتێ تورکیا هاوکاری ئۆتۆنۆمی کوردەکان ناکات، لە حاڵەتی دوهەمدا، پێویستی زۆریان بە تورکیا هەیە، لەبەرئەوەی هەمو هاوکاریەکان لە تورکیاوە بەسەر پردی خابوردا دێت و دوهەمیشیان، بارەگای ئاسمانی هاوپەیمانان لە خواروی رۆژهەلاتی تورکیایە (ئینج راليک)ە کە کوردەکان لە هێرشی سەدام حسێن دەپارێزێت، ئەگەر ئەنقەرە سنورەکە و ئینج رالیک دابخات، ئەوە کۆتایی تاقیکردنەوەی خودموختاری کوردەکان ئەبێت"[٣٨١].

ئەمریکا و بەریتانیا، هەوڵی چڕیان ئەدا بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕی ناوخۆی کوردی، هەردو ولات بە بەردەوامی لە پەیوەندیدا بون لەگەڵ هەردو هێزەکە و ناوبەناو سەردانی کوردستانیان دەکرد، لە ١٩٩٥/٦/٢٩ دا مام جەلال لە قەلاچوالان پێشوازی لە وەفدێکی بەریتانی کرد، کە پێکهاتوە لە فرانک بەیکەر سکرتێری یەکەمی سەفارەتەکەیان لە ئەنقەرە و، گرام واین، لێپرسراوی کاروباری عێراق لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا و دوای دو رۆژی تر مام جەلال چاوی کەوت بە وەفدێکی ئەمریکی کە پێکهاتبو لە رۆبێرت دۆیچ، بەڕێوەبەری سەروی کەنداو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، سوزان فۆند راوێژکاری سیاسی بنکەی ئینج رالیک، دمیول دین سکرتێری یەکەمی سەفارەتی ئەمەریکی لە ئەنقەرە. هەر هەمو ئەو سەردانانە هەوڵ بون بۆ لێک تێگەیشتن لە نێوان هەردولای کوردیدا و خۆ ئامادەکردن بۆ کۆبونەوەیەکی هاوبەش لە نێوان هەدولادا.

---

[٣٨١] (Der Tagesspiege) ٢٨/٤/١٩٩٥

پەرلەمانی کوردستان و درێژکردنەوەی وادەکەی کێشەیەک بو، هەردولا ڕێکەوتن و لە گوندی (دارەبەن) لە ٥/٢٧ دا بە ئامادەبونی حەفتاویەک ئەندام بڕیاریاندا کە کاری پەرلەمان بۆ یەک ساڵ درێژ بکەنەوە و هەمو کۆبونەوەکە و بڕیارەکان تەنها یەک چارەک سەعاتی خایاند.

لەسەرەتای مانگی ئابدا، شەڕی لە ناو رەواندز و دەوروبەری گەرمبو، لەبەرئەوەی شاری رەواندز لەژێر دەسەڵاتی یەکێتیدا بو، پارتی رۆژانە ئەوێ و دەوروپشتی تۆپباران دەکرد و لە ئەنجامدا جگە لە زیانی گیانی، زیانی مادی زۆریشی لێدەکەوتەوە.

زۆر کەس بۆیەکەمجار ناوی هەندێ شاخ و دۆڵ و ناوچەی لە دەزگای ڕاگەیاندنەکانەوە بەرگوێ دەکەوت کە گۆڕەپانی شەڕ بون و لایەک لە لاکان "سەرکەوتن"ی گەورەیان بەدەستدەهێناو و ژمارەیەکی زۆر لە "دوژمن" دەکوژران! ئەمەیە تراجیدیای شەڕی ناوخۆ بو، کە کۆمەڵێک زاراوەی ناشیرینی شەڕی دژ بەیەکی هێنایە ناو فەرهەنگی کوردییەوە.

لە ١٩٩٥/٦/٨، یەکێتی پرۆژەیەکی لە ژێر ناوی ( پرۆژەی ئاشتی بۆ کوردستانی عێراق) پێشکەشکرد و هەردوای دورۆژ لە ١٩٩٥/٦/١٠ پارتیش پرۆژەیەکی هاوشێوەی پێشکەشکرد (پرۆژەی پارتی دیموکراتی کوردستانی- یەکگرتو بۆ وەستانی شەڕ و هانینەکاییەی ئاشتی لە کوردستان)، لەبەر بێ متمانەی لە نێوان هەردو هێزەکەدا، هەردوپرۆژەکە بە مردویی هاتنە دنیاوە.

مام جەلال لە رۆڵی حەوت حیزبەکە تورە دەبێت و لە ٧/١١ دا بروسکەی ژمارە ٢١٩٦ یان بۆ دەنێرێت " بەراستی چیتر هەقی ناوبژێتان نیە، بەڵکو هەقی اعلانی وەلای خۆتان بۆ پارتی بکەن و من بەش بە حاڵی خۆم چیتر گوێ لە رەئی و پێشنیاری ئێوە ناگرم، تکام وایە هیچم بۆ نەنێرن"

بەڵام ئەوان بەردەوام بون و نوێنەرانی هەر حەوتیان، جارێکی تر هەوڵیاندا کە ئاوێک بەو ئاگرەدا بکەن ئەو شەڕە نەگریسە بکوژێننەوە، لە ١٩٩٥/٧/٣ ئەوان یاداشتێکیاندا بە یەکێتی و پارتی بۆ کۆتاییهێنانی شەڕ و

ناوەڕۆکەکەی وەک زۆربەی یادەشتەکانی تر وابو، کە لە ماوەی پێنج رۆژدا خاڵەکانی جێبەجێ بکەن، ئەویش بریتی بون لە وەستانی شەڕی راگەیاندن تا کشانەوەی هێزەکانی نزیک بەیەک و وەستانی شەڕ لە هەمو ناوچەکان. مەکتەبی سیاسی یەکێتی لە ١٩٩٥/٧/٦ دا وەڵامی یاداشتەکەیانیان دایەوە و نوسیبویان: "هەموی پێکەوە، بێ پچڕ پچڕ کردن، پەسەندە بەلامانەوە".

ئەم هەوڵەی هێزەکوردستانییەکان، وەک زۆربەی هەوڵەکانی تر، بێ ئەنجام بو، هێزی ناوچەی شەقڵاوەی یەکێتی لە بروسکەیەکی رۆژی ١٩٩٥/٧/٦ دا ئەنوسن: "هێزەکانی پارتی لە میحوەری چیای سەفین و شەقڵاوە بە بەردەوامی بۆ ماوەی ٣ رۆژە بۆردومانی سەنگەرەکانی پێشمەرگەکانی یەکێتی دەکەن لە کلاوقاسم..".

لەو رۆژانە، یەکێتی هێرشی کردە سەر هێزەکانی پارتی لە ناوچەی رەواندز، باڵەک، پشدەر، سەفین و خەلیفان. شەڕ لە زۆربەی بەرەکان گەرم بون و هەردولاش (سەرکەوتنی) گەورەیان بەسەر"دوژمن"دا تۆمار کردا!

تورکیا هەمو هەوڵێکی ئەدا کە جێ پەنجەی لە کوردستاندا دیاربێت و کاریگەری دیاری هەبێت لەسەر هێزە کوردییەکان، لەم بارەیەوە، رۆژنامەی (جمهوریەت)ی تورکی لە ١٩٩٥/٧/٢٦ دا بە پێنوسی رۆژنامەنوس لالە ئیبراهیم ئۆغلو دەنوسێت: "پارتی و یەکێتی پرۆژەیەکیان داوە بە تورکیا، کە چۆن ئارامی سنورەکان لە دژی پارتی کرێکاران دەپارێزن، بە ناواقعی دایانە قەڵەم، دوای ئارامییەک لە نێوان هەردو لادا، ئێستا شەڕ دەستپێکردۆتەوە و تورکیا هەندێ پێشنیازی پێشکەشکردون دەربارەی بارودۆخی ئاسایشی سنورەکان.

پارتی داوای لە تورکیا کردوە، کە موچەی ٢٠ هەزار پێشمەرگەیان بۆ سەرف بکات، ئەوەش بۆ پارێزگاری سنورەکان و هاوکارییان بکات بۆ دروستکردنی ٢٥٠ دێهات لەسەر سنور، پارتی لەو بڕوایەدایە، کە ئەم کارانە، سنورێک بۆ مانەوەی پارتی کرێکارانی کوردستان لەو ناوچەیە دائەنێت،

ئەنقەرە یارمەتی پێشمەرگەیداوە بە چەک دوای ١٩٩٢، بەڵام ئێستا بیر لەوە ناکرێتەوە کە یارمەتیان بدات، چونکە دژ بەیەک بەکاری دەهێنن...".

شەڕ ناوبەناو هێمن دەبۆوە، بەڵام خواستی شەڕ و جەوی شەڕ لەباربو، زۆرجار تەقاندنی فیشەکێک ئەبوە هۆی هەڵگیرسانی شەڕێکی ناوچەیی یان سەرانسەری. میحوەری ڕەواندز لە بروسکەیەکی ڕۆژی ١٩٩٥/٧/٢ دەنوسن: "موقف تاکو ئێستا لە صالحی خۆمانە، لە هەمو جەبهەکانی (هەندرێن، کاولوکان، ڕەش مالوک، بێخاڵ) لە هەموی شکاون و کوژراویان زۆرە، مەعنەویاتی خۆشمان بەرزە، حەوت شەهیدمان هەیە لەگەڵ ٣٠ بریندار، بەڵام لەبەر فراوانی جەبهەکە، زیانەکانی دوژمن نازانین..". لە تاکە شەڕێکدا، حەوت شەهید و ٣٠ بریندار بدەیت و بە سەرکەوتنی بزانیت.!.

هەر بە هەمان ناوەڕۆک، مستەفای سەید قادر لە بروسکەیەکدا بۆ کوسرەت ڕەسول لە ١٩٩٥/٧/٣ دەنوسێت: "هێزەکانمان وەزعیان زۆر زۆر باشە، دیارە پاش ئەو شکستە هیچیان پێناکرێ، لە هەمو قوڵەکان خراپ شکاون، تەنها تۆپ و راجیمە بۆ ناو شار هەیە. تاکو ئێستا ٧ شەهید و بریندارمان هەیە، لەگەڵ شەهیدێکی مەدەنی لەگەڵ منداڵێک".

## هەرلایە خۆی بە ڕاست و سەرکەوتو دەزانێت

سەرەرای دژواری شەڕ، وڵاتانی ئەروپا، ئەمەریکا، ئێران و تورکیا، هەریەکە بە مەبەستێک هەوڵیانداوە کە شەڕەکە بوەستێنن، شەڕەکە نەوەستا، لە هامانکاتدا خواستی جدی بۆ وەستانی هەمیشەیی شەڕیش، لە ئارادا نەبوە.

مەسعود بارزانی لە ١٩٩٥/٧/٢٥ بە بروسکەی ژمارە ١٥٩ بۆ (م.س)، گشت میحوەرەکان، گشت لق و ناوچەکان، دەنوسێت: "دام و دەزگاکانی (ی.ن.ک) بۆ پروپاگندەی خۆی بە شێوەیەکی دور لە تقالیدی دبلۆماسیەت، هەندێ تەقەلای وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بڵاوکردۆتەوە، هەر بۆ ئەم مەبەستە بە پێویستی ئەزانین، ئەم خاڵانە رون بکەینەوە:

١. لە مانگی کانونی دوهەم و لە مانگی حوزەیران و لەم رۆژانەشدا، وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هەوڵی جدی داوە بۆ راگرتنی شەڕ و چارەسەری ئاشتیانەی سیاسی کێشەکە.

٢. ئەمریکا دەیەوێت شەڕ رابگرێت.

٣. بەڵێنی داوە کە زامنی بەردەوام بونی ئاشتی هەبێت.

٤. داوای ئەوەی کردوە هەردولا لە دەرەوەی وڵات و لەژێر سەرپەرشتی ئەمریکا دابنیشن بۆ دۆزینەوەی چارەسەریٚ.

٥. سەرەڕای هەوڵ و داخوازی ئەمریکا، سەرانی (ی.ن. ک) بەردەوام بون لە شکاندنی هودنە.

٦. وەڵامی پارتی بۆ پێشنیاری ئەمریکا ئەمەیە: أ. دەستنیشان بکرێت چ لایەنێک شەوی ٨-١٩٩٥/٧/٩ هودنەی شکاندوە، ئیدانە بکرێت. ب. پێش هەمو شتێک چارەسەری شاری هەولێر و کشانەوەی چەکدارەکان و چوڵکردنی، کلیلی چارەسەرکردنی کێشەکەیە و ئەمریکا زامنی تەواوی چارەسەری بێت.

٧. بەم بۆنەیەوە، لە گشت (ب.م) و فەرماندەی میحوەرەکان داوا دەکەین، وریا و هوشیار بن، حاڵەتی شەڕ بەردەوامە، سەرانی یەکێتی بە هیچ شێوەیەک جێگای متمانە نین، ئەمجارە ئەوان لەم رۆژانەدا هەوڵی زۆریان داوە و هێرشیان هێناوە و شکاون و بەردەوام دەبن لە هەوڵدان و گرتنی (خاک) بۆ ئەوەی بە حیسابی خۆیان لە مەوقیفی قوەتەوە داخڵی گفتوگۆ ببن کە ئەمریکا دەیەوێت. هەربۆیەشە لە (پ.م) ئازاکانمان داوا دەکەین کە هەمیشە کە لە سەنگەری بەرگری و شکاندنی جەلالیە دۆڕاوەکان و خەبات و کۆڵنەدان و وریا و هوشیاربن.

لەم کاتاندا، (م.س) یەکێتی لە ١٩٩٥/٧/٢٨ بەیانێکی دەرکرد و وەڵامی بەیانامەیەکی پارتی بوە، کە ٣ رۆژ پێش ئەوە دەریکردبو.

دەربارەی زیانەکانی شەڕی ناوخۆ، مام جەلال بە درێژی لە

چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەنوسی عێراقی عەدنان حسێن دەڵێ: "ئێمە زۆر بەباشی زیانەکانی شەڕی ناوخۆ دەزانین، کە ئەو شەڕە کاریگەری لەسەر باوەڕی هاولاتیان بە خەبات هەیە، ئەوان وا دەخوازن کە کورد ئەتوانێت کێشە ناوخۆییەکانی خۆی چارەسەر بکات و کاریگەری خراپی لەسەر پەیوەندی کۆمەلایەتی نێوان هاولاتیان هەیە و زیان بە حکومەتی هەرێم دەگەیەنێت و پرۆژەکانی دوادەخات و ئەیانوەستێنێت، ئەو شەڕە لە بەرژەوەندی دوژمنانی کوردە کە هەمیشە دەیان ویست مەسەلەکەی وەک مەسەلەیەکی ناڕەوا و وەک کۆمەڵێک کەسانی دژ بە دەوڵەت بدەنە قەڵەم، نەک وەک مەسەلەیەکی میللی ڕەوا، ئەم شەڕە دەرگای هاتنە ناوەوەی ولاتانی ناوچەکە بۆ کوردستان دەکاتەوە، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی زیانی گەورە بە بەرژەوەندی مەسەلەی کورد دەگەیەنێت، چونکە چاودێران لە دورەوە، جیاوازی لە نێوان ئەودا ناکەن، کێ هێرش دەکات و کێ هێرشی کراوەتە سەر، ئەوان سەیری ئەوە دەکەن، کە کوردەکان لەناو خۆیاندا شەڕی یەکتر دەکەن، بۆچونێک لایان دروستدەبێت کە کورد ناتوانێت کاروباری خۆی بەرێت بەرێوە، هەروەها پێشێلکردنی مافی مرۆڤ کە لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆ دێتە ئاراوە، زیان بە کێشەی کورد لە دەرەوە دەگەیەنێت، چونکە خەباتی کورد لەسەر دو پرنسیپ دارێژراوە، مافی چارەنوس و دیموکراتیەت و پاراستنی مافی مرۆڤ، کاتێک کورد خۆی ئەم پرنسیپانە ڕەچاو ناکات، زیان بە داخوازیەکانی خۆی دەگەیەنێت"[٣٨٢].

مام جەلال زۆر بە ڕاشکاوانە زیانەکانی شەڕی ناوخۆی باسکردوە، ئەم باسە ئەوەندە ڕاستە، کە لەوە ناچێت بۆچونی کەسایەتییەک بێت، کە سەرکردەی یەکێکە لە هێزەسیاسیە سەرەکییەکانی شەڕی ناوخۆ بێت.

---

[٣٨٢] (الشرق الاوسط)ی ژمارە ٦٠٩٩ ی ١٩٩٥/٨/١٠.

# کۆبونەوەی ئاشتی لە ئیرلەندا

هەوڵێکی گرنگ بە سەرپەرشتی ئەمەریکا نرا بۆ ئاشتەوایی نێوان پارتی و یەکێتی، ئەمجارە دانیشتنەکە لە ئێرلەندا ئەنجامدرا، نەوشیروان مستەفا، سەرۆکی تیمی یەکێتی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ پارتی بەم شێوەیە باسی کۆبونەوەکە دەکات:

"لە ۱۹۹۵/۸/۹ دا لە لەندەنەوە چوینە ئیرلەندا، ئەو شوێنەی دانراوە لێی کۆبینەوە ئوتێلێکە لە شارێکی بچوک ناوی درۆگێدایە نزیکی دبلنی پایتەختە. دەزگاکانی راگەیاندن هەواڵی کۆبونەوەکە و ناوی شوێنەکەیان بڵاوکردۆتەوە. چەندین رۆژنامەوان بۆ سۆراخی هەواڵەکان هاتون، لەوانە تیمێکی "ئۆیرۆ نیوز".

تیمەکانی گفتوگۆ و ناوبژی و چاودێری پێکهاتون لە:

یەکێتی: د فوئاد مەعسوم، د بەرهەم ساڵح، سەعدی ئەحمەد پیرە، من.

پارتی: سامی عەبدورەحمان، جەوهەر نامیق، هوشیار زێباری، موحسین دزەیی.

وەفدی ئەمەریکی بۆ ناوبژی: رۆبێرت دۆیچ، ستیفن گرومۆن، بروس جۆنسۆن، سۆزان ماک کرۆمیک.

وەفدی تورکی بۆ چاودێری: ئیگۆر دۆغان، محەمەد ئەیمور، ئەجوەد تەزجان.

وەفدی موئتەمەر بۆ چاودێری: د. ئەحمەد چەلەبی، هانی فوکێکی، توفیق یاسری، نەبیل موسەوی.

هەمان رۆژ کۆبونەوە دەستپێکرد. بابەتەکانی ئەبو باس بکرێن:

١. چەکداماڵینی هەولێر.

٢. گێڕانەوەی داهاتەکان بۆ حکومەت.

٣. بە گەڕ خستنەوەی پەرلەمان و پێکهێنانی کابینەیەکی نوێ.

لە ڕۆژانی ٩ ی ئاب تا ١١ی ئاب گفتوگۆ بەردەوام بو بێ ئەوەی بگەینە هیچ ئەنجامێکی دیاریکراو، چونکە نوێنەرایەتی پارتی چۆڵکردنی بێ قەید و شەرتی شاری هەولێریان کرد بو بە مەرجی پێشەکی بۆ هەر باسێکی تر. ئامادە نەبون هیچ جۆرە سازشێ لەسەر دەروازەی ئیبراهیم خەلیل - خابور بکەن.

لە کۆبونەوەکەدا بوین، هەواڵ هات حسێن کامیل و برایەکی و دو کچی سەدام رایان کردوە بۆ ئوردون داوای مافی پەنابەریان کردوە. پاشان بو بە لێدوان کە ئاخۆ هەڵوێستی موعارەزەی عێراقی ئەبێ چی بێ لەم کابرایە: بەخێرهێنان یان ئافەرۆزکردن؟

ئەم خولەی گفتوگۆکان بە ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەیەک تەواو بو بە ناونیشانی "ڕاگەیاندنی سەرەتاکان" کە چوارچێوەی گشتی ناکۆکیەکانی باس کردوە بە هیوای ئەوەی لە خولی دوەمی گفتوگۆکاندا لە وردەکاریەکانی بدوێن و لە سەریرێک بکەون و میکانیزمی جێبەجێکردنی دابنێین. ئینجا هەردو سەرکردە پێکەوە دابنیشن بۆ ئیمزاکردنی. دەقی ڕاگەیاندنەکە.

هەردولا بەڵێنیاندا بۆ ڕاگرتنی ئاگربەست و کردنی بە هەمیشەیی. ڕێککەوتن هێرشی ڕاگەیاندن ڕابگرن، ڕێزی مافەکانی لایەنگرانی یەکتری بگرن و هەمو گیراوەکانی کە لە ڕوداوەکانی ئەم دواییانەدا لە لایەن حیزبەکانەوە گیراون بەربدرێن.

(پ د ک) و (ی ن ک) پێکهاتن درێژە بە گفتوگۆ بدەن بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتنی ئاشتی. بابەتەکانی ڕێککەوتنی ئاشتی ئەم خاڵانە ئەگرێتەوە:

- چەکداماڵینی هەولێر.

کەمکردنەوەی هێزەکانی دەوری هەولێر و کۆکردنەوەیان لە چەند بنکەیەکدا کە لە سەری پێکدێن.

- لە دوای ٤٨ سەعات لە ڕاوەستاندنی چەکداماڵینی هەولێر کۆکردنەوەی هەمو ئەو داهاتانەی لە لایەن حیزبەکانەوە کۆکراونەتەوە، بە سەرپەرشتی

هەیئەتی بێلایەن و دانانی لە حسابی بانقی دا بە ناوی دەسەڵاتی هەرێمەوە.

- حسابکردنی هەمو ئەو داهاتانەی کە لە ١ ی مایسی ١٩٩٤ەوە لە ژێر دەستی حیزبەکاندا بوە.

- گێڕانەوەی شەرعیەت بۆ دەسەلاتی هەرێم لە رێی بە گەڕخستنەوەی پارلەمانی هەرێمی هەڵبژێردراوەوە لە ماوەی ٤٨ سەعات لە راستاندنی چەکداماڵینی هەولێرەوە.

- کارکردنی خێرای پەرلەمانی هەرێم بۆ پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتیەکی نوێی خاوەن بنکەیەکی فراون بۆ پارێزگاکانی باکور کە حیزبەکانی تر و کۆمەڵگە ئیثنیەکانی تێدا بێ.

- هەمو ئەو خاڵانە ئەبێ لە چوارچێوەی یەکێتی ئەرزی عێراقدا جێبەجێ بکرێن.

- ئەم خاڵانە نیگەرانیە رەواکانی ئاسایشی تورکیا رەچاو ئەکا.

١١ی ئابی١٩٩٥

درۆگیدا - ئیرلاندا"

## خولی دوەم کۆبونەوەی ئیرلەندا: (١٢- ١٩٩٥/٩/١٥)

١٢ی ١٩٩٥/٩:

گەیشتینە دبلن، پایتەختی کۆماری ئیرلاندا.

پاشنیوەڕۆی هەمان رۆژ کۆبونەوەکان دەستیان پێکرد.

وەفدەکان هەمان وەفدەکانی پێشون و بەرنامەی کاری کۆبونەوەکانیش هەمان خاڵەکانی کۆبونەوەکانی پێشون:

١. چەکداماڵینی هەولێر.

٢. گێڕانەوەی داهاتەکان بۆ حکومەت.

٣. بە گەڕ خستنەوەی پارلەمان و پێکهێنانی کابینەیەکی نوێ.

١. چەکدامالینی هەولێر

پارتی داوای ئەکرد:

- بۆ هەر لایەک تەنیا ٣ بارەگا لە هەولێر بمێنێ بە ماڵەکەی مامجەلالیشەوە. بارەگاکان لە دەرەوەی جادەی ٦٠ مەتری بێ و، بۆ هەر بارەگایەکیش تەنیا ٢٠ پاسەوان تەرخان بکرێ. - هەر لایە تەنیا ١٠ مەسئولی لە هەولێر هەبێ. هەر مەسئولەش لە ٥ تا ١٠ پاسەوانی هەبێ.

- هەمو هێزەکانی یەکێتی و چەکی ناونجی و قورس لە ناو هەولێر و دەوری هەولێر بکشێتەوە.

- هێزەکانی یەکێتی لە (قوشتەپە و بیستانە و دێگەڵە) کۆ بکرێنەوە. هی پارتی لە (کەڵەک و مەلا ئۆمەر و دەربەندی گۆمەسپان).

- پارتی سورە لەسەر ئەوەی رێگای شاوەیس - هەولێری بۆ چۆڵ بکرێ بۆ هاتوچۆی خۆی (لەوەش مەبەستی ماڵ و بارەگای مام جەلالە) و، رێگای قوشتەپە بۆ هاتوچۆی یەکێتی تەرخان بکرێ.

پارتی ئەوەیان قوبوڵ نەبو.

دواجار پێشنیارمان کرد:

یەکێتی هەمو هێزەکانی خۆی لە هەولێر و دەوروبەری بکێشێتەوە و لە قوشتەپە کۆیان بکاتەوە.

- پارتی هەمو هێزەکانی خۆی لە دەوروبەری هەولێر بکێشێتەوەو لە صەلاحەدین کۆیان بکاتەوە. پارتی قوبوڵی نەکرد.

بەمجۆرە مەسەلەی هەولێر بە چارەسەرنەکراوی مایەوە.

٢. مەسەلەی داهات

وەفدی پارتی ئەیەوێ بەر لە هەر شتێ هەولێر بە تەواوی چۆڵ بکرێ لە چەکداری یەکێتی، دوای ئەوەی هەیئەتێکی بێلایەن شایەتی ئەدا بە ئەنجامدانی چۆڵکردن و ئەوان باوەڕ ئەکەن ئینجا پارلەمان کۆببێتەوە و، حکومەتێکی نوێی خاوەن بنکەیەکی فراوان پێکبهێنێ کە نوێنەرانی پارتی و یەکێتی و

حیزبەکانی تر و کۆمەڵگە ئیتنیەکان بەشداری بن و، ئەو حکومەتە نوێیە دەس بگرێ بە سەر هەمو ناوەندەکانی داهاتی کوردستاندا، ئەوسا ئیبراهیم خەلیل بخرێتەوە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێم. ئێمەش بۆمان رون کردنەوە کە پارتی ئەتوانێ لیستەیەک بکا بە سەرچاوەی دەرامەت لە سەرانسەری کوردستان دا. ئێمە قوبوڵمانە هەموی بخرێتە ژێر دەستی هەیئەتی بێلایەنەوە. بەڵام ئێمە یەک جێگامان بە لاوە گرنگە ئەویش برایم خەلیلە. تا کێشەی برایم خەلیل چارە نەکرێ کێشەی هەولێر چارە ناکرێ. پارتی قوبوڵی نەبو برایم خەلیل بخرێتە ژێر دەستی هەیئەتی بێلایەنەوە، .بەمجۆرە مەسەلەی ئیبراهیم خەلیل بە چارەسەرنەکراوی مایەوە"[٣٨٣].

## شکستهێنانی کۆبونەوەی دبلن

ئەمجارەش ئەم هەوڵە نێودەوڵەتیە سەرکەوتو نەبو، بە تایبەتیش تورکیا رەزامەندی لەسەر رێکەوتنەکە دەرنەبڕی، یەکێتی بڵاویکرەوە، کە نوسخەیەک لەو پرۆتۆکولە لە لایەن نوێنەری پارتیەوە لە تورکیا دراوە بە دەوڵەتی تورکی.

تورکیا بەم شیوەیە هەڵوێستی دەربڕی:

• نارەزاییان لای فەرەنسا دەربڕی، گوایە فەرەنسا یارمەتی کورد ئەدا بۆ دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ.

• وێنەی رێککەوتنەکە گەیشتبوە دەست ئێران و سوریا و ئەوانیش داوای کۆبونەوەی هاوبەشی وەزیرانی دەرەوەی هەر ٣ وڵاتیان کرد بۆ یەکخستنی هەڵوێست لە مەترسی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی.

تورکیا هەرایەکی گەورەی نایەوە، لە دەزگاکانی راگەیاندنی خۆی و کۆڕە دیپلۆماسیەکانیدا هێرشی کردە سەر ئەو رێکەوتن و کۆبونەوانەی ئیرلەندا، وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا بانگهێشتنەکەی مام جەلال و مەسعودی لەغو کرد.

---

[٣٨٣] خەون یان مۆتەکە-١، ل ١٦٠.

ئاشکراکردنی تێکستی ڕێککەوتنەکە، کە ئەبو بە نهێنی بپارێزرێ تا کاتی ئیمزاکردنی لە ئاهەنگێکدا بە ئامادەبونی سەرۆک میتیران، لای سەرۆک و حکومەتی فەرەنسی ڕەنگدانەوەیەکی خراپی بۆ سەر ناوبانگی کورد و دیپلۆماسییەتی کوردی هەبو. هەر لەبارەی ڕۆڵی تورکیا و کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقیەوە، ڕۆژنامەی (الحیاة) لە ژمارەی ١١٨٩٣ ی ١٩٩٥/٩/١٤ دا باسی ڕۆڵی وڵاتانی دراوسێ و تورکیا دەکات: "کێشەی هەولێر هێشتا چارەسەر نەکراوە و کێشەی گومرگیشی هاتۆتە سەر".

لە بارەی هەوڵی ئاشتیەوە، نێچیرڤان بارزانی بروسکەی ژمارە ١٠١٥ ی ١٩٩٥/٨/١٥ بۆ قیادەی مەیدانی کەرکوک-سلێمانی دەنوسێت: "بروسکەتان گەیشت، داواتان لێدەکەین، گوێبیستی رادیۆ درۆزنەکەی جەلال مەبن، ئەوەی کە دەڵێن هیچی وا نیە، تاکو ئێستا هیچ شتێک ئیمزا نەکراوە، داواکاری پارتیمان ئەوەیە، کە دەبێت پێش هەمو شتێک هەولێر چۆڵ بکرێت، ئەگینا هیچ ڕێکەوتنێک نابێت وە لە شتی تازە ئاگادارتان دەکەین". (سەچاوەی ئەم بوسکەیە دیار نیە).

کۆبونەوەکانی دبلن، تەنها لای دراوسێیان نەبوە جێی نارەزایی، بەڵکو لەناو هەندێ هێزەی عێراقیش پشتگیری نەبو، موزەفەر ئەرسەلان، سکرتێری گشتی پارتی نیشتیمانی تورکمانی عێراقی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەنوسی تورکی ئەرکون ئەکسوێلە دەڵێ: "کۆبونەوەی دبلن بە زاهری، بۆ ئاشتیە لە نێوان کوردەکاندا، بەڵام ئەگەر لە ناوەرۆکەکەی وردببینەوە، ئەمە بۆ پارچەبونی عێراقە. هەمو وڵاتێک قسە دەربارەی یەکپارچەیی عێراق دەکات، بەڵام هەنگاو بە هەنگاو هەوڵیدابەشکردنی ئەدەن، ئیستا هێڵی ٣٢-٣٦ ی ناوچەی ئارام هەیە. سەرو جیابۆتەوە کە ناوچەی تاڵەبانی و بارزانیە. ئەم گۆڕانانە لە ئایندەدا کێشەی گەورەمان بۆ دروست دەکات. ئێمەش بەرگری لە یەکپارچەیی عێراق دەکەین، بەڵام بە کردار، یەکێتی خاکی عێراق تێکچوە. پێویستە ناوچەیەکی فیدراڵی بۆ

تورکمـان تەرخـان بکرێت. پێویسـتە دان بە بەشداری تورکمانـدا بنرێت بـۆ بەشداری ئیداری لەو ناوچانەی کە کوردەکان ئۆتۆنۆمیان تێدا هەیە."[384].

هەر دەربـارەی بـاری ئـاڵۆزی کوردسـتان و رۆڵـی وڵاتـانی دراوسـێ و عێراق لە کێشەکاندا، رۆژامەنوسـانی ئینگلیزی شـارەزا (ئیدوارد مۆرتیمەر) و (گـارد سـمیث) لە وتارێکـدا دەنوسـن: "تـورکیش کە بێتـاقەتە لەو بۆشـایە دەسەڵاتەی کە لە بەری عێراق لەسەر سنور هەیە، ماوەیەکە فشاری خستۆتە سەر کوردەکانی عێراق بۆ دۆزینەوەی جۆرێک لە چارە بە رێکەوتن لەگەڵ سـەدام کە لە هەفـتەی رابـوردو نـوێنەرێکی نـاردبو بـۆ قسـەکردن لەگەڵ کوردەکان. وا دەردەکەوێت مستەر بارزانی بەدڵیدا چوبێت و ئەم ئامۆژگـاریە قبـوڵ بکـات. هەنـدێ لەسـەرکردەکانی پـارتی وەک مسـتەر جەوهەر نـامیق، سـەرۆکی پێشـوی پەرلەمـانی کـوردی بە ئاشـکرا وتـی کە باوەڕیـان هەیە کە "تاقیکردنەوەی کوردی" سەرنەکەوت و پێویستە کوردەکان چارەیەک لەگەڵ سەدام کە هەرچیەکیان بداتێ پێی قایل بن..."[385].

هەر دەربـارەی کۆبونەوەکـان و پرۆسـەی ئاشـتی و پێش دەسـتپێکردنی کۆبونەوەکـانی کۆتـایی لە دبلـن، نێچیرڤـان بـارزانی لە چاوپێکەوتنێکـدا لە ١٩٩٥/٩/٨ لەگەڵ رۆژنـامەنوس (ئـور شـەوکەتی) لە رۆژنـامەی (سـباح) ی تورکی دەڵێ: "ئەو هێرشـانەی (پ.ک.ک) دژ بە پارتی، هۆیەکانی بە تەواوی بۆمـان رون نـیە، هـۆکەی بەلای (پ.ک.ک) وە، مـادەیەکە لە رێکەوتنـامەی دبلن، پەیوەندی بە بابەتی ئەمنی تورکیاوە هەیە، بەڵام پێم وانیە ئەو هێرشە لە لایەن (پ.ک.ک) خـۆیەوە رێـک خرابێـت...(پ.ک.ک) تەنهـا هێـرش دەکـاتە سـەر پـارتی و ئەوان کەمپـی هەمیشـەییان لە ناوچەکـانی یەکێتـی هەیە، نامانەوێت تهدیدی تورکیا بکرێت، با لەگەڵ تورکیا دەست بخەینە ناودەست ئەم تهدیدە کۆتایی پێ بهێنین..".

[384] رۆژنامەی (جمهوریەت)ی تورکی ١٩٩٥/٨/١٨.

[385] رۆژنامەی (فیناشڵ تایمزی) لندنی ١٩٩٥/٨/٢٧.

دەربارەی بارودۆخی ئەو کاتە، وەفدێکی تێکەڵی بەشی مافی رۆڤی کۆنگرێسی ئەمریکی و پەرلەمانی بەریتانی، بە یاوەری د.مەحمود عوسمان و بەختیار ئەمین، لە ١٩٩٥/٧/١٧ دا سەردانێکی کوردستانیان کرد و لە ئەنجامی سەدانەکەیاندا، بەشی کوردی رادیوێی دەنگی ئەمریکا، لە ١٩٩٥/٨/٣ دا چاوپێکەوتنێکی لەگەل (کاترین پۆرتەر)، (خێزانی ئەندامی کۆنگرێس جان پۆرتەر) ئەندامی وەفدەکە و سەرۆکی رێکخراوی (هومان رایت ئەلیانس) کردوە و لە بەشیک لەو چاوپێکەوتنەدا دەڵی: "من ئێستا هەندێ ئیشاراتی سەیر و هاوبەش لە نێوان، ئەنقەرە و بەغدا و سەلاحەدیندا دەبینم، ئەم پەیوەندیانە زیانی زۆر بە پرۆژەی ئاشتی دەگەیەنێت، ئەوەی ئێستا روئەدات، ئەو رێگایەیە کە رۆژانە چەندەها شاحینەی نەوت هەڵگری تورکی نەوت لە عێراقەوە دەگوێزێتەوە بۆ تورکیا، ئەمە لە لایەن کۆمەڵی بارزانیەوە گومرگ دەکرێت و ئەمە ئەبێتە زیاد دەوڵەمەندی خێزانی بارزانی، هەروەها خانم پۆرتەر دەڵێ: ئەو پارانە ئێستا ناگەنە دەستی کورد، بەڵکو دەگەنە دەستی تایبەت، ئەوەش هۆیەکە بۆ خراپ بونی رەوشی ئابوری ناوچەکە و رێگا دەگرێت ئەو دوکەسە بگەنە ئاستی زەمینەیەکی هاوبەش.

دەربارەی پەیوەندییەکان دەڵێ: دوای هاتنە ژورەوەی سوپای تورکی بۆ سەروی عێراق و دوای کشانەوەی هێزەکانیان، زۆر چەکی قورسیان لەدوای خۆیان بەجێهێشت، کە هێزەکانی پارتی لە شەڕەکانیاندا دژی یەکێتی بەکاری دەهێنن. بۆئەوەی ئەم بارودۆخە وەک یەکی لێبکرێت، یەکێتی پەیوەندی بە ئێرانەوە کردوە، ئەمە بارودۆخێکی سەیرە، کە هێزە ناوچەیەکان دەست دەخەنە ناکۆکی نێوان ئەم دو گروپە...".

دەربارەی ئەنجامەکانی کۆبونەوەی دبلن،(م.س) یەکێتی لە ١٩٩٥/٩/١٨ بەیانێکی دەرکرد و ئامادەیی خۆی پیشاندا بۆ جێبەجێکردنی خاڵەکانی رێکەوتنامەی ٨/١١ لە دروگیدا و ئامادەیی نیشاندا بۆ کۆبونەوەی داهاتو،

بەمەرجێ کە ئەم کۆبونەوانە بەرهەمداربن و ئاسایش و ئارامی بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و هاولاتیان موچەی ئاسایی خۆیان وەگرن لەسەرچاوەی داهاتەکان، کە سەرکی تریان ئیبراهیم خەلیلە.

هەروەها رۆژنامەی (الحیاة) لە ژمارە ١١٨٩٨ ی ١٩٩٥/٩/١٩ دا باس لەوە دەکات کە بارزانی پشتگیری رێکەوتنامەی دبلن دەکات و هەوڵ ئەدات کە ئاشتی لەگەڵ یەکێتیدا بهێنێتە کایەوە، لە هەمان کاتیشدا باسی شەڕی پارتی دەکات لەگەڵ پارتی کرێکارانی کوردستان و رەخنە دەگرێت، کە هیچ هێزێک هاوکاریان ناکات لەو شەڕەدا.

زۆر لە دەزگاکانی راگەیاندن، باسی ئەویان دەکرد، کە تورکیا پشتگیری تەواوی پارتی دەکات لە شەڕی دژی بە پارتی کرێکاران، لەو قۆناغەدا پەیوەندی ئێران و پارتی بە کاتە باشەکانیدا تێپەری نەئەکرد.

هەروەها پارتی لە زۆر جێگادا، هێرشی دەکردە سەر ئێران، و بە رێگر بۆ ئاشتەوایی گشتی ناوی دەبرد، لە لێدوانێکی رۆژنامەوانیدا سامی عەبدولرەحمان دەڵێ: "ئێران دوژمنایەتی خۆی بۆ رێکەوتنی (درۆگیدا – ئیرلەندا) بۆ ئاشتەوایی نێوان پارتی و یەکێتی ناشارێتەوە، لە رێکەوتنەکەدا، رەچاوی بەرژەوەندییەکانی تورکیا کراوە و ئەوەشی رەتکردەوە، کە پارتی شەڕی وەکالەت بۆ تورکیا دەکات دژ بە پارتی کرێکاران"[٣٨٦].

---

[٣٨٦] (الحیاة)ی ژمارە ١١٩٠٠ ی ١٩٩٥/٩/٢١.

## سەرکردەکان چۆن باسی یەکتر دەکەن؟

هەر لەو کاتانەدا، مەسعود بارزانی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ گۆڤاری (الوسط) دەربارەی مام جەلال دەڵێ: "تاڵەبانی ڕێکەوتنەکان دەشکێنێت، پێش وشکبونەوەی مەرەکەبەکەی...من دەمزانی کە ڕێکەوتنم لەگەڵ سەدامدا دەکرد، دەمزانی چی دەوێت، بەڵام من نازانم تاڵەبانی چی دەوێت! من تاکو ئێستا سێ جار ڕێکەوتنم لەگەڵ تاڵەبانی کردوە، هێشتا مەرەکەبی ڕێکەوتنامەکە وشک نەبۆتەوە، ئەو بە شێوەیەک لە شێوەکان شکاندویەتی.. هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێویستە یەکێتی هەولێر چۆڵ بکات، هەولێر بە کلیلی ئاشتی نێوانیان دەزانێت"[387].

هەر لەو کاتانەدا مام جەلال لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەریدا لە ژێر ناونیشانی (بارزانی لەگەڵ ئەوەدا نیە کە خەبات دژ بە دیکتاتوریەت بکرێت) باس لە ڕۆڵی پارتی و نزیکبونەوەیان لە تورکیا و وەرگرتنی چەک و تەقەمەنی لێیان بۆ دژایەتی پارتی کرێکاران دەکات، باس لەوە دەکات کە یەکێتی دژی ئەوەبوە کە پارتی کرێکاران لە کۆبونەوەی ئێرلەندا وەک پارتێکی تیرۆریست ناو ببرێت[388]، هەردوسەرکردە لە چاوپێکەوتنەکانیاندا، درێخیان نەکردوە کە هەریەکەیان هێرش بکەنە سەر ئەوەی تر.

---

[387] گۆڤاری (الوسط)ی ژمارە ١٩١ ی ١٩٩٥/٩/٢٥.

[388] (الحیاة)ی ژمارەی ١١٩١٤ ی ١٩٩٥/١٠/٥.

## هەوڵێکی تر بۆ ئاشتی

ئێران هەوڵی ئەدا، کە ناوبژی بکات و کۆتایی بە شەڕ بهێنێت و لە جیاتی ئەمریکا و وڵاتانی ئەوروپا، رۆڵی سەرەکی ببینێت لە ئاشتەوایی نێوان هێزە کوردییەکاندا.

لە نێوان ٥ تا ١٩٩٥/١٠/٩ کۆبونەوەیەک لە تاران لە نێوان پارتی و یەکێتیدا بەسەرپەرشتی حکومەتی ئێران ئەنجامدرا و لە لەسەر هەندێ خاڵ رێکەوتن کە بریتی بون لە:

١. کشانەوەی هێزی چەکدار و چەکی قورس و مام ناوەندی لە ناو شاری هەولێر، جگە لەو چەکدارانەی کە رێکەوتنیان لەسەرکرواە، ئەوەش ٢٥٠ چەکدار بۆ هەر لایەکیان، ئەوەیش بۆ پارێزگاری بارەگا و لێپرسراوەکانیان و پێویستە ئەمە لە ماوەی دوهەفتە دوای مۆرکردنی ئەم رێکەوتنامەیە جێبەجێ بکرێت.

٢. هەر لایەک چوار بارەگای دەبێت.

٣. ئەو لێپرسراوانەی کە دێنە ناو هەولێر و پارێزگاریان لەگەڵدایە، نابێت ژمارەیان لە ١٠ زیاتر بێت و ئەوەی لەگەڵیاندایە نابێت ژمارەیان لە ١٠٠ زیاتر بێت بۆ هەرلایەکیان.

٤. هەر لێپرسراوێک لە نێوان ٥ تا ٢٠ پارێزگاری لەگەڵدا دەبێت.

٥. دوای ٢ مانگ لە دروستکردنی ئیدارەیەکی نوێ، پێویستە شەقامی ٦٠ی و ئەو ناوچانەی دەوروپشتی چوڵ بکرێت لە هەمو بارەگایەکی حیزبی و لە جیاتی ئەوانە، شوێنی تریان بۆ تەرخان بکرێت و لەو ناوچانە شوێن و بارەگای نوێ دانانرێن.

٦. قەڵای هەولێر، تەرخان دەکرێت تەنها بۆ دەزگای تەلەفزیۆن و رادیۆ بۆ هەمو هێزەکان.

٧. دوای هەفتەیەک کە دڵنیا بۆوە کە هەولێر هێمنە و چەکی تێدا نەماوە، هەر لایەک لیستێک ئەدا بە دەزگایەکی سەربەخۆ بە ناوی کەسەکانیان کە لە هەولێر و ناوچەکانی دەوروپشتی کە خانویان هەیە، جا هی خۆیان بێت یان کرێچی حکومەت بن، هەردو لا پێویستە خانوەکانیان کە ئەندام و هەوادارانیان تیدا نیشتەجێن، چۆڵی کەن و لە ماوەی یەک مانگدا، بدرێتەوە بە خاوەنەکانیان.

٨. ئەو هێزانەی تر کە دو بارەگایان هەیە، پێویستە یەک بارەگایان هەبێت و تەنها ٢٠ چەکداریش پارێزگاری بکات.

٩. هێزەکانی تر، پێویستە بارەگاکانیان بەرنە دەرەوەی هەولێر، هەر هێزێک تەنها یەک بارەگای سەربازی دەبێت.

١٠ هێزێکی سەربەخۆی بێلایەن، سەرپەرشتی ئاسایشی هەولێر دەکات لە کاتی گواستنەوەدا و هەروەها سەرپەرشتی دەرگا سنوریەکانی شارەکە دەکات.

١١. سەیتەرەکان، رێگا لە هاتنە ناوەوەی چەکدار دەگرن بۆ ناو هەولێر، ئەوان چاودێری ئەو چەکدارانە دەکەن، کە لەگەڵ لێپرسراوەکانیاندا دێنە ناو شار و پێش ئەوە لەسەریان رێکەوتون و ئەبێت لە کاتی چونە ناو هەولێر چاودێری ژمارە و چەکەکانیان بکرێت، بۆ ئەوەی لە کاتی دەرچونیان هەمان ژمارە بن.

١٢. هەردولا پێویستە لەو شوێنانانەوە بێنە ناو هەولێر کە بۆ خۆیان و حیمایەکانیان دەستنیشان کراوە.

یەکەم: دەوروپشتی هەولێر

١. کەمکردنەوەی ئەو هێزانەی لە دەوروپشتی هەولێرن بۆ شوێنێک کە بۆیان دەستنێشان دەکرێت.

٢. هەر لایەک هێزەکانی لە شوێنێک کۆدەکاتەوە، کە نزیک بێت لە بارەگاکانی خۆیانەوە.

٣. شارەزایانی سەربازی لەو شوێنانەی گرنگە وەک یەک بێت و ترسی هەڵگیرسانی شەڕ دوربخاتەوە.

دووهەم: داهات

١. دوای ٤٨ سەعات، کە دڵنیا بوەوە، کە هەولێر هێمنە و لە چەک داماڵێراوە، دەست دەکرێ بە کۆکردنەوە و تۆمارکردنی هەمو داهات لە ئیبراهیم خەلیلەوە تا پێنجوین و هەمو داهاتەکانی تر کە هەردو حیزب کۆی دەکەنەوە، بخرێتە سەر حسابێکی بانکی حکومەتی هەرێم بەسەرپەرشتی دەزگایەکی سەربەخۆ.

٢. ئەو دەزگا سەربەخۆیە، کارمەندی خۆی دەنێرێت بۆ هەمو ئەو شوێنانەی کە گومرگ و داهاتی تێدا کۆدەبێتەوە، بۆئەوەی چاودێری داهاتەکان بکەن.

٣. ئەو دەزگا سەربەخۆیە، چاودێری ئەوە دەکات، کە هەمو داهاتەکان بچێتە سەر حسابی بانکی حکومەتی هەرێم.

٤. ئەو دەزگا سەربەخۆیە، تۆماری هەمو داهات و پارەیەک دەکات کە لە بانکەکاندا هاتوە و هەیە.

٥. هیچ لایەک بۆی نیە بەتەنها دەسکاری داهاتی حکومەتی هەرێم بکات. ئەگەر پێویست بو، کە پارەیەک بۆ بەرژەوەندی گشتی رابکێشرێت، ئەوا پێویستە بە ئاگاداری دەزگا سەربەخۆکەوە بێت.

٦. نابێت هیچ زەریبە و رسوم بەبێ ئاگاداری یاسایی کۆبکرێتەوە.

٧. هەمو ئەو داهاتەی لەو ماوەیەدا کۆکراوەتەوە، بە زویی دەخرێتە سەر حسابی ئەو حکومەتە نوێیە کە دروست دەبێت، جگە لەو پارانەی کە بە ئاگاداری دەزگا سەربەخۆکە خەرج کرابێت.

٨. دوای ئەوەی حکومەتی نوێی هەرێم دروست دەبێت، بەرپرسە لە کۆکردنەوەی داهات و سەرفکردنی، وە ئیتر رۆڵی حیزبەکان کۆتایی دێت بە

کۆکردنەوەی داهات و هەروەها کۆتایی بە کاری ئەو دەزگا سەربەخۆیە دێت کە چاودێری دەکرد.

سێیەم: پەرلەمانی کوردستان و ئیدارەی هەر دو هەرێم

١. بانگهێشتی پەرلەمانی کوردستان دەکرێت بۆ ئەنجامدانی کۆبونەوەی ئاسایی لە ماوەی ٤٨ کاتژمێردا، دوای دڵنیابونەوەی ئەوەی کە هەولێر ئارام و لەچەک داماڵیوە.

٢. پەرلەمانی کوردستان، بە خێرایی هەڵدەستێت بە دانانی ئیدارە (حکومەت) یێکی نوێ بۆ هەرێمی کوردستان کە بناغەیەکی فراوانی هەبێت، کە نوێنەری پارتەکان و نەتەوەکانی تری تێدابێت کە لە هەرێم دەژین، وە ئەمە دوای ٢ هەفتە لە کۆبونەوەی یەکەمەوە دروست دەکرێت.

چوارهەم: ئاساییکردنەوەی گشتی

حکومەتی هەرێم و پەرلەمان هەڵدەستن بە هاوکاری دەزگای سەربەخۆ بە ئاساییکردنەوەی بارودۆخی هەمو ناوچەکانی کوردستان، لە ماوەی یەک مانگ دوای دروستکردنی حکومەتی هەرێم.

ئامرازی ئاسایکردنەوەی بارودۆخی هەرێم:

١. حکومەتی هەرێم و پەرلەمان، هەڵدەستن بە دروستکردنی دەزگایەک بۆ تۆمارکردنی هەمو حساباتێک کە لای پارتەکان لە ١٩٩٤/٥/١ وە تۆمارکراوە، ئەمە پێویستە دوای دامەزراندنی حکومەتی هەرێم بە دو هەفتە ئەنجام بدرێت.

٢. گەڕانەوەی هەمو ئەو هاولاتیانەی ناچارکران کە خانوەکانیان بەجێبهێڵن بۆ شوێنی خۆیان، ئەگەر موڵکی خۆیان بێت یان کرێچی حکومەت بن.

٣. پەرلەمان و حکومەتی نوێ، دەزگایەک دائەنێن بۆ گەڕانەوەی هەمو ئەو ئۆتۆمبیلانە و کەلوپەلی هاولاتیانەی دەستی بەسەردا گیراوە یاخود قەرەبو

کردنەوەیـان ئەگەر نەتـوانرا بیانـدرێتەوە، لە لایەن دەزگـایەکی بەرپـرس لەو کێشانە، ئەوەش پێویستە لەماوەی یەک مانگدا ئەنجام بدرێت.

٤. ئازادی سیاسی فەراهەم بکرێت بۆ هەمو وە لە هەمو شوێنێک.

٥. هەمو هاوڵاتیان ئازادبن لە هاتوچۆیاندا و لە سنورەکانیش بۆ دەرەوەش.

٦. گەڕانەوەی هەمـو ئەو بارەگایـانە کە دەسـتی بەسـەردا گیـراوە، هـی حکـومی یـان تـایبەت، یـاخود قەرەبوکردنەوەیـان لە لایەن ئەو دەزگـا لێپرسراوەی کە بۆ ئەو مەبەستانە دانراوە.

٧. کەمکردنەوەی هێزی چەکداری هەردولا بەیەکسانی.

پێنجەم: دەزگای سەربەخۆ

ا. دروستکردنی دەزگایەکی سەربەخۆ

• دەزگـای سـەربەخۆ لە هێـزی عێراقـی دروسـتدەکرێت، ئەمەش لە کۆبونەوەی داهاتودا لەسەری رێکدەکەون.

ب. ئەرکەکانی دەزگای سەربەخۆ

١. چاودێری جێبەجێکردنی وەستانی شەڕ.

٢. لێپرسـراوێتی ئاسایشـی هەولێـر ئەگـرێتە ئەسـتۆ لە قۆنـاغی ئینتقالیـدا، یاخود تاکو حکومەتی هەرێم دادەمەزرێت.

٣. سەرپەرشـتی هەمـو ئەو داهاتـانە دەکـات کە لە کـاتی ئینتقالیـدا کـۆ دەکـرێتەوە و دڵنیـابون لەسـەرئەوەی کە پارەکـان ئەخـرێنە سـەر حسـابی حکومەتی هەرێم.

٤. سەرپەرشتی خاڵە سنورییەکان و ئەو خاڵانە دەکات کە دەچنە ناو شارەکانەوە.

٥. سەرپەرشـتی و دڵنیـابون لەسـەر ئەوەی کە شـاری هەولێـر ئـارامە و لەچەک داماڵیراوە و گەران بەداوی چەکدا بۆ دڵنیابونەوەی لەوەی کە تا چەند بڕیارەکان جێبەجێ کراوە و کاری پێویست ئەنجام بدەن.

٦. لە کاتی پێویستدا هێزەکان لەیەک جیابکەنەوە.

٧. هاوکاری پەرلەمان و حکومەت بکەن بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکە.

٨. چاودێری و بەدواچون بۆ جێبەجێکردنی خاڵی ڕێکەوتنامەکە.

٩. دڵنیابون لە هاتوچۆی ئازاد لەسەرانسەری کوردستاندا و لە خاڵە سنورییەکانی کە دەچێتە دەرەوە.

شەشەم: هەڵبژاردنی داهاتو

• حیزبەکان لەگەڵ پەرلەمان و حکومەتی هەرێم هەڵدەستن بە هەمو ئامادەکاریەکی پێویست بۆ هەڵبژاردنێکی ئازاد بەسەرپەرشتی چاودێرانی نێودەوڵەتی.

ئەو خاڵ و برگانەی کە لەسەری ڕێکنەکەوتون، دوادەخرێت بۆ کۆبونەوەی داهاتوو.

١. ئەو شوێنانەی کە هێزی چەکداری هەردولای تێدا کۆدەبێتەوە لە دەرەوەی هەولێر.

٢. دەستنیشانکردنی ئەو ڕێگایانەی کە دەچێتە ناو شاری هەولێر

٣. کشانەوەی هێزی ئاسایش و پۆلیس لە هەولێر.

٤. هەمو ئەو بڕیارە تاکلایەنانەی کە لە ١٩٩٤/٥/١ تاکو مۆرکردنی ئەم ڕێکەوتنامەیە دراوە، بەتاڵدەکرێتەوە.

٥. پۆستی سەرۆکی حکومەت و سەرۆکی پەرلەمان.

٦. زیادکردنی تەعبیەی (گەڕانەوەی شەرعیەت) بۆ فەقەرەی ١ لە ٣ هەمدا لەو برگانەی لەسەری ڕێکەوتون.

٧. چۆنێتی دابەشکردنی موچە.

٨. تۆمارکردنی داهاتەکان، هەمو هەفتەیەک لە بانکەکانی، دهۆک، هەولێر و سلێمانی وەکو یەک.

٩. دابینکردنی ئاسایشی خاڵی داهات لە ئیبراهیم خەلیلەوە بۆ پێنجوین.

سامی عەبدولرەحمان، لە جیاتی وەفدی پارتی دیموکراتی کوردستان

د. فواد مەعسوم، لە جیاتی وەفدی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان[٣٨٩].

---

[٣٨٩] کۆپی ڕێکەوتنامەکە لای نوسەر پارێزراوە.

له ۱۹۹۵/۱۱/۸، مەسعود بارزانی، وەک سەرۆکی پارتی بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە، "کە زیاتر هێرش بو بۆ سەر پارتی کرێکارانی کوردستان و ئەو شەڕەی کە لە نێوانیاندا رویداوە و باسی رۆڵی پارتی کرێکارانی کردوە کە رۆڵێکی ئاژەوەگێرییە و دژ بە بەدیهێنانی ئاشتەوایی گشتیەو، وە لە کۆتاییدا داوای ئاشتی ناوخۆی نێوان هێزە کوردستانییەکان دەکات و داوا لە ئوجەلان دەکات کە بۆ گفتوگۆ بێتە کوردستان"

هەر لە پێناوی جێبەجێکردنی خاڵەکانی کۆبونەوەی ئێرلەندا، وەفدێکی ئەمریکی بەسەرۆکایەتی رۆبێت دۆیچ لێپرسراوی باکوری کەنداو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، لە ۱۹۹۵/۱۱/۱۲ هاتنە کوردستان و پرۆژەیەکیان پێبو بۆ ئاشتەوایی لە نێوان پارتی و یەکێتیدا، دوای چەند جارێک هاتوچۆ لە نێوان هەولێر و سەلاحەدیندا، یەکێتی پرۆژەکەی قبوڵ بو، بێ دەسکاریکردن، بەڵام پارتی خاڵێکیان بۆ زیاد کردبو کە پەیوەندی بە ئاسایشی تورکیاوە هەبو، یەکێتی باسی لەو خاڵە دەکرد، کە ئەوە بەجێبهێڵرێت بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان.. هەروەها کێشەی داهات و گومرگی ئیبراهیم خەلیل، وەک خۆی مایەوە و چارەسەر نەکرا و ئەم هەوڵەش وەک زۆربەی هەوڵ و تەقەلاکانی تر، بۆ ئاشتی بێ ئەنجام بو، کەشوهەوای بەردەوامی شەڕ، ئاسمانی کوردستانی تەنیبو.

پارتی لە ۱۹۹۵/۱۱/۱٦ دا بڵاوکراوەیەکی دەرکرد، دەربارەی هەوڵەکانی نوێنەرانی ئەمریکا، بۆ هێنانە کایەی ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی و رەزامەندی و پشتگیری خۆیان بۆ ئەو هەولانە دەربڕی.

سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان ئۆجەلان لە ۱۹۹۵/۱۲/۱۱ بەیانێکی بڵاوکردەوە، کە تێدا وەستانی شەڕی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانی راگەیاند، لە هەمان رۆژدا، وتەبێژێک بەناوی پارتیەوە، پێشوازی لە هەنگاوەکەی پارتی کرێکاران کرد.

لە ۱۹۹۵/۱۲/۲۰ سەرکردایەتی یەکێتی بۆ ماوەی چوار رۆژ،

کۆبـــونەوەیەکی درێژیـــان کـــرد، لە بڵاوکراوەکەیانـــدا کە لە ١٢/٢٦ بڵاویانکردۆتەوە، باس لە چاکسازییەکان دەکەن کە پێویستە لەناو ریزەکانی یەکێتیدا بیکەن و خەباتیان دژ بە رژێم بەردەوام بێت و لە هەمان کاتیشدا بەردەوام بن بۆ بەدەنگهاتنەوەی هەمو هەوڵێک بۆ ئاشتی ناوخۆ، بەلام هیچ هەنگاوێکی عەمەلی دیارینەکرا بۆ دابینکردنی ئاشتی نێوان خۆیان و پارتی.

شـەڕ هەمـو مـانگی تشـرینی دوهەم و کـانونی یەکەمیشـی بە خەسـتی گرتبۆوە، بە تایبەتی لە ناوچەکانی، شیلادزێ، سێبەردان، مەلاهۆمەر.

یەکێتی بۆ گەیاندنی سیاسـەتی خۆی بە دنیای عەرەبی، لە ١٩٩٥/١١/٢٧ دا، وەفـدێکیان کە پێکهـاتبو لە نەوشـیروان مسـتەفا و د. لەتیـف رەشـید سـەردانی مەلیـک حسـێن، شـای ئەردەنیـان لە لەنـدەن کـرد و زیـاتر باسـی داهاتوی عێراق و پێکەوەژیان لە نێوان کورد و عەرەب و سونە و شیعە و هەمو رەنگە جیاوازەکانیـان کردبو و مەلیک پاڵپشـتی خۆی بۆ مەسـەلەی کورد دەربڕیبو.

## ١٩٩٦

# کۆبونەوەی پارتی و یەکێتی لە ئەمەریکا

سـەرەتای سـاڵی نـوێ، لە ١٩٩٦/١/١١ وەفـدی یەکێتـی بەسـەرۆکایەتی بەرهەم صالح و ئەندامێتی بەختیار زوهدی و وەفدی پارتی بەسەرۆکایەتی نێچیرڤان بارزانی، هوشیار زێباری، سەفین دزەیی و فەرهاد بارزانی بەجیا لەگەڵ وەفـدی وەزارەتـی دەرەوە و بەرگـری و ئەنجـومەنی ئاسایشـی ئەمریکی و نوێنەرانی سەفارەتی بەریتانیا و تورکیا لە واشنتۆن کۆبونەوە. هەردولا باسیان لەسـەر چۆنێتی دەستپێکردنەوەی پرۆسـەی ئاشتی کرد و نوێنەرانی ئەمریکا هانی هەردولایەنیاندا، کە هەوڵ بدەن ئاگربەست نەشکێنن و بەردەوامبن لەسـەری و گفتوگۆ دەستپێبکەنەوە، ئەمریکا زۆر مەبەستی بو، کە هەردولا ئاگاداربکاتەوە کە نابێت ئێران و عێراق دەست بخەنە ناو کاروباری ناوخۆی کوردەوە.

## نامەی نێوان نەوشیروان مستەفا و مەسعود بارزانیدا

لە پێناوی ئاشتیدا، زۆر لە هاولاتیان، بە تایبەتی لە سلێمانی زۆریان لە نەوشیروان مستەفا دەکرد، کە پەیوەندییەک لەگەڵ پارتی دروست بکات و نامەیەک بۆ مەسعود بارزانی بنوسێت و هەوڵ بدات پردێک بۆ ئاشتی دروست بکات، ئەویش بە دەنگ داخوازییەکەیانەوە هات و ئەم نامەیەی بۆ مەسعود بارزانی نوسی:

سلێمانی

١٧ ی شوباتی ١٩٩٦

گەورەی بەڕێز جەنابی کاک مەسعود

سلاوێکی گەرم

هیوادارم هەمیشە لەخۆشیدا بن

بە ڕاستی نازانم لە کوێوە دەس پێ بکەم و بەچی کۆتایی پێ بهێنم، چونکە هەرچییەک بڵێم کورتییەکەی ئەوەیە کە: ئاشتی لە شەڕ و نیوەشەڕ باشترە. هەمو کەس ئەمە ئەزانێ، تەنانەت دوژمنەکانیشمان هەمان ئامۆژگاریمان ئەکەن.

بە پێویستی ئەزانم عەرزی جەنابتی بکەم کە ئێمە لە لای خۆمانەوە ئامادەین بۆ ئاشتبونەوەیەکی راستەقینە و ئەگەر بۆ ئەم مەسەلەیە تروسکاییەکی کزیش مابێ، ئەوە لە هەمو شت بە باشتری ئەزانین بۆ قازانجی گەلەکەمان و هی خۆمان: چ وەک یەکێتی و چ وەک ئەشخاص، هیوادارم قەناعەتێکی وەهاش لە لای ئێوە پەیدابوبێ.

ئەم برایانە کە دۆستی هەردولامانن، بە پەرۆشەوەن بۆ ئەوەی سەعاتێک زوتر ئاشتی یەکجاری و تەبایی سیاسی بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، بە درێژی قسە و گفتوگۆمان کردوەو، لە باری سەرنجی ئێمە تێگەیشتوون.

لای ئێمە لەم ململانێیەدا لایەنی سەرکەوتو و ژێرکەوتو و، براوە و دۆڕاو، نیە، ئەگەر ئاشتی راستەقینە ببێ هەردو لامان براوە و سەرکەوتو ئەبین و، ئەگەر نا هەردولامان دۆڕاو و ژێرکەوتو ئەبین.

ئەگەر ئێوەش قەناعەتێکی وەهاتان لەلا دروست بوە، کەواتە چی رێگای ئاشتی و پێکهاتنەوەی بەستوە؟

ئێمە ئامادەین: چ خۆبەخۆ وەکو هەردو حیزب، چ لە ژێر چاودێریی ناوبژیکەری بێگانەدا، هەمو ناکۆکیەکانتان بەوپەڕی لێبوردنەوە لە گەڵ باس بکەین و، چارەی مەعقول، کە جێگای قبوڵکردنی هەردولا بێ، بدۆزینەوە.

لەم روەوە چاوەڕوانی بیروڕای جەنابتم.

دوبارە سڵاوم قبوڵ بکەن

لەگەڵ رێزی بێئەندازەی نەوشیروان[390]

هەر لە پێناوی بەدیهێنانی ئاشتیدا، کەسایەتی زۆری کورد هەوڵیاندا، رۆڵ ببینن و زۆریان نامەیان نوسی بۆ هەمولاکان، لە وەڵامی نامەیەکی فاروقی مەلا مستەفادا، مەسعود بارزانی بەم شێوەیە وەڵامی داوەتەوە:

"برای زۆر بەرێز و خۆشەویست کاک فاروق مەلا مستەفا، پێشکەش ..سڵاوێکی گەرم، بە هیوای خۆشیتانم..

زۆر سوپاس بۆ نامەکەتان، هەستی برایانەتان جێگای شانازیمە وە گومان لەوەدا نیە کە زۆر هەوڵی دڵسۆزانەتان داوە و ئومێدەوارم کە هەوڵەکانتان بەرهەمی بێت.

حەفتەیەک من لە مەصیف نابم، بۆیە ئەگەر تەشریفتان هێنا لە ٢٧ بەدواوە بێت، هەر رۆژێ بفەرمون بەخێر بێن و ئێمەش زۆر خۆشحاڵ دەبین بە دیدارتان. هەمو برادەران سڵاویان هەیە..

---

[390] خەون یان مۆتەکە-١- کۆپی نامەکە لای نوسەر پارێزراوە، ل ١٩٠.

ئیتر هەر خۆش و سەرکەوتوبن . جەژنی رەمەزانی پیرۆزیش، پیرۆزبێت لێتان وە ئومێدەوارین گەلی کوردستانیش لەم مەینەتیە رزگاری بێت..
براتان مەسعود بارزانی ١٩٩٦/٢/٢١.[٣٩١]

دوای دو هەفتە، مەسعود بارزانی وەلامی نامەکەی نەوشیران مستەفای بەم شیوەیە دایەوە:

بەڕێز کاک نەوشیروان

سلاوێکی گەرم

زۆر سوپاس بۆ نامەکەتان و من هەمیشە توقعی دەوری چاکەم لە ئێوە هەبووە. لە کۆبونەوەی (م.س) بە درێژی نامەکەمان دراسەت کرد.

ئەو ماوەیەی پێکەوە کارمانکرد وا بزانم بەشی ئەوەندە ئێمەتان ناسی کە دلْنیا بن رۆژێک لە رۆژان حەزمان لە شەڕی ناوخۆیی نەکردوە و بە خەیالْیشماندا نەدەهات کە پاش ئاشتبونەوەکەی ١٩٨٦ و راپەڕینی ١٩٩١ جارێکی تر کارەساتی شەڕی خۆکوژی لە کوردستاندا روبداتەوە.

بێ گومان کەس لەم شەڕەدا قازانج ناکات تەنها دوژمنانی کورد نەبن و زۆر لام سەیرە کە هەمو لایەک ئەو حەقیقەتە دەزانن، ئەی بۆ شەڕەکە رویدا.

ئێمە هەمیشە لەگەڵ چارەسەری ئاشتیداین، بەلام پێموایە یەکێتی غەدرێکی زۆر گەورەی لە پارتی کرد و عقدەی هەرە گەورە لای ئێمە ئەوەیە کە بڕوا نەماوە و بۆ گەڕانەوەی بڕوا زۆر خۆشحاڵ دەبم کە جەنابت ئەو دەورە ببینی. ئەوسا هەمو شت قابیلی حەلە.

زۆریش بە تفصیل لە گەڵ برایانی بەڕێزی خێرخواز هەڵگرانی نامەکەم قسەمان کردوە.

ئیتر سوپاس ١٩٩٦/٣/٥ مسعود بارزانی[٣٩٢]

---

[٣٩١] هەمان سەرچاوە، ل ١٩١.

[٣٩٢] هەمان سەرچاوە، ١، ل ١٩٢.

دوای هەفتەیەک نەوشیروان مستەفا، وەڵامی نامەکەی مەسعود بارزانی بەم شێوەیە دایەوە:

هەولێر

١٢ ی مارتی ١٩٩٦

بەڕێز جەنابی کاک مەسعود

سڵاوێکی گەرم و، هیوادارم هەمیشە لەخۆشیدا بن

بە سوپاسەوە نامەکەی رۆژی ٣/٥ ی جەنابتم وەرگرت، رۆژی ٣/١١ خستمە بەردەمی کۆبونەوەی (م.س) یەکێتی، هەروەها نامەکەی خۆم و وێنەی نامەکەی جەنابتم نارد بۆ بەڕێز مام جەلال لە لەندەن، بەگشتی بڕیاریاندا کە درێژە بەم موبادەرەیە بدەین و لەسەری بڕۆین بە ئومێدی ئەوەی بگاتە ئەنجامێکی سەرکەوتو و، ئاشتبونەوەی راستەقینە بگێڕێتەوە نێوان هەردو حیزب، بەڵام لەجەنابتی ناشارمەوە، ئەمانیش هەمان انطباعی جەنابتیان هەیە کە لەنامەکەدا نوسراوە دەربارەی نەمانی متمانە و غەدری پارتی لە یەکێتی. من پێم وایە هەر لایەک غەدری لەوی تر کردبێ یان غەدریان لە یەکتری کردبێ لە ئەنجامی دوایدا میللەتەکەمان بەگشتی مەغدور بوە.

ئێمە لە ناو خۆمان دا بە درێژی باسی ئەوەمان کرد کە چۆن متمانە بۆ یەکتری بگێڕینەوە، پێمان باشە بەم هەنگاوانە دەس پێ بکەین:

١. شەڕی راگەیاندن رابگرین و ماوەیەک باسی یەکتری نەکەین.

لەبەر ئەوەی زۆرجار ئەمە اعلان کراوە و شکێنراوە و شەڕی راگەیاندن دەستی پێ کردۆتەوە.. پێم باشە ئەمجارە بێ اعلان کردن جێبەجێی بکەین.

٢. گیراوەکانی یەکتری، ئەوانەی ماون و نەکوژراون، بەر بدرێن.

٣. هەردولا رێگا بە رۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەی یەکتری بدەن لە کتێبخانەکانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی‌دا بە ئازادی بفرۆشرێ و، ئەوانەی ئەیفرۆشن و ئەیکڕن و ئەیخوێننەوە ئازار نەدرێن.

٤. خەتی تەلەفۆن لە نێوان مەصیف و هەولێردا بکرێتەوە.
٥. کادرو پێشمەرگە و ئەندامە راکردوەکانی هەردولا بە عدم تعرضیک کە هەردولا لەسەری رێ بکەون بۆ سەردانی کەسوکاریان هاتوچۆی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکتری بکەن، بێ ئەوەی ئازار بدرێن و بگیرێن، یان ئەوانەی هاتوچۆ ئەکەن کاری خراپ بکەن.
٦. رێگە لەو کەسانە نەگیرێ کە ئەیانەوێ بچنە ئیبراهیم خەلیل و تورکیا.

ئێمە لە لای خۆمانەوە داوامان کردوە، لە سەر زمانی بەڕێز مام جەلال بۆ بیبیسی و بەتەلەفۆن لەگەڵ بەڕێز رۆبێرت دۆیچ، کە ناوبژی ئەمەریکی دەس پێ بکاتەوە.

بۆ دانیشتن و کۆبونەوە بۆ زیاتر نزیک بونەوە و لەیەک گەیشتن ئێمە ئامادەین لە ناوچەیەکی بێلایەن دا بە پارێزگاری و پاسەوانی چەکداری حیزبە کوردستانیەکان بۆ درێژەپێدانی گفتوگۆ و هاویشتنی هەنگاوی تازە بەرەو ئاشتی یەکجاری.

لە کۆتاییدا دوبارە سڵاوم قبوڵ بکەن
لەگەڵ ریزی بێئەندازەی نەوشیروان مستەفا[٢٩٣]

مەسعود بارزانیش وەڵامی دوهەمی نەوشیروان مستەفای بەم شیوەیە داوەتەوە:

بەناوی خوا
١٦ ی مارتی١٩٩٦
بەرێز کاک نەوشیروان
سڵاوێکی گەرم

ئومێدەوارم خوا پشتیوانمان بێ لەسەرخستنی کێشەی گەلەکەمان داو رزگارکردنی لەم محنەتەدا.

نامەکەی رۆژی ١٢ ی مارتی جەنابتم پێ گەیشت و ئەمرۆ لە کۆبونەوەی

---

[٢٩٣] هەمان سەرچاوە، ل ١٩٤.

مەکتەبی سیاسیدا لەسەر نامەکەتان و بارودۆخەکە بە گشتی دواین.

بەلای ئێمەوە، نەمانی بێ متمانەیی و بی بڕوایی، کە بە داخەوە دروست بووە، بە هەنگاوی پچوک و لابەلایی لەناو نابرێ، بەڵکو پێویستی بە هەنگاوی گەورەتر و بەرفراوانتر هەیە، ئەویش چارەسەری سەرتاسەری کێشەکەیە و بۆ ئەمەش بناغەیەکی دروست و رون هەیە کە پرۆژەکەی درۆغێدایە.

پێمان باشە هەوڵ بدەین وەفدی ئەمریکا رابکێشینەوە ناو کێشەکە بۆ تەواوکردنی پرۆژەکەیان و گەیاندنی بە ئەنجامێکی گونجاو لە گەڵ ئاوات و بەرژەوەندی گەلی کوردستان و بیروبۆچونی هەردولا و حزبە نیشتمانپەروەرەکان.

بەڵام دەتوانین چوار خاڵی (خطوات الثقە) ی پرۆژەکە، بە هاوکاری و ناوبژی حزبە کوردستانییە تێکۆشەرەکان جێبەجێ بکەین، لەوانەش مەسەلەی گیراوەکان کە ئامادەین لیستی خۆمان بدەین و ئێوەش لیستی خۆتان بنێرن.

هەردولا گیراوەکان ئازاد بکەین و دەس بەجێ گرتن و دەرکردنی لایەنگیران رابگیرێ کە بە داخەوە لەم رۆژانە گرتن و ئازاردانی خەڵکانی سەر بەپارتی زۆر زیادی کردوە و بۆ راگرتنی راگەیاندنیش ئامادەین.

دوبارە سڵاوی گەرم   مسعود بارزانی[٣٩٤]

ئەم نامە گۆڕینەوانە لە ئەنجامی هەوڵی دۆستانەی چەند کەسایەتیەکی سلێمانی بو (فاروقی مەلا مستەفا، د. نەوزاد عەتار و سەفوەت رەشید)، لە کۆتایی ئەم هەوڵانەدا، نەوشیروان مستەفا لە ١٩٩٦/٥/٢١ دا لە لندەنەوە، نامەیەک ئاراستەی فاروقی مەلا مستافا دەکات و ڕەشبینی پێوە دیارە کە نوسیویتی: "پارتی ئێستا خۆی لە هەڵوێستێکی بەهێزتردا ئەبینێ لە چاو یەکێتی و، لە چاو ماوەیەک لەمەوپێشی خۆیدا، چونکە عێراق بڕیاری نەتەوەیەکگرتوەکانی قبوڵ کرد دەربارەی گۆڕینەوەی نەوت بە خواردەمەنی، پارتی ئەمە بەسەرکەوتن دائەنێ بۆ خۆی، بۆری نەوت بە ناوچەکەی ئەودا

---

[٣٩٤] هەمان سەرچاوە، ١، ل ١٩٥.

ئەروا و، خواردەمەنی و دەرمان بە ناوچەکەی ئەودا ئەگوازرێتەوە، یەکێتی بێ بەشە لەمانە و، پارتی نایەوێت یەکێتی ببێتە شەریکی..مەسعود پەیوەندی خۆی لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ چاک کردۆتەوە..پارتی مەترسی شەڕی (پێ کا کا)ی لەسەر نەماوە..لەناو یەکێتیدا ئیتیجاهێکی بەهێز و خاوەن دەسەڵات پەیدابوە، قازانجی یەکێتی لەوەدا ئەبینێ رێگا بە پارتی نەدرێ بگەڕێنەوە سلێمانی و هەولێر و کەرکوک. ئەمەش تێکەڵاوە لە بەهانەی سیاسی و قازانجی تایبەتی...دەوڵەتانی ناوچە: ئێران، تورکیا و سوریا و عێراق یەکگرتنەوەی ئەم دو هێزەیان پێ باش نیە. قازانجیان لەوەدایە ناکۆکی و ناتەبابن..هەروەها ئاشتی کاتێ دروست ئەبێ، کە هەردولا قازانجیان لە ئاشتی دا هەبێ و ئیرادەی راستەقینەیان هەبێ بۆ دروستکردنی..»[٣٩٥]

## پەیوەندی پارتی و یەکێتی لەگەڵ بەغدا

ساڵی ١٩٩٦، پەیوەندی نێوان هەردو هێزە سیاسییەکە لەگەڵ رژێمی عێراق بەرەو پێشەوە دەچو، هەردولا بە ئاشکرا و بە نەهێنی پەیوەندییان لەگەڵ رژێم هەبو، ئاژانسی هەواڵی رۆیتەر لە زمانی دبلۆماسییە ئەوروپییەکان بڵاویانکردەوە، کە پەیوەندی لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و رژێمی عێراق دروست بوە، ئەوەش پەیوەندی بە بەرنامەی نەتەوەیەکگرتوەکانەوە هەیە (نەوت بەامبەر بە خۆراک) و هاتنی نەوت بە بۆری بە ناوچەکانی پارتی و هاتوچۆی کاربەدەستانی میری لە رێگای ئیبراهیم خەلیلەوە بۆ تورکیا[٣٩٦].

هەروەها رۆژنامەی تورکی (یونی ئۆزگول) لە ١٩٩٦/٣/٥ دا دەربارەی هەمان مەبەست دەنوسێت، "دوای دروستبونی پەیوەندی نێوان سەرۆکی عێراق سەدام حسێن و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، مەسعود

---

[٣٩٥] کۆپی نامەکە لای نوسەر پارێزراوە، خەون یان مۆتەکە، ل ٢٠٢.

[٣٩٦] الحياة، ژمارە ١٢٠٧٤، ١٩٩٦/٣/١٦.

بارزانی، تورکیا خەریکی راکێشانی نەوتە، بۆیەکەمجار وەزیرێکی عێراقی لە ڕێگای پارتیەوە گەیشتە ئەنقەرە".

"ئالۆزیەک لەسەر سێ سوچی پارتی، عێراق و تورکیا دەربارەی راکێشانی بۆری نەوت، کە لە بەرژەوەندی هەر سێ لایەن بو کە بکرێتەوە. پارتی بە بۆچونی جەلال تالەبانی دەستی بەسەر ٧٠٪ داهاتی ناوچەکە گرتوە (کە لە وەرگرتنی باج لە هێنانی ئۆتۆمۆبیل و روشتنی نەوت و کەلوپەلەوە دەستی دەکەوێت) ئەم بۆریە داهاتی پارتی بە شێوەیەکی زۆر زیاددەکات، لەبەرئەوە روداوێکی کتوپڕ نەبو، کە پارتی پشتگیری خۆی بۆ بڕیاری نەوت بە خۆراک لە نێوان عێراق و نەتەوە یەککگرتوەکان لە مایسی ١٩٩٦ دا بکات".(هەمان سەرچاوەی یونی ئۆزگول)

هەر لەو بارەیەوە بڵاوبۆوە: "کاتێ حکومەتی عێراق رونکردنەوەیەکی پارتی بڵاوکردەوە کە هێرشی تێدا بو بۆسەر ئێران، کە هاوکاری یەکێتی دەکات، لە هەمان کاتدا تاریق عەزیز جێگری سەرۆک وەزیرانی عێراق هەمان رونکردنەوەی پارتی بڵاوکردەوە"[٣٩٧].

گرژی نێوان یەکێتی و پارتی، بە نامە گۆرینەوەی نێوان نەوشیروان مستەفا و مەوسعود بارزانی، کۆتایی بە شەڕ و ئالۆزی نێوانیان نەهێنا، ئاو و هەوای کوردستان لەو قۆناغەدا زیاتر شەڕاوی بو وەک لەوەی شەماڵی ئاشتی هەڵیکردبێت،

جگە لە پارتی و یەکێتی هەمو لاکان ئامادەیی شەڕیان تێدا بو زۆربەی جار گرژییەکان بێ بناغە بون و لە ئەنجامی تێنەگەیشتن و نەبونی متمانە لەنێوانیاندا روی ئەدا، شەڕ و پێکدادانی بێ هۆ رویداوە و لە ئەنجامدا کوژراو و بریندراری لێکدەکەوتەوە.

لە ٣/١٧ دا، حیزبی شیوعی لە هەڵەبجە، شانۆگەریەک لە باخی گشتی

---

[٣٩٧] آوفرا بینغیو، کرد العراق بناء دولة داخل دولة، دار ئاراس-الساقی. ٢٠١٤ ل- ٣١١ و لە گۆڤاری الف باء ١٩٩٦/٨/٢٨.

پێشـکەش دەکـات و نـاوەرۆکی شـانۆگەریەکە دژ بە توند و تیـژی بـو لە ئیسـلامدا، بەو هـۆیەوە ئاسایشـی پـارتی و بـزوتنەوە دەبێـت بەشـەڕ لە نێوانیانـدا و لە ئەنجامـدا: پاسـەوانێکی مەلا عەلـی و ٣ ژن و دومنـداڵ دەکـوژرێن و ٢ لێپرسـراوی پـارتی برینـدار دەبـن و ٢١ پـارتیش لە لایەن بزوتنەوەوە زیندانی دەکرێن و پارتیش ٥ بزوتنەوە بەند دەکات[٢٩٨].

مەسعود بـارزانی بە بۆنەی جەژنی نەورۆزەوە لە ١٩٩٦/٣/٢٠ نـامەیەکی ئاراستەی هاوڵاتیانی کوردستان کرد و داوای ئاشتی و تەبایی کرد و داوای لە یەکێتـی کـرد، کە لەسـەر بنەمـای ڕێکەوتنـی (دڕۆگیدیـدا) چارەسـەری کێشەکانی نێوان پارتی و یەکێتی بکەن و هەوڵی بەدەستهێنانی ئاشتی بدەن.

پەیوەندیەکانی نێوان مەسعود بارزانی و نەوشیروان بەردەوام بو، بەهـۆی وتاری مەسعود بارزانی لە یادی جەژنی نەورۆزدا، کە داوای ئاشتی و تەبایی دەکرد و هەروەهـا بەهـۆی چـونی وەفدی پـارتی و یەکێتـی بـۆ دیمەشـق بـۆ بەشـداریکردن لە کۆبونەوەکـانی هێزەکـانی بەرگـری عێراقـی، نەوشـیروان مستەفا ئەم نامەیەی بۆ مەسعود بارزانی نوسی:

سلێمانی

٢٧ ی مارتی ١٩٩٦

گەورەی بەڕێز جەنابی کاک مەسعود

سلاوێکی گەرم

هیوادارم هەمیشە لە خۆشی دابن

بە سوپاسێکی زۆرەوە وەلامی نامەکەتم وەرگرت.

زۆرم پـێ خـۆش بـو لـە نـەورۆزدا پـەیامی ئاشـتیتان ڕاگەیانـد. بێگومـان جـەنابت وتارەکـانی بـەڕێز مـام جـەلالتان بیسـتوەو، ڕاگەیاندنـەکـەی وتـەبێژی

---

[٢٩٨] پانورامای ژ ٣٢ یەکێتی نیشتیمانی ١٩٩٦/٣/١٨.

مەکتەبی سیاسیشتان بەرچاو کەوتوە، بۆ خۆشبەختی لە هەمو لایەکەوە بانگی ئاشتی بەرز ئەبێتەوە.

ناوەڕاستی مانگی داهاتو بەڕێز دۆیچ قەولە بێتەوە بۆ کوردستان بۆ درێژە پێدانی ناوبژی.

من سبەی لە گەڵ بەڕێز مام جەلال سەفەر ئەکەم بۆ سوریا، وەکو بیستومە کاک نێچیروانیش ئەچێتە سوریا. برایان لێرە پێیانوایە کاتی یەکتربینین هاتوە هەم لە کوردستان و هەم لە سوریا بۆ ئەوەی ئەو دیوارەی لە بەینی هەردولادا دروست بوە بڕوخێنین و، لە هەر ئاستێکا ئێوە بەپەسەندی بزانن لەلای ئێمە قبوڵە.

دوبارە سڵاوم هەیە

لەگەڵ ڕێزی بێئەندازەی

نەوشیروان مستەفا[٣٩٩]

---

[٣٩٩] خەون یان مۆتەکە، ١، ل ١٩٨.

## کۆبونەوەی نەوشیروان مستەفا و نێچیرڤان بارزانی لە دیمەشق

لەسەرەتای نیسانی ١٩٩٦، هێزەکانی بەربەرەکانی عێراقی لە دیمەشق کۆبونەوە و لەو رۆژانەدا، نەوشیروان مستەفا و نێچیرڤان بارزانی چاویان بەیەک کەوت و نەوشیروان مستەفا بەم شێوەیە باس لە کۆبونەوەکەیان دەکات:

" لە شام لە رۆژانی ٣ تا٤ی ١٩٩٦/٤ کۆبونەوەیەکی موعارەزەی عێراقی هەبو لە ژێر ناوی: "الاجتماع التداولي لقادة المعارضة العراقية" مام جەلال بەشداری تێدا ئەکرد. وەفدێکی پارتی بە سەرۆکایەتی نێچیروان بارزانی بەشدار ئەبون، لەوێ لەگەڵ نێچیروان بە دوقۆڵی دانیشتین، هەندێ باسی گشتیمان کرد. لە میانەی قسەکانم دا وتم:

"ئەگەر ئەم شەڕە چەند ساڵی تریش درێژە بکێشێ سەرەنجام هەر ئەبێ بەدانیشتن و گفتوگۆ چارەسەر بکرێ، وا دو هەزار کەسی ترتان لە یەکێتی کوشت و گریمان یەکێتیتان شکاند و راوتان نا بۆ ئێران یان بۆ کەرکوک، یەکێتی بەوە لە ناو ناچێ، جارێکی تر دێتەوە سەرتان ناهێڵی بە ئاسودەیی دابنیشن، یان بە پێچەوانەوە یەکێتی چەند هەزار کەسی تری لە پارتی کوشت و پارتی شکاند و راوی نان بۆ موسڵ یان بۆ تورکیا یان بۆ ئێران، پارتی بەوە لەناو ناچێ، جارێکی تر دێتەوە سەر یەکێتی و ناهێڵی بە ئاسودەیی دابنیشێ.. لەبەرئەوە تەنیا رێگە پێکهاتن و ئاشتبونەوەیە.

"کە یەکێتی و پارتی ئاشت بونەوە توانیمان رێزی خۆمان و گەلەکەمان بەسەر هەمو لایەکدا بسەپێنین، چونکە یەکگرتو بوین توانیمان پێکەوە: بەرەی کوردستانی، راپەڕین، کۆڕەو، موفاوەزە، هەڵبژاردنی گشتی، پارلەمان، حکومەتی هەرێم، دابمەزرێنین، کەچی لەوەتی شەڕەکان دەسی

پێ کردوە خەریکە هەمو شت ئەدۆڕێنین و، لە ناو گەلەکەمان و لە بەرچاوی دنیا خەریکە سوک ئەبین! تۆ کوڕێکی گەنجی، پاشەڕۆژێکی درێژت لەبەردەم دایە بۆچی لە باتی ئەوەی هەزاران منالی هەتیو تۆ بە بکوژی باوکیان بزانن و دوعای شەڕت لێ بکەن، وا ناکەی دلی هەزاران خێزان خۆش بکەیت و دوعای خێرت بۆ بکەن و لە سەردەمی تۆدا هەزاران کەس زانکۆ تەواو بکەن؟

گفتوگۆکەمان و کەشی دانیشتنەکەمان دۆستانە بو. بە پێچەوانەی ئەو وێنەیەوە کە لە لای من دروست بوبو خۆی بە ئاشتیخواز و بە لایەنگری ئاشتبونەوە پیشان ئەدا، پرسیاری لێ کردم کە ئاخۆ بەو نزیکانە ئەگەڕێمەوە بۆ کوردستان. وتم نەخێر، وای دەرخست پێی ناخۆشە[400].

هەر لە پێناوی ئاشتیدا، لیژنەی هاریکاری نیشتیمانی کە لە حەوت حیزبی کوردستانی پێکهاتبون (بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان، حیزبی شیوعی کوردستان، بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشوری، حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان، پارتی کاری سەربەخۆی کوردستان، حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان) لە ١٩٩٦/٤/٨ دا بەیانێکی ٥ خالیان بلاوکردەوە، بە مەبەستی هێنانەکایەی زەمینەی ئاشتی و تەبایی و داوای ئاشتی یەکریزیان دەکرد)[401].

ئەمریکا، لە هەولەکانیدا بەردەوام بو، بۆ بەدەستهێنانی ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی و هەروەها هانی هێزە کوردییەکانی ئەدا کە پەیوەندیان لەگەل بەغدا بپچڕن. ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)ی ژمارە ٦٣٥٢ ی ١٩٩٦/٤/٢٠ نوسیبوی: وەفدێکی ئەمریکی وەزارەتی دەرەوە بەسەرۆکایەتی ڕۆبیرت دۆیچ و کارمەندێک لە بەشی هەوالگری وەزارەتی دەرەوەی

---

[400] هەمان سەرچاوە، ل ١٩٩.

[401] شەڕی ناوخۆ، چۆن، ل ٢٩٦.

تورکیا سەردانی کوردستان دەکەن و بڕیارە لەگەڵ هەریەک لە مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی کۆبنەوە، بە مەبەستی ئاشتی و تەبایی لە کوردستاندا.

## ئایە ئاسۆی ئاشتەوایی بەدی دەکرا؟

نەوشیروان مستەفا بەم شێوەیە باس لەو هەوڵانە دەکات دەربارەی هاتنی ئەو وەفدە و ئەو ئەنجامانەی بەدەستی دێنێت:

"وەفدێکی گەورەی ئەمەریکی لە ٢٢-١٩٩٦/٤/٢٤ بە سەرۆکایەتی رۆبێرت دۆیچ گەیشتونەتە کوردستان بۆ گێڕانەوەی ئاشتی. چەند جارێ هەردولای ناکۆکیەکانی دیوە، پێ ئەچێ ئەمجارەش بێ ئەوەی هیچ پێشکەوتنێ لە کارەکەدا بوبێ، گەڕابنەوە.

لەم قۆناغەدا بەپێی بۆچونی خۆم و هەڵسەنگاندنی روداوەکان ئیمکانی هیچ ئاشتبونەوەیەک نابینم لەبەر ئەم هۆیانە:

١. پارتی ئێستا خۆی لە هەڵوێستێکی بەهێزتردا ئەبینێ لە چاو یەکێتی و، لەچاو ماوەیەک لەمەوپێشی خۆیدا چونکە:

١-١ عێراق بڕیاری نەتەوە یەکگرتوەکانی قوبوڵ کرد دەربارەی گۆڕینەوەی نەوت بە خواردەمەنی. پارتی ئەمە بە سەرکەوتن دائەنێ بۆخۆی: بۆری نەوت بە ناوچەکەی ئەودا ئەڕوا و، خواردەمەنی و دەرمان بە ناوچەکەی ئەودا ئەگوێزرێتەوە، یەکێتی بێ بەشە لەمانە و پارتی نایەوێ یەکێتی ببێتە شەریکی.

ئەم بڕیارە، پارتی لەجاران زیاتر مەغرور و لاسار ئەکا و، لای وایە یەکێتی پێ ئەشکێنێ.

١-٢ مەسعود پێوەندی خۆی لەگەڵ دەوڵەتانی دراوسێ چاک کردۆتەوە، لە گەڵ سوریا پتەوی کردۆتەوە، سوریا گوشاری زۆری ئەمەریکی و تورکی لەسەرە بۆ دورخستنەوەی (پی.کا.کا) ئەیەوێ ئەو شەڕە بمێنێ و، لەژێر

کۆنترۆڵی خۆیدا بێ، بەڵام لە ناوچەکەی خۆی دوری بخاتەوە، باشترین جێگاش بۆ ئەوە، وڵاتی بێ خاوەن: کوردستانی عێراقە، پێ ئەچێ مەسعود بەڵێنی ئەمەی پێ دابن.

١-٣ پارتی مەترسی شەڕی (پی. کا.کا)ی لەسەر نەماوە.

٢. لەناو یەکێتیدا ئیتیجاهێکی بەهێز و خاوەن دەسەڵات پەیدا بوە، قازانجی یەکێتی لەوەدا ئەبینێ ڕێگا بە پارتی نەدرێ بگەڕێتەوە سلێمانی و هەولێر و کەرکوک. ئەمەش تێکەڵاوە لە بەهانەی سیاسی و قازانجی تایبەتی.

٢-١ هەندێک لایان وایە صەددام ئەروخێ، لەکاتی روخانی ریژیم دا ئەیەوێ پارتی لەم ناوچەیەدا نەبێ و تەجروبەی سەردەمی راپەڕین دوبارە نەبێتەوە، کە بە خورایی پارتییان کرد بە شەریک و، دوایی بون بە بەڵا.

٢-٢ هەندێکی تریش، کە ئێستا کەم نین و تا دێ زۆرتر ئەبن، قازانجی تایبەتییان لەوەدایە بە تەنیا، بەبێ شەریکایەتی پارتی، حوکمی ناوچەکە بکەن، بۆ ئەمەش بروبیانوی سیاسی دائەتاشن.

٣. ئەمجارەش ئەمەریکا لە ناوبژییەکەیدا جدی نەبو، لە ناو موعارەزەی عێراقیدا ئەگەر کورد یەکگرتوو بێ لە هەمویان بەهێزتر ئەبێ، ئەمەریکا نایەوێ کورد بەهێزترین هێزی ناو موعارەزەی عێراقی بێ، بە تایبەتی لەکاتی روخانی سەددام دا، ئەیەوێ ئەمیش لاواز بێ، گرنگترین مەسەلە لای ئەمەریکا: درێژەپێدانی تەقەوەستاندنە.

٤. دەوڵەتانی ناوچە: ئێران و تورکیا و سوریا و عێراق یەکگرتنەوەی ئەم دو هێزەیان پێ باش نیە. قازانجیان لەوەدایە ناکۆک و ناتەبا بن، تەجروبەکە لەبەرچاوی کورد و گەلانی ناوچەکە فاشیل بێ و، لەبەر ناکۆکی ناوخۆیان نەیانپەرژێتە سەر مەسەلە نەتەوەییەکان.

ئاشتی کاتێ دروست ئەبێ، کە هەردولا قازانجیان لە ئاشتی دا هەبێ و، ئیرادەی راستەقینەیان هەبێ بۆ دروستکردنی، بەداخەوە لەبەر ئەو هۆیانەی

باسـم کـردن، جـاریَ مـن ئـەو قـازانج و ئیرادەیـە نـابینم کـە پێویسـتن بـۆ دروسـتکردنی ئاشـتی، ئـەگینا منـیش رەئـیم وایـە: حکومــەتێکی یــەکگرتو و، ئاشتیەکی دائیمی، لە پێش هەمو لایەک دا بە قازانجی یەکێتیە. ئەگەر بیانو نەبێ، باوەڕ ناکەم پارتی بونی من لە مەوزوعەکەدا بکا بە مەرج، بە تایبەتی لـە هــەمو گفتوگۆکـانی دو سـاڵی رابـردودا مـن نوێنــەری یـەکێتی بـوم و سودیشی نەبو و لە هەموشیان زیادتر جنێویان بە من داوە. ئەگەر پارتی لە پێکهاتن بێ، ئەبێ قوبوڵ بکا لـە گەڵ ئـەم دامودەزگایـەی ئێسـتای یـەکێتی-هەرکەسێک و هەرچۆنێک بی- پێک بێ، نەک لەگەڵ (من)ێکی کە مەعلوم نیە ساڵی داهاتو چی ئەکەم[٤٠٢].

لە پێنـاوی هێنـانەدی ئاشـتی و تەبـایی، زۆر لە وڵاتـان و هێـزی سیاسـی کوردستـانی جیـاواز و کەسـایەتی کـورد لە زۆربەی شـارەکانەوە، داوایەکیـان ئاراستەی هەردو (م.س) یەکێتی و پارتی کرد، بۆ ئەنجامدانی کۆبونەوەیەکی هـاوبەش لە نێـوان (مەلا هـۆمەر و شـاوەیس) لە رۆژی ٢٦ یـان ١٩٩٦/٥/٢٧، ئەم پێشنیازە رەزامەندی مەسعود بارزانی لەسەر بو.

## هەوڵێکی نوێ بۆ ئاشتی

یەکێتـی نیشـتیمانی لە کۆبـونەوەی ٥/٢٤ بڕیاریـدا، کە دەستپێشـخەریەک بکات و وەفدێک بنێرێت بۆ بارەگای پارتی لە هـاوینە هەواری سـەلاحەدین، بـۆ باسـکردنی ئاشـتی نێـوان هەردولا، بیریـان لەوە دەکـردەوە، ئەگەر لەم کۆبونەوەیەدا نەگەیشتنە رێکەوتنێکی سیاسـی لەگەڵ پارتیدا، ئەوا پەرلەمـان هەڵبوەشێنرێتەوە و حکومەتێکی کاتی دروستبکرێت و هەڵبژاردن لە ناوچەکانی یەکێتیدا بە شێوەی دائیری بکرێت و حکومەتێکی نوێ دابمەزرێت.

کۆبونەوەی هاوبەشی یەکێتی و پـارتی لە ١٩٩٦/٥/٢٧ لە بارەگـای پـارتی لە سـەلاحەدین دەسـتپێکرد و وەفـدەکەی پـارتی بریتـی بـون لە: سـامی

---

[٤٠٢] خەون یان مۆتەکە، ١- ل ٢٠٢.

عەبدولرەحمان، د. جەرجیس حەسەن، فەرەنسۆ حەریری، د. ناصح غەفور، فرسەت ئەحمەد. وەفدی یەکێتی بریتی بون لە: د. فواد مەعسوم، د. کەمال فـواد، ئەرسـەلان بـایز، عەدنـان مـوفتی. لەگەڵ ئەم کەسـایەتیانە: عەزیـز محەمەد، سکرتێری پێشوی حیزبی شیوعی، حەیدەر فەیلی نوێنەری حیزبی شـیوعی، یونـادم یوسـف کەنـا نـوێنەری بـزوتنەوەی ئاشـوری، رەشـید عەبدولقادر سەرۆکی دادگای تەمیز، سەید محەمەد نوێنەری بزوتنەوە و هەریەک لە فاروقی مەلا مستەفا، د. نەوزاد ساڵح رەفعەت و د. بەهرام خدر مولود، وەک کەسایەتی سەربەخۆبەشداربون .

هەردولا لەسەر ئەم خاڵانە رێکەوتن:

١. ئامـادەبوانی کۆبـونەوەکە رێکەوتـن کە دەسـتبکرێت بە ئیجرائـاتی یاسایی پێویست بۆ درێژەپێدانی دەورەیەکی هەڵبژاردنی پەرلەمان بۆ یەک ساڵ، لیژنەیەکی پەرلەمانی هاوبەش کە پێکدێت لە بەرێزان (یونادم یوسف کەنـا، فرسـەت ئەحـمەد فرسـەت، سـەید حەسـەن بەرزنجـی) ئامـادەی پێداویسـتیە یاسـاییەکان دەکـات، کە دەبێت پـێش کـاتی تەواوبـونی یاسـایی پەرلەمـان لە ١٩٩٦/٦/٤ ئامادەبێت. پەرلەمـانیش لە کـاتی درێژکـردنەوەکەدا بڕیارە پێویستیەکان وەردەگرێت بۆ بەدیهێنانی ئاشتی و ئاسایی کردنەوەی گشتی وەزعەکە وە ئامادەکردن بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی داهاتوو.

٢. ئامـادەبوان رێکەوتـن لەسـەر بەگەڕخسـتنەوەی پەڕلەمـان، ئەویـش لەرێگای دابینکردنی پێویستیەکان بۆ کۆبونەوەی پەرلەمان و بەردەوامی.

٣. هەردولا رێکەوتـن لەسـەر بەشـداربونی پارتەکـان "پارتیەکـان" و کەسایەتیە سەربەخۆکان لەپەرلەمان، لەگەڵ رەچاوکردنی مەرجە یاسایەکانی پێویسـت بـۆ ئەنـدامانی ئەنجـومەنی نیشـتیمانی کوردسـتان، ئەمەش پـاش درێژکردنەوەی کاری پەرلەمان.

٤. بڕیـاڕ درا کە هەردولا راوێـژی سـەرکردایەتی خۆیـان بـکەن بـۆ دەستنیشـانکردنی شـوێنی کۆبـونەوەی پەرلەمـان، هەروەهـاش لیـژنە سـێ

کەسیەکە بەردەوام دەبێت لە هەوڵدان بۆ چارەی بەپەلەی ئەم کێشەیە.

بە هەمان ناوەرۆک، مەکتەبی سیاسی پارتی لە ١٩٩٦/٦/١٥ دا (پرۆژەی ئاشتی) بڵاوکردەوە، کە ئەویش باس لە جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەی (درۆگیدا) دەکات[٤٠٣].

چونی وەفدی یەکێتی بۆ بارەگای پارتی لە سەلاحەدین، هەنگاوێکی باش و ئیجابی بو، لە جیاتی ئەوەی پارتی ئەو هەنگاوە بە باشی هەڵسەنگێنێت، لێکدانەوەیەکی پێچەوانەیان بۆ کرد و هاتنەکەیان پێ باش نەبو، لەوبارەیەوە فەرەنسۆ حەریری لە لێداونێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی برایەتی دەڵێ: "لە ١٩٩٦/٥/٢٧وەفدێکی یەکێتی هاتە هاوینە هەواری سەلاحەدین، هەڵبەت ئێمە داوامان لێ نەکردبون کە بێن و پێشمان خۆش نەبوو، حەزمان دەکر لە شوێنێکی تر لایان دابنیشین، چونکە پێشەکی ئەوان بۆ ئەوە هاتبون ئێمەش لەبەرامبەردا بچینە هەولێر، ئەوان بۆیە ئەو دەستپێشخەرییان کرد، کە تەنها ئێمە ئیحراج بکەن..دوپاتی دەکەمەوە پێمان خۆش نەبوو ئەوان بێن بۆ ئێرە"[٤٠٤].

ئەم دەستپێشخەرییەی یەکێتی بۆ نزیکبونەوە لە پارتی، لەگەڵ هەوڵی ئەمەریکییەکان یەکیان دەگرتەوە، کە بەنیازی کودەتایەک بون لە بەغدا، بە هاوبەشی پارتی لە سنوری موسڵ و یەکێتی لە سنوری کەرکوک.

لەو کاتەدا، کە ئاسۆیەکی ئاشتی کەمێ بەدی دەکرا، لە ١٩٩٦/٦/١٦ دا، پارتی هێرشی کردە سەر گوندی کەڵەکین، کە بارەگای حسێن ئاغای سورچی لێبو، لە ئەنجامدا حسێن ئاغا و ژمارەیەک لە کەسوکاری کوژران و بەدیل گیران.

---

[٤٠٣] حامید گەوهەری، باشووری کوردستان...، ل ١٨٨.

[٤٠٤] برایەتی ژ٢١٧٩ ی ١٩٩٦/٨/٧.

## کێشەی بارەگای حیزبی دیموکراتی ئێران لە کۆیە

ماوەیەکی زۆر بو ئێران فشاری لە یەکێتی دەکرد کە ئەبێت هەوڵ بدات ئیستگەکەی حیزبی دیموکرات (حدک) لە کۆیە دابخات، ئەم کێشەیە چارەی نەبو تا گەیشتە ئەوەی کە ئێران لە ١٩٩٦/٧/٢٨ دا، لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی، تۆپبارانی بارەگاکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانیان لە قەزای کۆیە کرد.

لەبەرئەوەی هێزەکەی ئێران بەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیدا هاتبون و لەوێوە تۆپبارانیان کرد، رەخنەیەکی ناوخۆیی و دەرەکی روی کردە یەکێتی کە چۆن رێگای داون لە کۆیەوە تۆپبارانی بارەگاکانی حیزبی دیموکرات بکەن.

یەکێتی دەربارەی ئەو هێرشەی ئێران، رونکردنەوەیەکی دەرکرد، کە تێدا نوسیبوی: "ئێرانیەکان لەسەرەتای مانگی تەموزەوە سنورەکانیان داخست و ئینزاری ئێمەیان کرد، کە ئەگەر رێگا بە (حدکا) بدەین لە کوردستانی عێراقەوە چالاکی چەکدارانە سازبکات بۆ ناو ئێران، ئەوا ئەوان پەلامار دەدەن و ئەگەر ئێمەش لەسەریان هەڵبدەینێ، شەڕمان دەکەن بۆ ئەو مەبەستەش هێزێکیان لەسەر سنور ئامادەکردبو".

" یەکێتی نیستیمانی بەرانبەر بە زەختی کۆماری ئیسلامی ئێران لە رادەیەکی سنورداردا سازشی سیاسی کرد. دیارە بێگومان رێگە پێدان بە هێزی پاسداران کە بچنە سەر مەقەڕەکانی حیزبی دیموکرات، ئەگەرچی لە ژێر زەختی زۆری کوردستانی ئێراندا. بەڵام لە هامان کاتدا ئەوەش بزانن کە حیزبی دیموکرات پێشتر لە هێرشەکە ئاگادارکرابۆوە و هەر بۆیە زیانێکی

پێنەگەیشت. لە واقیعدا مەبەستی ڕژێمی ئێران، حیزبی دیموکرات نەبوو، بەڵکو مەبەستی شکاندنی سومعەی یەکێتی بوو، حیزبی دیموکرات بوو بە بیانووی بەڕێوەچوونی ئەو پلانە کە تا ئێستاش لەسەرشانی یەکێتی قورسایی دەکات" (سێ ساڵ لەگەڵ ئیبراهیم عەلیزادە، ل ٢٩٣- بەهمەن سەعیدی)

یەکێتی، (حدکا) و هەمو حیزبە کوردستانیەکانی ئاگادارکردبۆوە، کە ئەوان پێش هێرشەکە هەوڵی خۆیان داوە: "ڕۆژی ٧/٢١ یەکێتی یاداشتێکی ئاراستەی دەفتەری سیاسی (حدکا) کرد و ڕۆژی ٧/٢٤ وەفدێکی یەکێتی چونە لای دیموکرات و کۆبونەویان لەگەڵدا کردن، بەداخەوە (حدکا) بەدەنگی داواکاریەکانەوە نەهات. ئەوە بو شەوی ٢٧-٧/٢٨ لە دوقۆڵەوە، هەندێکیان لە حاجی ئۆمەران و ئەوانەی تر لە ڕێگای مەریوانەوە هاتنە ناو خاکی کوردستانی عێراقەوە، هێزەکانیان پێکهاتبو لە ٤٠٠ پاسدار و چەندەها سەیارە. لە بەرەبەیانی ڕۆژی ٧/٢٨ ڕۆشتن بەرەو کۆیە و دەستیان کرد بە تۆپبارانکردنی بارەگاکانی (حدکا) و چەنین شوێنی کۆیە (حەمامۆک و ئازادی) و گوندی هەرمۆتە. سەرکردایەتی یەکێتی یەکسەر پەیوەندی بە ئێرانەوە کرد و داوایان کرد کە هێرشەکە بوەستێنن، وەڵامی ئێران ئەوە بو، ئەگەر (حدکا) خەباتی چەکداری ڕابگرێت، ئەوە ئەوان مانیع نین (حدکا) لەهەر شوێنێکی کوردستانی عێراق دانرێت. لەسەر داواو پێداگری یەکێتی هەمان ڕۆژ ٧/٢٨ شەڕەکەیان وەستاند".

لە ١٩٩٦/٨/٤ دا حیزبی دیموکرات و یەکێتی کۆبونەوە و بەیانێکیان دەربارەی ئەو بارە ئاڵۆزە دەرکرد، تێداهاتبو: "لە ئاکامی ئەو وتووێژانەدا، بە تەوافق گەیشتین، کە حیزبی دیموکرات، بەرنامە و کار و تێکۆشانی خۆی بە چەشنێکی ئەوتۆ دابرێژێتەوە کە لەگەڵ هەلومەرجی کوردستانی عێراقدا گونجاو بێت و یەکێتی نیشتیمانی کوردستانیش وێرای تەزمینی تێکۆشانی سیاسی حیزبی دیموکرات، لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا ئەمن و ئاسایشی ئەندامان و لایەنگیرانی ئەو حیزبە بپارێزێت."

هێرشی ئێران بۆ سەر بارەگاکانی حدکا، بە سود بۆ یەکێتی نەگەڕایەوە، بەڵکو کاریگەری سلبی کردە سەر ناوبانگی یەکێتی لای کوردی ئێران کە بە

(هێزی پشتیوان) ناوی دەرکردبو: "زەرەرمەندی یەکەم، یەکێتی و پاشان ئێران بوو، ئەوەش سودی یەکەمی پێ دەگات حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانە و پارتیش بەکاری دەهێنێ بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی"[٤٠٥].

## دەستپێکردنەوە شەڕ

ئاشتی کاتیی نێوان یەکێتی و پارتی زۆری نەخایاند، لە ناوەڕاستی ئابی ١٩٩٦ ەوە لە ناوچەکانی قەسرێ، باڵەک، گەلاڵە، حاجی ئۆمەران، چۆمان، وەرتێ، برادۆست، ڕەواندز، سەفین، ئۆردوگای شاویس و پیرزین، دوڵی خانەقا، شەڕێکی گەرم دەستپێکرد و چەند ڕۆژێکی خایاند، شەڕ گەیشتە نزیک سەری ڕەش و بە پێی ڕونکردنەوەکانی یەکێتی، ئەوان لەو شەڕانەدا (دەستکەوت) ی زۆریان بەدەستهێنا و (کوژرواوی و بریندار و دیلی) زۆری پارتی لێکەوتەوە و ناوچەیەکی گەورەی ژێر دەسەڵاتی پارتی کەوتە ژێر دەستی یەکێتیەوە.

ئێران ڕۆڵی هەبو لە هاوکاری یەکێتیدا و بۆردومانکردنی ناوچەکانی پارتی.."تۆپخانەی ئێران بە خەستی بۆردومانی هێزەکانی پارتی دەکرد، بە چاوساغی و ڕەسەدی یەکێتی لە حاجی ئۆمەران، لە چۆمان و دەوروبەری بە دەیان پێشمەرگەی پارتی بونە قوربانی شەڕی ناوخۆ، هێزی پارتی لە پەلوپۆ کەوتبون، شەڕیان پێ نەدەکرا"[٤٠٦].

هاوکاری ئێران بۆ یەکێتی، ترسێکی لای پارتی دروستکرد، لە جەولەی شەڕەکانی پێشو، ئێران لە ناوچەکانی پێنجوین و قەلادزێ و چۆمان، یارمەتی زۆری پارتیدا، ئەمجارەیان بە پێچەوانەوە، ئێران بەرژەوەندیەکانی لەوەدا بو، کە یارمەتی یەکێتی بدا، دەستتێوەردانی ئێران لە شەڕەکەدا، کارێکی خراپ و ئاگر خۆشکەر بو، بە هیچ جۆرێک بۆ یارمەتی ئەو لایەنە نەبو کە هاوکاری دەکردن، زەرەرمەندی یەکەم لەم شەڕانەدا تەنها خەڵکی

---

[٤٠٥] محەمەد حاجی مەحمود، ڕۆژ ژمێری.. بەرگی ٤، ل ٥٦٣.

[٤٠٦] هەمان سەرچاوە، ل ٥٧٤.

کوردستان بوە، چەند یارمەتیەکەی ئێران لە قۆناغێکدا بۆ پارتی پڕ زیان بو، ئەوەندەش لەم قۆناغەدا بۆ یەکێتی!.

لە نامەیەکی مام جەلالدا لە ٨/١١ بۆ هەریەک لە کۆسرەت رەسوڵ و جەبار فەرمان، دەردەکەوێت، کە یەکێتی لە خۆ ئامادەکردندا بوە بۆ هێرشکردنە سەر پارتی و لەم هێرشەشدا، پشتیان بە ئێرانیەکان بەستبو. بارودۆخەکە ئەوەندە ناسک و ئاڵۆز بوە، سەرکردایەتی یەکێتی بە پەرۆشەوە، خەمی بوە، بزانێت هەنگا و بە هەنگاو چی روئەدات و بەرەی شەڕەکان چۆنن و چ گۆڕانکاریەک رویداوە، بۆ نمونە مام جەلال لە ٨/١٧ دا، ئەم بروسکەیە بۆ سەرجەم فەرماندەکان دەنێرێت: "پێویستە لەسەر هەمو لەشکرەکان هەمو رۆژێک، سێ جار موقیف بدەن، تەنانەت ئەگەر هیچیش روی نەدابێت"[٤٠٧].

نەوشیروان مستەفا لە ١٩٩٦/٨/٢٥ نامەیەک بۆ مام جەلال دەنێرێت و بەم شێوەیە باس لە رۆڵی ئێران دەکات لەم شەڕانەدا:

" ١. ئێران نایەوێت کێشەی پارتی و یەکێتی، نە بە شەڕ نە بە رێکەوتنی سیاسی، یەکلایی ببێتەوە، ئەیەوێت وەکو ئێستا بمێنێتەوە.

٢. ئێران، بەم زەغتەی لە پارتی ئەکات، ئەیەوێت پارتی بهێنێتەوە ژێر رکێفی خۆی.

٣. مەبەستێکی تری ئێران لەم جموجوڵەی ئێستای تێکدانی موبادەرەی ئەمریکیە".

---

[٤٠٧] پاشکۆی پانۆرامای ٨/١٨، ژمارە ١٣١ ی یەکێتی نیشتیمانی.

## هاوپەیمانی ئێران - یەکێتی، عێراق - پارتی وەک هەوێنی گەرمکردنی شەڕ

ئابی ١٩٩٦، مانگی توندکردنی پەیوەندی نێوان پارتی و رژێم بو، پارتی هەوڵی ئەدا کە ئەم پەیوەندییە، هەنگاو بە هەنگاو ئاشکرا بکات، بۆئەوەی نەبێتە کارێکی کتوپر، لەبەرئەوە ٣١ ئاب روداوێکی نامۆ نەبو لای هێزە سیاسییەکان و پارتی خۆشی نەی ئەشاردەوە کە خەریکی پەیوەندیە بە رژێمەوە، مەسعود بارزانی لە ١٩٩٦/٨/١٦ دا، بە بۆنەی یادی دامەزراندنی پارتیەوە لە کۆبونەوەیەکی جەماوەری لە سلاحەدین دەربارەی پەیوەندی لەگەڵ رژێم وتی: "پارتی لە هەمو قۆناغەکانی مێژوی خەباتی خۆیدا، نەترساوە کە رێکەوتنێک مۆر بکات، چالاکیەکانی هەمیشە بە ئاشکرا کردوە و مساوەمەی لەگەڵ هیچ رژێمێکدا نەکردوە، لە هەمان کاتیشدا پارتی سڵناکاتەوە، کە هەر رێکەوتنێک بکات کە بەرژەوەندی گەلی کوردستانی تێدا بێت..پارتی بە ئاشکرا دەیکات، بێ ئەوەی روخسەت لە هیچ کەسێ وەرگرێت، جگە لە گەلی کورد نەبێت"[٤٠٨].

دەربارەی شەڕی نێوان یەکێتی و پارتی و رۆڵی ئێران، پارتی لە ١٩٩٦/٨/٢٠ بانگەوازێکی بە زمانی عەرەبی دەربارەی شەڕەکە دەرکرد و هێرشی زۆری بۆ ئێران تێدابو[٤٠٩]، کۆمەڵێک هێزی سیاسی دەرکردنی ئەم بەیانەیان بەو زمانە زۆر زبرە دەبەستەوە بەوەی کە پارتی ویستویەتی زەمینە بۆ ٣١ ئاب خۆش بکات و نیشانی بدات کە ئەوان ناچاربون داوای هاوکاریان لە بەغدا بکەن.

---

[٤٠٨] عبدالقادر البيفكاني، الحركة القومية المعاصرة، من مصطفى الى مسعود بارزاني، القاهرة ١٩٩٨، ل ٣٢٤.

[٤٠٩] خەون یان مۆتەکە،١، ل ٢١٧.

ڕۆژ بە ڕۆژ، هەست دەکرا کە پەیوەندیەک لە نێوان هێزەکانی ڕژێم و پارتیدا بەرەو پێشەوە دەچێت، لە بروسکەیەکی محوەری هەولێری یەکێتی لە ٢٥-١٩٩٦/٨/٢٦ سەعات ٩ شەو دەنوسن: "وا پێدەچێت ڕژێم و پارتی هێرش بکەن بۆ جەبهەکانی کانی قرژاڵە و سێبەردان و تەحەشدی زۆریان هەیە لەو ناوچەیە" لە بروسکەیەکی تردا لە ١٩٩٦/٨/٢٧ دا هاتوە: "کەتیبەیەکی دەبابات هاتوتە ناوچەی بەرامبەر سێنارە لە نزیک ڕێگای ئاڵتون کۆپری-قوشتەپە، هەمو هێزەکان حەرەسی جمهورین.." هەروەها لە هەمان ڕۆژدا بروسکەیەکی تری یەکێتی ئاراستەی سەرکردایەتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان کراوە: "ئیمرۆ ٨/٢٧/ نزیکەی ١٠٠ سەیارە و شاحنە لە هێزی عەسکەری هاتوتە مەفرەقی حەمدانیە- موسڵ، لەوێوە بۆ ڕێگای خازەر - فایدە، ڕێگای موسڵ ئاکرێ"

بارودۆخی سەربازی ئاڵۆز بو، کاتێکیش یەکێتی، خەریک بو، ئابڵوقەی تەواوی پارتی بدات و دەست بخاتە قورقوراگەیەوە، حسێن عارف زۆر جوان نەخشەکەی کێشاوە کە دەنوسێت: "هەواڵی هێرشی هێزەکانی یەکێتیمان لە دۆڵی بالیسانەوە بۆ خەلیفان و لە هیرانەوە بۆ شەقڵاوە و سورچییەکانیش بۆ سپیلک دەکەوێتە بەرگوێ. بەم پێیە ئاشکرایە کە ئەگەر خەلیفان و سپیلکیان لەژێر دەست دەربهێنرێت، ئەوا پردی قەندیلیشیان لە دەست دەچێ و لە ئەنجامدا، سەلاحەدین و سەری ڕەشی مەڵبەندی سەرکردایەتیان دەکەونە حاڵەتی ئابڵوقەدانەوە. خۆ ئیتر بەدویدا، یا دەبێ بە پێی خواستەکانی یەکێتی مل بۆ ئاشتی بدەن، یا بەلایەنی کەمەوە لەوێش هەڵدەکەنرێن و دەبێ بەرەو بادینان هەڵبێن. واتە پارتی گەڵێک بچووک دەبێتەوە و دەخرێتە ناوچەیەکی تەنگەبەری کوردستانی لەمەڕ خۆمان"[٤١٠].

ئەمریکا زۆر قەڵس بوبو بەم شەڕە و زیادبونی ڕۆڵی ئێران، لەبەرئەوە، یاریدەدەری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، پیلترۆ لە ١٩٩٦/٨/٢٨ دا تەلەفۆنی لەگەڵ هەریەک مەسعود بارزانی و مام جەلال کردو و

---

[٤١٠] حسێن عارف، بیرەوەری، ب ٢، ل ٢٠٧.

داوای وەستانی شەڕی لێکردن و داوایکرد کە نوێنەرانیان لە لەندەن کۆببنەوە و ئامادەبن بۆ کۆبونەوەیەکی هاوبەشی مام جەلال و مەسعود بارزانی.

لە ١٩٩٦/٨/٣٠ دا نـوێنەرانی یەکێتـی و پـارتی و ئەمریکـی و نـوێنەرنی بەریتانیا و تورکیاش بەشداربون لەو کۆبونەوەیەدا و هەمو لایەک ڕێکەوتن کە دەرگای ئاشتی بکەنەوە و هی شەڕ دابخەن و پرۆژەیەکیان ئامادەکرد، کە ڕۆژی دوایی ئیمزای بکەن.

فێڵی پارتی لەوەدایە، کاتی ئەوان خەریکی کۆبونەوەی ئاشتی بون لە لەندەن، سوپای عێراقی بە تۆپ و تانکەوە بە پاڵپشتی و کۆمەکی پارتی بەرەو هەولێر دەهاتن و هەنگا و بە هەنگاو لەناو شار نزیک دەبونەوە، پێش کۆبونەوەکە پارتی ئەیزانی بۆ ڕۆژی دوایی چی لە هەولێر ڕوئەدا، ئەم کۆبونەوەیە لە لەندەن تەنها شانۆگەریەکی سیاسی بو، لە دەرهێنانی پارتی.

# ٣١ ئاب و داگیرکردنی هەولێر

تراژیدیای مێژوی کورد، هەر جارە بە شێوەیەکی قێزەونانە و جیاواز خۆی پیشان داوە و هاولاتیانی کوردستان بونەتە سوتەمەنی و قوربانی ئەو قۆناغە و ئەندازیارە و نەخشەکێشەری ئەو درامایە نەیارانی کورد بون.

رۆژی ٣١ ئابی ١٩٩٦، کە پێویست بو، لە لەندەن رێکەوتنی شەڕ وەستان و ئاشتی لە نێوان یەکێتی و پارتی بە هاوکاری ئەمریکا، بەریتانیا و تورکیا بێتە کایەوە، لەو کاتەدا * سوپای عێراق بە ٣٠ هەزار سەرباز لە هەردو فەیلەقی یەک و پێنجی گاردی کۆماریی لەگەڵ هێزی ئاسمانی عێراقی لە هێرشەکەی ٣١ی ئابدا بەشداربون و بەشێک لەو تانکانەی کە بەکارهاتوون لە جۆری (T٧٢) بون، کە ئەو دەمە پێشکەوتووترین تانکی سوپای عێراقی بون. لەپاڵ ئەم هێزانەدا چەندین هێزی تری سوپای عێراق لە هێرشەکەدا بەشداربون، لەوانە: هێزەکانی فەرماندەی عەمەلیاتی "ئەلاهوئەکبەر"ی گاردی کۆماریی، تۆبخانەی فەرماندەیی عەمەلیاتی "ئەلاهوئەکبەر"، هێزەکانی گاردی بەغدا، هێزەکانی عەدنانی گاردی کۆماریی، لیوای ٣٩ی پیادەی گاردی کۆماریی، لیوای کۆماندۆی گاردی کۆماریی، لیوای ٣٨ی پیادەی گاردی کۆماریی، لیوای زرێپۆشی ٤٠، تۆبخانەی فەرماندەی هێزەکانی عەدنانی گاردی کۆماریی، تیپی ٧ و ٨ و یەکی پیادە و ئالی، لیوای چوار و پێنج و شەشی پیادە، تۆبخانەی فەرماندەیی هێزەکانی گاردی کۆماریی بەغدا"[٤١١].

* ئەم ژمارانە ئەگەر زیادەی پێوە نرابێت، بەڵام دیمەنی دەبابەکانی عێراقی لە ناو هەولێردا، بەس بون بۆ ئەوەی ورەی هێزەکانی یەکێتی بروخێنێت،

---

[٤١١] ساتیی شار پرێس، ٢٠١٨/٨/٣١.

ئەوە وایکرد کە هێزەکانیان بەرگریەکی وایان نەکرد کە دیاربوبێت"[412].

ئەم هێزە بە هاوکاری پارتی هاتن و هەولێریان داگیرکرد و یەکێتی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە شارەکە دەرکرا و ژمارەیەکیان بە دیل گیران. سوپا و چەکدارانی پارتی ئەوەی توانیان دژ بە یەکێتی و ئەندام و هەوادار و دۆست و بارەگا و شوێنە گشتیەکان کردیان و تالانێکی زۆریانکرد و زیانێکی گەورەیان لە یەکێتی و هێزەکانی بەربەرەکانی عێراقی بە گشتی و ئەندامانی کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی (INC) بە تایبەتی دا.

لە هەمان رۆژدا، واتا لە ۳۱ ئابدا، مەکتەبی سیاسی پارتی بەیانێکی لەژێر ناوی (هەولێری پایتەخت ئازاد کرا) دەرکرد کە باسی لە شەڕەکانی نێوان یەکێتی و پارتی ئەو هەوڵە سەرنەکەوتوانەی بۆ بەرقەراربونی ئاشتی و ناچاری پارتی پیشان ئەدات بۆ ئەو کارە هاوبەشە بۆ داگیرکردنی هەولێر لەگەڵ رژێمدا، لە بەیانەکەدا هاتوە "پارتی مافی رەوای خۆی لە بەرگری لە خۆکردندا بەکار هێنا و مافی رەوای خۆی بوو داوای هاوکاری رەوا و مەحدود لە هەر کەسێک بکات کە ئامادەی ئەو هاوکاری کردنەبێت. بۆ ئەوەی ئەو هەڵوێستە ئازاد و سەربەخۆیی کارمان لە ئێستا و داهاتودا لە دەست بدات، ئەوە بو حکومەتی عێراق بە سوپاسەوە بە دەنگمانەوە هات و هاوکاری کردین"[413].

مەسعود بارزانی لە چاوپێکەوتنێکی کورتدا لە گەڵ گۆڤارێکی ئەڵمانی دەڵێ:

پ: ئەم هاوپەیمانێتییەتان لەگەڵ سەدام چۆن هاتە کایەوە.

و: ئێمە لە رێگای خۆمانەوە نامەمام بۆ نوسی، هەر ئەوە بوە و هیچی تر، ئێستا هیچ هاوپەیمانێتییەکمان لەگەڵ ئەواندا نیە و نەماوە.."[414].

هەروەها لەو چاوپێکەوتنەدا هێرشی توند دەکاتە سەر ئەمەریکا و CIA و

[412] آوفرا بینغیو، کرد العراق بناء دولة داخل دولة، ل۳۱۳.

[413] حامید گەوهەری، باشوری کوردستان...، ل ۲۲۳.

[414] (Der Spiegel) Nr. ٣٩- ١٩٩٦

کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی کە بە ئەرکی سەرشانیان هەڵنەساون و هاوکاری بارزانیان نەکردوە لە ئەگەری هاتنی سوپای ئێراندا.

هەروەهـا سـامی عەبـدولرەحمان ئەنـدامی مەکتەبـی سیاسـی پـارتی لە چاوپێکەوتنێکـدا لەگەڵ (دەزگـای رۆژنـامەوانی ئەڵمـانی dpa) دەڵـێ: "هـاتنی سوپای عێراق بۆ هەولێر، لە ئەنجامی داخوازی حیزبەکەی بوە بۆ سـەدام حسێن کە بە (ئاخر رێگا) دایە قەڵەم، لە کاتێکدا کە ئێران سـوپاکەی دەنێرێتە سەروی عێراق، مافی عێراقە کە سوپاکەی رەوانەی هەولێر بکات"[٤١٥].

پارتی بەم شێوەیە باسی داگیرکردنی هەولێری دەکرد: "لە ماوەی ١٠ سـەعات شەڕدا، تونرا دەست بەسـەر هەولێردا بگیرێت و جەلالیەکان دەرکرێن و دەست بەسەر سکرتاریەت و مەکتەبی سیاسی و هەمو بارەگاکانیان و هێزەکانی عێراقیش لە رۆژانـی ٢ و ٣ی ئەیلـولی ١٩٩٦ دا گەڕانەوە بـۆ شـوێنەکانی خۆیـان، هەنـدێ لەسـەرکردەکانی یەکێتـی گیـران و ئەوانـی تـریش رایـان کرد..هەنـدێ خروقـات رویـدا، کـاتێ یەکـێ لە مەفرەزەکـانی موخـابەراتی عێراقـی، مەشـغوڵی پارتیـان بە هەل زانی کە خەریکی دەست بەسەراگرتنی شار بو، ئەوانە هـاتن چەنـد کەسـێکی هێزەکانی بەربەرەکانی عێراقیان دەستگیر کرد و چونە بارەگای هەندێکیانەوە .."[٤١٦].

## ئەمەریکا و ٣١ ئاب

یەکێتی زۆرجـار باسـی پتەوی دۆسـتایەتیی خـۆی و ئەمریکـای دەکـرد و هەر رۆژی هێرشـەکە بە دەستپێشـخەری ئەمریکـا لە لەنـدەن کۆبـونەوەی هاوبەش دەکرا، کەچی پارتی ئەم هێرشـەی کرد و بەڵێنەکـانی کە دابـوی بە ئەمریکا، پێشێل کرد و هاوکاری عێراقی بە باشتر و کاریگەر تر زانی لە هـی ئەمریکا.. سەرەرای ئەمانە، ئەمریکا هیچ هەڵوێستێکی نەبو، بێ هەڵوێسـتی و

---

[٤١٥] Frankfurter Rundschau Nr. ٣٦-٢٠٥- ٣/٩/١٩٩٦

[٤١٦] راپۆرتی کۆنفرانسی لقی ٦ ی ئەوروپای پارتی دیموکراتی کوردستان لە ٢-٣/١١/١٩٩٦، ل ٨

بێ تەرەفی هەڵبژارد، ئەویش بە بیانوی ئەوەی کە سوپای عێراقی (نەهاتۆتە سەروی هێڵی ٣٦، ناوچەی دژە فڕین) لەبەرئەوە ئەمەریکا ناتوانێت هێرشیان بکاتە سەر یان ڕێگایان لێبگرێت!.

خۆشباوەڕی مام جەلال لەوەی ئەمەریکیەکان دێنە شەڕەکە و هاوکاری یەکێتی دەکەن، بارودۆخێکی باوەڕبونی لای سەرکردایەتی یەکێتی دروستکردبو کە خۆیان بۆ ئەگەری یارمەتی و پشتگیری نەکردنی ئەمەریکا ئامادە نەکردبو: "بروسکەی مام جەلال بۆ (م.س) یەکێتی و تەئکیدی خۆیان ئەوەندە یەکێتی دڵنیاکردبوو کە هەلیکۆپتەری ئەمریکا بێت بۆ مەکتەبی سیاسی یەکێتی و هەڵیان بگرێت و بیانبات"[417].

مام جەلال لە چاوپێکەوتنێکدا دەربارەی ڕۆڵی ئەمریکا لەو کاتەدا دەڵێ: "پێش ئەوەی سوپای عێراق هێرش بکات، ئێمە لەگەڵ ئەمەریکیەکاندا قسەمان کرد و ئەوان بەڵێنیاندا و گوتیان "ئەگەر عێراق هێرش بکات، ئەوە ئێمە لێیان دەدەین" ئێمە پێمان وابو، ئەگەر سوپای عێراق هێرش بکات و ئەمەریکا لێیان بدات، ئەوا ئێمە نەک هەر دەیانشکێنین، بەڵکو دەچین چەکەکانیشیان کۆدەکەینەوە، ئێمە پلانەکەمان لەسەر ئەو بۆچونە دارشتبو..من شەوێ عومەر فەتاحم لە قەلاچوالانەوە ناردەوە بۆ هەولێر بۆئەوەی بە برادەران بڵێ، ئەمریکیەکان لێیان ئەدەن. لەو کاتەدا قوبادی کورم لێرە بو، ئەو خۆی لەگەڵ پیلترۆ (جێگری وەزیری دەرەوە بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەراست) تەلەفۆنی کرد و ئەوان دوپاتیان کردەوە و پێیان گوتین: (مەترسن ئێمە لێیان دەدەین و تەمێیان دەکەین)"[418].

دەربارەی خۆشباوەری یەکێتی بە بەڵێنەکانی ئەمریکا و هەڵەکانی خۆیان مام جەلال دەڵێ: "هەڵەکەی ئێمە ئەوەبو، کە پێویست بو ئێمە حسابی ئەوە بکەین، ڕەنگە ئەمریکا لە سوپای عێراقی بدات، یاخود لێی نەدات. ئەگەر ئێمە

---

[417] محەمەد حاجی مەحمود، ڕۆژ ژمێری...، بەرگی ٤، ل ٥٨٣.

[418] دیداری تەمەن، بەرگی ٢، ل ٢٥٠.

بمانزانیایە ئەمەریکا لێیان نادات، ئەوا بە جۆرێکی تر شەڕەکەمان دەکرد، بەو جۆرەی کە تەنها بەخۆمان بکرێت."[419].

ئەمەریکا، نیشانی دا، کە ئەو وڵاتە بەرژەوەندیەکانی خۆی لەسەرو هەمو بەڵێنێکیەوەیە، ئەمە تەنها لە ٣١ ئابدا روینەدا، بەڵکو لە کۆن و ئێستا و ئایندەدا بە هەمان شێوە دەبێت.

داگیرکردنی هەولێر، چەند دژی یەکێتی بو، ئەوەندەش دژ بە ئەمریکا بو، سەدام ویستی پیشانی بدات، کە ئەو بڕوای بەو سنورانە نیە کە ئەمریکا و نەتەوەیەکگرتوەکان کێشاویانە.

ئەم هەڵوێستەی سەدام، وای لە سەرۆکی ئەمریکا کرد، کە دوای دو رۆژ، خواروی عێراقی بە ٢٧ ڕۆکێتی دورهاوێژ لە دەریاوە بۆردومان کرد و هێڵی دژفرینی لە باشوری عێراقەوە فراوانتر کرد، کە فرۆکەکانی سەدام نەتوانن بەسەر شوێنانە بفڕن و شیعەکان بۆردومان بکەن. زوربەی وڵاتانی ئەوروپا جگە لە فەرەنسا ئەم هێرشەی ئەمریکایان بە باش دایە قەڵەم."[420].

هێنانی سوپای عێراق لە لایەن پارتیەوە، کەمێک چاوەڕوانکراو بو، پارتی هەمو هەوڵێکی ئەدا بۆئەوەی لە گۆرەپاتی کوردایەتی دورنەکەیتەوە، بۆ گەیشتن بەو مەبەستە هەمو ڕێگایەکی بە رەوای دەبینی: "هەڵبەتە پێویستە ئەوە بڵێین کە لە خەباتی ئۆتۆنۆمیخوازیدا تۆوی ئەو کولتورەی کە تیایدا داگیرکەرێکی دیکە کرا بە فریادرەس هەر لە ساڵی ١٩٦١ەوە، لەگەڵ دەستپێکردنی بزاڤی ئەیلول، چێنراوە، ٣١ ئابی ١٩٩٦ یش بەرهەمێکی ئەو تۆوە بوو، ئەگەر چی ٣١ی ئاب لە زەمینەیەکی دیکەدا روویدا، بەڵام لۆژیکە هاوبەشەکە ئەوە بوو: لە پێناوی مانەوەی خۆم و بردنەوەی شەڕ، لە وەرگرتنی یارمەتیدا هیچ هێڵێکی سور نیە! پێشتر ئەو لۆژیکە بۆ ماوەی ١٤ ساڵ بووە بەهانەی ئەوەی کە بزاڤی ئەیلول شای ئێران بکات بە فریادرەس،

[419] هەمان سەرچاوە، ل ٢٥١.

[420] Der Tagesspiegel - Nr. ١٥٧٣٥- ٤/٩/١٩٩٦

بەڵام دواتر لە ٣١ ئابدا بۆ بردنەوەی شەڕ دژی "براکان"، دیسان هێڵی سور بەزێنرا و ئەمجارەیان یارمەتی لە ئەندازیاری ئەنفال و کیمیابارانکردنی هەڵەبجە، سەددام حسێن، وەرگیرا"[٤٢١].

## پارتی و بەعس

هێرشی سوپای عێراق بۆسەر هەولێر، چاوەڕوانکراو بو، دەمێک بو باس لە پەیوەندی نێوان پارتی و رژێم دەکرا و باس لە هاتوچوی نوێنەرانی هەردولا دەکرا بۆلای یەکتر، بەڵام ئەوەی چاوەڕێ نەدەکرا، هەرەسهێنانی هێزی یەکێتی بو، کە هیچ خۆی بۆ ئەو هێرشە ئامادە نەکردبو، نەشیتوانی لەناو شاری هەولێر بەرگری بکات، ئەوەی کە یەکێتی پشتی پێبەستبو، قسەی زارەکی ئەمریکا یاخود باوەڕخۆشی بو کە ئەمریکا هەڵوێستی دەبێت و بە فرۆکە لە سوپای عێراقی ئەدا.

دەربارەی پەیوەندی پارتی و رژێمی عێراق، تاریق عەزیز لە کتێبەکەیدا (رجل و قضية) دەنوسێت: "لە کانونی دوهەمی ١٩٩٢ دا، مەسعود بارزانی سەردانێکی نهێنی کردین و سەرۆکیشی بینی و گوتی ئێمە رێکەوتنمان قبوڵکرد، بەڵام جەلال تاڵەبانی بە هاندانی ئەمریکا رەتیکردەوە...هەروەها نوسیویێتی: مەسعود داوای لێکردین و گوتی: هەولێر کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئێرانیەوە، ئێرانیەکان و جەلال دەیانەوێت لەناوم بەرن، داوای هاوکاریتان لێدەکەم، ئێمەش چوینە ناو هەولێر و تاڵەبانی چوە دەرەوە لێی و لە ئابی ١٩٩٦ دا تەسلیمی پارتی دیموکراتی کوردستانمان کرد و هێزەکانی عێراق کشانەوە بۆ شوێنی خۆیان"[٤٢٢].

---

[٤٢١] د. بورهان آ یاسین، د. سەردار عەزیز، دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان، لە ناوەوە بونیادنان، لە دەرەوە دانپیانان، چاپی یەکەم ٢٠١٧، ل٢٥٠.

[٤٢٢] طارق عزيز، الرجل و القضية، ل ١٦١.

مەسعود بارزانی خۆی دان بەو هاوکاریەی لەگەڵ بەعسدا دەنێت و دەڵێ: "کاتێ هەستم بە مەترسی دەرەوەکرد، لە ١٩٩٦/٨/٢٢ دا نامەیەکم بۆ سەرۆک سەدام حسێن نوسی و ئەویش وەلامێکی ئیجابی دامەوە"[٤٢٣].

هەروەها نە بارزانی و نە بەعس، ئەم ڕێکەوتنەیان نەشاردەوە، "مەسعود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٩٩٦/٩/١ دا، بەیانێکی دەرکرد و سوپاسی سەدام حسێنی کرد کە هێزی سەربازی ناردوە بۆ دەستبەسەراگرتنی هەولێر، هەروەها باس لەو هاوکاریانە لە ڕژێم دەکات دەڵێ، وتی: "سوپاسی حکومەتی عێراق دەکەین کە بەدەم داخوازیەکەمانەوە هات و هاوکاری کردین".

هەروەها (تاریق عەزیز) ڕۆژی شەمەی ٨/٣١ لە ڕونکردنەوەیەکیدا وتی: "سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان لە ٢٢ ی ئابدا نامەیەکی بۆ سەرۆک سەدام حسێن نوسی و تێدا هاتبو: ناوچەی چۆمان و سیدەکان لە ١٧ ی ئابەوە، توشی هێرشێکی درندانەی هاوبەشی نێوان گروپی جەلال تاڵەبانی و ئێران هاتوە، کە بۆتە هۆی شەهید و بریندداربونی هاولاتیان و زیان گەیاندن بە موڵک و ماڵیان. مەسعود بارزانی لە نامەکەیدا نوسیویێتی، کە ئەم پیلانە گەورەترە لە توانای ئێمە، بۆیە داوا لە بەڕێزتان دەکەم کە فەرمان بدەن بە هێزی چەکداری عێراقی بۆئەوەی بێن بۆ هاوکاریمان، بۆ ئەوەی بەر لە هێرشی بێگانە و پیلانی دوژمنکارانە جەلال بگرین"[٤٢٤].

هاتنی سوپای بەعس، کارێکی نەهێنی نەبوە، هەمو دەزگاکانی عێراق بە شانازیەوە لەو بارەیەوە ئەدوان و ئەیاننوسی کە (سەرۆک صەدام) بە دەنگ بارزانیەوە هاتوە، مانشێتی ڕۆژنامەی (العراق) نوسیبوی: "مەسعود بارزانی سوپاسی سەرۆکایەتی دەکات بۆ داوای ڕزگارکردنی هەولێر،

---

[٤٢٣] التیرات السیاسیة، ل ٥٥٥.

[٤٢٤] المؤتمر، ژ ١٦٥ ی ١٩٩٦/٩/٦،زمانحاڵی کونگرەی نیشتیمانی عێراقی INC .

کۆتـــایی رۆڵـــی قێزەونـــانەی جەلال و ســـەرکەوتنی گەلـــی عێـــراق..[٤٢٥].

ســـەدام حســـێن لە ١٩٩٦/١١/١٨ دا بە بـــۆنەی رێزلێنـــان لەســـەرکردە سەبازییە عێراقیەکان کە سەرپەرشتی هێرشی سەر هەولێریان کرد، لەوانە وەزیـری بەرگـری سـوڵتان هاشـم ئەحـمەد، قوصـەی سـەدام حسـێن، سەرپەرشتیاری گاردی کۆماری و عەبدولواحید شنان، سەرۆکی ئەرکان، سەدام لەم رێز لێنانەدا زۆر بە درێژی باسی رۆڵی سوپای عێراقی کرد لە جەنگـی دژ بە داگیرکەرانـی نـاوە و دەرەوە و رزگـارکردنی هەولێـر، لە وتارەکەیدا بە هیچ جۆرێک باسی لەوە نەکردوە کە مەسعود بارزانی داوای ئەو هاوکـاریەی کـردوە، تەنهـا لە بەشـێکی دا دەڵـێ: "سـڵاو لە کوردەکـانی گەلەکەمان، ئەوانە لەگەڵ ئێوە جەنگان و ئێوەش لەگەڵیان جەنگان، سڵاو لە رۆڵەکانی گەلەکەمـان لە نـاوچەی ئۆتۆنـۆمی و هیـودارم ئەوانەی بە هەڵەدا چون و لایانداوە بگەڕێنەوە ریزی نیشتیمانی"[٤٢٦].

گرتنـی هەولێـر و شـەڕەکانی دوایـی، کەلێنێکـی زۆر گەورەتـری لە جـاران خستە نێوان یەکێتی و پارتیەوە، ٣١ ئاب، بارودۆخێکی نوێی هێنایە کایەوە کە بە ئاشـکرا دوژمـنە سەرسـەختەکە ببێـت بە بەشـێکی کـاریگەر لە کێشـە ناوخۆیەکاندا، ئەم شانۆگەریە یەکەم جار نیە لە مێژوی سیاسی گەلی کوردا رویدابێت، بەڵکو ئەمە چەندجارێک دوبارە بۆتەوە.

سیاسەتمەداری شیوعی، (بەهادین نوری) لەوبارەیەوە دەڵێ: "ئابڕوچوونی ٣١ ئابی ١٩٩٦..لە رووی ئەخلاقیەوە جورئەتێکی زۆری دەوێ بۆ مرۆڤ کە پاش ٣٥ ساڵ چەکهەڵگرتن و شەڕ دژی سەدام لە پڕ، بە چرکەیەک، رێکەویت لەگەڵ ئەو دوژمـنە نەگریسـە و چەکـدارەکانی خـۆی بخـاتە نێـو تانـک و زرێپۆشی ئەو دوژمنە خوێنرێژە و هێرش بکاتە سەر شاری هەولێر"[٤٢٧].

[٤٢٥] رۆژنامەی (العراق)، ژ ٢٠٩٨، ١٩٩٦/٩/٢٠.

[٤٢٦] رۆژنامەی (الجمهورية)، ژ ٩٣٩٠، ١٩٩٦/١١/١٩.

[٤٢٧] سایتی پەرەگراف، ٢٠١٩/٨/١٩.

لە ئەنجامی ئەو داگیرکردنەدا، ژمارەیەکی دیار لە ئەندامانی سەرکردایەتی و کادێرانی یەکێتی بەدیل لای پارتی گیران یاخود خۆیان گەیاندە لای حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و ماوەیەک لەوێ مانەوە، تا فرسەتیان بۆ رەخسا خۆیان گەیاندەوە لای یەکێتی.

پارتی هەرزو هەوڵیدا کە پەرلەمان دەست بکاتەوە بە کارەکانی خۆی و لەم کارەدا، ژمارەیەکی بەرچاو لە پەرلەمەنتارانی یەکێتی ئامادەی کۆبونەوەکان بون و (شەرعیەت) یاندا بە پەرلەمان، پەرلەمانەکەی پارتیش حکومەتێکی پارتی لە هەولێر دروستکرد.

"لە مزگەوتی گەورەی شەقڵاوە، لە ١٩٩٦/٩/٣ دا، کۆبونەوەیەکی نا ئاسایی پەرلەمان بۆ درێژکردنەوەی تەمەنی خۆی گیرا بە ئامادەبونی دەستەی سەرۆکایەتی و ٤٠ ئەندام لە لیستی زەرد (پارتی) ١٠ ئەندام لە لیستی سەوز (یەکێتی) ٣ ئەندام لە لیستی مۆر (مەسیحی)، تەمەنی ئەندامێتی پەرلەمانیان تا ١٩٩٨/٦/٤ درێژ کردەوە"[٤٢٨]، ئەوەی کە لێرەدا جێی پرسیار بو، چۆن ئەندام و کادرەکانی یەکێتی بە بڕیاری پارتی ئامادەی کۆبونەوەکە بون و تەمەنی پەرلەمانیان درێژکردەوە؟.

ئەم یەکێتیانە نەک تەنها ئامادەی کۆبونەوەکە بون، بەڵکو لە گۆڤارەکانی پارتیدا دەستخۆشیان لە پارتی کرد، ئەمە لە کاتێکدا بو کە هاوڕێیانیان لە هەولێر دەرکرابون و هەندێکیان لە زینداندا بون و یەکێتیش هیچ لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەیەکی لەگەڵ نەکرد، لە جیاتی ئەوە هەندێکیان لە لایەن یەکێتیەوە پۆستی باڵاتریان پێدرا.

کەسە دیارەکانی یەکێتی کە لەگەڵ پارتیدا پەرلەمانیان زیندوکردەوە، بریتی بون لە جێگری سەرۆکی پەرلەمان و جێگری سەرۆکی فراکسیۆنی سەوز، ئەوانە لە پێشەوەی ئەوانە بون کە چونە هۆڵی پەرلەمانەوە و پشتیان کردە یەکێتی و کۆمەڵێک لێدوانی سەیریان دا لەوانە جێگری سەرۆکی

---

[٤٢٨] شەڕی ناوخۆ .. چۆن، بەڵگەنامەی ژ ٦٦.

فراکسیۆنی سەوز دەڵێ: "کاک مەسعود بارزانی وەک باوکێک، وەک قائیدێک لە کوردستان هەمو کوردێکی لە باوەش گرت"[429].

یەکێک لە ئامانجەکانی رژێم بۆ هەولێر، لێدانی گورزێکی کوشندە بو لە هێزە عێراقیە موعارەزەکان، بە تایبەتی INC، ژمارەیەکی باش لەوان گیران و تیرۆر کران، بەو هۆیەوە ئەمریکا بڕیاریدا، کارمەندانی رێکخراوە بێگانەکان بگوێزێتەوە بۆ ئەمریکا.

لە ماوەیەکی کەمدا، پارتی توانی زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی بگرێت و هێزەکانی یەکێتی هەرەسیان هێناو و زۆر جێگایان بێ بەرگری چۆڵکرد و یەکێتی پەرش و بڵاوبوەوە و زۆربەی هەرە زۆری هێزەکەی هەڵهاتن بۆسەر سنوری ئێران و هیچ شار و شارۆچکەیک بەدەست یەکێتیەوە نەما.

دەربارەی باودۆخی هاتنی پارتی بۆ مەڵبەندی سەرەکی یەکێتی کە شاری سلێمانیە، حسێن عارف کە لەناو شاردا بوە، بەم شێوەیە باسی دەکات: "ناوشار شڵەقاوە و خەڵکەکەی بەیەکدا دێن، فرکان فرکانی خۆ ئامادەکردنە بۆ هەلاتن. حاڵەتی رەوەکەی دوای راپەڕینەوە دوبارە دەبێتەوە. ئەگەر ئەویان کورد لە دەستی بەعس رایدەکرد، ئەمیان کورد لە دەستی کورد رادەکات!. راستە ترسە سەرەکییەکە هەر لە بەعس و سوپاکەیەتی، بەلام ئەمجارەیان ئەوەتا کوردەکە خۆی پێشی کەوتوە!"[430].

دەربارەی ئەو رۆژانە، نوێنەری رۆژنامەی (الحیاة) لە سلێمانیەوە نوسیوێتی: "هێزەکانی بارزانی، سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا، کاتێ کە دەستیان گرت بەسەر شاخی هەیبەت سوڵتاندا، کە رێگای نێوان کۆیسنجەق و سلێمانی جیادەکاتەوە، بارزانی دەرگای لەسەر دژەکەی بە کراوەیی بەجێهێشت (کێشەکە لای تاڵەبانیە، ئایە دان بە شکاندنی خۆیدا

[429] برایەتی ژ ٢١٨٦ی ١٩٩٦/٩/١٩.

[430] حسێن عارف، بیرەوەری، ب ٢، ل٢٣٧.

دەنێت یاخود نا، ئەگەر دانی پێدانا، ئەوا هەڵبژاردن دەکەینەوە بۆ دانانی حکومەت. هەروەها وتی: پێویستە یەکێتی نیشتیمانی بزانێت ئەمە داوای پارتی دیموکراتی کوردستان نیە، بەڵکو داوا لە حکومەت و پەرلەمان دەکەین کە لە کۆتایی ساڵدا خۆیان بۆ هەڵبژاردنێک ئامادەبکەن"، هەروەها دەربارەی پەیوەندیان لەگەڵ ئێران وتی: "لە نێوان ئێمە و ئێرانیەکاندا گیروگرفتمان نیە، ئەگەر دەست نەخەنە ناو کاروباری ئێمەوە هەروەها نابێت دەست بخەنە ناو ئەم شەڕەوە"[٤٣١].

## هەرەسهێنانی یەکێتی

هەر دەربارەی شکان و هەڵسانەوەی یەکێتی مام جەلال بەم شێوەیە باسی دەکات: "ئێمە نەمانتوانی هێزەکانمان لە کشانەوەدا چاک ڕێبەری بکەین، ئەوە بو بەهۆی ئەوەی کە لەسەر سنوری ئێران خۆ بگرینەوە، بە باشمان زانی بچینەوە سەرسنورەکان و بچینەوە ناوزەنگ کە مەڵبەندی دێرینی خۆمان بوە، بۆئەوەی سەرلەنوێ هێزەکانی خۆمان کۆبکەینەوە. ئەوەبو توانیمان بە ماوەیەکی کەم چەند هەزار پێشمەرگەیەک کۆبکەینەوە، کە کۆمانکردنەوە، دو، سێ هێرشمان هاتە سەر و ئێمە هێرشەکانمان شکاند.

پێشتر ئێران بەڵێنێکی پێدابوین، بەڵام بەڵێنەکەیان جێبەجێ نەکرد، پێشتر کۆسرەت چوبو بۆ ئێران پێمان گوتن :"کەوا پارتی لەگەڵ عێراق ڕێکەوتوە و هێرشمان ئەکەنە سەر"، ئێرانیەکان گوتیان :"مەترسێن، ئێمە ئەو چەکەی عێراق بەکاری دەهێنێت ئەو چەکەتان دەدەینێ دەبابە بو، دەبابەتان دەدەینێ، هێز بو، هێزتان دەدەینێ و لەسەرتان هەڵ ئەدەینێ، هەرکاتێ عێراق پەلاماری ئێوە بدات، ئێمەش پاسدار دەنێرین بۆ پشتگیریتان"[٤٣٢].

---

[٤٣١] الحياة، ژ ١٢٢٥١، ١٩٩٦/٩/١٠.

[٤٣٢] دیداری تەمەن، بەرگی ٢، ل ٢٥٤.

دەربارەی هەمان مەسەلە مام جەلال دەڵێ "وەکو بیستمان دوای ئەوەی کە عێراق هەولێری داگیرکرد، ئاغای موحسین ڕەزایی دەستبەجێ بڕیاری دابو، بە موشەک لەسەری ڕەش بدات و موشەکەکانی (توجیە) کردبو بۆ ئەوێ، سەرکردایەتی ئێرانی بڕیاریاندابو، ئەو هێرشەی عێراق ڕەنگە پیلانێک بێت لە ئەمەریکاوە بۆئەوەی ئێران بۆ شەڕەکە رابکێشێت. سەرکردایەتی ئێران، نەیان هێشتبو هێرش بکرێتەسەر سەری ڕەش، ئەگینا هەندێ لێپرسراوی ئێرانی پێشنیازیان کردبو و گوتبویان ئێمە هێزی پاسدار دەبەین لەگەڵ خۆمان و دەچین شەڕ دەکەین، نابێت عێراق زاڵ بێت بەسەر یەکێتیدا.

ئێران زۆری پێ ناخۆشبو ئێمە هاتوینەتەوە بۆ ناوزەنگ، وای بۆ چوبو کە ناوچەکانی سنوری ئەو دەکەوێتە دەست دوژمنەکانی و دەکەوێتە دەست عێراق و ئینجا ڕەنگە جەماعەتی موجاهیدینی خەلق و کوردەکانی ئێران بێنە سەرسنورەکان، لەبەرئەوە، ئێران کەوتە خۆی و هات بۆئەوەی یارمەتیمان بدات"[٤٣٣].

دەربارەی هەرەسهێنانی هێزی یەکێتی، مەحمود سەنگاوی وەک یەکێک لە فەرماندەکانی یەکێتی نوسیویەتی: "پێشمەرگە کەمێک نەبێ توانای شەڕکردنیان نەمابوو، بۆیە زوو زوو سەردانمان ئەکردن لە سەنگەرەکانیاندا و کەمێک وزە و وورەمان پێ ئەبەخشین و زۆرجاریش بە جیهاز قسەمان لەگەڵا ئەکردن، بەڵام بێ سوود بوو، هەر کە هێزەکانی پارتی دەرکەوتن، دوای بەرگریەکی کەم کشانەوە.."[٤٣٤].

---

[٤٣٣] هەمان سەرچاوە، ل ٢٥٥.

[٤٣٤] مەحمود سەنگاوی، بیرەوەریەکانی سەنگاوی، ل ٧٢٧.

## پارتی دوای ۳۱ ئاب

مەسعود بارزانی و پارتی دوای ۳۱ ئاب، زۆر لە خۆیان بایی بوبون و خۆیان بۆ ئەوە ئامادەدەکرد، کە بەتەنها یان لەگەڵ چەند هێزێکی بچوکی بێ دەسەلات، حوکمی هەمو کوردستان بکەن و زۆر بە بێڕێزی باسی یەکێتی و مام جەلالیان دەکرد بە فاشست و دیکتاتۆر ناویان دەبردن و لە یادی ۳۵ ساڵەی شۆڕشی ئەیلول و لە وتارێکدا لە ۱۹۹٦/۹/۱۱ کە هەوای سەرکەوتنی پێوە دیار بو، دەڵێت: "سەرکەوتنی هەمو ڕاستی و شەرعیەت بەسەر دەسەلاتی دیکتاتۆریەت و تێرۆر و فیتنەگێراندا پیرۆز بێت..رەحمەتی ئیلاهی یە، کە بەر کورد و کوردستان کەوتووە و ئەنجامی هیمەتی پێشمەرگەی ئازا و تێکۆشان و خۆراگری لایەنگران و جەماوەری پارتیە، ئەم سەرکەوتنە حەقانیەت و عەدالەتی هەڵوێستی پارتی سەلماند..۳۲ ساڵە شۆڕشی ئەیلوول و پارتی توشی تاقمێکی خیانەتکار بووە، کە پیشەی دوبەرەکی نانەوە و هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ بووە، دەیان کۆسپ و تەگەرەی خستۆتە ڕێگەی خەباتی رزگاری گەلەکەمان...بە تێچوونی جەلال تاڵەبانی و تێکشکانی سیاسەت و ڕێباز و هێزە عەسکەریەکانی، هۆی سەرەکی شەڕی ناوخۆ نەماو، هەربۆیەشە ئەمڕۆ خەباتی کورد یەک دەگرێتەوە..ئێمە ئەمانزانی هاولاتیانی ئازیزی سلێمانی لەگەڵ رەفتاری ستەمکارانەی فاشستیانەدا نین..وە پشتیوانی ڕێبازی بارزانی نەمر و هەڵوێستی ئاشتیخوازیانەی پارتی دیموکراتی کوردستانن".

هەروەها سەرۆکی پارتی لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەریدا کە بۆ ئاژانسە بێگانەکان سازدرابو لە ۱۹۹٦/۹/۱۲ دا دەڵێ: "مەسەلەی جەلال تەواو بوو

..ئێمە هیچ مانعێکمان نیە بێن (یەکێتی) و ڕۆڵی خۆیان ببینن، بەڵام چەکداریان نابێ و ئەوە فیفتی فیفتی نیە و ئەوەلەن چەکداری ینک لە ناو سنوری ئێمەدا نەماون و ئینهیاریان کردوە و ورەی (تەحتی) عەسکەری ئەوان ڕووخاوە، ئەوانەی کە ڕایانکردوە و چوونەتە ئێران ئەگەر شتێک ببێت ئێرانە نەک (ینک) و ئەگەر یەک تەقە بێت لەم سنوورانە و یەک شت ببێ مانای ئەوەیە کە ئێران کردویەتی و ئێران ئەوانەی پڕ چەک و تەجهیز کردوە و تەشجیع کردوە بۆ تەخریب و خراپەکاری ئەگەر نا ئەوان ئەو هێزەیان نەماوە کە شتێک بکەن"[٤٣٥].

مەسعود بارزانی لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا لەگەڵ ڕۆژنامەنوس زوهێر قەسیباتی لە ڕۆژنامە (الحیاة) لە ژ ١٢٢٥٧ی ١٩٩٦/٩/١٦ دا، باسی هەمو پرۆسەکە دەکات و شەڕەکە بەسەرکەوتنی دیموکراتیەت بەسەر دیکتاتۆریەتدا ناو دەبات و بە دەسکەوتێکی گەورەی دەزانێت بۆ گەلی کورد و بزوتنەوە ڕزگاریخوازەکەی.." ڕێگا بۆ چارەسەری کێشەی کوردی تەنها لە ڕێگای گفتوگۆوە دەبێت لە پێناوی دیموکراسیەتەوە بۆ عێراق و چارەسەری کێشەی کورد. وە ڕێگای ئاسایی، لەگەڵ حکومەتی ناوەندیدا دەبێت، ئەگەر بڕوای بە دیموکراسیەت و ئازادی و هەڵبژاردنی ئازاد و بڕوابون بێت بە فیدرالیەت..ڕێکەوتنی نێوان یەکێتی و ئێران، لە پێناوی سەرکەوتندا بو بەسەر پارتیماندا، وەک بەرگری سەرەکی لە مافەکانی گەلەکەمان. ئەم هاتنە ناوەوەی ئێران زۆر گەورە بو، بارەگای سەربازیان لە ناوچەکانی چۆمان، قەسرێ و گەڵاڵە دامەزراندبو. ئەگەر داوای یارمەتی سەربازیمان لە عێراق نەکردایە، ئەوا تەرازوی هێز لە بەرژەوەندی یەکێتی و ئێران دەگۆڕا، چونکە ئێمە نەمان ئەتوانی بە تەنها بەرگری لەو هاوپەیمانێتیە بکەین. ئێمە لەگەڵ حکومەتی عێراق لەسەر دوخاڵ ڕێکەوتوین، پارێزگاری سیادە و مافی مانەوە".

هەر دەربارەی پەیوەندی عێراق و پارتی و بارودۆخی کوردستان، مام جەلال لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (ئێران) لەو بارەیەوە دەڵێت: "ئێمە

---

[٤٣٥] حامید گەوهەر، باشوری کوردستان، ل ٢٣٨.

لە روی سەربازیەوە، شکاین، شەڕەکەمان دۆراند، بەلام هێشتا جەنگەکەمان نەدۆراندوە، لەم شەڕەدا، دەموچاوی راستەقینەی بارزانی دەرکەوت، کاتێ بارزانی هاوپەیمانی لەگەڵ سەدام حسێن کرد، ئەمە وایکرد کە خۆی لە گۆڕەپانی خەباتی نیشتیمانی گەلی کورد دورخاتەوە..هەروەها دەربارەی رۆڵی ئەمریکا، دەڵێ: رەنگە زەمینەیان بۆ ئەوە خۆشکردبێت کە لەگەڵ سەدامدا لێمان بدەن..دەربارەی هاوکاری ئێران بۆ تاڵەبانی رەتی دەکاتەوە و دەڵێت: بەداخەوە هاوکاریمان وەرنەگرتوە، سەرەڕای ئەوەی کە پێویستی زۆرمان بە ساروخ هەبو، هەروەها دەڵێت من داوای یارمەتیم نەکرد، لە ترسی ئەوەی نەک ئەم کێشەیە گەروە بێت و ببێت بە شەڕێکی فراوان لە نێوان عێراق و ئێراندا لەسەروی عێراق.."[٤٣٦].

هەردەربارەی ئەم روداوە گرنگە، بارزانی هەڵوێستی دەربارەی بەغدا و یەکێتی و ئایندەی پەیوەندی هەردو هێزی سیاسی و دژایەتی سەدام و ناکۆکی لەگەڵ یەکێتیدا دەڵێ: "کەس بەقەد تاڵەبانی ئازاری کوردی نەداوە، دەبێ ئەو ئەمە زۆر باش بزانێت!..ئەوەی ئەو ئەم دو ساڵە بەسەر کوردی هێنا، هیچ حکومەتێک هیچ سەرۆکێک لە عێراق نەیتوانیوە بەسەر کوردی بهێنێت،" هەروەها دەربارەی رۆڵی بەغدا لە ئەگەری ئەوەی کە ئەو هاوکاریە یارییەک بێت کە بەغدا لەگەڵ پارتیدا بیکات: "ئێمە هاولاتی عێراقین، ئێمە کوردی عێراقین، پارچەیەکین لە عێراق، بەڵێ مومکینە تا ئێستە خیلافیشمان لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی هەبێ، تا ئێستا رێکەوتنی سیاسیمان نەبووە، بەڵێ یەک خاڵ کۆی کردوینەتەوە، ئەویش بەرگریکردنە لەسەروەری نیشتیمانی عێراق، ئێمە کۆکبوین کە مەترسییەکی دەرەکی هەرەشەمان لێدەکا، هەروەها نە ئەمەریکا و نە رۆژئاوا وەلامی ئێمەیان نەدایەوە، یارمەتی ئێمەی نەدا، ئێمە لەگەڵ حکومەتی مەرکەزیدا رێکەوتین

---

[٤٣٦] الحیاة، ژ١٢٢٦٠ی رۆژنامە گەریدا لە ١٩٩٦/٩/٢٠ .

بۆ ئەوەی ئەم مەترسیە...»[٤٣٧].

بارزانی لە چەند چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەگەری جیاوازدا، باس لە شێوەی پەیوەنـدی خـۆی و سـەدام و ئاینـدەی ئەو پەیوەنـدییە دەکـات و زۆر بە گەشـبینیەوە دەروانێـتە دوارۆژی پـارتی لە هەرێمـی کوردسـتان و بـڕوای تەواوی هەیە کە جارێکی تر، یەکێتی ناتوانێت رۆڵی کاریگەر لە کوردستان ببینێت و زۆر بە ڕەقی و زبری باسی مام جەلال دەکات و هێرشی توندی دەکاتە سەری و بە هەڵگیرسێنەری شەڕی ناوخۆی دائەنێت و باسی بۆچونی خـۆی دەربـارەی مـام جەلال دەکـات، کە مێـژوکەی بـۆ ٤ سـاڵی رابـوردو دەگەڕێتەوە، کە هەردولایـان، گفتوگۆی هاوبەشیان لەگەڵ رژێم هەبوە. زۆر بە رونی و ئاشکرا هێرش دەکاتە سەر ئێران و بە گومانەوە باسی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا دەکات، هەروەها هیچ گومانی نیە کە هاتنی سوپای عێراقی بۆ ناو هەولێر، کارێکی ناچاری و لە بەرژەوەندی کورد بوە.

مەسـعود بـارزانی لە چـاوپێکەوتنێکی درێـژدا لەگەڵ رۆژنـامەنوس (هـدى الحسيني) لە رۆژنامەی (الشرق الاوسط) بە درێژی باسی هەمـو ئەو بابەتـانەی کـردوە، کە سـەردێرەکانیان بریتـی بـوە لە: داوای یـارمەتیم لە بەغـدا کـرد، بەهـۆی ئەوەی کە پیلانێکـی دەرەکـی هەبـو، کە مەترسـی لەسـەر سـەروەری عێـراق و بـونی ئـێمە هەبـو، لەگەڵ هـیچ دەوڵەتێکـی نـاوچەکە هاوپەیمـانیم نەبەسـتوە بـۆ لێدانی حزبێکـی کـوردی یـان غەیـرە کـوردی، ئـێمە دڵنیایمـان دەوێـت کە دان بنێـت بە مـافی گەلـی کـورددا، لە چوارچێـوەی عێراقـدا، مـن ئامـادەنیم لەگەڵ جەلال تاڵەبـانی لە دەرەوەی کوردسـتان کـۆببمەوە، بەڵام بە رێـزەوە لە نـاو کوردسـتان پێشـەوازی لێدەکەم، بە درێـژای ٣٢ سـاڵ، جەلال تاڵەبـانی هەوڵ ئەدات، بەسـەرماندا سـەرکەوێت، بەڵام هیـواکەی نەهـاتەدی، ئەگەر بەنـاوی تاڵەبـانیەوە هێرشـکرایە سـەرمان، ئەوا ئێران تاونبـار دەکەیـن، ئەوە بە دەستخستنە نـاو شـەڕەوە دژ بە ئـێمە ئەنێین، تاڵەبـانی هـیچ هێزێکـی

---

[٤٣٧] رۆژنامەی برایەتی ژ ٢١٨٧ی ١٩٩٦/٩/٢٧.

نەمــاوە کە هێرشـــی ســـەربازیمان بکــاتە ســـەر، بینینـــی ئـــێمە و نـــوێنەرانی حکـومەتی ناوەنـدی دوای ئەوەهـات کە نامەمـان بـۆ نوسـین، تەنهـا فەنیەکـان کۆبونەوە، ئێمە نەمان وتوە کە یارمەتیمان لەگەڵ سەدام حسێن کاتیە، یان بـۆ قۆناغێکە یان هاوکاریەکی هەمیشەییە. خاڵێکی گرنگ کۆیکردوینەتەوە، ئەویش بەرگریە لەسـەروەی نیشـتیمانی عێراق، ئەمەوێت بڵێم کە تـاکو ئێسـتا ئـێمە بەشێکین لە عێراق، پەیوەندی خێزانی و کۆمەڵایەتی کۆمـان دەکاتەوە، سـاڵی ١٩٩٢، هەنگـاوی باشـمان بڕیبـو بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەی کـورد لەگەڵ حکـومەتی بەغـدا، بەڵام تاڵەبـانی ڕێکەوتـنەکەی هەڵوەشـاندەوە لەبەرهـۆی شەخسی، هێزی عێراقی تەنها بۆ چەند دەقیقەیەک هاتنە ناو هەولێر و دوایی کشانەوە، ئێستا تاڵەبانی لە ناوچەی سەردەشتە لە ئێران"[٤٣٨].

هەر دەربارەی هاوکـاری عێراق بـۆ بـارزانی و هـاتنی سـوپای عێراق بـۆ هەولێر، سەدام حسێن لە کۆبونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی لە ٩/٢١ دا، لەو بـارەیە دەڵـێ: "دەرکردنـی هێزەکـانی یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان لە هەولێری سەروی عێراق، دەریخسـت کە عێراق هێزێکە نابەزێت" و باسـی لە هێـزە عێراقیەکــان کــرد لە (ڕزگــارکردنی هەولێــر) دا و "ئەمە نیشــانەیەکی عەرەبـی و نێودەڵەتیە بە هێـزی عێراق و تواناکـانی"، هەروەهـا دەڵـێ: "گەلـی عێراق و سـوپاکەی شکسـتیان بە پیلانـی دەرەوە هێنـا و نەیـان هێشـت عێـراق دابەشـبێت..هەروەها ئەمەی لەسـەروی عێـراق ڕویـدا، شـانازیە بـۆ هەمـو عێراقیەک و عەرەبێک بە سـوپا پاڵەوان و شـەڕکەرە ئازاکانمـانەوە، هەروەهـا ئەو پێشەوازیە گەرمەی کە هاوڵاتیـانی کوردمـان لە سـوپاکەمانیان کرد کـاتێ چونە ناو هەولێرەوە"[٤٣٩].

ئەم قسانەی سەدام، باس لەوە ناکات کە بارزانی داوای لێکردوە کە سـوپا بنێرێـت، بەڵکـو بـاس لە "ڕزگـار" کردنـی هەولێـر دەکـات و بە "سـەرکەوتنی"

---

[٤٣٨] (الشرق الاوسط)ی ژمارە ٦٥١٢ی ١٩٩٦/٩/٢٦.

[٤٣٩] الحیاة، ژ ١٢٢٦٤ی ١٩٩٦/٩/٢٣.

سوپای عێراق و شانازی عەرەب ئەداتە قەڵەم.

هەر بەهۆی ۳۱ ی ئابەوە، بۆ یەکەمجار دوای پێنج ساڵ سوپای عێراقی توانی بێ کێشە و بێ بەرگری بێتەوە کوردستان و وەک سەرکەوتنێک بۆ سوپای عێراق و بە (گەڕانەوەی کورد بو ریزی نیشتیمانی و گەڕانەوەی هەرێم بۆ ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عێراق) دانرا !.

هاتنی هێزی پارتی بۆ ناوچەکانی یەکێتی، غرورێکی گەورەی لای پارتی دروستکردبو، وایان نیشان ئەدا کە ئەم (سەرکەوتن)ە بە شەڕی پێشمەرگانەی پارتی هاتۆتە کایەوە: "پارتی وای دەزانی بە هێز و بازوی پارتی ئەو شەڕانەی کردوە، هەرچی جاش و ماش بوو کۆیان کردبۆوە، ئەوانەش بە حەیاتیان بۆ کورد فیشەکێکیان نەتەقاندبوو، سوپای تالانیان لێ دروستکردبون، مەکتەبی سیاسی پارتی تا ئەو سێ رۆژە بە رەسمی هەمو چەکدار و مەسئولینی خۆیان ئازادکردبوو لە هەمو جۆرە تالان و برۆیەکی کوردستان و ماڵی خەڵکی کوردستان"[٤٤٠].

یەکێتی پێش گەڕانەوەی بۆ شوێنەکانی خۆی، زۆر بەقین بو لە پارتی و ۳۱ ی ئابیان بە (خیانەتێکی نەتەوەیی) دەزانی و لە رونکردنەوەیەکدا لە ژێر ناوی (بۆ روداوەکانی ئەو دوایەی کوردستان) لە هەندێ شوێندا تیدا هاتبو: "چیتر مەسعود بارزانی لە ریزی کوردایەتی نەماوە و چیتر خەبات دژی چڵکاوخۆرەکانی مەسعودیش براکوژی نیە...ئەو پەرلەمانەی کە ناتوانێ رەخنە لە داگیرکردنی هەولێر بگرێت، ناتوانێت نارەزایی خۆی لەسەر بۆردومانکردنی بیناکەی خۆی دەربرێت، ناتوانێت بە جەلادی گەلی کوردستان بڵێ بەری چاوت بە کلە، ئەو پەرلەمانە ساختەیە هەربۆیە کۆکراوەتەوە، ئیمزای پرۆژەی گفتوگۆی پێبکرێت.."

---

[٤٤٠] محەمەد حاجی مەحمود، رۆژ ژمێری...، بەرگی ٤، ل٦٠٠.

## هەرەسی پارتی و هەڵسانەوەی یەکێتی

پـــارتی لە مـــاوەیەکی کەمـــدا و لە ١١و ١٩٩٦/٩/١٢ بە خێراییەکـــی زۆر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی گرت و گەورەترین شاریش، سلێمانی بو کە لە ١٩٩٦/٩/٩ دا لە لایەن پـارتیەوە گیـرا، پـارتی بە چ خێـراییەک هـات و ئەو ناوچانەی گرت، بە هەمان خێرایش هەمان شوێنیان بەجێهێشت و رایانکرد و گەڕانەوە سنورەکانی خۆیانی پێش ٣١ ئاب جگە لە شاری هەولێر.

سـلێمانی لە ٩/٩/لە لایەن پـارتیەوە گیـرا و لە ١٠/١٣ لە لایەن یەکێتـیەوە گیرایەوە، واتا پارتی توانی تەنها نزیکی یەک مانگ لە سلێمانی بمێنێتەوە.

بۆ گەڕانەوەی یەکێتی بۆ شوێنەکانی خۆی جگە لە هەولێر، ئێران رۆڵی دیـاری هەبـو، پشـتگیری ئێران نەبوایە، شـەڕێکی درێژ و خوێنـاوی زیـاتری پێویست بو تا یەکێتی بگەڕێتەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان.

موخـابەراتی عێـراق بە ئاگـاداری سـەدام حسـێن، نـامەیەکی بـێ ئیمـزاو ناویان لە ڕێگای شـێخ عەتـای تاڵەبـانیەوە ئارسـتەی (جەبـار فەرمـان یـاخود هەرسەرکردەیەکی دیکەی باڵای فەرمان بەدەست لە یەکێتی نیشتیمانی) کرد و تێدا هاتبو "ئێمە ئاگادارتان دەکەینەوە کە ئەگەر لەو شوێنانەی تاکو ئێستا هـاتوون، زیـاتر بێنە پێشـەوە، هەر لە سـنوری قەزای کفری تـاکو پارێزگـای هەولێـر بە تونـدی وەڵامـمـان دەبێـت. لە هەر لێکەوتـنەوە و کارەسـات و ڕوداوێکی نـاخۆش ئێوە تحەمـولی مسـئولیەت ئەکەن، بـۆیە ناچـارین بڵێـین Sopp"[٤٤١]، مام جەلالیش لە ڕێگای دارای تۆفیق ئاغا وەڵامی بۆ نـاردنەوە

[٤٤١] زانیاریەکـان و نـامەکە لە مەحمـود بیکەیسـی وەرگیـراوە، کە خـۆی نـامەکەی وەرگرتبو و ئەندام مەڵبەندی کفری و پێشمەرگەیەکی دیاری نـاوچەی گەرمیـان بـوە، جریدة المؤتمر، ژ ١٧٦، ١٩٩٦/١١/٨.

کە لە شوێنەکانی خۆیان دەوەستن.

مـــام جەلال لە گفتوگـــۆیەکی تەلەفۆنیـــدا لەگەڵ ڕۆژنـــامەنوس زوهیـــر قەسـیباتی لە ڕۆژنـامەی (الحیـاة) دەڵـێ: "کۆتـایی بـارزانی زۆر نـزیکە ئەگەر ڕژێمی عێراق هاوکاریان نەکات، هێزەکانیان لەهەمو بەرەکانەوە هەڵدێن، ئەمە کۆتـایی سیاسـەتیانە، کۆتـایی سەربازیشـی نـزیکە ئەگەر سـەدام هاوکاریـان نەکات..ئێمە پارێزگای سلێمانیمان ڕزگار کردوە و بەرەو کۆیسنجەق دەڕۆین، پێنجوین، هەڵەبجە و دەربەندیخانیش ڕزگـار کـران" دەربـارەی هەولێر دەڵـێ: "ئێسـتا بەرنـامەی وامـان نـیە، چـونکە شـارەکە بە دەبـابەی عێراقـی دەوری گیراوە..شـارەکە بۆ هاولاتیانی هەولێر خۆی بەجێ دەهێڵین.. بـارزانی خـۆی ڕۆژی شـەممە سەرپەرشـتی شـەڕەکانی لە چوارتـا و قەلاچـوالانی دەکـرد"، دەربارەی هۆی کشانەوەیەی هێزی پارتی لە سلێمانی، دەڵێ: "هەرەسـهێنانی مەعنویاتیـان" دەربـارەی هاتنەناوەوەی ئێران، دورسـتکراوە، ئێمـە داوامـان لە کارمەنـدانی نەتەوە یەکگرتوەکـان کـرد، بـۆ لێکـۆڵینەوەی ڕاسـتەوخۆ لە هاتنەنـاوەوەی هێـزی ئێرانـی، هەمـو ئەو قسـانە بە ناڕاسـت باسـکرا و هـیچ دیـاردەیەکی لەو شـێوەیە نەبـوە، ئـێمە هـاتنە نـاوەوەی نە ئێرانیمـان قبوڵە نە عێراقـی..ئێمە داوا لە هێـزی هاوپەیمانـان دەکەیـن، کە بە گـژ هەر هێرشـێکدا بچنەوە کە دژ بە گەل بکرێت، هێرشی ئێرانی بێت یان عێراقی"[٤٤٢].

دەربارەی بارودۆخی کوردستان و شەڕی ناوخۆ و هەڵوێستی هاوپەیمانان لەم شـەڕ و ئەم گرژیـانەدا، وەزیـری دەرەوەی بەریتانیـا جیریمـی هـانلی لە کۆبونەوەیەکی ڕۆژنامەنوسیدا لە ریاز دەڵێ: "تا ئێسـتاش بەریتانیا بەڵێنی داوە کە بەرگری لە گەلی کورد بکات، نامەی بۆ هەردو سـەرۆک بـارزانی و تاڵەبـانی نوسیوە و داوای یەکبینین و گفتوگۆی لێکردون. بەریتانیا و ئەمریکا پەیوەندیان بە کوردەکـانەوە کـردوە و هانیانـداون کە گفتوگـۆ بـکەن بەیەکەوە بـۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان خۆیـان، چونکە دوا ڕۆژی گەلی کورد لەگەڵ

---

[٤٤٢] الحیاة ی ژمارە ١٢٢٨٥ی ١٩٩٦/١٠/١٤

سەدام و ئێران نیە، بەڵکو بەستراوە بە لێتێگەشتن لەناو خۆیاندا و ئاگادارکردنیان لە مەترسی هاتنە ناوەوەی سوپای عێراقی لە شەڕی نێوانیاندا"[443].

دەربارەی رۆڵی ئێران و هاتنە ناوەوەی سوپای ئێرانی بۆ ناو کوردستان و پشتگیریان بۆ تاڵەبانی، وەزیری بەرگری ئەمریکا (ولیم بیری) لە ١٠/١٥ دا لەو بارەیەوە دەڵێ: "لای ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هیچ زانیاریەک نیە، بیسەلمێنێت کە سوپای ئێرانی لەسەروی عێراقن"[444]، ئەمە لە کاتێکدا کە پارتی باس لە هاتنی سوپای پاسداری ئێرانی و دانانی چەندەها ئۆردوگای سەربازی ئێرانی لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتیدا دەکرد..بەلام جگە لە پارتی، هیچ دەزگایەکی سەربەخۆ ئەم زانیارانەیان پشتراست نەکردەوە. ئەوەی ئاشکرایە، کە ئێران هاوکاری باشی یەکێتی کردوە لەو شەڕانەدا و چەکی قورس و هاوکاری تری کردون، بەلام هاوکاری و هاتنەناوەوەی سوپا و دامەزراندنی کەمپی سەربازی ئێرانی دوو مەسەلەی جیاوازن.

هەر لەو بارەیەوە، سەرۆکی جارانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، بیل کلنتۆن وتی: "کێشەکە ئاڵۆزتر بوە، کاتێ بارزانی داوای هاوکاری لە سەدام حسێن کرد" ئەم هاوکاریەی بە (زواجی کاتی) دایە قەڵەم، وتی: "ئەمەی لەسەروی عێراق رویدا، لە روانگەی ئەمریکاوە، شکاندنی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتوەکانە"، دەربارە هەڵوێستی ئەمریکا لە هاتنی سوپای عێرقی دەڵێ: "هاتنی سوپای ئەمریکی بۆ سەروی عێراق بۆ دەرکردنی سەدام حسێن، کارێکی گونجاو نەبو، چونکە ئەبوە هۆی کوشتنی زۆری هاولاتیانی سیڤیل.."[445].

هەروەها بیل کلنتۆن لە ١٩٩٦/٩/٣ دا لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا لە کۆشکی سپی دەبارەی ٣١ ی ئاب وتی: "سێ رۆژ لەمەوپێش سەرەڕای هۆشداری ئەمەریکا و کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی، هێزە عێراقیەکان هێرشیان

[443] الحیاة، ژ ١٢٢٨٦، ١٩٩٦/١٠/١٥.

[444] الحیاة، ژ ١٢٢٨٧، ١٩٩٦/١٠/١٦.

[445] الحیاة، ژ ١٢٢٨٩، ١٩٩٦/١٠/١٨.

کردە سەر شاری هەولێر لە باکووری عێراق کە لە لایەن کوردەوە کۆنترۆڵ کرابوو، ئەو پاشەکشێ سنوردارەی کە سەدام رایگەیاند، راستی ئەوە ناگۆڕێت کە سوپای سەدام ئێستا کۆنترۆڵی هەولێر دەکات. هێزە عێراقیەکانیش لە ئامادەباشیدان بۆ هێرشی زیاتر. ئەم کارانە پێویستیان بە وەڵامی بەهێزە و وەڵامەکەشیان دراوەتەوە، ئەمڕۆ بڕیارمدا هێزەکانی ئەمەریکا لە عێراق بدەن، موشەکەکانمان ئەم پەیامەی بە سەدام گەیاندوە، کاتێک ئازاری خەڵکەکەت دەدەیت و هەڕەشە لە دراوسێکانت دەکەیت، دەبێت باجەکەی بدەیت. گروپێکی کوردی (پارتی) کە لە رابوردودا دژی سەدام بون، ئێستا بڕیاریان داوە هەماهەنگی بکەن، بەڵام ئێستا شەرعیەت نادات بەوەی کە هێزە عێراقیەکان بەربدرێنە خەڵکی مەدەنی هەولێر. بە بەردەوامی لە چەند مانگی ڕابردودا هەوڵمانداوە ئاگر بەستی نێوان یەکە کوردییەکان بپارێزین، هێرشەکەی عێراق بەنزین دەکات بە ئاگردا و دەبێتە هۆی تێکچونی سەقامگیری ناوچەکە. ئامانجەکانمان سنووردارن بەڵام ڕونن"[٤٤٦].

دەربارەی ڕۆڵی ئێران لەم شەڕەدا و هاوکاری ئەوان بۆ یەکێتی، وتەبێژە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا نیکۆلاس بیرنس وتی: "ئێمە هیچ بەڵگەیەکی راستەوخۆمان لەبەردەستدا نیە لەسەر هاوکاری ئێرانی بۆ هێزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بۆ گرتنەوەی شاری سلێمانی لە باکوری عێراق، بەڵام تێوەگلانی ئێران لەم شەڕەدا، بەدور نازانین"[٤٤٧].

هەر دەربارەی گرتنی شاری سلێمانی، مەسعود بارزانی لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا دەڵێ: "یەکێتی سلێمانی داگیر نەکرد، من خۆم شاهیدی ئەو هێرشە بوم، سلێمانی بە یارمەتی هێزی ئێرانی، چەکی ئێرانی و بۆمبای ئێرانی دەستی بەسەردا گیرا، تاڵەبانی سەرەرای ئەو هەمو کاتیوشانەو و نوێترین ئۆتۆمبیلی سەربازی و چەکی قورسی لەبەردەستا

[٤٤٦] سایتی ئەلکترۆنی DOZ، ٢٠١٩/٨/٣١.

[٤٤٧] dps، واشنتۆن ١٩٩٦/١٠/١٥.

بو، ئەو کاتێ لە سلێمانی هەڵهات، کاتی نەبو جانتاکەی خۆی لەگەڵ خۆی بیات ... دەربارەی ئەو پرسیارەی کە پلانتان نیە جارێکی تر سلێمانی وەرگرنەوە، بارزانی دەڵێ: ئێمە رێگا نادەین بە تاڵەبانی وەک داردەستێکی ئێرانی دەسەڵاتی بەسەر گەورەترین شاری کوردستاندا بچەسپێنێت"[448].

مستەفا چاورەش، یەکێک لەسەرکردەکانی پێشمەرگەی یەکێتی، بەم شێوەیە باسی هاتنەوەی یەکێتی دەکات بۆ ناو سلێمانی: "لەگەڵ کاک کۆسرەت و کاک عومەر (مولازم عومەر) لە قەڵاچوالان یەکمانگرتەوە، خەریک بو ببێت بە سەعات یەکی شەو، بەرنامەمان دادەنا چی بکەین؟ کورێکی شارباژێریم دەناسی بە ناوی (فەتاح حاجی ئەحمەد)، هات و وتی ئەوە ئێوە چی دەکەن لێرە؟ سلێمانی نەنوستوە و چاوەروانتان دەکات، پارتی کشاوەتەوە و سلێمانیان چۆڵکردوە، خەبەرێکی زۆر خۆشبو، سەرکەوتنەکان بەرهەمی خۆی هەبو، پاش ئەوە رانەوەستاین و بڕیارماندا بەرەو سلێمانی برۆین...هەر ئەو بەیانییە زو سەعات پێنجی بەیانی راگەیاندنم بانگکردو دو بەیانم دەرکرد، یەکەمیان بۆ هەمو خەڵکی شاری سلێمانی بەرێز، ئەمرۆ دەوام هەیە و کەس دوانەکەوێت، بەیانەکە لە تەلەفزیۆن خوێنرایەوە. بەیانی دوەم: داوا لە هەمو پێشمەرگەکان و جەماوەری یەکێتی دەکەین بە هیچ بیانویەک نەچنە سەر ماڵی پارتیەکان و خەڵکانی تر، دەستدرێژی نەکەنە سەر هیچ کەس و ماڵی کەس تاڵان نەکرێت. بە ئیمزای پارێزگای سلێمانی ناوم تێدا نەهێنا"[449].

هیچ سەرچاوەیەکی باوەرپێکراوم بەردەست نەکەوتوە، کە باس لە هاتنی هێزی سەربازی ئێرانی بکات بۆ ناو سلێمانی، هەمو دەزگا جیاوازەکان، لە ئەمریکی و ئەوروپی و عەرەبی و کوردی، باس لە هاتنی سوپای ئێرانی ناکەن بۆ گرتنەوەی سلێمانی، هیچ کەسێ و دەزگایەکی راگەیاندن وێنەی لەو شێوەی نەگرتوە، ئەوەی کە رون و ئاشکرایە، ئەوەیە کە ئێرانیەکان بە چەک

---

[448] Die Zeit - Nr. ٤٤ – ٢٥/١٠/١٩٩٦

[449] مستەفا چاورەش، یادەوەرییەکان، چاپی دووەم، ٢٠١٥، ل ٣٦٥.

و تەقەمەنی هاوکاری یەکێتیان کردوە، نەک بەسەرباز، ئەوەی باسی هاتنی سەربازی ئێرانی کردوە، تەنها پارتی بوە.

ئەو هۆیەی کە وای لە پارتی کرد، وا بە خێرایی سلێمانی و شوێنەکانی تری یەکێتی بەجێ بهێڵێت، تەنها ورە روخاندن بو، چۆن یەکێتی لە هەولێر ورەی روخا و لە کورترین ماوەدا، هەرەسی هێنا، هەمان کارەسات بەسەر پارتیشدا هات لە سلێمانی!.

## رۆڵێکی نوێی ئەمەریکا بۆ ئاشتبونەوە

دوای ئەوەی تەرازوی هێزی یەکێتی و پارتی وەک یەکیان لیهاتەوە و لای هەمولایەک دەرکەوت، کە نە پارتی ئەتوانێت بە تەنها دەسەلاتی بەسەر هەمو کوردستاندا بگرێت، بەهەمان شێوەش یەکێتیش.

لەبەرئەوە تورکیا و ئەمریکا، هەوڵی زۆریاندا، کە پردێکی گفتوگۆ لە نێوان پارتی و یەکێتیدا دروست بکەن، هەر لەو روانگەیەوە، بانگهێشتی مەسعود بارزانیان کرد و لە ٩/١٨ دا کۆبونەوەی هاوبەشی لەگەڵ جێگری وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا (رۆبێرت بلیترۆ) و جێگری وەزیری دەروە و وەزیری دەرەوەی تورکیا، خانم (تانسو چیلەر) کرد، لەو کۆبونەوانەدا، جیاوازی بۆچونەکانی ئەمریکا و تورکیا ئاشکرا بون، هەرچی ئەمریکا بو، ئەیویست کە بارزانی پەیوەندیەکانی لەگەڵ سەدامدا بپچرێت و تورکەکانیش پێیان باشبو، کە بارزانی لە پەیوەندیدا لەگەڵ سەدام بمێنێت و ئەو پرۆژەیەی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد کە لە ساڵی ١٩٩١ دا، پێشکەشی کرد، قبوڵی بکات، هەر دەربارەی ئەو کۆبونەوەیە، تەها یاسین رەمەزان، جێگری سەرۆکی عێراقی وتی: "بناغەیەکی هاوبەش لە نیوان حکومەتی مەرکەزی و بارزانیدا هەیە، بەلام ئەمە لەسەرەتادایە بۆئەوەی بگەین بە شێوەی کۆتایی، تا ئێستا کاری هەوبەشی زۆرمان ماوە، دەربارەی کاریگەری کۆبونەوەی ئەنقەرە وتی: گرنگ ئەوەیە کە جیاوازی لە نێوان ئەوەدا بکرێت، کە حکومەتی

ناوەنــد، جاسوســەكانی بەســەرۆكایەتی تاڵەبــانی لە هەولێــر دەركــرد و چوارچێــوەی ڕێكەوتنــی نێــوان حكــومەتی ناوەنــد و بــارزانی دانــا"[450].

بۆ هەمان مەبەست، مام جەلال لە ١٠/٢٢ دا، هەمان كۆبونەی لەگەڵ (ڕۆبێرت بلیترۆ) و جێگری وەزیری دەروە و وەزیری دەرەوەی توركیا، خانم (تانسو چیلەر) كرد، هەمو لاكان ڕێكەوتن لەسەر ئەوەی كە شەڕی نێوانیان بوەستێت[451].

هەر لەو بــارەیەوە، جێگــری وەزیــری دەرەوەی ویلاتەیەكگرتوەكــانی ئەمریكا، لە فرۆكەخانەی ئەنقەرە لە كاتی گەڕانەوەیدا بۆ ئەمریكا، وتی: "ئێمە لەگەڵ بارزانی و تاڵەبانی ڕێكەوتین بۆ كۆتایهێنان بە شەڕی ناوخۆ، وە ئەمریكا و توركیا و بەریتانیا، داوا لە هەردولای كوردی دەكەن، كە ڕێكەوتنی وەســتانی شــەڕی نێوانیــان، جێبەجێبكەن..هەروەهــا وتەبێــژی وەزارەتــی دەرەوەی تــوركی (عــومەر ئیقبــال) وتــی: "حیزبەكــانی بــارزانی و تاڵەبــانی، ڕێكەوتن لەسەرئەوەی كە هەفتەی داهاتو لە ئەنقەرە، كۆبونەوەی هاوبەشی ڕاستەوخۆ بە ئامادەبونی لێپرسراوانی توركیا، ئەمریكا و بەریتانیا ئەنجام بدەن و بگەن بە ڕێكەوتنێكی كۆتایی"[452].

كۆبونەوەكانی پارتی و یەكێتی لە ١٩٩٦/١٠/٣١ لە ئەنقەرە بێ ئەنجام كۆتایی هات.

كۆبونەوەیەكی تر لە ١٩٩٦/١١/١٥ بە سەرپەرشتی ئەمریكا و توركیا گیرا، ئاستی نوێنەرانی هەردو هێزی كوردیش نیشانی دا، كە هەردولا زۆر گرنگی بە كۆبونەوەكە نادەن و هیوای زۆریان پێی نیە، نوێنەرەكانیان نەیانئەتوانی بڕیاری چارەنوسساز بدەن، ئەوەی كە بڕیاریانــدا، مەسەلەی ڕاگرتن و پتەوكردنی ئاگربەست بو لە نێوان یەكێتی پارتی و نیشانەكردنی هێڵەكانی ئاگربەست و بەگەڕخستنی هێزی چاودێری و گەڕانەوەی (خدمات) ی گشتی

[450] الحیاة، ژ١٢٢٦١، ١٩٩٦/٩/٢٠.

[451] الحیاة، ژ ١٢٢٩٤، ١٩٩٦/١٠/٢٣.

[452] الشرق الاوسط، ژ٦٥٤٠، ١٩٩٦/١٠/٢٤ .

و ڕاگرتنی (حەملەی ئیعلامی) بو بەرامبەر بەیەک.

هەروەها لیژنەی چاودێرییەکە بۆ وەستانی شەڕ کە پێکهاتبو لە نوێنەرانی یەکێتی و پارتی و بەرەی تورکمانی و دوایی نوێنەری ئاشوریشی بۆ زیاد کرا، ئەو هێزەی کە دروست بو بە ناوی P.M.F و جەنەراڵێکی تورک بەناوی حەسەن قابلان سەرپەرشتی دەکرد و چەند بارەگایەکیان بۆ دانرا لە نێوان کۆیە-هەولێر، بالیسان-خەلیفان و جێگای تر.

داخوازییەکان، وەک زۆربەیجار، بریتی بون لە کۆتاییهێنان بە شەڕی هەردولا و بڕیاریشدرا کە جارێکی تر مانگی ١٢ کۆببنەوە، بە مەرجێ نوێنەرانیان لە ئاستێکی بەرزتردا بێت و هەردولاش نابێت هاوکاری لە ئێران و عێراقەوە وەربگرن و مەسەلەی گومرگ پێویستە بە شێوەیەکی عادیلانە چارەسەر بکرێت.

دوای چەند ڕۆژێک لە کۆبونەوەکەی ئەنقەرە، نوێنەرانی پارتی و یەکێتی و بەرەی تورکمان لە ١٩٩٦/١١/٢٧ لە کۆیە کۆبونەوە و لەسەر دەستنیشانکردنی شوێنەکانی هێزەکانی یەکێتی و پارتی ڕێکەوتن و داوا لە هەردولا کرا، کە جوڵە بە هێزەکانیان نەکەن لەو سنورەی کە ئێستا بۆیان دەستنیشان کراوە.

ئەم ئاشتیە زۆری نەخایاند و لە ١٢/١ دا، پارتی دەستیکرد بە هێرش دژ بە یەکێتی، لە قۆڵی قوشتەپە بەرەو خوڕخوڕە و بەستی شەرغە، لە بێستانەوە بەرەو بەردەێ سپی و گرتنی دیدەوان.. ئەمە شکاندنی ئەوە ڕێکەوتنە نوێیە بو، کە نابێت هیچ لایەک هێرش بکات و لە شوێنی خۆی بجوڵێت.

دوای تێپەربونی ساڵێک بەسەر ٣١ ئابدا، پارتی زۆر بە شانازیەوە یادی ئەو ڕۆژەی کردەوە و لە زۆربەی ئەو جێگایانەی کە لەژێر دەسەڵاتی ئەودا بو، یادیانکردەوە و مەسعود بارزانی وتارێکی لە (کەرنەڤالی ٣١ ی ئاب)دا پێشکەشکرد، لە بەشێکیدا دەڵێ: "هەر هەنگاوێک، هەر بڕیارێک بۆ ڕاماڵینی دکتاتۆریەت و نەهێشتنی نا شەرعیەت، شەرعیەتە، شەرعیەت لە کوێ

سەرچاوەی وەردەگریێ؟ شەرعیەت سەرچاوە لە ئیرادەی میللەت وەردەگریێ. ئیرادەی میللەتیش ئیمشەو دیارە چۆن "٣١" ئابی ساڵی رابوردو، بوو بۆ پیلانێکی گەورە، کۆبونەوەی گەورە، کۆبونەوەی جەماوەری ئیمرۆ وەڵامێکی ترە بۆ زمان درێژی ئەوانەی کە ئێستا لە حەقیقەت نەگەیشتون، یان نایانەوێ تێی بگەن...من ئامادە نەبووم جەلال تاڵەبانی ببینم، بەڵام دوای رزگارکردنی هەولێر، من رامگەیاند کە من ئامادەم لە کوردستان ببینم، ئێستاش ئەم قسانەی من یەکسەر موجەهن بۆ خودی جەلال تاڵەبانی کە لە ساڵی ١٩٦٤ ەوە تا ئێستا ئەمە ٣٣ ساڵە هیچ نەما نەیکەی، بۆ ئەوەی پارتی لەناوببەی، بۆ ئەوەی بە قسەی خۆت بنەماڵەی بارزانی لەناو ببەی، بەڵام عیبرەت لە تەجروبەی خۆت وەربگرە، دوجار دەربەدەر کرای و راتکرد بۆ ئێران و جارێکیش بۆ بەغدا و بووی بە ٦٦"[٤٥٣].

٣١ ئاب و رێکەوتنی باڵی (م.س) پارتی لە ١٩٦٦ دا لەگەڵ رژێمی بەغدا بون بە مێژویەکی ناشیرین کە گەلی کورد هەق نیە شانازی پێوە بکات، یادێکی تفت و تاڵە و لوتکەی دژایەتی کوردە بۆ براکانی، ئەگەر ژمارە ٦٦ ژمارەیەکی شوم بێت بۆ هەندێ هێزی سیاسی، بە دڵنیایەوە، ٣١ی ئابی ١٩٩٦ ئەگەر زیاتر شوم و ناشیرینتر نەبێت ئەوە بەقەد ئەو شوم و نەفرەت لێکراوە، ئەمە سەرەڕای کات و شوێن و قۆناغی روداوەکان.

لە هەمان کاتیشدا لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی یادی ٣١ ئاب بە تەواوەتی بە پێچەوانەی پارتیەوە کرایەوە و باس لە دەرکردنی پارتی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی کراو و باس لە (داگیرکردنی) هەولێر کرا لە لایەن سوپای بەعسەوە.

زمانی گرژی و توند و زبر، لە نێوان هەردولادا بەردەوام بو، تا گەیشتە ئەوەی کە کەریم سنجاری، کە لێپرسراوێکی دیاری دەزگای پاراستنی

---

[٤٥٣] برایەتی ژ ٢٦٩٧ی ١٩٩٧/٩/١.

ئەوکاتەی پارتی بڵێ: "تەنانەت مام جەلال خۆی و دکتۆر فواد مەعسوم ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی و شازاد صائب، نوێنەری یەکێتی لە ئەنقەرە، لە حەفتاکاندا لە ناو ریزەکانی پاراستن کاریانکردوە"[٤٥٤].

ئاشکرایە کە مام جەلال لەو کاتانەدا، لە دەرەوەی کوردستان بوە و هاوکاری پەیوەندیەکانی دەرەوەی پارتی کردوە و د. فواد مەعسومیش نوێنەری پارتی بوە لە قاهیرە و شازاد صائیبیش، کادێرێکی دیاری کۆمەڵەی رەنجدەران بوە لە سلێمانی.

---

[٤٥٤] برایەتی، ژ ٢٣٩٥ ی ١٩٩٧/٨/١٦.

## ١٩٩٧

# شەڕ و هەوڵی بێ ئەنجام بۆ ئاشبونەوە

سەرەتای ساڵی ١٩٩٧، وردە شەڕ لە نێوان یەکێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی لە١/٢٠وە تا ٤/٧ ی خایاند، لەو بارەیەوە مەڵبەندی شارەزوری یەکێتی لە بروسکەیەکدا دەنوسێ : "بزوتنەوە ئەم ئێوارەیە ئیعلانی شەڕی کرد لەگەڵماندا، بزوتنەوە پەلاماری هەمو بارەگاکانی (ی.ن.ک) داوە لە (کۆمیتەی بیارە، کۆمیتەی هەڵەبجە، ئاسایشی هەڵەبجە، بارەگای هێزی زەمەقی، عامورە و شیرەمەڕ) هەروەها لە هەمانکاتدا، وردە شەڕ لە ناوچەکانی، (بالیسان، چوارقوڕنە، پشدەر، قەڵادزێ و سەنگەسەر) بەردەوام بو، بزوتنەوە زۆربەی بارەگاکانیان لەم ناوچانە بێ بەرگری چوڵکردبو.

بۆ کۆتایی ئەو شەڕە بە دەستپێشخەری (حیزبی سۆسیالیستی کوردستان، یەکگرتوەی ئیسلامی کوردستان، حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان، پارتی پارێزگارانی کوردستان، رابیتەی ئیسلامی) و بە چاودێری کۆماری ئیسلامی ئێران لە گوندی گوڵەخانە و بە ئامادەبونی محەمەدی حاجی مەحمود کۆبونەوەیەک ئەنجامدرا و رێکەوتنێک لە نێوان یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان ئیمزاکرا، کە کۆتایی بە شەڕی هەردولا بهێنرێت و بارودۆخەکە وەک جارانی لێبێتەوە.

لە لایەکی ترەوە، هێز و کەسایەتیە دیارەکانی کوردستان هەوڵی جیاوازیان ئەدا بۆ نزیکبونەوەی یەکێتی و پارتی، لەو بوارەدا هەریەک لە عەزیز محەمەد سکرتێری حیزبی شیوعی کوردستان و دکتۆر مەحمود عوسمان، کەسایەتی سیاسی سەربەخۆ، لە ١٩٩٧/٤/٢ دا نامەیەکیان ئاراستەی مەسعود بارزانی و مام جەلال و سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمیتەی ناوەندی

پارتی کرد و داوای ئاشتبونەوەی هەردولایان کرد و داوای کۆنگرەیەکی گەورەی نیشتیمانیان دەکرد و کۆمەڵێک پێشنیازیان خستبوە بەردەمیان.

وەک هەنگاوێکی سەرەتایی بۆ ئاشتەوایی گشتی، لە خاڵێکدا نوسیبویان: "شەڕەکانی نێوان پارتی و یەکێتی پاش مانگی ئابی ١٩٩٦ گۆڕینێکی نەوعی لە کوردستان دروستکردوە، بوە بەهۆی ئەوەی کە دەستپێشخەری لە دەست کورددا نەمێنێت و زیادکردنی رۆڵی عێراق و ئێران و تورکیا بە ئەندازەیەک بێت، کە زۆر شت بەسەر هەردو حیزبەکە و میللەتی کوردا فەرزدەکرێت کە نە لە بەرژەوەندی حیزبەکان و نە لە بەرژەوەندی کێشەی کوردن" لەو نامەیەدا، کۆمەڵێک پێشنیاز و راسپاردەی تێداهاتبو بۆ هێمنکردنەوەی بارودۆخەکە و کۆتاییهێنان بە شەڕی ناوخۆ.

مەسعود بارزانی ناوەڕۆکی نامەکەی بەدڵ نەبوە و چاوەڕێی ئەوەی لە (دۆستانی) خۆی نەدەکرد کە هەردو هێزەکە وەک یەک سەیربکەن. مەسعود بارزانی لە هەمو نامە جیاوازەکان و گفتوگۆ رۆژنامەگەرییەکان و وتار و چاوپێکەوتنە هەمە جۆرەکانیدا، هیچ کاتێ باسی ٣١ی ئابی نەکردوە، ئەگەر لێشیان پرسیبێ، بەرگری لەو کارە کردوە.

لە وەڵامی نامەی هێزە سیاسییەکان کە ئاراستەی کرابو، لە ١٩٩٧/٤/١١ دا دەنوسێت: "..ئێوەش دەزانن کە ئێمە لە بانگهێشتی (کۆنگرەی نیشتیمانیدا) داوامان کرد کە ئەو کۆنگرەیە دەستنیشانی لایەنی (پەلاماردەر، هێرشکەر، معتدی) بکات، ئێستاش کاتی نەچوە و دەبێت لایەنی شەڕکە و شەڕفرۆش و تیرۆریست و تێکدەر دەستنیشان و ئاشکرا بکرێت، کە کێ دەستی بەم شەڕە شومە نەگریسە کردوە، کێ دەستی دەرەوەی بۆ ناو کوردستان راکێشاوە، کێ کوردستانی کردە گۆرەپانی ئیقلیمی، بەداخەوە ئێستاش خەڵکانێک هەن کە لەم حەقیقەتە هەڵدێن، تاوانبار و تاوانلێکراو، شەڕفرۆش و ئاشتیخواز، بەیەک چاو تەماشا دەکەن.."

لەم وەڵامەدا، مەسعود بارزانی هەست ناکات کە خۆیان هیچ هەڵەیەکیان کردبێت و یەکێتی بە (شەڕفرۆش، تێکدەر، تیرۆریست و هێنانی دەستی

دەرەوە بۆ کوردستان) دەناسێنێ و خۆی وا پیشان ئەدات کە غەدری لێکراوە و ئۆباڵی هەمو شەڕەکان ئەخاتە ئەستۆی یەکێتی!

سیمایەکی ناشیرینی تری ئەم شەڕانە، بریتی بو لە دەکردنی ئەندام و دۆست و لایەنگرانی یەکتر بۆ لای لاکەی تر و دەست گرتن بەسەر ماڵ و موڵکیاندا ودابەشیاندەکرد بەسەر ئەندام و لایەنگیرەکانیاندا.

لەم کاتانەدا، مەسعود بارزانی هەوڵی ئەدا کە ناکۆکی بخاتە نێو ریزەکانی یەکێتی و بە تایبەتیش نێوان مام جەلال و نەوشیروان مستافاوە، چەند جار مەسعود بارزانی پەیامی زارەکی بە دۆستانی هەردولادا بۆ نەوشیروان مستەفا ناردوە و دەڵێ: "من دو تەجروبەم هەیە لە کارکردندا لەگەڵ یەکێتی، فەترەیەکیان لەگەڵ نەوشیروان و فەترەیەکیان لەگەڵ مام جەلال، ئەو فەترەییەی لەگەڵ نەوشیروان کارم کردوە وەک یەک حیزب و بۆ یەک میللەت کارمانکردوە، بەلام ئەو فەترەیەی لەگەڵ مام جەلال وەک دو حیزب...یەکێ لە قسەکانی ئەوە بوە کە "با مام جەلال واز لە یەکێتی بێنێ ئەوسا ئێمەش لەگەڵ یەکێتی رێک ئەکەوین" نەوشیرانیش وەلامی ناردۆتەوە کە: "ئەگەر مەسعود و سەرکردایەتی پارتی ئەیانەوێ لەگەڵ یەکێتی رێک بکەون، ئەبێ لەگەڵ مام جەلال و سەرکردایەتی مەوجودی یەکێتی رێک بکەون"[٤٥٥].

جارێکی تر، لە پێناوی ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتیدا، جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا بۆ کاروباری ناوچەی ناوەڕاست بە وەکالەت، دێڤید ویلش لە ١٩٩٧/٤/٤ دا، لە کۆیسنجەق لەگەڵ مام جەلال کۆبۆوە، دوای ئەوەی کە رۆژێ پێش ئەوە لە سەلاحەدین لەگەل مەسعود بارزانی کۆببوەوە، هەوڵی ئەمەریکا ئەوە بو، کە بتوانێت لە کاتێکی نزیکدا، کۆبونەوەیەکی هاوبەش بە ئامادەبونی کەسانی دەسەلاتداری هەردو هێز ئەنجام بدرێت.

ئەمەریکیەکان پێیان باشبو کۆبونەوەکە لە ئەنقەرە ئەنجام بدرێت،

---

[٤٥٥] نامەی نەشیروان مستەفا بۆ مام جەلال لە ١٩٩٧/١/٤ لە لندنەوە، کۆپی نامەکە لای نوسەر پارێزراوە.

لێپرسراوە ئەمەریكیەكە وتی: "زۆر گرنگە كە بەندەكانی كۆبونەوەی ئەنقەرە جێبەجێ بكرێت، كە پەیوەندی بە ئاشتی نێوان هەردولاوە هەیە، لەوانەش چارەسەركردنی داهاتی گومرگی كە حیزبەكەی بارزانی لە هاوینی ١٩٩٤ وە دەستی بەسەرداگرتوە"[٤٥٦].

ناوبەناو، تروسكەیەكی هیوابەخش لەو ئاسمانە تاریكەدا دەردەكەوت و گرنگە كە باس بكرێت، ئەویش بە هاوكاری لیژنەی ئاگربەست، لە ١٩٩٧/٤/١٤ دا، پرۆسەیەكی دیل گۆڕینەوە لە نێوان پارتی و یەكێتیدا رویداو و پارتی ٦٠ بەندی یەكێتی و یەكێتیش ٧١ بەندی پارتی ئازادكرد.

## كۆبونەوەیەكی تر لە نێوان پارتی و یەكێتی لە لندن

بۆ بەردەوامی ئەو پرۆسەیە و زەمینە خۆشكردن بۆ هەنگاوی گەورەتر، هەولێكی تر درا بۆ ئاشتەوایی نێوان هەردولا، لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا، كۆبونەوەیەك لە ١٩٩٧/٤/٣٠ دا لە نێوان پارتی و یەكێتی ئەنجام درا، وەفدی یەكێتی بریتی بون لە (كۆسرەت رەسوڵ، قادری حاجی عەلی، د. لەتیف رەشید، د. محەمەد سابیر) و وەفدی پارتی پێكهاتبو لە (نێچیرڤان بارزانی، هوشیار زێباری، ئازاد بەرواری و فەرهاد لوقمان بارزانی) بەسەرپەرشتی فرانك بێكەر (بەریتانیا) رۆبێرت دۆیچ (ئەمریكا) لۆزچیلیكۆ (توركیا) هەمو لاكان جەختیان لەسەر بەردەوامی ئاشتی هەمیشەیی كردەوە و بڕیاریاندا دوای مانگێكی تر كوبۆنەویەكی تر لە ئەنقەرە ئەنجام بدرێت و هەمو ئەو زیندانیانەی كە ماون ئازادبكرێن و خاڵە ئیجابیەكانی كۆبونەوەكانی تر، جێبەجێ بكرێت.

بۆ كۆتاییهێنانی شەڕی نێوان یەكێتی و بزوتنەوەی ئیسلامیش، ئێران نوێنەرانی هەردولای بانگهێشتی تاران كرد و لەژێر كاریگەری ئێراندا، هەردولا لە ٤/٢٩ رێكەوتنامەیەكیان مۆركرد، كە ئیتر بە هیچ شێوەیەك شەڕ

---

[٤٥٦] الحیاة، ژ ١٢٤٥٥ی ١٩٩٧/٤/٥.

لە نێـوان ئەو دولایەنەدا رو نەدات و بـارودۆخەکە هـێمن بـکەنەوە و هەوڵ بدەن بۆ فەراهەمکردنی ئاشتییەکی سەرانسەری.

وڵاتانی عەرەبی کەمترین رۆڵ و هەوڵیان هەبو بۆ هێنانەکاییەی ئاشتی لە کوردسـتاندا، لەم بـوارەدا وڵاتـی میسـر هەوڵـی خۆیـدا بـۆ ئاشـتەوایی لە نێوان پـارتی و یەکێتیـدا، ئەم هەوڵەش، جـگە لە خەمخۆرییـان بـۆ کێشـەکە، مەبەستیشیان بو کە ئێران رۆڵـی دیـار نەبینێت لە بەرقەراکردنـی ئاشـتی لە نێو ریزەکانی هێزە سیاسیەکاندا و هەروەهـا ئەیانگوت کە نابێت "وڵاتێکی عەرەبـی وەک عێـراق" پارچەپـارچە ببێـت، گۆڤـارێکی عەرەبـی لە ژێـر ناونیشـانی (قـاهیرە بانگهێشـتی تاڵەبـانی دەکـات بـۆ باسـکردنی دەسـەڵاتی ئێرانی) نوسیبوی: "ئاشکرایە کە حکومەتی میسر دڵگرانی خۆی دەربڕیوە، لە دابەشبونی یەکێتی عێراق، لە ئەنجامی نەبونی دەسەڵاتی ناوەند لە نـاوچە کوردییەکان لەسەروی عێراقەوە...ئەم خەمخۆرییەی قاهیرە لەو زانیـارانەوە دێـت کە دەڵێـت، دەسـەڵاتی ئێرانـی لە ناوەڕاسـتی سـاڵی پـارەوە، بەهـۆی هاوکـاری حیـزبە کوردییەکـانەوە زیـادی کـردوە..ئەمە سـەرەڕای ئەوەی کە قـاهیرە لە سـاڵی ١٩٩٢ وە سـوربوە لەسـەرئەوەی کە هـیچ پەیوەنـدییەک لەگەڵ هێزە بەرهەڵسـتکارەکانی عێراقـی نەکـات، لەوانەش کوردەکـان، بەڵام کاتێ کە نفوزی ئێرانی و تورکی و نەبونی رۆڵی عەرەبی دەبینێ، هەروەهـا ئەو کە نایەوێـت لەگەڵ هێـزە بەرهەڵسـتکارەکانی عێراقیـدا مـامەڵە بکـات، قاهیرە ناچارە کە گرنگییەکی تایبەتی بە کێشەی عێراقی بدات"[٤٥٧].

هەر لەو بـارەیەوە، رۆژنـامەی (الحیـاة) نوسـیویێتی: "بڕیـارە کە سـەرۆک حوسنی موبـارەک ئیمـرۆ چـاوی بەسـەرۆکی یەکێتـی نیشـتیمانی کوردسـتان، جەلال تاڵەبـانی بکەوێت، لێپرسراوێک وتـی: بڕیـاری داوە و پشـتگیری میسـر ئاشـکرا بکـات، هەروەهـا چاویشـی بەسـەرۆکی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان، مەسـعود بـارزانی دەکەوێـت. لەو بارەیەشـەوە، سـەرۆکی ویـلایەتە

[٤٥٧] الوسط، ژمارە ٢٧٣ی ١٩٩٧/٤/٢١.

یەکگرتوەکانی ئەمریکا وتی: ئەوە هەوڵ و بینینانە هیچ بەرهەڵستیەکی نیە بۆ ڕۆڵی میسر بۆ نزیک خستنەوەی هێزە کوردییەکانی سەروی عێراق، هەوڵی قاهیرە، تەواوکەری هەوڵی ئەنقەرەیە، نەک جێگریەتی"[458].

وڵاتانی دراوسێ وەک ئێران و تورکیا، هەروەها وڵاتانی زلهێز وەک ئەمریکا، بەریتانیا و فەرەنسا، هەوڵی جیاوازیان ئەدا بۆ هێنانە کایەی ئاشتەوایی لە کوردستاندا، مەسعود بارزانی لە ١٩٩٧/٦/٤ دا، وتارێکی لە پەرلەمانی کوردستان پێشکەشکرد و داوای ئاشتەوایی گشتی دەکرد، بێ ئەوەی ناوی ئەو هێزە بێنێت کە دەیەوێت ئاشتی لەگەڵدا بکات.

بۆ بەردەوامی ئاگربەست لە نێوان یەکێتی و پارتیدا، سەرۆکی بەرەی تورکمانی بە دەستپێشخەری P.M.F لە ١٩٩٧/٦/٣٠ کۆبونەوەیەکی لە شوێنی هێڵی تەماس لە نێوان کۆیە و دێگەڵە ئەنجامدا و باسیان لە شێوەی باشترکردنی ئاگربەست کرد.

هەر لە پێناوی ئەو ئاشتییەی کە نەئەهاتەدی، نوێنەرانی پارتی و یەکێتی لە ٦-١٩٩٧/١٠/٧ بە ئامادەبونی نوێنەرانی ئەمریکا، بەریتانیا و تورکیا لە ئەنقەرە کۆبونەوە، یەکێتی جەختی لەسەر ئەوەدەکردەوە کە ڕێکەوتنی ئەنقەرەی ١٩٩٦/١٠/٣١ جێبەجێبکرێت، کە پەیوەندی بە وەستانی شەڕ و گرژی و دروستکردنی حکومەتێکی هاوبەش و مەسەلەی هەولێر و داهاتی گومرگی ئیبراهیم خەلیل هەبو. ئەم کۆبونەوەیەش وەک زۆربەی کۆبونەوەکانی لەوەوپێش بێ ئەنجام بو.

---

[458] الحیاة، ژمارە ١٢٤٨٥ی ١٩٩٧/٥/٦.

## شەڕی گەردەلولی تۆڵەی یەکێتی

ئەو ئاشتیە کاتیە لەقە زۆر بەردەوام نەبو، جارێکی تر، شەڕ لە نێوان هەردولادا دەستپێکرد، لە ١٩٩٧/١٠/١٣ لە میحوەرەکانی (وەرتێ، دۆڵی بالیسان، دۆڵی هیران، سماقوڵی)، شەڕەکان زیاتر لەسەر شاخە روت و قوتەکان بو، کە نە ژیانی تێدابو، نە سەوزایی نە ناوچەی ئیستراتیجی بون!.

یەکێتی ئەم شەڕەی ناونا (گەردەلوولی تۆڵە)، ئینسکلۆبیدیای یەکێتی نیشتیمانی بەم شێوەیە باسی دەکات: "ئۆپەراسیۆنی دوەمی گەردەلولی تۆڵە، ئۆپەراسیۆنێکی گەورەی شەڕی ناوخۆیە، هێزی پێشمەرگە لە شەوی ١٢ لەسەر ١٣ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩٧ دەستپێکرد و توانی لە ماوەیەکی کورتدا دەست بەسەر قەڵەمڕەوێکی فراواندا بگرێ.

لە قۆڵی بالیسان، ئالانە هێزی پێشمەرگە کەپکی حەمەد ئاغا و کڵاو قاسم، شاخە سور و بەنی هەریر و زەرتکان و زینەتیر و گوندەکانی دۆڵی ئالانەی تا گوندی بناوێ و چیای ئیرۆن و گوندەکانی دەوروبەری گرت.

لە قۆڵی هیران – شەقڵاوە رەبیەکانی زورکی هیران و سەر هیران و داربەن، گردی جاسوسان، گردی گەورە، کەپکی شیلانە، کەپکی حاجی ساڵح، ناولانک، کەپکی گەرۆتە و گردەکانی کونەکانی چیای سەفین گیران.

لە قۆڵی سماقوڵی، دۆڵی هەرمێ، سەری بنەباوێ، قۆپی سوسێ، دۆڵی بیرۆکە و ناودارۆکان بەهەر ٢٤ رەبیە و ٨ بارەگای هێزی گوندی سوسێ و بارەگای لیوای ٢٧ و ٢ بارەگای داری حەمەوە گیران.

لە قۆڵی دۆڵی خانەقا، وەرتێ، قەسرێ، شاخی ناسر، هەمو رەبیەکانی خانەل، وێڵزێ، سۆرەبان، کۆلیتار، کۆڵانە فاتان، زنجیرە چیای دێزیلە،

زنجیرە چیای دڕەبی، چیای سەر باڵەک، گوندەکانی دۆڵی خانەقا و وەرتێ تا دەگاتە حافیز و قۆپ، شاخی سەری کێڵ، زینی ماویلیان، سەری رۆڵە، شاخی سور، کۆخان، ساکۆت، زینی گۆران، چیای مامە ڕوت و قەسرێ، گیران.

لە هەندێ قۆڵدا بەشێک لە هێزەکانی پەکەکە بەشداریيان لە هێرشەکاندا کرد، ئەمەش بۆچونێکی وای لای تورکیا دروستکرد، کە دەشێ هەر گۆڕانێکی تەرازوی هێز لە هەرێم بە سودی پەکەکە بشکێتەوە، بۆیە لە ۳۱ ی تشرینی یەکەمدا، سەرکردایەتی سیاسی تورکیا، بڕیاریدا هێز بخاتە گەڕ بۆ ڕێگرتن لە هەر سەرکەوتنێک کە هێزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە دەستی بێنن، هەر ئەو ڕۆژە یەکەم دەستتێوەردانی سوپایی دەستپێکرد، کاتێ فرۆکە جەنگیەکانی بۆ ماوەی ۱۵ خولەک گردە زۆزیان لە قۆڵی دۆڵی خانەقا بۆردومان کرد[٤٥٩].

ئەمە یەکەمجار بو، کە فرۆکەی تورکی بەشداربێت لە شەڕی ناوخۆدا لە سودی پارتی.

[٤٥٩] ئینسکلۆبیدیای یەکێتی نیشتیمانی کوردستان. لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران، چاپی دوهەم، ۲۰۱۲، ل٦٧١.

## شەڕی نێوان پارتی کرێکاران (PKK) و پارتی

هاوینی ١٩٩٧، شەڕی نێوان (پ.ک.ک) و پارتی، بەقەدەر گەرمای ئەوساڵە گەرم بو، هەردولا بە سەختی شەڕی یەکتریان دەکرد و تورکیاش بە خەستی هاوکـــاری پـــارتی دەکـــرد: "پارتیمـــان پێشـــتر لە ڕۆژی ١٩٩٧/٨/٢٦ دا بەیاننامەیەکی ئاراستەی ڕای گشتی کرد دەربارەی بۆردومانی (ئامێدی) لە لایەن (پ.ک.ک) و تۆپبارانی (حاجی ئۆمەران) و گوندی (سەران) و چەند جێیەکی تر بە هاوبەشی لەگەڵ (ینک)دا، چەکدارەکانی (پ.ک.ک) گوندەکانی کوردستانیان کردە نیشان و کەوتنە پەلاماردانیان و سوتاندنی ماڵان و بەتاڵان بردنی ملک و ماڵ و سوتاندنی ڕەز و باخ و کوشتنی پیر و منداڵ، بەو ئامانجەی گوندنشینان ناچار بکەن کۆچ بکەن"[٤٦٠].

ئەم شەڕە نەگریسە لە نێوان پارتی و پارتی کرێکاراندا بەردەوام بو، ڕۆژ بە ڕۆژیش، گڕەکەی زیادیدەکرد، ڕۆژنامەی برایەتی لە ١٩٩٧/٩/١٥ دا بە مانشێتی گەورە نوسیویتی: "پەکەکە و یەنەک هێرش دەبەنە سەر وەرتێ و ٧٤ خانوو دەسوتێنن، پێشمەرگە قارەمانەکان هێرشەکە تێک دەشکێنن و تەرمی ١١ کوژراویان پێ بەجێ دێڵن"، لە ٩/١٦ دا لە هەمان ڕۆژنامە نوسیویانە: "لە لایەکی ترەوە پێشمەرگە قارەمانەکانی پارتیمان لە دەڤەری (باڵەکایەتی) سەعات ٦ و نیوی بەیانی پێرێ ١٤ ئەیلولی ١٩٩٧ هێرشێکی کتوپڕ و پڵنگ ئاسایان کردە سەر مۆڵگایەکی چەکدارە بەزیوەکانی (پەکەکە) لە بەرزاییەکانی (بەردوناف) و ئاگری هەمە جۆرەکانیان بۆ ماوەی سێ

---

[٤٦٠] برایەتی، ژ ٢٤١٩ی ١٩٩٧/٦/١٧.

سەعات باراندە سەر تێرۆریستان و بە نەخشەیەکی سەربازی گونجاو و ٨ بریندارییان لە دوژمن داو باقییەکەی تریشیان پەرتەوازە بون و ڕێویی ئاسا ڕایان کرد" شەڕ بەم شێوەیە بەردەوام بو.

بێگومان ئاگری ئەم شەڕەی کورد-کوردە، بە بەنزینی سوپای تورکیا کڵپەی زیاتر دەسەند و ئەوانیش بە دڵخۆشیەوە سەیری کوژرانی روڵەی کورد و خاپورکردنی دیهاتی کوردستانیان دەکرد، سەرکەوتوی یەکەم دەسەڵاتداران و سوپای تورکیا بو، زەرەرمەندی یەکەم و سەرەکیش تەنها و تەنها روڵەکانی کورد بون لەم دیو یان لەودیو سنور.

شەڕی گەرمی نێوان یەکێتی و پارتی و سوپای تورکیا، زۆری خایاند و تورکیا بە هێزی کۆماندۆ و هەمو توانایەکیەوە و بە نوێترین فرۆکە و تۆپ، هێرشی ئاسمانی و زەوییان دەکردە سەر هێزەکانی یەکێتی، یەکێتی ناچارکرا لەو شوێنانەی دەستیان بەسەردا گرتبو، بکشێنەوە و بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە شەڕی پارتیزانی یان بەرەیی هێزێکی سیاسی، لەگەڵ سوپایەکی پڕ چەکی وڵاتێک کە ئەندامی ناتویە کە مۆدێرنترین چەک بەکاردێنێت، لەم چەرخەدا زۆر نابەرامبەرە و ئاسۆی سەرکەوتنی زۆر تاریکە.

دەربارەی پرسیارێک کە بۆچی یەکێتی لە شەڕی گەردەلولی تۆڵەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، مام جەلال دەڵێ: "یەکێتی سەرکەوت، ئەو هێرشەی کە کردمان هەمو ئەو شوێنانەی کە دامانابو بە یەک سەعات گرتمان، بە کەپکی حەمەد ئاغاوە بە سەفینەوە، بە پەنای سەرکردایەتی مەسعود بارزانیەوە بو، هەمو ئەو شوێنانەی دامانابو لەو نەخشەیە بەیەک سەعات هەموییانمان گرت.

بۆچی تەوامان نەکرد، چونکە تورک تەداخلی کرد، رۆژی یەکەم دێڤید وێڵش یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بۆ خۆرهەڵاتی نزیک تەلەفۆنی لەگەڵ کردم و گوتی :"شیریک بێڵ لەسەر خەتە پێم دەڵێت :جەلال با شەڕەکە ڕاوەستێنێت، چیتر نەچنە پێشەوە". ئێمە

بەتەمای گرتنی سەری ڕەش بوین، سەفینمان گرتبو، تكایان كرد كە سەری ڕەش نەگرین، چونكە ئەوكاتە موشكیلەكە قوڵ دەبێتەوە، گوتی: "منیش بەڵێن دەدەم كێشەكە بەپێی ڕێكەوتنامە كۆنەكان چارەسەر بكەم".

حكومەتی عێراق هەواڵیان بۆ ناردین و گوتیان :"مەسعود بارزانی (دەخیل)ی سەرۆك بوە، سەری ڕەش هی ئێمەیە، سەرۆك تكات لێدەكات مەچنە سەری ڕەش و سەری ڕەش مەگرن، چونكە لەو كاتەدا سەرۆك ناچارە بەرگری لەسەری ڕەش بكات، ئێمە ئەمجارە نامانەوێت بەشداری شەڕ بین لە دژتان، چونكە ئێوە بەرامبەر بە توركیا وەستاون، بۆیە تكاتان لێدەكەین نەچنە سەری ڕەش".

بەهۆی گوشاری توركیا و تكای ئەمەریكا و داخوازی عێراقەوە، ئێمە هەڵوێستەیەكمان كرد، ئەو هەڵوێستەیە لەڕوی عەسكەریەوە هەڵە بو، بەڵام لە ڕوی سیاسیەوە دەبوایە بیكەین، چونكە ئەو هەمو هێزە هاتبوە كایەوە، ڕۆژی دوەم و سێهەم فڕۆكەی تورك هاتە شەڕەكەوە و لە خەلیفان فڕۆكەی تورك زیانێكی زۆری لێداین.

لە ئاسمانەوە بە فڕۆكە چەندین ئۆتومبێلی سوتاندین بۆ ئەوەی نەگەینە ئەوێ، هەمو ڕۆژێك فڕۆكەی تورك دەهاتە سەرمان، پاشان دەبابەی تورك و ئەوجا سوپای تورك هاتن .ئەگەر سوپای تورك نەهاتنایە، ئەوا بە تەواوی سەركەوتنمان بەدەست دەهێنا و پارتی لەشەڕەكەدا بەرامبەرمان خۆی نە ئەگرت"[٤٦١].

لەو كاتانەدا و بۆ نیشاندانی ڕۆڵی بەعس لە جارەسەری كێشەناوخۆیەكانی كوردا، سەدام حسێن، هاتنی هێزەكانی بۆ هەولێر بەوە نەدەزانی كە بۆ یارمەتی مەسعود بارزانی چۆتە ناو هەولێرەوە، سەدام لە ١٩٩٧/١١/١٨ دا، لە كۆشكی كۆماری لە ئاهەنگێكی گەورەدا، پاداشتی

---

[٤٦١] دیداری تەمەن، بەرگی ٢، ل ٢٦٠.

کۆمەڵێک ئەفسەری گەورەی عێراقی بە (آنواط الشجاعة) کرد بە بۆنەی ئازایەتیان لە چونە ناو هەولێر، پایتەختی ناوچەی کوردی لە عێراق لە ئابی رابوردودا بۆ هاوکاری بارزانی دژ بە تاڵەبانی، لەوانەی کە خەلات کران، هەریەک لە وەزیری بەرگری هاشم ئەحمەد سوڵتان و کوری دوهەمی سەدام قوصەی سەدام، سەرپەرشتیاری دەزگای ئاسایشی تایبەت و سەرۆکی گاردی کۆماری، هەروەها سەدام لەو ئاهەنگەدا بانگهێشتی حیزبە کوردیاکانی کرد، کە بێنەوە بۆ بەغدا و لەگەڵ حکومەتی ناوەند گفتوگۆ بکەن و بە هەمو خزمەتی عێراق بکەن[٤٦٢].

---

[٤٦٢] الشرق الاوسط، ١٩٩٧/١١/٢٠.

## ١٩٩٨

# هیلاکبون له شەڕی یەکتر

لەگەڵ هاتنی ساڵی نوێی ١٩٩٨ دا، شەڕی گەرمی نێوان یەکێتی و پارتی کۆتایی هاتبو، هەردو هێزەکەماندوببون و توانای شەڕی تریان نەمابو، بۆ هەرولا دەرکەوتبو کە هیچیان ناتوانن ئەوەی تر لەناوبەرن. یەکێتی و پارتی و هاوڵاتیانی کوردستان و دۆستانی ناوەوە و دەرەوە بەتەواوی بێزاربوبون لەو شەڕە و هیچ لایەک هیوای بەوە نەمابو کە لەو ڕێگایەوە سەرکەوتن بەدەستبهێنێت، هەمو لایەکیش ئەوەیان بۆ رون ببۆوە، کە کورد لەناوخۆیاندا بێ هاوکاری جدی هێزی دەرەوە ناگەنە هیچ ئەنجامێک و هاوڵاتیانی کوردستان بەم شێوەیەی کە تا ئەو کاتە بەڕێوە دەچو، بێهیوا بون کە ئاسۆی ئاشتی و تەبایی ببینن.

له ١٩٩٨/٢/٢٠، نوێنەرانی یەکێتی و پارتی بە دەستپێشخەری عەزیز محەمەد لە شەقڵاوە کۆبونەوە و باسی دابەشکردنی هاوکاریەکانی ڕێکخروەکانی نەتەوەیەکگرتوەکانیان لە کوردستان کرد و ئەمەش زەمینەی خۆشکرد بۆ بەشداری هەردو نوێنەرانیان لە ١٩٩٨/٥/٢٧ لە (کۆنگرەی دیالۆگی کوردی - عەرەبی) کە لە قاهیرە ئەنجام درا.

دەربارەی شەڕ و ئاشتی و پەیوەندی نێوان یەکێتی و پارتی، نەوشیروان مستافا لە ١٩٩٨/٧/١٥ دا نامەیەک بۆ مام جەلال دەنوسێت و لە بەشێکیدا دەڵێ: "..وەک لە لەندەن عەرزم کردیت، پێی ناچێت لە هەلومەرجی ئێستادا زەمینەی ئاشتبونەوەی پارتی و یەکێتی لەسەر بنچینەی ڕێکەوتنێکی هاوسەنگ و بەرامبەر لای بنەماڵەی بارزانی هەبێ. تەنانەت ئەگەر جەنابیشت

سەردانی سەلاحەدین بکەی، مەگەر بە مەرجە پێشەکیەکانی پارتی رازی بن، مەرجەکانی پارتیش ئەوەی من بیستومە:

١. ئەبێت ئەوان زۆرایەتیان لە پەرلەماندا هەبێ.

٢. ئەبێ ئەوان زۆرایەتیان لە وەزارەتدا هەبێ.

٣. ئەبێ داهاتی کوردستان (مەبەستیان ئیبراهیم خەلیله) و سەرفی بەدەست خۆیانەوە بێ.

٤. ئەبێ ئاسایشی هەولێر بەدەست خۆیانەوە بێ. نازانم سەرکردایەتی یەکێتی تا چ ئەندازەیەک ئەم مەرجانەی پێ قبول ئەکرێ؟.

رەنگە بەدیلێکی تر، ئەگەر پارتی قبوڵی بکا، ئەوە بێ: لەم بارودۆخەدا تا کاتێکی دیاریکراو (بۆ نمونە بۆ ماوەی ساڵێک یان زیاتر) هەردو حکومەت بە رەسمی دان بەیەکتریدا بنێن و کۆتایی بە حاڵەتی شەڕ بهێنن و بە پێیی چەند قاعیدە و ضەمانێکی بەهێز، رێک بکەون لەسەر: هاوکاری هەردو حکومەت لە هەمو مەیدانەکاندا. هەردو حیزب رێگا بەیەکتری و بە رێکخراوە دیموکراتیەکانیان بدەن لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکتریدا بە ئازادی کار بکەن. گیراوەکان بەر بدرێن. رێوشوێن دابنێن بۆ گەڕانەوەی ئاوارەکان بۆ شوێنی خۆیان. رێوشوێن دابنێن بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی چەکدار و گۆڕینی ترکیبی ئاسایش و پۆلیس و کردنی بە دەزگایەکی بێلایەن. رێوشوێن دابنێن بۆ هەڵبژاردنێکی نوێ ...هتد.

بەراستی هەلومەرجی کوردستان ئەوەندە ئاڵۆز و (تەڤ لە هەڤە!)، من سەری لێدەرناکەم، ئەوەی ئەیڵێم هەر بیروڕایە و، رەنگە لە کردن نەیەن، بەڵام ئەبێ هەنگاوێکی سیاسی بهاوێژرێ، کوردستانی عێراق لەم چەقینە درێژە دەربچێ..[٤٦٣].

---

[٤٦٣] کۆپی نامەکە لای نوسەر پارێزراوە.

# ڕێکەوتنامەی واشنتۆن ١٩٩٨/٩/١٧

هەمو هێزە کوردستانییەکان و لە پێشیانەوەش یەکێتی و پارتی، هیچ هێز و ئامادەییەکی شەڕیان تێدا نەمابو، واتا زەمینەی شەڕی ناوخۆ، خەریک بو کاتی بەسەر ئەچو، وە ئامرازی شەڕەکەش ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو کزی و نەمان ئەچو. لەبەرئەوەی ئەمریکا دەمێک بو ئامادەکاری دەکرد بۆ ئەوەی لەژێر چەتری خۆیدا ئاشتەوایی کوردی-کوردی دروست ببێت و ڕێگا لە ئێران بگیرێت کە ڕۆڵی نێوانگیری ببینێت، بۆیە بانگهێشتکردنی مام جەلال و مەسعود بارزانی بۆ ئەمریکا، لە کاتێکی گونجاودا بو، کە هەلی ئاشتی نێوان پارتی و یەکێتی گەیبو وە زۆر لەباربو.

مام جەلال، بەم شێوەیە باسی ئەو ڕێککەوتنە دەکات: "ئەو ڕێککەوتنە، بە دەستپێشخەریی ئەمەریکیەکان هاتەکایەوە، ئەمەریکیەکان پێشتریش لە نێوان یەکێتی و پارتیدا زۆر هەوڵیاندابو، چەندینجار وەفدیان هاتە کوردستان بەتایبەتی (ڕۆبەرت دۆیچ) زۆر هەوڵیدا و گەلێک ماندوبو لە بەینماندا.

ئێمە هەمو ئەو پێشنیارانەمان قبوڵکرد کە ئەمەریکا دابویان، بەڵام پارتی قبوڵی نەکرد، دوای ئەوەی ڕێکەوتنامەی ئەنقەرەش لە ١٩٩٦/١٠/٣١ لە نێوان وەفدی پارتی و یەکێتیدا ئیمزا کرا، دیسان پارتی پەشیمان بۆوە.

ڕێکەوتنامەی ئەنقەرە، لە شانزە، حەڤدە فەقەرە پێکهاتبو، ئێمە قبوڵمان کردبو لەوێ، سەرۆکی وەفدی پارتیش سامی عەبدولرحمان قبوڵی کردبو، بەڵام مەکتەبی سیاسی پارتی لە کوردستان قبوڵی نەکرد. ئەمەریکیەکان کەوتنە خۆیان کە دەبێ شتێک بکەن بۆئەوەی پەیوەندی نێوانمان چاکببێتەوە، بە پێویستیان زانی بۆئەوەی ئەو ئەزمونەی کوردستان نەفەوتێ و عێراق لەو

نێوانەدا سودمەند نەبێت بە تایبەتی کە پارتی دوای داگیرکردنی هەولێر، عێراقی هێنابوە ناو کێشەکەوە و ئەیویست دەورێک ببینێ.

ئەمەریکا دەیویست ئەو دەورە لە عێراق بسێنێتەوە بۆ ناوبژیکردنی ئێمە و پارتی، لەبەرئەوە هەردولامانی بانگکرد بۆ واشنتن بۆ گفتوگۆ.

من لەبیرمە، یەکەم دانیشتن کە مەسعود بارزانی و من پێکەوە بوین، ئەو لە ژورێک دانیشتبو، لەگەڵ من چومە ژورەوە زۆر بەگەرمی چاک و چۆنیمانکرد و پێکەوە دانیشتین، ئەوان سەریان سوڕما و چاوەڕێیان نەدەکرد، ئێمە بتوانین ئەو جەوە گەرمە دروستبکەینەوە.

لەپاش گفتوگۆیەکی زۆر لە نێوان ئێمە و پارتیدا، گەشتینە قبوڵکردنی ئەو پرۆژەیەی ئەمریکیەکان ئامادەیان کردبو. یەکەمجار ئەمریکیەکان پرۆژەیەکی تریان هێنابو، ئەو پرۆژەیە زۆرتر داخوازیەکانی ئێمەشی تێیدا دیاربو، بە تایبەتی مەسەلەی دەرامەت و یارمەتی و گەڕانەوە بۆ هەولێر، هەندێک لە برادەرانی پارتی، پێیان وابو ئەو پرۆژە ئەمریکیە لە نوسینی دکتۆر بەرهەم بوە، بۆیە ئەوان قبوڵیان نەکرد. جارێکی کە پرۆژەیەکی تر هاتەوە، ئاخر پرۆژە ئەوە بو بەو سیغەیەی ئێستا دەرچو و هەردولامان قبوڵمان کردوە و ئیمزامان کرد.

کە رێکەوتنامەکەمان ئیمزاکرد، بردیان بۆ (مەدام ئۆڵبرایت)، ئەویش لە دوی ناردین، هەردوکمان مەسعود بارزانی و من لەگەڵ بەرهەم و هۆشیار زێباری چوینە ژورەوە. لەوێ (مەدام ئۆڵبرایت) پیرۆزبایی لێکردین و گوتی: "ئەم رێکەوتنامەیە شتێکی زۆر باشە، من بەڵێنتان دەدەمێ کە ئەگەر ئێوە ئەو رێکەوتنامەیە جێبەجێ بکەن، ئەوا ئێمە پشتیوانی و بەرگریتان لێدەکەین و یارمەتیتان ئەدەین بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەتان. من خۆم ئامادەم لەبەرچاوی ئاژانسەکان، ئەم رێکەوتنامەیە ئیعلان بکەم و پشتیوانی ئەمەریکای بخەمە پاڵ، بەڵام چەند مەرجێکم هەیە، ئێوەش بەڵێنم بدەنێ ئەو مەرجانە قبوڵ بکەن:

یەکەم: ئێوە هەردولاتان بەڵێن بدەن، بارودۆخەکە ئاسایی بکەنەوە، شارەکانی هەولێر و دهۆک و سلێمانی ببێتەوە بە شاری هەموان.

دوەم: ببنەوە بەشەریک لەو دەرامەتەی کە هەیە و بەش بکرێت لە نێوانتاندا.

سێیەم: ئێوە هەردولاتان هەڵبژاردن قبوڵ بکەن.

چوارەم: حکومەتەکە یەک بخەن، ئیدارە یەک بخەن.

ئەگەر ئەم چوار مەرجەتان قبوڵکرد، ئەوا من دێم لەگەڵتان رێکەوتنامەکە ئیعلان دەکەم".

پێش من مەسعود بارزانی وەلامی دایەوە و گوتی: "هەمویمان قبوڵە بەزیادیشەوە"، منیش گوتم :"دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ دەنگی کاک مەسعود و مەرجەکانتان قبوڵ دەکەین". ئینجا هاتینە دەرێ، ئەوە بو بە ئامادەبونی مەدام ئۆڵبرایت رێکەوتنامەکە ئاشکرا کرا[٤٦٤].

رێکەوتنی واشنتۆن، هەنگاوێکی گەورەی گرنگ بو، دەنگێکی زۆری دایەوە لە ناوە و دەرەوەی وڵات و بوە جێی خۆشحاڵی هەمو هاوڵاتیانی کورد و دۆستەکانیان، ئەوەی دڵگران بو، تەنها ناحەزان و ئەوانەی کە سودمەند بون لە شەڕی ناوخۆی کوردی، لەم بارەیەوە رۆژنامەیەک دەربارەی رۆڵی تورکیا نوسیبوی: 'ئەنقەرە ئاگاداری بارزانی و تاڵەبانی دەکاتەوە بۆ دروستکردنی بەرێوەبەرایەتیەکی خۆجێتی لەسەروی عێراق، نجات ئەوتکان، قسەکەری وەزارەتی دەرەوەی تورکیا وتی: هەمو رێکەوتنێک بۆ ئیدارەی کاتی لەسەروی عێراق، پێویستە کاتی بێت، چارەی هەمیشەیی پێویستە لە چوارچێوەی عێراقدا بێت'[٤٦٥].

دەربارەی ناوەرۆکی رێکەوتنامەکە، رۆژنامەی (الشرق الاوسط) لە بەیانێکی یەکێتیەوە، ئەم خاڵانەی بڵاوکردۆتەوە:

---

[٤٦٤] دیداری تەمەن، بەرگی ٢، ل ٢٦٧.

[٤٦٥] الشرق الاوسط، ژمارە ٧٢٣٣ ی ١٩٩٨/٩/١٧.

١. دروستکردنی حکومەتێکی ئینتقالی یەکگرتو.

٢. گەڕانەوەی هەمو داهات بۆ خەزێنەی حکومەتی هەرێم. (ئەم دو خاڵە پێویستە لەماوەی ٣ مانگدا جێبەجێبکرێت)

٣. ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی هەولێر، سلێمانی و دهۆک.

٤. هەڵبژاردنێکی ئازاد و ڕاستیانە لە ماوەی ٩ مانگ درەنگتر نەبێت.

هەروەها هەردولا لەسەر ئەم خاڵانەش ڕێکەوتن:

١. دانانی پەرلەمانێکی نوێ، کە جێگای ئەم پەرلەمانە بگرێتەوە، لەو کەسایەتیانەی کە لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ١٩٩٢ دا، هەڵبژێرابون.

٢. دروستکردنی لیژنەیەکی باڵا لە ٣ ئەندامی یەکێتی و ٣ ئەندامی پارتی، ئەرکیان، بەدوداچون بێت بۆ جێبەجێکردنی خاڵەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیە و دانانی حکومەتێکی کاتی یەکگرتو، گەڕانەوەی هەمو داهات بۆ خەزێنەی حکومەت و زەمینە خۆشکردن بۆ هەڵبژاردنێکی پەرلەمانی نوێ.

٣. داهات هەرێم لە ماوەی ٣ مانگدا، بگەڕێتەوە خەزێنەی حکومەت، تا ئەو کاتە، پێویستە حکومەت، یارمەتی دارایی بدات بەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتیماندایە.

٤. کار بۆ فیدراڵیەت، حکومەتی هەرێم و پەرلەمانی کوردستان.

٥. ڕێگرتن لە هەڵهاتنی هاولاتیان لە کەرکوکەوە بۆ ناوچەکانی تر، وە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی چوارچێوەیەکی گونجاوتر لە بڕیاری ٩٨٦.

٦. کۆبونەوەی هەردو سەرۆک (تاڵەبانی و بارزانی) لە کوردستان و دەرەوە و هەرکاتێ کە پێویست بکات.

٧. حکومەتی هەرێم پێویستە پارێزگاری لە ئاسایشی سنورەکانی ولاتانی دراوسێ بکات[٤٦٦].

ئەم ڕێکەوتنە، گرنگیەکی نێو دەوڵەتی هەبو، بە تایبەتی کاتێ کە مادلین ئۆڵبرایت، وەک وەزیری دەرەوەی گەورەترین و بەهێزترین ولاتی جیهان،

[٤٦٦] هەمان سەرچاوە، ژمارە ٢٤١٧ی ١٩٩٨/٩/٢١.

پشتگیری خۆی و لەژێر چەتری وەزارەتەکەیدا ئەو ڕێکەوتنە ئیمزاکرا، هەروەها ئەمە بەرهەمی زنجیرەیەک کۆبونەوە بوە، لە کوردستان و ئەنقەرە و لەندەن و پاریس و درۆگیدا و ماوەیەکی باشی خایاندوە تا بە ئاسایی لەدایکبوە. ئەم ڕێکەوتنە کۆتاییهێنا بە شەڕی ناوخۆی کوردی، بوە خۆشحاڵی زۆر لەو وڵاتانەی کە مەبەستیان بو کێشەکە چارەسەر بێت

هەر لە پێناوی ڕونکردنەوەی زیاتری ئەو ڕێکەوتنامەیە، بڕیار درا کە مەسعود بارزانی و مام جەلال سەردانی تورکیا بکەن و مام جەلالیش دەعوەتی دیمشق کرا بۆ هەمان مەبەست و ڕەوانەوەی هەر دودڵییەک کە هەبێت لای وڵاتانی دراوسێ، هەروەها هەردولا وڵاتانی تریشیان وەک ئێران و قاهیرەش ئاگادارکردەوە دەربارەی وردەکاری ڕێکەوتنامەکە. تەنها ڕژێمی بەغدا لە ڕێگای چەند بەیانێکەوە، دژایەتی خۆی بۆ ئەو ڕێکەوتنامەیە دەربڕی و داوای لە هێزە کوردستانییەکان کرد، کە لەگەڵ ڕژێمدا بکەونەوە گفتوگۆ بۆ چارەسەری کێشەکان[٤٦٧].

نەوشیروان مستەفا، وەک کەسی دوهەمی ناو یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و یەکێک لەوانەی لە نزیکەوە ئاگادار و بەشداری شەڕ و ئاشتی و هەمو ڕێکەوتنەکانی نێوان یەکێتی و پارتی بوە و دەستوخەتی لەناو زۆربەی ئەو ڕێکەوتنامانە هەبوە، لە ١٩٩٨/١١/٤دا لە لندەنەوە، ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ مەکتەبی سیاسی یەکێتی نوسیوە:

نامە بۆ م س:

برایانی بەڕێزی،

مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

سڵاوێکی گەرم و هیوادارم هەمیشە سەربەرز و سەلامەت بن

ئەگەرچی ماوەیەکی زۆرە من لە ڕوداوەکانی کوردستانەوە دورم و، هیچ

---

[٤٦٧] هەمان سەرچاوە، ژمارە ٧٢٥٤ی ١٩٩٨/١٠/٨.

بەشداریەکی ئەوتۆم نەکردوە لە هەڵگرتنی باری گرانی ئەرکەکانی یەکێتیدا تا بە ئازایەتیەکی زۆرترەوە ڕەئی خۆم دەرببڕم، بەڵام وا بزانم هەقی ئەوەم ئەدەنێ: کە لەم مەسەلەیەدا، کە پێوەندی بە ئێستا و پاشەڕۆژی گەلەکەمان و هەر یەکێکمانەوە هەیە، بیروبۆچونی خۆم دەرببڕم، بە تایبەتی کە لەم ماوەیەدا بە چاوی چاودێر بە وردی سەیری ڕوداوەکانی ناوەوە و دەرەوەم کردوە.

١. شەڕی ناوخۆ و لە ئەنجامی ئەوەیشدا دابەشبونی کوردستانی عێراق بە سەر دو ناوچەی حوکمڕانی دا یەکێتی میللەتەکەمانی خستبوە مەترسیەوە، جگە لەو گیروگرفتانەی بۆ دانیشتوانی دروستکرد بو، لە دەرەوەیش ناوبانگی جوڵانەوەکە و سەرکردەکانی خراپ و، پشتیوانی دەوڵەتانی دۆستی لە مەسەلەی کورد کەم و لاواز کرد بو. بایەخدانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن زۆر کەم بوبوەوە و، لە هەندێ حاڵەت دا زۆر خراپ بوبو. لەوەوپێش کە باسی سەرکردەکانی کورد ئەکرا وەکو پێشەوای ئازادیخواز و داواکاری مافی مرۆڤ باس ئەکران، کەچی لە کاتی شەڕەکان دا بە ئەمیری جەنگ ناویان ئەبردن. بێگومان ئەمەیش بۆ دواوەچونێکی زۆر ناخۆشبو. بە تایبەتی ئێوە خۆتان تەقدیری گرنگیی پشتیوانی ناو دەوڵەتی ئەکەن لە ڕاگرتنی هەلومەرجی ئێستای کوردستان دا.

٢. بەکارهێنانی زمانی گفتوگۆ بۆ بەلاداخستنی کێشەکان، لە باتی زمانی شەڕ و توندوتیژی و، سەرەنجام سەرکەوتنی منطقی عقڵ و، بەستنی ئەو ڕێککەوتنە لە لایەن سەرکردەی هەردو حیزبی ناکۆک بە شایەتی گەورە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی گەورەترین زلهێزی دنیا و، لە پایتەختی ئەوان دا، حورمەتی جوڵانەوەکە و سەرکردەکانی ئەگێڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی. بەم ڕێکەوتنە جارێکی تر ئەو هەلە مێژوییە زێڕینەی بۆ کورد هەڵکەوت بو، سەرلەنوێ ئەڕەخسێتەوە، ئەوەتا گەورەترین زلهێزی دنیا بەڵێن بە سەرکردەی هەردو حیزب ئەدا ئەگەر ئەو ڕێککەوتنە جێبەجێ

بکەن ئەمەریکا پارێزگاری کورد و یارمەتی ئەدا.

ئەم بەڵێنەی ئەمەریکا، مەسئولیەتێکی گەورە ئەخاتە ئەستۆی سەرکردایەتی کورد، بە تایبەتی هی یەکێتی، بۆ ئەوەی بە چاکترین شێوە بەکاربهێنرێ بە قازانجی ئیدارەیەکی یەکگرتو کە دامەزراوەی دامودەزگای حوکمرانی لە کوردستان دا یەک بخا و، بیکا بە حکومەتێکی ئەوتۆ جێگەی ڕێز لێ نانی دۆست و دوژمن بێ و، ئامادە بێ بۆ ڕوبەڕوبونەوەی هەر ڕوداوێکی چاوەڕوانکراو یان چاوەڕوان نەکراو، کە ڕەنگە لە عێراق دا بێتە پێشەوە. باوەڕم وایە ئیدارەیەکی یەکگرتو، بە دامودەزگای مالی و عەسکەری و پۆلیسی و، نوێنەرایەتی یەکگرتووەوە، هەلێکی گەورە بۆ کورد ئەهێنێتە پێشەوە، ئەم دەسکەوتانە بۆ پاشەڕۆژیش مسۆگەر بکات و، کورد داوا لە کۆمەڵگای ناو دەوڵەتان بکا، هەلومەرجێکی قانونی لە بابەتی ئەوەی لە هۆنگ کۆنگ بە سەر چین دا سەپێنرا، شتێکی لەو بابەتەیش بۆ کورد بە سەر عێراق دا بسەپێنرێ.

٣. ئاشتی یەکێتی و پارتی وەکو خۆتان ئەزانن دوژمنی زۆرە، لە بەر ئەوە وریاییەکی زۆری گەرەکە بۆ ئەوەی پایەدار و بەردەوام بێ، جا بۆ ئەوەی ئەم ڕێککەوتنە تێک نەچێ، هەقە سەرکردایەتی هەردولا ئەم ماوەیە هەموی بە هێمنی خەریکی ڕێکخستنەوەی کاروباری ناوخۆی کوردستانی عیراق بن و، کارێک نەکەن حکومەتی عێراق، یان هیچ یەکێ لە دەوڵەتە دراوسێکانی بوروژێنێ و، بەهانەی شەڕ پێ فرۆشتن و گێچەڵ کردن بدا بە دەستەوە. ئەگەر ئیدارەیەکی یەکگرتوی بە هێز لە کوردستانی عێراق دا هەبێ، هیچ لایەک بە ئاسانی ناتوانێ گێچەڵی پێ بکا و ئیبتیزازی بکا.

٤. جێبەجێکردنی ئەم ڕێکەوتنە لە پێش هەمو لایەکدا بەستراوە بە ئیرادەی کورد خۆیەوە، بە تایبەتی بە ئیرادەی هەردو سەرکردە و بە ئیرادەی هەردو سەرکردایەتیەوە، ئەگەر کورد خۆی سور بێ لە سەر ئاشتی و ڕێککەوتن، نە هیچ کەس و تاقمێ لە ناوەوە و، نە هیچ هێزێکی ناوچەیی و دەرەکی ناتوانێ

تێکی بدا و، شەڕ و ناتەبایی لە کوردستان دا هەڵبگیرسێنێتەوە و، ئەگەر کورد خۆیشی ئاشتی نەوێ هیچ لایەک نایەت بە زۆر ئاشتی بە سەردا بسەپێنێ. ئەمە ئەرکی نەتەوەیی، بەڵکو ئینسانیی، سەرانی کورد خۆیەتی.

دیارە مام جەلال و، سەرکردایەتی یەکێتی، لە ماوەی چەند ساڵی ڕابوردودا هەوڵێکی یەکجار زۆریان داوە بۆ گێڕانەوەی ئاشتی و گەیشتن بە ڕێککەوتن، بە داخەوە هەمو ئەو هەوڵەی لە ڕابوردودا درا سەری نەگرت و، نەیتوانی کۆتایی بە شەڕەکە بهێنێ، بەڵام بۆ خۆشبەختی کورد ئەم جارە وا ئەم ڕێککەوتنە نوێیە ئیمزا کرا، کە لە چاو ئەوانی کەدا لە هەمویان گرنگترە، چونکە:

ا. دوای چەند ساڵ ناکۆکی و شەڕی خوێناوی کە دەرکەوت هیچ لایەک کێشەکەی بە شەڕ پێ بە لادا ناخرێ و، قەناعەتی هەردولا هاتوتە سەر بێهودەیی بەلاداخستنی جەنگیی و، مەترسی کوشندەی درێژەکێشانی شەڕ.

ب. هەردو سەرکردە خۆیان ڕوبەڕو هاوبەشی گفتوگۆکان و، خۆیان لە دارشتنی بەندەکانی ڕێکەوتنەکەدا بەشدار بون و ئیمزایان کردوە.

ج. ئەمەریکا ناوبژی و چاودێری و پشتیوانی کردوە و، بەڵێنی جێبەجێکردنی لە هەردولا وەرگرتوە،

د. لە ناو دۆستەکانی دەرەوەی دا، بە تایبەتی دەوڵەتانی ئەوروپی، هەواڵەکە بە خۆشی وەرگیرا و بە پشتیوانیەکی بەهێزەوە پێشوازی لێ کرا.

بۆیە ئەمەوێ بە ڕاشکاوی بڵێم، پێویستە هەمو کوردێکی دڵسۆز لە هەر پلە و پایەیەک دا بێ، ئەبێ بەوپەڕی توانایەوە هەوڵ بدا، کە ڕێ نەدەن ئەم هەلەیش لە بار بچێ و، ئەبێ هەوڵ بدەن ئەم جارە ئەم ئاشتیە پایەدار و، ئەم ڕێککەوتنە جێبەجێ بکرێ.

٥. لەم قۆناغەدا ئەرکێکی مێژویی زۆر گەورە کەوتوتە ئەستۆی سەرکردەکانی یەکێتی، چونکە لەم ڕێکەوتنەدا لەوانەیە بۆ ئەوەی پارتی بهێنرێتە سەر ڕێگای جێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکە پێویست بکا یەکێتی

(تنازل) لە هەندێ دەسکەوتی خۆی بکا و، پارتی وەکو حیزب هەندێ دەسکەوتی لە یەکێتی زۆرتر بێ، بەڵام جێبەجێکردنی ئەم ڕێکەوتنەی کە تا ڕادەیەکی زۆر چارەنوسی گەلەکەمانی پێوە بەستراوە، ئەو (تنازل)ە ئەهێنێ، چونکە دەسکەوتی میللەتەکە بە کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆ و، یەکگرتنەوەی ئیدارەی کوردستانی عێراق و، زیندوبونەوەی پارێزگاری و پشتیوانی ناودەوڵەتان لە کوردی عێراق، لە دەسکەوتی هەردو حیزبەکە زیاتر ئەبێ و، کارێکی وەهای یەکێتی ئێستا لە بەرچاوی دڵسۆزانی کورد و، پاشەڕۆژ لە مێژوی میللەتەکەمان دا، بە هەڵوێستێکی جوامێرانە بۆ سەرکردەکانی تۆمار ئەکرێ.

لە کۆتایی دا سەرکەوتنتان بە ئاوات ئەخوازم،

لە گەڵ ڕێزی بێ ئەندازەی نەوشیروان مستەفا[٤٦٨].

ڕێکەوتنی واشنتۆن، مانای کۆتایی هێنانی شەڕی چەکداری بو لە نێوان یەکێتی و پارتیدا، بەڵام کۆتایی هێنان نەبو بە ناکۆکی و داخستن و بەلاونانی لاپەرە کۆنەکان و زیندەبەچاڵکردنی رق و دوژمنایەتیە کۆنەکان و گێرانەوەی متمانە لە نێویاندا.

دوای ئەو ڕێکەوتنە، دو ئیدارەیی نەک هەر مایەوە، بەڵکو زیاتر چەسپا، سەرەڕای ئەوەی یەک پەرلەمان و یەک حکومەتی هەرێم بە بەشداری پارتی و یەکێتی و چەند هێزێکی تر دروست بو، بەڵام ناکۆکییەکان و سنورەکەی دێگەڵە وەک جاران مایەوە و نە پەرلەمان و نە حکومەتی یەکگرو نەیانتوانی یەکگرتنێکی ڕاستەقینە بێنێتە کایەوە، ڕەنگی زەرد و سەوز لە هەردو زۆن لە جاران گەشتربون.

---

[٤٦٨] خەون یان مۆتەکە، چ١، ل٢٢٠.

# دوا وشە

مێژوی زۆر لە گەلان، لەوانەش کورد، سەلماندویانە کە لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆدا، هیچ لایەک سەرکەوتنی هەمیشەیی بەدەست ناهێنێت.

شەڕی ناوخۆی کوردی ئەم سەردەمە نوێیە و بە تایبەتی نێوان پارتی و یەکێتی، کە هەزاران قوربانی و دارمانی ژێرخانی کۆمەلایەتی لێکەوتەوە و بوە هۆی تەفروتونابونی سامانی نەتەوایەتی و دروستبونی کینە و بوغز و رق و تۆڵە لە یەکتر و ئینجا ئیفلیجکردنی پەرلەمان و لەتکردنی حکومەت و کوشتن و لەناوبردنی باشترین رۆڵەی ئەم میللەتە و دەرکردن و دەستبەسەراگرتنی موڵک و ماڵی یەکتر.

ئەم شەڕە بوە هۆی ئەوەی جێگۆرکێکردن لە مابەینی ئینتیما بۆ نیشتیمانی و خۆشەویستی و قوربانی بۆ کوردستان، بە پابەندبون و خۆ بە کوشتدان بۆ حیزب و خێڵ و سەرکردە و گروپ و تایەفە و بەرژوەوەندی تایبەت. زوربەی زۆری هێزە سیاسیەکان هەمو ڕێگایەکیان گرتوتەبەر بۆ ئازاردان و ناشیرینکردنی هێزی بەرامبەر.

نە یەکێتی و نە پارتی، نە ئێستا و نە تا ئایندەیەکی دوریش نەیانتوانیوە و ناتوانن لە (عوقدە)ی شەڕی ناوخۆ خۆیان رزگار بکەن و وەک دو هێزی سیڤیل بێنە گۆرەپانی سیاسیەوە و هەوڵی بە دامەزراوەکردنی حکومەتی هەرێم و پەرلەمان بدەن و ناکۆکیەکانیان بە ڕێگای ئاشتی چارەسەر بکەن و سندوقی دەنگدانی پاک و بێ دەسکاری بکەن بە سەنگی قورسایی سیاسی خۆیان.

یەکێک لە شکستە دیارەکانی پەرلەمان و حکومەت و هێزە سیاسییەکان، بە تایبەتیش دوای زیاتر لە سی ساڵ بەسەر ڕێکەوتننامەی واشنتۆندا، ئەوەیە کە نەیانتوانیوە هێزی پێشمەرگە و دەزگای هەواڵگری و ئاسایش یەک بخەن،

ئەم دەزگایـانەش ئـامرازی بەهێـز و کـاریگەرن بـۆ بەردەوامـی نـاکۆکی و ئامادەیی بۆ شەڕی ناوخۆ.

لە قۆنـاغی شـەڕی نـاوخۆی نوێـدا، ئەم دو هێـزە پێشـمەرگەکانیان بـۆ شەڕی دژبەیەک بەکار هێنـاوە، بەڵام ئێستا ئەم دو هێزە، سـەرەڕای هێزی نیزامی خۆیان، سەرکردەیان هەیە کە هێزی تـایبەت بە خـۆی هەیە، تەنها و تەنها لەژێر فەرماندەیی لێپرسراوەکەی خۆیاندایە و گوێ نە لە پەرلەمـان و نە لە حکومەت و هەتـا لە حیزبەکەی خۆشیان نـاگرن، واتـا وڵاتـی بەرەڵای فرە گروپی چەکداری تایبەت.

تاکو ئێستا، نە هێزە سیاسییەکان، نە مێژونوس و سیاسیە سـەربەخۆکان یـان نوسـەر و رۆشـنبیران، لێکۆڵینەوەیەکی وردی بێلایەنـانە و زانسـتیانەیان لەسـەر رەهەنـدەکانی شـەڕی نـاوخۆ نەکـردوە، حیـزبە سـەرەکییەکانیش، هەریەکەیـان لە روانـگەی حیزبـی خـۆیەوە، هۆکـاری شـەڕ و گرژیەکانیـان خستۆتە پاڵ هێزەکەی تر و خۆیان بە کۆتری ئاشتی لەقەڵەم داوە.

ئەوەی کە زۆر ئاشـکرایە و روداوەکـانی رابـوردوی نزیـک نیشـانی داوە، کـاریگەری و دەسـتتێوەردانی وڵاتـانی دراوسـێ و نـاوچەکە و زلهێزەکـان، ئەوەنـدە بەهێـزن لەسـەر روداوەکـانی کوردسـتان و هێـزە سیاسـییەکان، کە رێگـا نـادەن نە ئێسـتا و نە لە ئاینـدەدا، هـیچ هێزێـک بە تەنهـا حـوکمی کوردستان بکـات، واتـا چارەنوسـی ئەم نـاوچەیە لەم قۆنـاغەدا بە پەیوەندی ئەم دو هێزەوە بەستراوەتەوە.

چـاوەڕێ دەکـرا لەم قۆنـاغە هەسـتیارەی کە ئێسـتا کوردسـتان و ناوچەکەی پێدا تێپەر دەبێت، ئاشتییەکی راستەقینە و پتە بێتە کایەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە شەڕێکی شاراوەی کەم تین بوە بە سیمای پەیوەندی ئەم دو هێـزە و عەقڵیەتـی (تـۆڵە)ی لای سـەرکردایەتی هەردولا لەنـاو نەبـردوە، لەسەرو هەموشیانەوە، متمانە لە نێوانیاندا لە جێی نەبونە.

ئەم عەقڵـیەتەی کە ئێسـتا لای هێـزە سیاسـیەکان دروسـت بـوە، دژ بە

بەرژەوەنــدیە بنەڕەتیەکــانی نەتەوەکەمــانە و پــێچەوانەی ئەو دەســکەوتە هاوبەشـانەیە لە راپەیـن و هەڵبـژاردن و دروسـتکردنی حکومەت و پەرلەمـان بەدەست هاتون.

یەکێتی و پارتی لە کۆڕەوی ١٩٩١ و لە گفتوگۆ لەگەڵ رژێم هاوبەش بون و سەرکەوتنی دیاریان لەو قۆناغانەدا بەدەستهێنا، بەڵام کاتێ هەریەکەیـان دژ بەوەی تــر پیلانگێڕیــان دەســتپێکرد و عەقڵــی تــاکرەویی سیاســی زاڵبــو، کارەسـاتی زۆر گەورە رویـدا لەوانە چـوار سـاڵ شـەڕی نـاوخۆ و نزیکتـرین روداویـش، کارەسـاتی ئۆکتـۆبەری ٢٠١٧ بـو، کە لە ئەنجـامی ناتەبـایی و پیلانگێـری لە یەکتـر، فراوانتــرین نــاوچەی جــوگرافی و گرنگتــرین شــار و شارۆچکەی کوردستان کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی بەغداوە.

## گرنگی ئەم کتێبە چیە؟ یان بۆچی ئەم کتێبە نوسراوە؟

ئەو بابەتـانەی لەم کتێـبەدا نوسـراون، روداوی واقعیـین و بـاس لە مێـژوی دوێنێ دەکات، باس لە کۆمەڵێک روداو دەکات کە زۆر نزیکن لێمان، باسـی خەم و خواست و پەژارەی زۆر ماڵی کوردی تێدایە کە کەمیان هەیە راستەوخۆ یـان ناراستەوخۆ پریشکی ئەم کارەساتەیان بەرنەکەوتبێت و قوربانیان نەدابێت.

ئــێمە هــاتوین باســی روداوێکــی زۆر دڵــتەزێن دەکەیــن لە مێــژوی میللەتەکەمـان کە شـەڕی نـاوخۆیە، نابێت باسی خوێنـاوترین قۆنـاغی مێژوی گەلەکەمان بە تاریکی بهێڵینەوە، ئەگەر کورد مێژوی شـەڕی دوێنێی نەزانێت، ناتوانێت پلانی ئاشتی سبەینێ دارێژێت، روداوی بڤە نیە لە مێژوی میللەتانـدا، تەمەنی ئەم روداوانە هەمـوی چەنـد سـاڵێکە، لەبەرئەوە مـافی هـاوڵاتی کوردە بزانێت دوێنی چی رویدا، چۆن رویدا، بۆ رویدا لە نێوان (برایان)ی ئیمڕۆدا.

لە زۆر وڵات، دیکــۆمێنتی مێژویــی گرنــگ، دوای تێپەربــونی چــارەکە سادەیەک بەسـەریدا، بە نەهێنی نـامێننەوە و ئاشکرا دەکرێن، زوربەی زۆری نـامە و بڵاوکـراوە و دیکۆمێنتەکـانی شــەڕی نـاوخۆش، تەمەنیـان زیـاترە لە

چارەکە سەدەیەک و زۆربەی زۆریان لە چەند شوێنێک و بەشێوەی جیاواز بڵاوکراونەتەوە.

ژمارەیەکی زۆر لە بروسکە، نامە، بڵاوکراوە هەموجۆرەکان، فرە سەرچاوە و فرە زمانن، ئارشیفێکی باشی هەمەرەنگمان لەبەردەستا بوە و پێمان باش بوە، کە تەنها لای بەندە و لە کتێبخانەکەدا نەمێنێتەوە، بەڵکو دۆست و هاوڕێیانیش سودی لێوەرگرن، زۆریم لەم کتێبەدا خستوتە بەردەم خوێنەران.

هەوڵمان داوە، تا ئەو شوێنەی کە سەرچاوەی باوەڕپێکراومان دەستکەوتوە، روداوەکان لەو روانگەیەوە بگێڕینەوە، زۆری سەرچاوەکانمان هی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانن، بە تایبەتی بروسکەکان، زۆر هەوڵمانداوە لای برادەرانی پارتی هەندێ سەرچاوەی گرنگ و بڵاونەکراوەمان دەستبکەوێت، بەداخەوە سەرکەوتو نەبوین، سەرەڕای ئەوەش هەندێ سەرچاوەی جیاوازی پارتیمان دەسکەوتوە و بڵاومانکردۆتەوە.

بروسکە و بەیان و رونکردنەوەکان سەرچاوەی جیاوازیان هەیە، بە تایبەتی ئەوانەی یەکێتی نیشتیمانی، بەڵام هەرهەمویان لای نوسەر پارێزراون، زۆر لە بروسکەکان لە کتێبێکی ۱۲۱۰ لاپەڕیدا بە ناوی (تۆڕی پەیوەندیەکانی پێشمەرگە لە شاخ – سندوقە ڕەشەکەی پێشمەرگە- لە ئامادەکردنی - بەختیار مستەفا ئەمین و خالید حسێن ئەحمەد- ۲۰۱۹) بڵاوکراوەتەوە.

ئێمە هاتوین باسی روداوکان دەکەین، وەک چۆن لەبەردەستماندایە، بەرپرس نین، کە بروسکەیەک، نامەیەک، بڵاوکراوەیەک یان رونکردنەوەیەک، راستن یان هەڵەن، هێزە سیاسیەکان لە روانگەی بۆچونی خۆیانەوە نوسیویانە، بێگومان هەوڵمانداوە ئەو بروسکە و نامانە بخەینە بەردەم خوێنەران، کە بۆ بڵاوکردنەوە شیاون، چونکە لە کاتی شەڕدا زمانی نوسین دەگۆڕێت و زۆر زبر دەبێت، هەروەها نەهاتوین دەسکاری ڕێزمان یاخود شێوەی نوسینەکان بکەین، وەک چۆن لەبەردەستماندا بوە، بەو شێوەیە بڵاومان کردۆتەوە.

لەم نوسینەدا باس و ناوی کۆمەڵێک حیزب، هێز و گروپی سیاسی و لێپرسراو و کەسایەتی جیاواز هاتوە، بەیان و بڵاوکراوە و بروسکە و نامە و رونکردنەوەکانیانمان وەک خۆی داناوە، ئەمە تەنها و تەنها ئاوێنەی دەربڕینی هەڵوێستی ئەو کات و ساتەیە کە تێکستەکەی تێدا نوسراوە و بڵاوکراوەتەوە و ئێمە وەرمانگرتوە.

زۆر لەو هێزە سیاسیانەی کە تا ئێستا لە گۆڕەپانەکەدان و ئەو کەسایەتیانەی لە ژیاندان یان وەفاتیان کردوە، رەنگە زۆریان، دەمێکە کە گۆڕانی بنەڕەتی بەسەر فکر و هەڵوێستیاندا هاتوە، هەندێ لە هێزەکان یان لە کەسایەتیەکان تەنها ناوەکانیان وەک جاری جاران ماوەتەوە. باسکردنیان نە پشتگیرییە بۆیان و نە پێچەوانەکەیەتی.

روداوەکان لە دیدی جیاوازەوە باسکراون، بە کاری خۆمانمان نەزانیوە رۆڵی دادوەر ببینین و بڵێین کێ تاوانبارە و کێ بێ تاوان، یان شەڕی ناوخۆ لە ئەستۆی کێیە و کێ نیە؟ ئێمە هاتوین باس لە سەرهەڵدانی کێشەکان و ئەنجامەکانی دەکەین، باس لەوە دەکەین بۆچی و چۆن شەڕەکان سەریان هەڵدا، کێ دەستی پێکرد و ئەنجامەکەی بەچی گەیشتوە، با خوێنەر خۆی ئازادانە بڕیار بدات، کە تاوانی کام گروپ بو، کە فلان شەڕی هەڵگیرساندوە، یان کام هێز فلان دەوڵەتی هێنایە ناو شەڕە ناوخۆییەکانەوە، بۆچی هێنای؟ باشی کرد یان خراپ؟ ئەنجامەکەی چی بو؟ خوێنەر ئەبێ خۆی دادوەر بێت.

هەمومان بە هیوای ئەوەی جارێکی تر ئەم کارەساتانە رونەداتەوە و گەلەکەمان و هێزەسیاسیەکان لە ئەنجامی ئەو شەڕە نەگریسانە، وانەی ئاشتەوایی و لێبوردەی و برایەتی راستەقینە فێربوبن و جارێکیتر خوێنی رۆڵەی کورد لە پێناوی بیری تەسکی حیزبایەتی بە فیڕۆ نەڕوات.

زۆر زەحمەت نیە شەڕ لە نێوان دو هێزی سیاسیدا هەڵبگیرسێت ، بەڵام کوژانەوەی زۆر ئەستەمە و سرینەوەی پاژماوەکانی ئەستەمترە.

ئەو پرسیارەی کە زۆرجار دەکرێت، ئایە شەڕی ناوخۆ جارێکی تر

ڕوئەداتەوە؟ وەڵامـــی ئەم پرســـیارە بەزۆر خـــاڵی نـــاوخۆیی و دەرەکـــی و چارەســـەرنەکردنی کێشـــە هەمەلایەنەکـانی نێـوان ئەو دو هێـزە و عەقڵیەتـی سەکردایەتی هەردولاوە بەستراوەتەوە، تا ئەو کاتەی کە هاوسەنگی و متمـانە لە نێوانیاندا دروست نەبێت، تا ئەو کاتەی دانیشتوانی زۆنێک هەست بکەن کە بە عەدالەت و یەکســـانی مامەڵەیـــان لەگەڵـدا ناکرێـت و بە پـلان، پشـتگوێ دەخرێن و دەسەڵاتەکانیان سنوردار دەکرێ و مافەکانیـان پشـتگوێ دەخرێت، ئەو بە دڵنیاییەوە هەمو هەنگاوێک بۆ چارەسـەری کێشـەکان بەرەو کۆلانێکی داخراو دەچێت، ئاشتی راستەقینە کاتێک دێتە کایەوە، کە هەردو هێزی گەورە و هێزەکانی تر بەقەدەر یەک یان نزیک لەیەک سودمەندبن تێدا.

ئاشتی بەهێزی سەرانسـەری و بنـاغە پتەو،کاتێ دێتە کـایەوە کە بە پلەی یەکەم لە بەرژەوەندی کێشـەی ڕەوای نەتەوایەتیدا بێت، گرنگە ئەو ئاشـتی و تەبـاییە لە قەنـاعەتی هێـزە سیاسـیەکانەوە بێـت و هـیچ لایەک بە ئەنقەسـت پشتگوێ و پەروایز نەخرێت، ئەگەر وانەبێت ئەوا هەمو ئاشتییەک کاتی دەبێت و ژیلەمۆی ناتەبایی و گرژی و شەڕ هەر سەرهەڵئەداتەوە..

ئەم بارودۆخ و پەیوەندیە سیاسیە ناتەندروستەی ئێسـتا لە کوردسـتان و لە نێـوان پـارتی و یەکێتیـدا هەیە، زەمیـنە خۆشـدەکات بـۆ تەقیـنەوەی بارودۆخەکە و هەمولایەک بەرەو ئایندەیەکی تاریک رادەکێشێت.

زۆرجـار هەردوهێـزەکە لە ڕێگـای سۆسـیال میـدیای خۆیـان و میـدیای چەواشەکار و پەیجی فەیکەوە، ڕۆڵی زۆر خراپ و ناراست دەبینن بۆ تیژکردنی ڕق لەیەکتربون، ئەمە لەگەڵ ئامانج و دروشـمی میدیای ئازاددا یەک ناگرێت، کە پەیامەکەی بریتیە لە ناشتنی تۆوی ئاشتەوایی و خۆشەویستی لە نێو کۆمەڵانی خەڵکی کوردسـتاندا، بە هەمـو ڕەنـگ و دەنـگە جیاوازەکانیـانەوە و ڕەتکـردنەوە هەمو هەنگاوێک کە تۆوی ڕق و دوژمنایەتی بچێنێت.

هەروەها پێویستە ڕاگەیاندنی ئـازاد بە چاوێکی کراوە و ورد و هەسـت بە لێپرســراوێتیەوە بــڕوانێتە ڕوداوەکــان و هەڵوێســتی ڕەخنەگــرانەی ئــازا و

بەرپرسانە و بێلایەنانەی نیشتیمانیانە بەرامبەر بە هەمو هێزو گروپ و کۆمەڵێک وەک یەک بگرێتە بەر.

ئەوەی دڵخۆشکەرە کە شەڕخوازان و ئازایانی دوێنێی شەڕی ناوخۆ لە هەردو هێزەکە، ئێستا زۆر لە بەرژەوەندیاندا نیە شەڕ دەستپێبکەنەوە و زۆر لە دەسترۆشتوە سیاسی و سەربازیەکانی ئەم دیو و ئەو دیوی دێگەڵە، بە چەندەها بەرژەوەندی ئابوری گەورە و قەبەوە بەیەکەوە بەستراونەتەوە و شەڕیشیان پێ بفرۆشیت، ئەوان شەڕناکەن.

زۆر ئاساییە کە هەرکەس و لایەک بۆچونی جیاوازی هەبێت دەربارەی قۆناغێک لە قۆناغەکانی شەڕی ناوخۆ، با لەجیاتی هێرشکردن و دروستکردنی تۆمەتی بێ بنەما بۆمان، با بۆچونەکانیان بە بەڵگەوە بخەنە رو، وەک چۆن ئەوان بینیویانە و ئەیبینن، من هاتوم بەشێ لە روداوەکانم بەیەکەوە بەستۆتەوە. شەڕی ناوخۆ و ئەنجامەکانی ئەوەندە دەهێنێت، کە چەند نوسینێکی هەمەلایەنەی زانستیانەی لەسەر بڵاوبکرێتەوە، با تێروانینەکانیش جیاوازبن، با ئەم نوسینەش سەرەتایەک بێت، بۆ باسکردنی هەندێ لاپەڕەی تری تاریک و شاراوەی ئەو مێژوەی کە بە دڵنیاییەوە ئێمە هەمویمان باس نەکردوە.

هەندێ سەرچاوە، رەنگە لاپەڕەکانی جیاوازبن، وەک لەوەی لای خوێنەرێک هەیە، ئەوەش لە ئەنجامی ئەوە دروست بوە، کە ئەو سەرچاوانە، چەند چاپێکیان هەیە.

بۆ ئەم نوسینە، هاورێیان و برادەران (عوسمانی حاجی مەحمود، مستەفای سەید قادر، چولی ئەسعەد، سەردار عەبدولا و خەبات عەبدولا) هاوکاری هەمەچەشنەی زۆریان کردوم و بێ ئەو هاوکاریە، ئەم کتێبە بە دڵنیاییەوە، بەم شێوەیە دەرنەئەچو، کۆڵێک رێز و سوپاسم بۆ هەیەکەیان هەیە.

سەلاح رەشید

ئابی ٢٠٢٠

**مام جەلال**

شەڕی براکوژی، کارەساتێکی نیشتیمانی و نەتەوایەتییە دەبێتە هۆی بەفیڕۆدانی بەری ڕەنج و خەباتی خۆتان و برا شەهیدەکانتان و دەبێتە هۆی شادیی دژمنان و لەدەستدانی دۆستان و پشتیوانیی گەلان و هاوپەیمانان. پاراستنی خوێنی شەهیدەکانتان و تاقیکردنەوە دیموکراتییەکەمان و ژیان و مان و گەشەکردنی حکوومەتە ساواکەمان بەند و بەستراوەتەوە بە یەکێتیی ڕیزەکانی گەل بەگشتی و یەکێتیی هاوپەیمانێتی (ی.ن.ک) بە تایبەتی. مام جەلال 1994/5/10

**مەسعود بارزانی**

زۆر بەداخەوە ڕووداوی ناخۆش و دڵتەزێن لە نێوان یەکێتی و پارتی ڕوویان دا. خەڵکی نەفام و نەزان و هەندێ خائینیش بەداخەوە مەیدانیان بۆ خۆش بووە، تا یاری بە چارەنووسمان بکەن. نابێ کۆڵ بدەین و دەبێ ئیشەڵا ئیرادەی خێر سەربکەوێت. مەسعوود بارزانی 5-5-1994

**نەوشیروان مستەفا**

ئەگەر ئەم شەڕە چەند ساڵی تریش درێژە بکێشێ، سەرەنجام هەر ئەبێ بە دانیشتن و گفتووگۆ چارەسەر بکرێ. وا دوو هەزار کەسی ترتان لە یەکێتی کوشت و گریمان یەکێتیتان شکاند و ڕاوتان نان بۆ ئێران یان بۆ کەرکووک. یەکێتی بەوە لەناو ناچێ، جارێکی تر دێتەوە سەرتان و ناهێڵێ بە ئاسوودەیی دابنیشن. یا بە پێچەوانەوە، یەکێتی چەند هەزار کەسی تری لە پارتی کوشت و پارتیی شکاند و ڕاوی نان بۆ موسڵ یان بۆ تورکیا یان بۆ ئێران. پارتی بەوە لەناو ناچێ، جارێکی تر دێتەوە سەر یەکێتی و ناهێڵێ بە ئاسوودەیی دابنیشێ. لەبەر ئەوە تەنیاڕێگە پێکهاتن و ئاشتبوونەوەیە. 4-4-1996

6000
نرخی تەنها

لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان